

تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
مختصر
صحيح مسلم
للإمام زكي الدين عبد العظيم عبد القوي المنذري
المتوفى ٦٥٦ هـ
بە کوردی کردن و ڕوونکردنەوەی
نوری فارس حمه خان
سەرپەرشتی چاپ
مەلا مەحموودی گەلالەیی
دار المعرفة
بيروت - لبنان



# مُختَصَر
# صَحِيح مُسلِم

لِلإمام زكي الدين عبد العظيم بن عبد القوي المنذري
المتوفى ٦٥٦ هـ

به كوردی كردن و ڕونكردنه‌وه‌ی
**نوری فارس حمه‌خان**
سه‌رپه‌رشتی چاپ
مه‌لا مه‌حموودی گه‌لاڵه‌یی

( به‌رگی پێنجه‌م )



📖 ناوی کتێب ﴿ مختصر صحيح مسلم ﴾

📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان.

📖 تیراژ: (٣٠٠٠) دانــە.

📖 ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٦٢٧)ی ساڵی (٢٠١١)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

📖 ساڵی چاپ: ٢٠١١ز - ١٤٣٢ ك.

📖 تایپ: (نیان حسین)



# ٥٢- نامەی کردەوەی چاکەو بەسەرکردنەوەی خزمو کەسوکارو باشبوون بۆیان:

## كِتَابُ البِرّ والصّلَةِ

{بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ١ هەتا زنجیرە: ١٠، لەژمارە: ٤٦٥٠ هەتا ٤٧٢٥} + {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣١٢} + {تەجریدی بوخاری/٥، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ١٩١٤ هەتا ١٩٢٧ = ٦٠١٣} .

**١٣٣٥) باسی باشبوونو چاکەکردن لەگەڵ باوكو دایك، وەكامیان لەپێشترەو زیاتر شایانی ئەوەیە كەزۆر بەجوانی هاوڕێتی بكرێت.** (٦٤٤٧ - ٦٤٥٤)

**بَابٌ: فِي بِرّ الوَالدَيْنِ وَأَيُّهُمَا أَحَقُّ بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ**

١٧٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ: مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِى؟ قَالَ: «أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَبُوكَ». {الحديث: ٦٤٤٧ = ٦٤٦٠ فم. تەجریدی بوخاری/٥، رقم: ١٩١٤ = ٥٩٧١ فتح الباری. تحفة الأشراف: ١٤٩٠٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆ خزمەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ ڕەواترین کەسە کە بەجوانی هاوڕێتی بکەم؟ فەرمووی: (دایکت). گوتی: ئەوجا کێی تر؟ فەرمووی: (دیسان هەر دایکت). گوتی: ئەوجا کێی تر؟ فەرمووی: (دیسانەوە هەر دایکت). گوتیەوە: ئەوسا کێی تر؟ فەرمووی: (ئەوجا باوکت!). {ریاض/١، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣١٦} لە گێڕانەوەیەکی ریاضدا: (ئەوجا خزمو کەسوکارت بەپێی دوورو نزیکیان لێتەوە!) + {تاج/٥، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٤٦٥١ ج/٤} . گەورەترین چاکە چاکەکردنە لەگەڵ بابو داك.

## ١٣٣٦) باشبوونو چاكەكردن لەگەل باوكو دايكدا لە پەرستشو عيبادەتی سوننەت باشترە. (٦٤٥٥ - ٦٤٥٩)

## بَابٌ: تَقْدِيمُ بِرِّ الْوَالِدِينَ عَلَى الْعِبَادَةِ

١٧٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ إِلاَّ ثَلاَثَةٌ: عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ، وَصَاحِبُ جُرَيْجٍ، وَكَانَ جُرَيْجٌ رَجُلاً عَابِدًا فَاتَّخَذَ صَوْمَعَةً فَكَانَ فِيهَا، فَأَتَتْهُ أُمُّهُ وَهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: يَا رَبِّ! أُمِّي وَصَلاَتِي، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِهِ، فَانْصَرَفَتْ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي، فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ! فَقَالَ: يَا رَبِّ أُمِّي وَصَلاَتِي، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِهِ، فَانْصَرَفَتْ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي، فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ! فَقَالَ: أَيْ رَبِّ أُمِّي وَصَلاَتِي، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِهِ، فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى وُجُوهِ الْمُومِسَاتِ!. فَتَذَاكَرَ بَنُو إِسْرَائِيلَ جُرَيْجًا وَعِبَادَتَهُ، وَكَانَتِ امْرَأَةٌ بَغِيٌّ يُتَمَثَّلُ بِحُسْنِهَا، فَقَالَتْ: إِنْ شِئْتُمْ لأَفْتِنَنَّهُ لَكُمْ، قَالَ: فَتَعَرَّضَتْ لَهُ فَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيْهَا، فَأَتَتْ رَاعِيًا كَانَ يَأْوِي إِلَى صَوْمَعَتِهِ فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا، فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَحَمَلَتْ، فَلَمَّا وَلَدَتْ قَالَتْ: هُوَ مِنْ جُرَيْجٍ! فَأَتَوْهُ، فَاسْتَنْزَلُوهُ، وَهَدَمُوا صَوْمَعَتَهُ، وَجَعَلُوا يَضْرِبُونَهُ، فَقَالَ: مَا شَأْنُكُمْ؟! قَالُوا: زَنَيْتَ بِهَذِهِ الْبَغِيِّ فَوَلَدَتْ مِنْكَ! فَقَالَ: أَيْنَ الصَّبِيُّ؟ فَجَاءُوا بِهِ، فَقَالَ: دَعُونِي حَتَّى أُصَلِّيَ، فَصَلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَتَى الصَّبِيَّ فَطَعَنَ فِي بَطْنِهِ وَقَالَ: يَا غُلاَمُ مَنْ أَبُوكَ؟ قَالَ: فُلاَنٌ الرَّاعِي. قَالَ: فَأَقْبَلُوا عَلَى جُرَيْجٍ يُقَبِّلُونَهُ وَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ، وَقَالُوا: نَبْنِي لَكَ صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ وفضةٍ، قَالَ: لاَ، أَعِيدُوهَا مِنْ طِينٍ كَمَا كَانَتْ. ففعلوا. وَبَيْنَا صَبِيٌّ يَرْضَعُ مِنْ أُمِّهِ، فَمَرَّ رَجُلٌ رَاكِبٌ عَلَى دَابَّةٍ فَارِهَةٍ، وَشَارَةٍ حَسَنَةٍ، فَقَالَتْ أُمُّهُ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَ هَذَا، فَتَرَكَ الثَّدْيَ وَأَقْبَلَ إِلَيْهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهِ، فَجَعَلَ يَرْتَضِعُ. قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَحْكِي ارْتِضَاعَهُ بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ فِي فَمِهِ، فَجَعَلَ يَمُصُّهَا. قَالَ: وَمَرُّوا بِجَارِيَةٍ وَهُمْ يَضْرِبُونَهَا، وَيَقُولُونَ: زَنَيْتِ سَرَقْتِ، وَهِيَ تَقُولُ: حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، فَقَالَتْ أُمُّهُ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهَا، فَتَرَكَ الرَّضَاعَ وَنَظَرَ إِلَيْهَا فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا، فَهُنَاكَ تَرَاجَعَا الْحَدِيثَ. فَقَالَتْ: حَلْقَى! مَرَّ رَجُلٌ حَسَنُ الْهَيْئَةِ فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهُ، فَقُلْتَ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ! وَمَرُّوا بِهَذِهِ

الأَمَةِ وَهُمْ يَضْرِبُونَهَا وَيَقُولُونَ: زَنَيْتِ سَرَقْتِ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهَا، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا! قَالَ: إِنَّ ذَاكَ الرَّجُلَ كَانَ جَبَّارًا، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ وَإِنَّ هَذِهِ: يَقُولُونَ لَهَا: زَنَيْتِ، وَلَمْ تَزْنِ، وَسَرَقْتِ، وَلَمْ تَسْرِقْ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا).
{الحديث: ٦٤٥٦ = ٦٤٦٩ فم. تجريد البخاري بالكوردی/٤، رقم: ١٣٦٨ = ٣٤٣٦، ١٢٠٦، ٢٤٨٢، ٣٤٦٦. تحفة الأشراف: ١٤٤٥٨}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەم سێ کەسە نەبێ کەسی تر، بەساوایی، لە بێشکەدا قسەی نەکردووە:**

**یەکەم: عیسای کوڕی مەریەم.**

دووەم: هاوڕیکەی جورەیج، پیاوێ دەبێ لەنەوەی ئیسرائیل ناوی جورەیج دەبێ، سۆفیلکەو خواناسێکی باش دەبێ، خەڵوە خانەیێ بۆ خۆی دروست دەکاو لەناویا خواناسیی دەکا، جارێ نوێژدەکا، لەوکاتەدا دایکی دێ بۆلای‌و بانگی دەکا: ئەی جورەیج!

ئەویش لەدڵی خۆیدا دەفەرموێ: خودایە! نازانم وەڵامی دایکم بدەمەوە، یا نوێژەکەم تەواوبکەم، لەپاشا وا بەباش دەزانێ کە نوێژەکەی تەواو بکاو وەڵامی دایکی نەداتەوە، جا دایکی دەگەڕێتەوە، بۆ سبەینێ کە دایکی دێتەوە بۆلای، دیسان جورەیج خەریکی نوێژکردن دەبێ، بانگی دەکاو دەڵێ: ئەی جورەیج! جورەیجیش دەفەرموێ: خودایە! نازانم وەڵامی دایکم بدەمەوە، یا نوێژەکەم تەواوبکەم، لەپاشا وا بەباش دەزانێ کە وەڵامی دایکی نەداتەوەو نوێژەکەی تەواوبکا، جا دایکی دەگەڕێتەوە بۆ سبەینێ کە دێتەوە بۆلای، دیسان جورەیج نوێژدەکا، بانگی دەکا: ئەی جورەیج! جورەیجیش دەڵێ: خودایە! نازانم وەڵامی دایکم بدەمەوە، یا نوێژەکەم تەواوبکەم، لەپاشا وا بەباش دەزانێ کە وەڵامی دایکی نەداتەوەو نوێژەکەی تەواوبکا.

دایکیشی دەڵێ: خودایە! نەیمرێنی هەتا رووی داوێنپیسانی پێ نیشان دەدەیت. لەولاشەوە نەوەی ئیسرائیل لەناو خۆیانا باسی خواناسیی جورەیج دەکەن، کەچۆن بۆ خودا لێ بڕاوە. ژنێکی سۆزانی دەبێ، بۆ جوانی بێ وێنە دەبێ، دەڵێ: ئەگەر

حەزدەکەن من دەچم لەخشتەی دەبەم‌و تووشی فەرتەنەی دەکەم. جا ژنەکە دەچێ بۆلای جورەیج، گەلێ خەریکی دەبێ‌و دێ بەلایەوە کە ئەو ئیشەی لەگەڵدا بکا، بەڵام جورەیج مل ناداو ئاوڕی لێ ناداتەوە. جا ژنەکە دەچێ بۆلای شوانێ، کە لەشەودا لە خەڵوە خانەکەی جورەیجا دەحەوایەوە، ئەو شوانە دەنێ لەخۆی‌و سکی لێی پڕدەبێ‌و کوڕێکی دەبێ، دەڵێ: ئەم مناڵە لەجورەیجە!

ئەوانیش دەچن بۆ گیانی جورەیج‌و لە خەڵوە خانەکەی دەری دەهێنن‌و خەڵوەخانەکەی دەرووخێنن‌و، خۆشی تێرو پڕ فەلاقە دەکەن‌و دەیدەنە بەرجمێن. ئەویش دەفەرموێ: ئەوە چیتانە؟ بۆ وادەکەن، من گوناهم چییە؟ دەڵێن: چونکە ئیشی بێ شەرعیت لەگەڵ ئەم قەحبەیەدا کردووەو ئەوەتانێ لەتۆ ئەم زۆڵەی بووە!

دەفەرموێ: کوا مناڵەکە لەکوێ یە؟ ئەوانیش دەیهێنن بۆی. دەفەرموێ: تۆزێ پشووم بدەن، با نوێژێ بکەم. جا دەستنوێژ دەگرێ‌و نوێژدەکا، کە نوێژەکە تەواو دەکا دەڕوا بۆلای کوڕە ساواکەو دەژەنێ بەسکیاو دەفەرموێ: ئەی کۆرپەی ساوا! کێ باوکی تۆیە؟ کوڕەکەیش دێتە زمان‌و دەڵێ: باوکی من فیسارە شوانە!!

جا ئەوسا خەڵکەکە لە راستیی رووداوەکە تێ دەگەن‌و داوای لێ بووردن لە جورەیج دەکەن‌و پەلاماری دەدەن‌و دەست دەکەن بەماچکردنی‌و خۆیانی تێ هەڵەسوون بۆ پیرۆزی‌و مووفەڕك، وە دەڵێن: خەڵوە خانەکەت لەزێڕو زیو بۆ دروست دەکەینەوە؟ دەفەرموێ: نەء، بەڵام لە قوڕ وەك جارانی خۆی بۆم دروست بکەنەوە، ئەوانیش بۆیان دروست کردەوە.

سێیەم مناڵ کە لەلانکا قسەی کردووە: جارێ ژنێ مەمکی دەدا بە کوڕە کۆرپەکەی، کە لەنەوەی ئیسرائیل بوو، لەوکاتەدا سوارێکی قۆزی بەناوبانگ بەلایانا رادەبووری، بەسواری ولاخێکی کەشخە، پایەو پلەو نیشانێکی زۆری پێوە دەبێ. ژنەکە دەڵێ: خودایە! ئەم کوڕەی منیش بکەی بەسوار چاکێکی ئاوا قۆزو بەناوبانگ!

جا کوڕەکەی مەمکەکەی بەردەداو روودەکاتە سوارەکەو تەماشایەکی دەکاو دەڵێ:

خودایە! وەك ئـەم سوارەم لێ نەكـەی‌و نەمكـەی بـە پیـاوێكی وا، ئینجا دیسان مەمكەكەی دەگرێتەوەو دەست دەكاتەوە بەمژینی!

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەیفـەرموو: دەڵێـی وا لەبەرچـاوم كەچۆن چـۆنی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەی دۆشـاو مـژەی خـۆیی دەمـژی‌و لاسكایی حـاڵی مەمكخواردنی منداڵەكەی دەكردەوە.

خۆشەویســت (دروودی خـودای لەســەر بـێ) فــەرمووی: لەپاشــدا كــەنیزەكێكیان هێنــا، هێنابوویانە گیروگازو لێیان دەداو دەیانگوت: حیزی‌و دزیـت كـردووە، ئـەویش هـەر دەیگوت: {حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الوكيلُ: من هەر خودام هەیە كە كەسم بـێ‌و بەسـم بـێ! بەڕاستی خودا هاناو پشتیوانی چاكە. جا دایكی منالەكە دەڵێ: خودایە! ئەم كوڕەی من وەك ئەم كچە بەم دەردە نەبەی، دیسان كوڕەكەی مەمكەكـەی دایكـی بـەردەداو تەماشایەكی كچەكە دەكاو دەڵێ: خودایە! وەك ئەم كچەم لێ بكەی!

جا لێرانەدا منالەكەو دایكی دەكەونە گفتوگۆو رازو گلـەیی، دایكـی پێـی دەڵـێ: دەمم بشكێ! ئەمە بۆ وایە؟ ئەو پیاوە شێوە جوانـە، رەت بـوو، مـن گـوتم: خودایـە! كوڕەكەم پیاوێكی وەك ئەمەی لێ دەرچێ، كەچـی تـۆ گوتـت: خودایـە! نەمكـەی بـە پیـاوێكی ئـاوا، لەپاشـدا ئـەم كەنیزەكـەیان بەلێـدان‌و تێهەڵـدان هێنـاو پێـی دەڵـێن: حیزی‌و دزیت كـردووە، منـیش گـوتم: خودایـە! كوڕەكـەم بـەدەردی ئـەم كەنیزەكـە نەبەی، كەچی تۆ گوتت: خودایە! وەك ئەم كچەم لێ بكەی، ئەمە لەبەرچی؟

سـاواكە گـوتی لـەوەڵامی دایكیـا: چـونكە سـوارەكە زۆردارێكـە لـە سـتەمكارە زەبردارەكـان‌و، ملهوڕێكـە لـە ملـهوڕەكان، لەبەرئـەوە گـوتم: خودایـە! نەمكـەی بـە پیاوێكی ئاوا ستەمكار!

بەڵام ئەم كەنیزەكەی كە پێی دەڵێن: دزی‌و حیـزی كـردووە، بـێ تـاوان‌و پـاك‌و بێ گەردەو ستەمبارە، نەدزی كـردووەو نـەحیزی، لەبەرئـەوە گـوتم: خودایـە! وەك ئەم كچە ستەمبارەم لێ بكـەی!. {تـاج/٥، زنجـیرە: ٢٣، ژمـارە: ٥٢٤١ چـاپی چـوارەم}.

ئەو منداڵانەی كە لەناو بێشكەدا قسەیان كردووە.

**ڕوونکردنەوە:**

لەم فەرموودەیەدا کۆمەڵێ سوودو بەهرەی زۆر هەیە وەك:

١ - چاکەکردن لەگەڵ باب‌و داك، بەتایبەتی چاکە لەگەڵ دایك.

٢ - نزای باوك‌و دایك لەمناڵی خۆیان ئەگەر لەسەر هەق بێ گیرایە.

٣ - ئەگەر چەند کارێکی چاکە بەرابەر وەستان، کامیان باشترە ئەوەیان پێشبخرێ‌و بەوەیان دەستیان پێ بکرێ، وەك وەڵامی دایك پێش بخرێ لەسەر کردنی نوێژی سوونەت.

٤ - زۆرینەی کات خودای گەورە بە پیرۆزیی نزاو دەستنوێژو خێرو چاکەوە، دەرووی ڕەحمەت لەبەندە باشەکانی خۆی دەکاتەوە، لەکاتی مەینەت‌و لێقەومان‌و ئێش‌و ئازاردا.

٥ - زۆر جاران پیاوچاکان تووشی گیروگرفت‌و ئێش‌و ئازارو مەینەت‌و ئەزموون دەبن، تا زیاتر سووربن لەسەر حاڵەکانیان‌و دەروون‌و گیانیان زاخاو بدرێ‌و ساف‌و بێ گەرد ببێ‌و ببن بە پێشەنگ‌و سەر مەشقی جوان بۆ پەیڕەوان‌و کەسانی تر.

٦ - لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا دەستنوێژ زۆر سوننەتە، هەروا کردنی نوێژی سوننەت.

٧ - دەستنوێژ لە نەتەوە پێشینەکانیشا بووە، وەك جوولەکە.

٨ - کەراماتی ئەولیاو بەهرەی پیاوچاکان هەقەو ڕاستە.

٩ - بەڵگەیە لەسەرئەوە کەراماتی ئەولیا جۆری زۆرەو لەنەتەوە پێشینەکانیشا کەرامەت بووە.

١٠ - جاروبار نزای خراپ دێ بەسەردەمی مرۆڤدا، بەبێ مەبەست، شتی وا زیانی نییە، وەك (حلَقی: دەمم بشکێ).

١١ - دەبوو جورەیج نوێژەکەی ببڕیایەو وەڵامی دایکی بدایەتەوە، چونکە نوێژەکە سوننەتە، وەڵامی دایك فەرزو پێویستە.

١٢ - تاکە تاکە لەنەتەوە، لێ ببڕێن بۆ خواو لە خەڵوەخانەدا طاعەت بکەن کاری پەسەندە.

**١٣٣٧) نەچوون بۆ غەزا لەبەر چاکەکردن لەگەڵ باوكو دایك. (٦٤٤٧ - ٦٤٥٤)**
**بابُ: تَرْكُ الجِهَادِ لِبِرِّ الوَالِدَينِ وَصُحْبَتِهِمَا**

١٧٥٦- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أَقْبَلَ رَجُلٌ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ وَالْجِهَادِ، أَبْتَغِى الأَجْرَ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. قَالَ: «فَهَلْ مِنْ وَالِدَيْكَ أَحَدٌ حَىٌّ»؟ قَالَ: نَعَمْ، بَلْ كِلاَهُمَا. قَالَ «فَتَبْتَغِى الأَجْرَ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَارْجِعْ إِلَى وَالِدَيْكَ فَأَحْسِنْ صُحْبَتَهُمَا».
{الحديث: ٦٤٥٤ = ٦٤٦٧ فم. تجريد البخارى/٣، رقم: ١٢٢٩ = ٣٠٠٤، ٥٩٧٢. أبو داود. جهاد: ٢٥٢٩. ترمذى. جهاد: ١٦٧١. نسائى. جهاد: ٣١٠٣. تحفة الأشراف: ٨٦٣٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە یەمەنەوە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەمەوێ پەیمانت پێ بدەم لەسەرئەوە کە کۆچ بکەم بۆ خزمەتت بۆ مەدینەو ئەوجا خەباتو تێکۆشانو غەزا ئەنجام دەدەم، مەبەستیشم لەم کۆچو خەباتگێڕانە تەنیا رەزای خودایە، بە تەمای پاداشی باشی لای خودای گەورەو سەروەر.

پێی فەرموو: (ئایا دایكو باوكت کەسیان لەژیانا ماون؟) گوتی: بەڵێ هەردووکیان ماون. فەرمووی: (مەبەستیشت پاداشی باشی لای خودای گەورە و سەروەرە؟). گوتی: بەڵێ. فەرمووی: (دەبڕۆرەوە بۆلای باوكو دایکت، لەجیاتی چوون بۆ غەزا بەجوانی هاوڕێتیی ئەوان بکەو دڵیان راگرەو باشبە بۆیان!).
{تاج/٤، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٤٣٦٤}+{ریاضی صالحین/١، زنجیرە:٤٠، ژمارە: ٣٢١ چ/٢}.

**١٣٣٨) فەرمایشتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودا دل رەنجاندنی دایکانی حەرامکردووە). (٤٤٥٦ - ٤٤٦١)**
**بابُ: قَوْلُهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): {إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ}**

١٧٥٧- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ وَمَنْعًا وَهَاتِ،

وَكَرِهَ لَكُمْ ثلاَثًا: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ». {الحديث: ٤٤٥٨ = . تجريد البخاري/٣، رقم: ١٠٥٠ = ٢٤٠٨، ١٤٧٧، ٥٧٧٥ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١١٥٣٨}:

**موغيرەی کوڕی شوعبە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر، قەدەغەی کردووە لێتان: دڵڕەنجاندنی باوکانو دایکان، وەزیندە بەچاڵکردنی کچان، وە نەدانی مافی سەرتان، وە زەوتکردنی مافی خەڵکان، وە حەزیش ناکا لەم سێ ڕەفتارانە بۆتان: لەوتی وتیو، لە پرسیاری زۆر لەشتێ کە کاتی نەهاتووەو لەسواڵکردنی زۆر، وە لەزایەکردنی ماڵ بەخۆڕایی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٤، ژمارە: ١٨٨٥. چاپی چوارەم} + {ریاضی الصالحین/١، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ٣٤٠}.**

**ڕوونکردنەوە:**

**نەوەوی** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **لە ڕوونکردنەوەو ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ:**

**١-دڵڕەنجاندنو ئازاردانی باوكو دایك لە كەبائیرەو لەتاوانە هەرە گەورەكانە، هی دایك زۆرتر.**

**٢-زیندە بەچاڵكردنی منداڵو كوشتنی لەبەر هەر بیانوویەك بێ، چ كچ بێو چ كوڕ لەتاوانە هەرە گەورەكانە، بۆیە باسی زیندە بەچاڵكردنی كچ كراوەو هی كوڕ نەكراوە، چونكە لەناو عەرەبەكانا زیندە بەچاڵكردنی كچ باوتر بووە، لەسەردەمی نەفامیدا.**

**٣-شەنو كەوكردنی هەواڵەكانو دەم ژەندنە دەنگوباسی خەڵكی بەبێ پێویست، كاری ناڕەواو ناشیرینو ناپەسەندە.**

**٤-منیش دەڵێم: گوێگرتن لەمیدیای ئەمڕۆو بەشداری لەو شەڕە دەمێو قسەو قسەلۆكانەدا، كە ئەم كەناڵانی هەواڵانە پەخشی دەكەنەوە، جۆرێكی زۆر خراپە لەم وتی وتییە ناڕەوایە، واباشە مرۆڤی موسوڵمان خۆی لێ بپارێزێو لەجیاتی ئەوە گوێ لەقسەی خێر بگرێو بەشداری لەپەخشی قسەی خێردا بكا.**

بەڕاستی ئەم چینی نوێیە، کە کۆمەڵێ موراهیقو چەنەبازو درۆزنو مرۆی بێ ئایینو بێ ڕەوشتو لەزەت پەرست، مامۆستایی دەکەنو ئاڕاستەی بوارەکانی ژیانی دەکەن، بەڕاستی ئەم چینە دوورترین چین دەبێ لە: ١- دین. ٢- ڕەوشتی بەرز. ٣- نیشتمان پەروەری. ٤- کردەوەی باش. چینێ دەبێ لەگەڵ ئاژەڵا هیچ جیاوازی نابێ، هەزار خۆزگەی بە ئاژەڵی کێوی!!

**١٣٣٩) لووتی ئەوکەسە بەقوڕداچێ، کە دایکو باوکی، هەردووکیان یا یەکێکیان لەکاتی پیریدا دەکەونە لای و بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر ناکا.** (٦٤٥٥ - ٦٤٥٩)

**بَابٌ: رغم أنف من أدرك أبويه أو أحدهما عند الكبر فلم يدخل الجنة**

١٧٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «رَغِمَ أَنْفُهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ». قِيلَ: مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ عِنْدَهُ الْكِبَرِ أَحَدَهُمَا أَوْ كِلَيْهِمَا ثُمَّ لَمْ يَدْخُلِ الْجَنَّةَ». {الحديث: ٦٤٥٧ = ٦٤٧٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەی لووتی بەقوڕداچێو دووبارەو سێ بارە لووتی بەقوڕداچێو لووتی بتەوسێتەوە!

گوترا: کێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەو کەسەی کە لەکاتی پیریی باوکو دایکیدا، خۆی دەمێنێ، کەچی بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا، ئەوەندە خزمەتیان ناکا، کە چوونە بەهەشتی خۆی مسۆگەر بکا، ئیتر خوای بەکاتی پیریی یەکێکیانا بگا، یا بەهی هەردوکیانا بگا جیاوازیی نییە). {تاج/٥، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٤٦٥٣ ج/٤ + ریاض الصالحین/١، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣١٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

زیکری صالحین ڕەحمەتی واپێ: حاجی کاکە حەمەم گوتی: جارێ باوکم نەخۆش بوو، بردم بۆلای دوکتۆر ڕێگەکە کۆلانێکی تەنگەبەر بوو، باوکیشم لەبەر پیریی و نەخۆشی نەیدەتوانی بڕوا، کردمە کۆڵو بردم، کاکەم فەرمووی: لەڕێ

چەند جارێ سەر سمم دەدا، باوکیشم بە چەپۆك دەیماڵی بەسەرماو پێی دەگوتم: ئەوە کوێری؟ نازانی من بەرگەی ئەم لەترانەی تۆ ناگرم، منیش هیچ دەنگم نەکرد، کاکە حەمەم فەرمووی: جا چەندین جار بەو شێوەیە باوکم دەبرد بۆلای دوکتۆرو بە قادرمەو شتی وادا بە باوش‌و بەکۆڵ سەرم دەخست. فەرمووی: ڕۆژێ هێنامەوەو لەسەر جێگەکەی خۆی پاڵم خست‌و عەرزیم کرد: باوە ئەوە بۆ لەبەرچاوی ئەو هەموو خەڵکە جمێنم پێ دەدەیت‌و دەمدەیتە بەر چەپۆك، من بۆ تۆمە بۆ خۆم نییە، با خەڵك نەڵێن: حاجی فارس خەڵافاوە.

کاکە حەمەم فەرمووی: باوکم لەناخی دڵەوە چەند جارێ فەرمووی: (حەمە تاماوی نانی کەم نەخۆی، من چەندە لێت ڕازیم، خودایش ئەوەندە لێت ڕازی بێ!).

کاکە حەمەم هەموو جارێ دەیفەرموو: سوێندم بەخودا ئیتر لەوەدوا نانی کەمم نەخواردو بەڵکوو بەهۆی ئەو نزایەی باوکمەوە دووجار چووم بۆ حەج‌و زۆر خزمەتی مزگەوت‌و هەژارم دەکرد، کە ئومێدە ئەویش هۆی ڕەزامەندی خودا بێ لێم). {بڕوانە: ژمارە: ١٨٩٥ لەزنجیرە: ١٤٤٨ دا لەدواوە دێت}.

**١٣٤٠) چاکەکردن لەگەڵ دۆست‌و خزم‌و کەسوکاری باوك‌و دایك.** (٦٤٦٠ - ٦٤٦٢)

**بَابُ: مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلَةُ الرَّجُلِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ**

١٧٥٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما): أَنَّهُ كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ كَانَ لَهُ حِمَارٌ يَتَرَوَّحُ عَلَيْهِ إِذَا مَلَّ رُكُوبَ الرَّاحِلَةِ، وَعِمَامَةٌ يَشُدُّ بِهَا رَأْسَهُ. فَبَيْنَا هُوَ يَوْمًا عَلَى ذَلِكَ الْحِمَارِ، إِذْ مَرَّ بِهِ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: أَلَسْتَ ابْنَ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ؟ قَالَ: بَلَى. فَأَعْطَاهُ الْحِمَارَ وَقَالَ: ارْكَبْ هَذَا، وَالْعِمَامَةَ قَالَ: اشْدُدْ بِهَا رَأْسَكَ، فَقَالَ لَهُ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: غَفَرَ اللَّهُ لَكَ، أَعْطَيْتَ هَذَا الأَعْرَابِيَّ حِمَارًا كُنْتَ تَرَوَّحُ عَلَيْهِ، وَعِمَامَةً كُنْتَ تَشُدُّ بِهَا رَأْسَكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلَةَ الرَّجُلِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ بَعْدَ أَنْ يُوَلِّيَ». وَإِنَّ أَبَاهُ كَانَ صَدِيقًا لِعُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم). {الحديث: ٦٤٦٢ = ٦٤٧٥ فم}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خودایان لێ بێ) دەستووری وابوو کەدەچوو بۆ مەککە، گوێ درێژێکی یەدەکی لەگەڵ خۆی دەبرد، کاتێ لەسواری وشتر بێزار دەبوو، بۆ وچان سواری پشتی ئەو گوێ درێژە دەبوو، وە مێزەرێکیشی دەبەست بەسەریەوە، جا رۆژێکیان سواری ئەو گوێ درێژە بوو بوو، لەوکاتەدا عەرەبێکی دەشتەکی تووشی بوو، پێی فەرموو: ئەرێ تۆ فیساری کوڕی فیسارە کەس نیت؟ کابرا گوتی: بەڵێ ئەوم، ئیبنو عومەر چاکو چۆنی لەگەڵ دەکاو گوێ درێژەکەی ژێر خۆیی دەداتێو پێی دەفەرموێ: بۆ خۆت سواری ئەمەبە، وە مێزەرەکەی خۆشی پێدەداو پێی دەفەرموێ: ئەمەیش ببەستە بەسەرتەوە.

بازێ لە هاوەڵانی، کە ئیبنو دیناری برادەری بوو، پێی دەفەرموێ: خودا لێت خۆش بێ، ئەمانە دەشتەکین، بەکەمیش قایل دەبن، ئیتر بۆچی وڵاخی ژێر خۆتو مێزەری سەری خۆتی پێ دەبەخشی؟

فەرمووی: بۆ خۆم لە خۆشەویستم ژنەوت، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (لە چاکترینی چاکە ئەوەیە: کە مرۆڤ کەسوکاری ئاشناو دۆستو برادەری باوکی خۆی بەسەر بکاتەوەو مافیان بەجێ بهێنێ، ئیتر باوکی لەژیانا بێ، یا مردبێ!).

ئەوجا ئیبنو عومەر فەرمووی: دەی باوکی ئەم پیاوە، کاتی خۆی دۆستو برادەری عومەری باوکم بوو، کەواتە: جێگەی خۆی بوو کەئاوا خەڵاتی بکەمو بەسەری بکەمەوە!). {ریاض/١، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ٣٤٢}.

### ١٣٤١) چاکەکردن لەگەڵ کچاندا. (٦٦٣٦ - ٦٦٣٨)
### بَابٌ: فِي الإِحْسَانِ إِلَى الْبَنَاتِ

١٧٦٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ وَمَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا، فَسَأَلَتْنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا، غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا، فَأَخَذَتْهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا، وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا شَيْئًا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ وَابْنَتَاهَا، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَحَدَّثْتُهُ حَدِيثَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنِ ابْتُلِيَ مِنَ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ».

{الحديث: ٦٦٣٦ = ٦٦٥٣ فم. تجريد البخاری بالكوردی/٢، رقم: ٦٧٩ = ١٤١٨، ٥٩٩٥}:

عائيشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەوبێ) فەرمووی: ژنێ دووكچی خۆیی پێ بوو، هاتە لام سوالّی لێ كردم، منیش تاقە دەنكێ خورمام هەبوو دام پێی، ئەویش لەتی كرد بۆ هەردوو كچەكەی خۆی لێی نەخوارد، ئینجا هەلّسا لەگەلّ دوو كچۆلّەكەیدا رۆیشتن، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتەوە ئەمەم بۆیگێڕایەوە، فەرمووی: (كەسێ دووچاری دەستی كچ بێو خودا بیەوێ بەهۆی كچەوە تاقی بكاتەوە، وە باشبێ بۆیان، ئیتر یەك بن یا زیاتر، خودا لەرۆژی دوا رۆژدا لەبەر خاتری ئەو كچانە رزگاری دەكا لە ئاگری دۆزەخ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٤٦٦٨ چ/٤ + ریاضی الصالحين/١، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٦٩ چ/٢}.

١٧٦١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ». وَضَمَّ أَصَابِعَهُ. {الحديث: ٦٦٣٨ = ٦٦٥٤ فم}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەركەسێ دوو كچ بەخێوبكا هەتا لەخەم دەرەخسێن، منو ئەو، وەك ئەم دوو پەنجەیە ئاوا جووت پێكەوە دەچینە بەهەشت!). {ریاضی صالحين/١، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٦٧} + {تاج/٥، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٤٦٦٩ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٣٤٢) بەسەركردنەوەی كەسوكارو خزم تەمەن درێژ دەكات. (٦٤٦٥ - ٦٤٧٢)

## بابٌ: صِلَةُ الرَّحِمِ تَزِيدُ فِي الْعُمُرِ

١٧٦٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ أَوْ يُنْسَأَ فِي أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ». {الحديث: ٦٤٧١ = ٦٤٨٤ فم. تجريد البخاری/٣، رقم: ٩٤٠ = ٢٠٦٧، ٥٩٨٦. تحفة الأشراف: ١٥١٦}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: لە خۆشەویستم بیست دەیفەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەو كەسەی كە حەزدەكا رزق‌و رۆژی زۆربێ‌و تەمەنی درێژبێ، باخزم دۆست بێ، سیلەی رەحمی خۆی بەجێ بهێنێ!). {ریاض/١، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣١٩ ج/٢}.

## ١٣٤٣) پاراستنی پەیوەندیی خزمایەتیی، با لایەنەكەی تریش بیپچڕێنێ.

(٦٤٦٥ - ٦٤٧٢)

## بَابٌ: صِلَةُ الرحم وإن قطعوا

١٧٦٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِى قَرَابَةً أَصِلُهُمْ وَيَقْطَعُونِى وَأُحْسِنُ إِلَيْهِمْ وَيُسِيئُونَ إِلَىَّ، وَأَحْلُمُ عَنْهُمْ وَيَجْهَلُونَ عَلَىَّ. فَقَالَ: «لَئِنْ كُنْتَ كَمَا قُلْتَ فَكَأَنَّمَا تُسِفُّهُمُ الْمَلَّ، وَلاَ يَزَالُ مَعَكَ مِنَ اللَّهِ ظَهِيرٌ عَلَيْهِمْ، مَا دُمْتَ عَلَى ذَلِكَ». {الحديث: ٦٤٧٢ = ٦٤٨٥ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەندێ خزمم هەن، من دڵی ئەوان راگیر دەكەم، بەلام ئەوان بە پێچەوانەوە دڵی من دەڕەنجێنن، وەمن چاكەیان لەگەڵ دەكەم كەچی ئەوان خراپەم لەگەڵ دەكەن، وەمن چاوپۆشییان لێ دەكەم كەچی ئەوان نا پیاویم لەگەڵ دەكەن، من چەند باشم بۆ ئەوان، ئەوان ئەوەندە خراپن بۆ من!

فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەگەر وەك خۆت دەڵێیت وابێ، ئەوە تۆ بە پاداشی باشی خۆت دەگەیت بەلام بۆ ئەوان وەك تۆ ژیلەمووی گەرمیان دەرخوارد بدەیت وایە، چونكە لەسەرئەوەی كە تۆڵەی چاكەی تۆ بەخراپە دەدەنەوە، خودا ئازاریان دەدا، وەهەتا تۆیش ئەمە رەفتارت بێ‌و وابی لەگەڵیانا، خودا هەر پشتیوانی تۆیەو سەرت دەخات بەسەریاندا!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣١٨ ج/٢ + تاج/٥، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٤٦٨٠ ج/٤}.

## ١٣٤٤) باسی پابەندبوون بە پێوەندیی خزمایەتییەوەو پچڕاندنی ئەو پێوەندییە.
(٦٤٦٥ – ٦٤٧٢)

## بَابٌ: فِي صِلَةِ الرَّحِمِ وَقَطْعِهَا

١٧٦٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ خَلَقَ الْخَلْقَ حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْهُمْ قَامَتِ الرَّحِمُ فَقَالَتْ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَمَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَذَاكَ لَكِ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِى الأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ، أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ، أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا))».
{الحديث: ٦٤٦٥ = ٦٤٧٨ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٤، رقم: ١٦٩٦ = ٤٨٣٠، ٤٨٣١، ٤٨٣٢، ٥٩٨٧، ٧٥٠٢. تحفة الأشراف: ١٣٣٨٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەفەرمویێ: (ئەو کاتەی خودای گەورەو سەروەر ئەم بوونەوەرەی دروست کرد، کاتێ لێ بوویەوە لێی، خزمایەتی (ڕەحم) هەڵسا، کەمەری خودای میهرەبانی گرتو گوتی: دەستم دامێنت! خودا فەرمووی پێی: وامەکە، بۆ وادەکەی، داوات چییە لێم بیلێ؟ خزمایەتی گوتی: بۆ ئەوە هەڵساوم تا لەم شوێنەدا کەمەرت دەگرم، پەنام بۆ هێناویتو سکاڵا دەکەم لەدەستی ئەو کەسانەی کە مافی من بەجێ ناهێننو ڕشتەی پەیوەندیی خزمایەتی دەبڕن. خودای گەورەیش دەفەرموێ: بەڵێ، باشە، داواکەت وەرگیرا، ئایا تۆ رازی دەبی بەوەی کە هەرکەسێ پێ لەتۆ نەبڕێو خزم دۆست بێو مافی تۆ بەجێ بهێنێ، بەرابەر بەوە منیش پێ لەئەو نەبڕمو مافی ئەو بەجێ بهێنمو بۆی باشبم، وە ئەو کەسەشی پێ لەتۆ ببڕێو پەیوەندی نەبێ لەگەڵتاو مافی تۆ بەجێ نەهێنێ، منیش بەرابەر بەوە پێ لەو ببڕمو پەیوەندیم نەبێ لەگەڵیو مافی ئەو بەجێ نەهێنم، ئایا ئەی خزمایەتی! تۆ بەم بەڵێنە رازی دەبی؟ خزمایەتی: دەڵێ: بەڵێ، ئەی پەروەردگارم! من بەمە رازیم. فەرمووی: (دەی ئەمە پەیمان بێ لەنێوانی منو تۆدا).

ئـەوجا خۆشەویسـت (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: (ئەگـەر ئـارەزوو دەکـەن، بـۆ پشـتیوانی ئـەم فەرموودەیـە، ئـەم ئایەتانـە بخـوێنن، کـە ئـەم مەبەسـتە دووپـات دەکاتەوە:

{فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ. أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ. أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا — محمد — ٤٧ / ٢٢ — ٢٤}:

واتە: چی چاوەڕوان دەکرێ لە کاربەدەستانی بەدو لە سەرکردانی ناموسوڵمان، جگەلـەوە: کاتـێ بـبن بـە بەرپرسـانی وڵات، دەس بکـەن بـە خراپـەکاری‌و پشـێوی نانـەوە لـە وڵاتـداو رشـتەی پەیوەنـدی خزمایـەتی بپچـڕن‌و مـافی خـزم‌و کەسوکار پێشێل بکەن. ئەوانە خودا نـەفرین‌و نەحلـەتی لێ کـردوون‌و گوێی بیسـتنی هـەقی کـەڕ کـردوون‌و چـاوی دڵـی کوێر کـردوون. ئـەوە بـۆ بـەدڵ سـەرنجی ئـەو قورئانـە پیرۆزە نادەن، یا دڵیان مۆرکراوەو بە کلیل کلیل دراوە). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٤٠٩٩}.

١٧٦٥- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعٌ». قَالَ ابْنُ أَبِى عُمَرَ: قَالَ سُفْيَانُ: يَعْنِى قَاطِعَ رَحِمٍ. {الحديث: ٦٤٦٧ = ٦٤٨٠ فم. تجريد البخاری بـالكوردی/ ٥، رقـم: ١٩١٦ = ٥٩٨٤ فـتح البـاری. أبو داود. زكاة: ١٦٩٦. ترمذی. بروصلة: ١٩٠٩. تحفة الأشراف: ٣١٩٠}:

جوبەیری کوڕی موطعیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: (ئـەوەی رشـتەی خزمایـەتی بپسـێنێ‌و سـیلەی ڕەحـم بـبڕێ، دوو پێـی ناچـێتە نـاو بەهەشـت). {ریـاض/١، زنجـیرە: ٤١، ژمـارە: ٣٣٩ + تـاج/٥، زنجـیرە: ٤٠، ژمارە: ٤٦٨٢ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

### ١٣٤٥) پایەی داڵدەی هەتیو لە بەهەشتا. (٧٣٩٣ - ٧٣٩٤)
### بابٌ: فِي كَافِلِ الْيَتِيمِ

١٧٦٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ، أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ فِى الْجَنَّةِ». وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى. {الحديث: ٧٣٩٤ = ٧٤٢٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (منو سەرپەرشت (کافل = داڵدە)ی هەتیو، لە بەهەشتا وەك ئەم دوو پەنجەیە ئاوا لەیەکەوە نزیکین، ئیتر گریمان ئەو هەتیوە هی خۆی بێو خۆی هەقداری بێ، وەك هەتیوەکە هی برای بێ، یا هی خزمو کەسوکاری خۆی بێ، یا هی بێگانەیێ بێ جیاوازیی نییە).

مالیك کە مامۆستای ئیسحاقە، کە ئیسحاق مامۆستای زوهەیرە، کە زوهەیر مامۆستای ئیمامی موسلیمە، لەم فەرموودەیەدا، ئاماژەی کرد: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەنجەی دۆشاو مژەو هەڵمەقووتە ئامازەی کردو فەرمووی: (منو سەرپەرشت... تاد). {تاج/٥، زنجیرە:٦، ژمارە: ٤٦٩٧، ٤٦٩٨ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

### ١٣٤٦) تێکۆشان لە پێناوی بێوەژنو هەژاردا. (٧٣٩٣ - ٧٣٩٤)
### باب: في ثواب السَّاعي على الأَرْمَلَةِ وَالمسكين

١٧٦٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِى سَبِيلِ اللَّهِ» وَأَحْسِبُهُ قَالَ: «وَكَالْقَائِمِ لاَ يَفْتُرُ، وَكَالصَّائِمِ لاَ يُفْطِرُ». {الحديث: ٧٣٩٣ = ٧٤٢٨ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٥، رقم: ١٧٩٨ = ٥٣٥٣، ٦٠٠٦، ٦٠٠٧. ترمذى. بروصلة: ١٩٦٩. نسائى. زكاة: ٢٥٧٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ تێبکۆشێ لەپێناوی ژنی بێ مێردو مرۆڤی هەژارداو، ساخ بۆ رەزای خودای گەورە بەخێویان بکاو، خزمەتیان بکاو، مەسرەفیان بکێشێ، ئەوە بەقەد ئەو

خەباتگێڕە کە لەڕێگەی خودادا خەبات دەگێڕێو غەزا دەکا، خێرو پاداشی بۆ هەیە).

گێڕەرەوە (راوی) کە عەبدوڵلای کوڕی موسلیمە دەفەرموێ: وادەزانم کە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (وە هەروەها بەقەد ئەو کەسەیش خێرو پاداشی باشی بۆ هەیە، کە بەشەو هەر شەونوێژ بکاو سەرگەرمی شەونوێژ بێو لێی سارد نەبێتەوەو، بەرۆژیش هەمیشە بەرۆژووبێو ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژووبێو یەك رۆژی لێ نەشکێنێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٤٧٠١. چ/٤}.

## ١٣٤٧) کەسانێ لەبەر رەزای خودا یەکترییان خۆش دەوێ. (٦٤٩٤ - ٦٤٩٥)
## بَابٌ: فِي الْمُتَحَابِّينَ فِي اللهِ عَزَّ وَجَلَّ

١٧٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِي؟ الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي». {الحديث: ٦٤٩٤ = ٦٥٠٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە رۆژی ژینەوەدا خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەو کەسانەی کە لەبەر خاتری شکۆمەندی منو ساخ لەبەر رەزای من یەکترییان خۆش دەویست کوان لەکوێن؟ بابێن ئەمڕۆ پاداشو چاکەیان دەدەمەوە، لەسێبەری خۆما دایان دەنێم، ئەمڕۆ ئەو رۆژەیە کە بێجگە لە سێبەری رەحمەتی من هیچ سێبەرێکی تر نییە، کە کەسێ پەنای بۆبەرێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٩٣٥ چ/٤}.

لە ریاضدا ئەم فەرموودەیە ئاوا وەرگێڕراوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەرۆژی قیامەتدا خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو کەسانەی کە لەجیهانا، لەبەر خاتری رەزای من یەکتریان خۆش دەویست لەکوێن بابێن، ئەمڕۆ رۆژی ئەوانە، ئەمڕۆ دەستی قەدرو رێزیان لێ دەنێمو لە سێبەری خۆمدا پەنایان دەدەم، ئەمڕۆ ئەو رۆژەیە کە جگە لە سێبەری من سێبەری تر نییە). {ریاض/١، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٣٧٧}.

١٧٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخًا لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى، فَأَرْصَدَ اللَّهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكًا، فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَخًا لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ، قَالَ: هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا؟ قَالَ: لاَ، غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، قَالَ: فَإِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ، بِأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ». {الحديث: ٦٤٩٥ = ٦٥٠٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویێ: (پیاوێ دەچێ بۆ گوندێ، بۆ دیدەنی برادەرێکی خۆی، خودا فریشتەیێ دەنێرێتە سەر ڕێگەکەی، کە دەگاتە لای پێی دەفەرموێ: بۆ کوێ دەچی؟ دەڵێ: دەچم بۆلای برادەرێکم لەم گوندە. فریشتەکە دەفەرموێ: ئایا هیچ نیازێکت پێی هەیە؟ دەڵێ: نەخەیر، تەنیا ئەوە نەبێ، کەساخ لەبەر خاتری ڕەزای خودای گەورە ئەوم خۆش دەوێ. دەفەرموێ: (دەبزانە کەمن فروستادەی خودام، منی ناردووە بۆلای تۆ کەپێت بڵێم: کە خودایش تۆی خۆش دەوێ، چونکە تۆ ئەوت لەبەر خودا خۆش دەوێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٤٩٣٣}.

## ١٣٤٨) مرۆڤ لەقیامەتدا لەگەڵ خۆشەویستی خۆی دەبێت. (٦٦٥٢ - ٦٦٦٢)

## بابٌ: المَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ

١٧٧٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: «وَمَا أَعْدَدْتَ لِلسَّاعَةِ»؟ قَالَ: حُبَّ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، قَالَ: «فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ». قَالَ أَنَسٌ: فَمَا فَرِحْنَا بَعْدَ الإِسْلاَمِ فَرَحًا أَشَدَّ مِنْ قَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ». قَالَ أَنَسٌ: فَأَنَا أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ وَإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِأَعْمَالِهِمْ. {الحديث: ٦٦٥٥ = ٦٦٧٢ فم. تجريد البخاری بالكوردی/٤، رقم: ١٤٥٩ = ٣٦٨٨، ٦١٦٧، ٦١٧١، ٧١٥٣ فتح الباری. تحفة الأشراف: ٢٩٩}:

ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا! کەی

قیامەتـە؟ فـەرمووی: (باشـە چـیت بـۆی ئامـادە کـردووە؟). گـوتی: هـیچ، بـەڵام دەسـتمایەی دەسـتم ئەوەیـە کـە خـوداو پێغەمبـەری خـودام خـۆش دەوێ! تـەنیا ئومێـدم بـەوە قەوییـە. فـەرمووی: (دەی مـوژدەت لێ بـێ: کـەتۆ لەوێسـتگاو مەڵبەنـدەکانی قیامەتـدا، لەگەڵ ئەوکەسـانە دەبیـت کـە ئێسـتا لـە جیهانـا خۆشـت دەوێـن!). ئەنـەس فـەرمووی: بەهیچـی تـر وەك ئـەوە شـادمان نـەبووین، وەك بـەو فەرموودەیـەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شـادمان بـووین، کـە فـەرمووی: (دەی موژدەت لێ بێ کەتۆ لە قیامەتدا، لەگەڵ خۆشەویستی خۆتا دەبیت!).

ئەنەس دەیفەرموو: لەخودا بـەزیادبێ کـەمن پێغەمبـەرو ئەبوبـەکرو عومـەرم خـۆش دەوێ، وە ئومێـد دەکـەم کـە لەوجیهانـدا، لەخزمـەت ئـەوانابم، بـەهۆی ئـەو خۆشەویسـتییەی کـەمن هەمـە بۆیـان، گەرچـی بـەکردەوەی بـاش بـەوانا ناگـەم!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٤٩٢٦ ج/٤}.

### ١٣٤٩) کاتێ خودا بەندەیەکی خۆشویست لەلای بەندەکانی خۆی خۆشەویستی دەکات. (٦٦٤٢ - ٦٦٤٧)

### بابٌ: إذَا أحَبَّ اللّهُ عَبْداً حَبَّبَهُ إلى عِبَادِهِ

١٧٧١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللّـهُ عَلَيـهِ وَسَلَمْ): «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَلاَمْ فَقَالَ: إِنِّى أُحِـبُّ فُلاَنًـا فَأَحِبَّهُ، قَالَ: فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِى فِى السَّمَاءِ فَيَقُـولُ: إِنَّ اللَّـهَ عَـزَّ وَجَـلَّ يُحِـبُّ فُلاَنًـا فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، قَالَ: ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِى الأَرْضِ، وَإِذَا أَبْغَضَ عَبْـدًا دَعَـا جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَلاَمْ، فَيَقُولُ: إِنِّى أُبْغِضُ فُلاَنًا، فَأَبْغِضْهُ، قَالَ: فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيـلُ، ثُـمَّ يُنَـادِى فِى أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلاَنًا فَأَبْغِضُوهُ، فَيُبْغِضُونَهُ، ثُـمَّ تُوضَـعُ لَـهُ الْبَغْضَـاءُ فِـى الأَرْضِ». {الحـديث: ٦٦٤٧ = ٦٦٦٤ فـم. بخـاری. أدب: ٦٠٤٠، ٧٤٨٥. ترمـذی. تفسـیر: ٣١٦١. تحفة الأشراف: ١٢٦٢٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کاتێ کە خودای گەورەو سەروەر بەندەیەکی خۆشویست، بـانگی جوبرائیـل دەکـاو

دەفەرمویٚ: ئەی جوبرائیل! من فیسارە کەسم خۆش دەویٚت، دەی تۆیش خۆشت بویٚ). فەرمووی: (جا جوبرەئیلیش ئەو بەندەی خۆش دەویٚ، ئەوجا جوبرائیل بەناو دانیشتوانی ئاسماندا جاڕدەداو بانگەواز هەڵ دەداو دەفەرمویٚ: خودای گەورەو سەروەر، فیسارە بەندەی خۆش دەویٚ، ئیٚوەیش ئەو بەندەیەتان خۆش بویٚ، ئیتر خەڵکی ئاسمانیش هەموو خۆشیان دەویٚ). فەرمووی: (ئیتر خۆشەویستی ئەو بەندەیە قورس دەبەستیٚ، لەدڵی دانیشتوانی سەر زەویداو ڕەزای سووكو شیرین دەبیٚ لەبەر چاویانو پەسەند دەکریٚ).

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بیٚ): (وەکاتیٚ خودا رق لەبەندەییٚ بگریٚ، جوبرائیل بانگ دەکاو پیٚی دەفەرمویٚ: من رقم لەفیسارە کەسە، تۆیش رقت لیٚی بیٚ). فەرمووی: (جاجوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بیٚ) رقی لیٚ دەگریٚ، ئەوجا بەناو خەڵکی ئاسماندا بانگەواز هەڵ دەدا: خودای گەورە رقی لە فیسارە کەسە ئیٚوەیش رقی لیٚ بگرن، ئەوانیش رقی لیٚ دەگرن، ئیتر لە زەویشا ڕەزای تاڵ دەبیٚو لەبەر چاوی خەڵکی زەوی ئیٚسکی قورس دەبیٚو هەرکەسیٚ لەلای خۆیەوە، لەسەر رووی زەوی، رقی لەو نەگبەتە دەبیٚتەوە!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٣٨٧ + تاج/٤، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٩٩٠ + تاج/٥، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٤٩٢٣ = چاپی چوارەم}.

## ١٣٥٠) گیانەکان سەربازی مەشق دیدەن. (٦٦٥٠ - ٦٦٥١)

## بابٌ: الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ

١٧٧٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَرْفَعُهُ قَالَ: «النَّاسُ مَعَادِنُ كَمَعَادِنِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ، خِيَارُهُمْ فِى الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِى الإِسْلاَمِ إِذَا فَقُهُوا، وَالأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ». {الحديث: ٦٦٥١ = ٦٦٦٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (ئەو خەڵکە لەبنەڕەتدا، وەك کانو کانزای زیوو زیٚڕوان ... لە پیٚشەوە لە ژمارە: (١٧٤٤)دا رابورد. لیٚرەدا لەکۆتاوە ئاوایە:

(گیانگەلیش لە ئەزەلدا، هەر لەسەرەتاوە، لەپێش دروستکردنی لەشەکانیاندا، لەناو خۆیانا، وەك چەند کۆمەڵە سەربازێکی قاڵبوو وان، کە هەر کۆمەڵەی جۆرە مەشقێکی تایبەتییان کردبێ، خودا کردوونی بەچەند چەشنی جیا جیاو، جۆرە مەشقێکی تایبەتی لە جیهانی رۆحدا پێ کردوون، جا بۆیە ئێستایش لە ژیانی جیهاندا، دەق نموونەیەکن لە عالەمی ئەزەلیان، ئەوانەیان کەهاو تەحرو هاو لفی یەکترین هۆگری یەکتری دەبن‌و پێکەوە دەسازێن‌و دۆستایەتی لەگەڵ یەکتر دەبەستن، ئەوانەشیان کە لەسەرەتاوە لە عالەمی ئەرواحدا، لەیەك جودا بوون‌و مەشقی جیا جیایان کردووە، ئەمڕۆکەیش نامۆیی لە یەکتر دەکەن‌و دژی یەکتر دەوەستن‌و لەگەڵ یەکتر ناسازێن‌و لەناو خۆیانا نەسازن نەك بساز).

**١٣٥١) موسوڵمان قەڵایە بۆ موسوڵمان.** (٦٥٢٨ - ٦٥٣٣)

**بابٌ: الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ**

١٧٧٣- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ): «الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا». {الحديث: ٦٥٢٨ = ٦٥٤٥فم. تجريد البخاري بالكوردى/٥، رقم: ١٩٣٣ = ٦٠٢٧ = ٦٨٧ تجريد = ١٤٣٢ فتح البارى. ترمذي. بروصلة: ١٩٢٨. نسائى. زكاة: ٢٥٥٩}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمان قەڵایە بۆ موسوڵمان، دەبێ وەك چینی دیوار چنگ بدەنە یەك). {ریاض/١، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٢٢ + تەجرید/٢، ژمارە: ٦٨٧ = ١٤٣٢ فتح البارى} + {تاج/٥، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٤٧٢٠، ٤٧١٩}.

**١٣٥٢) موسوڵمانان لەناو خۆیانا دەبێ وەك برا یەك دڵ‌و هاوسۆزبن.**

(٦٥٢٨ - ٦٥٣٣)

**باب: الْمُؤْمِنُونَ كَرَجُلٍ وَاحِدٍ فِي التراحُمِ والتَّعَاطُف**

١٧٧٤- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ، مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى

مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى». {الحديث: ٦٥٢٩ = ٦٥٤٦ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٢٥ = ٦٠١١ فتح الباري}:

**نوعمانی کوڕی بەشیر** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (دەبێ موسوڵمانان لەناو خۆیانا، وەك برا تەباو دۆستو دڵسۆزی یەکتری بنو، لەگەڵ یەکتری بە رەحمو میهرەبان بن، نموونەی بالاو سەر مەشقێکی جوان بن بۆ بەتەنگەوە بوونی یەکتریی، وەك چۆن ئەگەر جەستەیەك ئەندامێکی هاتە ژان، بەوێنە چاوی ژان بکا، ئیتر هەموو گیانی وەك یەك دێنە ژانو، هەموو ئەندامەکانی تری، شەو نخوونی لەگەڵ دەکێشنو، لەتاوی ئازاری ئەو ئەوانیش تایان لێ دێ! دەبێ موسوڵمانانیش لەگەڵ یەکتریدا ئاوا هاوسۆزو هاوباری یەکتری بن!). {ریاض/١، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٢٤ چاپی دووەم} + {تاج/٥، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٤٧١٨ چاپی چوارەم}.

**١٣٥٣) موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو ناهەقی لێ بکا.** (٦٤٨٧ - ٦٤٨٩)
**باب: الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ**

١٧٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ): «لاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ، التَّقْوَى هَا هُنَا». وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، «بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ، دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ». {الحديث: ٦٤٨٧ = ٦٥٠١ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (حەسوودیو بەخیلی بەیەکتری مەبەنو کۆستە کۆستە لەیەکتری مەکەنو زەمی درۆ لەسەر یەکتری مەکەنو، کینەو دەغەز لەیەکتری مەکێشنو، پشت لەیەکتری مەکەنو پشتی یەکتری بەرمەدەنو، لە یەکتری لووتەلا مەبنو، کڕیار یا فرۆشیار لەیەکتری هەڵمەگێڕنەوە، وەك ئەوە پێی بڵێی: وەرە من بەهەرزانتر ئەو شتەت

دەدەمێ. وە وەك برا بەندەی خودا بن‌و، لەناو خۆتانا ڕێك‌و سازو تەبابن‌و ببن بەبرای یەكتری، موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو ستەم‌و ناهەقی لێ بكا، نابێ بەچاوی سووك تەماشای بكا، نابێ پشتی لەزەوی بداو دەستەشكێنی بكا، بەپێی تەوانا دەبێ لەسەری بكاتەوە).

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ‌جار دەستی نایە سەردڵی‌و فەرمووی: (تەقواو ترسی خودا، وا لێرەدا: لەناو دڵدا، ئەوەندە بەسە بۆ خراپیی موسوڵمان: كە بەچاوی سووك تەماشای برای موسوڵمانی خۆی بكا! هەموو شتێكی موسوڵمان بە موسوڵمانێكی تر حەرامە: خوێنی‌و سامان‌و ماڵی‌و شەرەف‌و نامووس‌و ئابڕووی). {ریاضی صالحين/١، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٣٥، ٢٣٤، ٢٣٣ + تاج/٥، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٤٨٠١. چاپی چوارەم}.

**ڕوونكردنەوە:**

ئەو بڕیارانەی لەم فەرموودانە وەردەگیرێن، بۆ ڕەگەزی نێرو بۆ ڕەگەزی مێ چوون یەكن، ناوهێنانی برا بۆ تەغلیبە، دەنا زۆرو ستەم‌و ناهەقی لەبرای موسوڵمان‌و لەخوشكی موسوڵمان، وەك یەك ناڕەوایەو چوون یەك تاوانە، هەروا چۆن خودا فەرمانمان پێ دەكا كەبۆ برای موسوڵمان باش بین، بۆ خوشكی موسوڵمانیش هەروەها.

١٧٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ». {الحديث: ٦٤٨٩ = ٦٥٠٣ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە سەیرو تەماشای شكڵ‌و شێوەو ماڵ‌و سامانتان ناكا، بەڵام سەیرو تەماشای دڵ‌و دەروون‌و كردەوەكانتان دەكا، كردەوەی باش كە بەنیازی پاك بكرێ، لەلای خودا پەسەندەو جێگەی تەماشاكردنیەتی بەچاوی ڕەحمەت). {تاج/١، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٨٨ چ/٤}.

## ١٣٥٤) پەردەی خودا لەسەر بەندەی خۆی. (٦٥٣٧ - ٦٥٣٨)

## بَابٌ: فِي السِّتْرِ عَلَى الْعَبْدِ

١٧٧٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) أنه قَالَ: «لاَ يَسْتُرُ اللَّهُ عَلَى عَبْدٍ فِى الدُّنْيَا إِلاَّ سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث: ٦٥٣٧ = ٦٥٥٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەربەندەیێ لەجیهاندا خودا بە پەردەی رەحمەتی خۆی تاوانەکەی بۆ بپۆشێ، مسۆگەر لە قیامەتیشدا لەهەموو مەڵبەندو وێستگاکاندا خودا بە پەردەی رەحمەتی خۆی بۆی دەپۆشێ).

١٧٧٧م- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «لاَ يَسْتُرُ عَبْدٌ عَبْدًا فِى الدُّنْيَا إِلاَّ سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث: ٦٥٣٨ = ٦٥٥٥ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەم جیهانەدا عەیبو نەنگی یەکێ لەبەندەکانی خودا بپۆشێ، یا لەشی بە پۆشاکێ بپۆشێ، ئەوە خودا ئەو کەسە لەهەردوو جیهانا بە بەرگی رەحمەتی خۆی دادەپۆشێ). {ریاض/١، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٤٠ چاپی دووەم}.

## ١٣٥٥) تکای هاونشینان. (٦٦٣٤)

## بابٌ: فِي شَفَاعَةِ الجُلَسَاءِ

١٧٧٨- عَنْ أَبِى مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) إِذَا أَتَاهُ طَالِبُ حَاجَةٍ، أَقْبَلَ عَلَى جُلَسَائِهِ فَقَالَ: «اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا، وَلْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا أَحَبَّ». {الحديث: ٦٦٣٤ = ٦٦٥٠. تجريد البخارى بالكوردى/٢، رقم: ٦٨٧ = ١٤٣٢، ٦٠٢٧، ٦٠٢٨، ٧٤٧٦، ٤٨١. تحفة الأشراف: ١٤٠٠٢}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) نیازمەندێ دەهاتە خزمەتی، بۆ کارێکی خۆی، رووی دەکردە دانیشتوانی خزمەتیو دەیفەرموو پێیان: (تکای باش بکەن بۆ داماوانو نیازمەندان، هەتا مزو

کرێو پاداشتی باشی لەسەر وەربگرن، هەرچیش نیازی خودای گەورەی لەسەربێ بۆ تکا بۆکراو، خودای گەورە ئەوە لەسەر زمانی پێغەمبەری خۆی جێبەجێ دەکا، باهیوای تکا بۆکراویش نەیەتەدی، بەڵام پاداشی باش بۆ تکاکار دەنووسرێ!).
{ریاض/١، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٤٦ چ/٢} + {تاج/٥، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٤٨٥٥ چ/٤}.

## ١٣٥٦) نموونەی هاونشینی باش. (٦٦٣٥)

## باب: مَثَلُ الجَلِيسِ الصَّالِحِ

١٧٧٩- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ، وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ، كَحَامِلِ الْمِسْكِ، وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً». {الحديث: ٦٦٣٥ = ٦٦٥١ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٥، رقم: ١٨٣٦ = ٥٥٣٤، ٣١٠١. تحفة الأشراف: ٩٠٥٩}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نموونەی هاوڕێو هاونشینی باش، وەك میسك فرۆش وایە، وێنەی هاوڕێو هاودەمی خراپیش وەك مووشە دەمەچی وایە، میسك فرۆش یاخۆت لێی دەکڕێ، یا خۆی بەشت دەدا، یا هەرهیچ نەبێ بۆنە خۆشەکەی دەچێت بەسەرتا، بەڵام مووشە دەمەچی (واتە: ئاسنگەر) یا پریشکی ئاگری کوورەکەی جلەکانت دەسووتێنێ، یا هەر هیچ نەبێ بۆ چرووکێکی پیسی مووشە دەمەکە دێت بەسەرتا). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٤٩٣٢ + ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٦٣ چ/٢}.

## ١٣٥٧) مافی دراوسێو راسپێری باش دەربارەی. (٦٦٢٨ - ٦٦٣٢)

## باب: فِي الوَصِيَّةِ بِالجَارِ

١٧٨٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَقُولُ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَيُوَرِّثَنَّهُ». {الحديث:

٦٦٣٠ = ٦٦٤٤ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٥، رقم: ١٩٢٨ = ٦٠١٤. تحفة الأشراف: ٧٤٢١}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم له خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەمیشە، بەردەوام جوبرائیل (سڵاوی خودای لێ بێ) ئامۆژگاری خێری دەکردم دەربارەی مافی دراوسێ لەسەر دراوسێ، تەنانەت وامزانی کە هاوسێ میرات و کەلەپوور لەهاوسێی خۆی دەگرێ!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٣٠٣ + تاج/٥، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٧٠٢ چ/٤}.

**١٣٥٨) بەسەرکردنەوەی هاوسێ بەخێرکردن لەگەڵیدا.** (٦٦٢٨ - ٦٦٣٢)

**بابٌ: فِي تَعَاهُدِ الجِيرانِ بالبِرِّ**

١٧٨١- عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ خَلِيلِى (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَوْصَانِى: «إِذَا طَبَخْتَ مَرَقًا فَأَكْثِرْ مَاءَهُ، ثُمَّ انْظُرْ أَهْلَ بَيْتٍ مِنْ جِيرَانِكَ فَأَصِبْهُمْ مِنْهَا بِمَعْرُوفٍ». {الحديث: ٦٦٣٢ = ٦٦٤٨ فم. بخاري. أدب: ٦٠١٥. تحفة الأشراف: ٧٤٢١}:

ئەبو زەڕی غەفاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویستەکەم پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) ڕاسپێری کردم: ئەی ئەبو زەڕ! کاتێ مەرگەو شتی وات لێنا، هەندێ ئاوەکەی زۆرتر بکە، ئەوجا سەرنجی دراوسێکانت بدە، بەپێی تەوانا، بەشێوەیەکی شایان، بەشی دراوسێکانت، لەو مەرگەیە بدە). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٣٠٤ چ/٢ = چاپی دووەم} + {تاج/٥، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٧٠٥ چ/٤}.

١٧٨٢- عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِىَ النَّبِىُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ». {الحديث:٦٦٣٣=٦٦٤٩فم}:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەی ئەبو زەڕ! ئەوەی پێی بگوترێ چاکە بەکەمی مەزانەو بەسووک مەیگرە، با ئەوەیش بێ کە بەڕووی خۆش و ڕووی گەشەوە بگەی بە برادەری خۆت، یا بەبرای ئایینی خۆت!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٢١ چاپی دووەم}.

## ١٣٥٩) باسی شێنەیی و نەرمو نیانی. (٦٥٤١ - ٦٥٤٦)

## باب: فِي الرفْقِ

**١٧٨٣- عَنْ جَرِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سمعت رسول الله (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَقُولُ: «مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرَمِ الْخَيْرَ». {الحديث: ٦٥٤٢ = ٦٥٥٨ فم}:**

**جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بوجەلی** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: (هەرکەسێ لەبەشە نەرمو نیانی خۆی بێ بەش بووبێ، ئەوە لەبەشە خێری خۆی بێ بەش بووە).**

**ڕوونکردنەوە:**

**ئەم فەرموودەیە لە تاجا ئاوایە: ئەبو دەرداء** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (هەرکەسێ بەشە نەرمو نیانیی خۆیی پێ درابێ، ئەوە بەشە خێری خۆیی دەسکەوتووە، وە هەرکەسێ لە بەشە نەرمو نیانیی خۆی بێ بەش بووبێ، ئەوە لەبەشە خێری خۆی بێ بەش بووە). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٤٨٦٦ ج/٤ = چاپی چوارەم}.**

**١٧٨٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِنَّ الرِّفْقَ لاَ يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ زَانَهُ، وَلاَ يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ». {الحديث: ٦٥٤٥ = ٦٥٦٢}:**

**عەمرەی کچی عەبدورەحمان** (رەحمەتی خودای لێ بێ) **لەبابەت چوون بۆ سەیران و دەرچوون بۆ هەوار لەدەشت و دەر، بەنیازی وەرزش و هەوا گۆڕین، لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەری پرسی (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لە هاوسەرانی بێ) فەرمووی: (جاران پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بۆ سەیران و هەوار هەڵدان، جاروبار دەڕۆیشتە سەر ئەم بەرزایی و سەرچاوە بەرزانە، کە وەك تاڤگەوان. جارێ خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ویستی بچێ بۆ سەیران، وشترێکی تۆڕی نەگیراوی بۆ من نارد، لە وشتری زەکات، کە لەوەوپێش سواری پێ نەکرابوو، لەو گەشتی سەیرانەدا سواری بووم، خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پێی فەرمووم: (ئەی عائیشە! بە نەرمیی بجووڵێرەوە لەگەڵیا، چونکە نەرمیی و نەزاکەت لەهەر شتێکا هەبێ جوانی دەکاو دەیڕازێنێتەوە، وە نەرمیی و نەزاکەت لەهەر شتێکا نەبێ**

ناشیرینی دەكا!). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٤٨٦٥ ج/٤} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٦٣٥}.

**ڕوونكردنەوە:**

لە تاجول ئوصولدا، لەشەرحی غایەتولـەئموولا، دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

(واباشە كە مرۆڤ ناو بەناو، لە شارەكان دەربچێو بچێ بۆ دەوروبەری شارەكانو بۆ سەیرانگاكانو بۆناو باخو بۆلاخو سەوزاییو شینایییو سەرچاوەی ئاوەكانو تاڤگەو بەرزاییەكان، بە مەبەستی وەرزشو پشوودانو حەوانەوەی مێشكو بۆ سەیركردنی دیمەنە سروشتیەكانو تەماشای شینایییو گوڵو گوڵزارو جوانییو نازداریی بەهار، چونكە شتی وا زاخاوی مێشك دەدا، لەش ساخلەم دەكات، چونكە بۆ ئەم مەبەستانە لە عائیشەیان پرسی، عائیشە بەم فەرموودەیەی عەمرە وەڵامی دانەوە). {بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی چوارەم، زنجیرە: ٢٣، لاپەڕە: ٦٨١، ژمارە: ٤٣٧٩ تەرجەمەی كوردییەكەی = المجلد الرّابع ص٣٤٦، هامش رقم: ٥، (فائِدةٌ) من شرح غاية المأمول على التاج الجامع للأصول}.

## ١٣٦٠) خودای گەورە نەرمونیانی پێخۆشە. (٦٥٤١ - ٦٥٤٦)

## بَابٌ: إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ

١٧٨٥- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «يَا عَائِشَةُ إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ، وَمَا لاَ يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ». {الحديث: ٦٥٤٤ – ٦٥٦١ فم}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی عائیشە! خودا بۆ خۆی نەرمو نیانەو لەهەموو شتێكا نەرمو نیانیی پێ خۆشەو ڕەزای لەسەریەتی، ئەو پاداشو خەڵاتو بەخششەی كەخودا دەیدا بە بەندەی خۆی لەپاداشی نەرمونیانیدا، لەپاداشی هیچی تردا، پاداشی واچاكو باشی پێ نادا،

نە لەپاداشی توندو تیژیداو نە لەپاداشی هیچی تردا). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٤٨٦٤ + ریاض/٢، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٦٣٤ ج/٢}.

## ١٣٦١) سەبارەت بەسزای خۆ بەزلزان. (٦٦٢٣)
## بابٌ: فِي عَذَابِ المتكَبِّرِ

١٧٨٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَأَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «الْعِزُّ إِزَارُهُ، وَالْكِبْرِيَاءُ رِدَاؤُهُ، فَمَنْ يُنَازِعُنِي عَذَّبْتُهُ». {الحديث: ٦٦٢٣ = ٦٦٣٩ فم}:

ئەبو سەعیدی خودریو ئەبو هورەیرە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای باڵا دەستو شکۆمەند دەفەرموێ: گەورەییو شکۆمەندیی عاباو کەوای خۆمنو مافی کەسی تریان پێوە نییە، ئەوەی کە لەسەر یەکێ لەم دوانە گەڕو تەشقەڵەم پێ بکاو خۆی بەگەورەو زل بزانێ، تووڕی دەدەمە ناو ئاگری دۆزەخەوە!). {ریاض/٢، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٦١٨ + تاج/٥، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٤٧٧٣}.

**ڕوونکردنەوە:**

لە ئەصڵەکەدا دەفەرموێ: ریداو ئیزار، واتە: کراسو دەرپێ، یاخود پۆشاكو لەشپۆش، بەڵام ئەم دەربڕینە (تەعبیر)ە کە بڵێین: خودای گەورە دەفەرموێ: گەورەییو مەزناهی کراسو دەرپێی منن، لە کوردیدا زۆر لەبارنییە، چونکە کراسو دەرپێ هەموو کەس لەبەریان دەکا، بەڵام عاباو کەوا هەر بۆ گەورە پیاوانە.

لەهەمان کاتا دەبێ هەموومان ئەوە بزانین کە بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشەو دەربڕینانە، لەسەر رووی راستینەیی (حەقیقەت) نییە، بەڵکوو مەبەست لێیان روونکردنەوەی مەبەستەکەیە، کەواتە وەرگێڕانی پیت بەپیت لەم شوێنانەدا، زیان بە مەبەست دەگەیەنێو لەسوودو کەڵكو بایەخی کەم دەکاتەوە.

ئـا لـەم روانگەيـەوە كـە رەچـاو دەكـرێ: زۆرينـەی وەرگێڕانـە كوردييـەكان بـۆ ئايەتـەكانی قورئـانو فـەرموودەكانی پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) وەك ميوەيـەكی خۆشـی بـاش وايـە كەهـەم كـاكڵو هـەم تـوێكڵی هـەبێ، ئەصـڵە عەرەبيەكـەی وەك كاكڵەكـەی وايـەو وەرگـەڕاوە كوردييەكـەی رێـك وەك توێكڵەكـەی وايـە، رێـك وەك ئاسمانو رێسمان وان.

بـەڵام بـەهيچ شـێوەيێ مەبەسـتم ئـەوە نييـە كـە لـەنرخی ئـەركو هـەوڵی خـەمخۆرانی زمـانی شـيرينی كـوردی كـەم بكەمـەوەو دڵيـان لەبەرهـەمی خامـەی كۆششـيان ساردبكەمەوە، بـە پێچەوانەوە: كـورد گوتـەنی: لـەپڕێ نـابی بـە كـوڕێ، گـرنگ رەخنـەی باشـە، بۆئـەوەی خەڵكەكـە وا نـەزانن مەيـدان چـۆڵەو كـەس بەهەڵەيان نازانێ، تاپتر هەوڵ بدەنو زياتر كۆشش بكەن بۆ بـەپێزيیو بـەهێزيیو باشيیو نايابی بەرهەمەكانيان، هەتا كل بن بۆ چاوی كەلتووری كوردی، نەك چقڵ بن بۆ دڵی!

١٧٨٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيـهِ وَسَلَمْ): «ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُـمُ اللَّـهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ وَلاَ يُـزَكِّيهِمْ، (قَـالَ أَبُـو مُعَاوِيَـةَ: وَلاَ يَنْظُـرُ إِلَيْهِمْ) وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: شَيْخٌ زَانٍ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ». {الحديث: ٢٩٢ =}:

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەويست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم سێ كەسـە، لـە رۆژی دوا رۆژدا، خـودا نـە قسـەيان لەگـەڵ دەكـاو، نـە وەسـپی جوانيان دەكاو، نە بەچاوی سۆزو ميهرەبـانی تەماشـايان دەكـا، سـەرەڕای ئـەوەيش سزايەكی بەسوێو ئازارێكی پڕ ئێشيان بۆ دەبڕێتەوە:

يەكەم: پيری شەڕواڵ پيس.

دووەم: پاشای درۆزن.

سێيەم: هەژاری لووتبەرزی خۆبەزلزان!). {رياض/٢، زنجيرە: ٧٢، ژمـارە: ٦١٧ + تاج/٣، زنجيرە: ٨٦/١٠٦، ژمارە: ٢٤٣٤ + تاج/٥، زنجيرە: ١٨، ژمارە: ٤٧٧}.

### ١٣٦٢) سزای کەسێ بەناهەق سوێند بەسەر خودا بخوات. (٦٦٢٤)
### بابٌ: فِي المتألِّي علَى اللّه عزَّ وجَلَّ

١٧٨٨- عَنْ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) حَدَّثَ: «أَنَّ رَجُلاً قَالَ: وَاللَّهِ لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لِفُلاَنٍ، وَإِنَّ اللَّهَ تَعالَى قَالَ: مَنْ ذَا الَّذِى يَتَأَلَّى عَلَىَّ أَنْ لاَ أَغْفِرَ لِفُلاَنٍ، فَإِنِّى قَدْ غَفَرْتُ لِفُلاَنٍ، وَأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ». أَوْ كَمَا قَالَ. {الحديث: ٦٦٢٤ = ٦٦٤٠ فم}:

**جوندوب** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لە فەرموودەیەکا، فەرمووی: (پیاوێ دەڵێ: بەخودا، خودا لە فیسارە کەس خۆش نابێ، خودای گەورەیش دەفەرموێ: ئەوە کێیە کە سوێندم لێ دەخوا: کە نابێ لە فیسارە کەس خۆش ببم، دەسا وا لەوکەسە کەتۆ دەڵێی من لێی خۆش نابم، خۆش بووم و کردەوەی تۆشم، ئەی سوێندخۆر! پووچ کردەوە)ز {تاج/٥، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٥١٥٤م}.**

### ١٣٦٣) باسی خۆسازی و خۆگونجان لەگەڵ خەڵك، بەتایبەتی لەترسی زمانی بەدیان. (٦٥٣٩ - ٦٥٤٠)
### بابٌ: فِي المُدارَةِ، وَمَنْ يُتَّقى فُحْشُهُ

١٧٨٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ رَجُلاً اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِىِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ)، فَقَالَ: «ائْذَنُوا لَهُ، فَبِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ، أَوْ بِئْسَ رَجُلُ الْعَشِيرَةِ». فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ أَلاَنَ لَهُ الْقَوْلَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قُلْتَ لَهُ الَّذِى قُلْتَ ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ، قَالَ: «يَا عَائِشَةُ: إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ وَدَعَهُ أَوْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ». {الحديث: ٦٥٣٩ = ٦٥٥٦ فم. بخاری. أدب: ٦٠٥٤، ٣١٣٢. أبو داود. أدب: ٤٧٩١. ترمذی. بروصلة: ١٩٩٦}:

**عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ داوای ڕێگادانی کرد، کەبێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ڕێگەی پێ بدەن بابێ، بەڕاستی کابرایەکی زۆر بەدە!) یا فەرمووی: (کابرایەکی زۆر خراپە!).**

بەڵام کاتێ کابرا هاتە خزمەتی، پێغەمبەر رووی خۆش بوو لەگەڵیا، بەنەرمی دەدوا لەگەڵی، عائیشە فەرمووی: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ لەپێشدا قسەیەکی ئاوات فەرموو، کەچی لەپاشدا قسەت نەرمبوو لەگەڵیدا!

فەرمووی: (ئەی عائیشە! لەڕاستیدا بەدترین پایە لەلای خودا، لە رۆژی دوا رۆژدا، پایەی ئەو کەسەیە کە خەڵك لەترسی بەد گوێیو بەد زمانییو زمان پیسی، خۆیانی لێ لادەدەن). یا فەرمووی: (لەبەر بەد گوێی خۆیانی لێ دەپارێزن). {تاج/٥، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٤٧٥٩}.

### ١٣٦٤) باسی چاو پۆشیو لێبووردن. (٦٥٣٥)

### بَابٌ: فِي العَفْوِ

١٧٩٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلاَّ عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ». {الحديث: ٦٥٣٥ = ٦٥٥٢ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نە ماڵ بە بەخشینو خێر لێکردن کەم دەکا، نە بەندەی خودایش بە چاوپۆشییو لێبووردن کەم دەکا، بەڵکوو زیاتر خودا پلەو پایەی بەرزەوە دەکا، هەرکەسێکیش ساخ لەبەر رەزای خودا خاکیو بێ هەوابێو خۆی بەکەم بگرێ، مسۆگەر کە خودای گەورە زیاتر پایە بەرزیی دەکا). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٤٨٤٤ ج/٤}.

### ١٣٦٥) خۆگرتن لەکاتی تووڕەبووندا. (٦٥٨٤ - ٦٥٩١)

### بَابٌ: فِي الَّذِى يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ

١٧٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «مَا تَعُدُّونَ الرَّقُوبَ فِيكُمْ؟» قَالَ: قُلْنَا: الَّذِى لاَ يُولَدُ لَهُ. قَالَ: «لَيْسَ ذَاكَ بِالرَّقُوبِ، وَلَكِنَّهُ الرَّجُلُ الَّذِى لَمْ يُقَدِّمْ مِنْ وَلَدِهِ شَيْئًا». قَالَ: «فَمَا تَعُدُّونَ الصُّرَعَةَ فِيكُمْ؟». قَالَ: قُلْنَا: الَّذِى لاَ يَصْرَعُهُ الرِّجَالُ. قَالَ: «لَيْسَ بِذَلِكَ، وَلَكِنَّهُ الَّذِى يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ». {الحديث: ٦٥٨٤ = ٦٦٠١ فم}:

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئێوە لەناو خۆتانا کێ بەوەجاخ کوێر دادەنێن؟). گوتمان: ئەوەی کە منداڵی نەبێ، فەرمووی** (دروودی خودای لەسەر بێ)**: (ئەوە وەجاخ کوێر نییە، بەڵام ئەو پیاوە وەجاخ کوێرە کە کەس لە منداڵەکانی لەپێش خۆیدا نامرن). فەرموویشی: (ئەی باشە ئێوە کێ بە پاڵەوانو ئازاو زۆرانباز دادەنێن؟). عەرزیمان کرد: ئەو کەسەی کەس نەیدا بەزەویداو دەرەقەتی نەیێ!**

**فەرمووی: (ئەمیش ئەوە نییە، بەڵام پاڵەوان ئەو کەسەیە کە لەکاتی رق هەستانو تووڕە بووندا، خۆی پێ ڕادەگیرێو دەروونی خۆی پێ زەوت دەکرێو رقی خۆی دەخواتەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٤٨٣٤ ج/٤}.**

## ١٣٦٦) پەناگرتن بەخودا لەکاتی تووڕەییدا. (٦٥٨٤ - ٦٥٩١)
## بابٌ: التَّعَوُّذُ عِنْدَ الغَضَبِ

**١٧٩٢- عَنْ سُلَيْمَانُ بْنُ صُرَدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ)، فَجَعَلَ أَحَدُهُمَا يَغْضَبُ وَيَحْمَرُّ وَجْهُهُ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) فَقَالَ: «إِنِّي لأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ ذَا عَنْهُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»، فَقَامَ إِلَى الرَّجُلِ رَجُلٌ مِمَّنْ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) فَقَالَ: أَتَدْرِي مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) آنِفًا؟ قَالَ: «إِنِّي لأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ ذَا عَنْهُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: أَمَجْنُونًا تَرَانِي؟ {الحديث: ٦٥٩٠ = ٦٦٠٧ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٣٢٥ = ٣٢٨٢، ٦٠٤٨، ٦١١٥}:**

**سولەیمانی کوڕی صورەد** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دانیشتبووم دوو پیاو لەلامانا، بوو بەشەڕە جنێویان، یەکێکیان بەدەم تووڕە بوونەوە، روخساری سوور هەڵگەڕاو چاوی سوور بوو رەگی لاملی هەڵسا، پێغەمبەریش تەماشای کابرای کردو کە حاڵەکەیی بینی فەرمووی: (من وشەیە دەزانم ئەگەر ئەم کابرایە بیڵێ، رقەکەی دەنیشێتەوە، ئەو وشەیە ئەمەیە، بڵێ:**

أَعُوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: پەنا دەگرم بەخودا، لەشەڕی شەیتانی دوور لە ڕەحمەتی خودا).

جا پیاوێ هەڵساو چوو بۆلای ئەو کابرایەو پێی گوت: ئایا دەزانی کە ئێستا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) چی فەرمووی؟ فەرمووی: (من وشەیەك دەزانم ئەگەر ئەم کابرایە بیڵێ، ڕقەکەی دەنیشێتەوە، ئەو وشەیە ئەمەیە، بڵێ: (أَعُوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: پەنا دەگرم بەخودا، لەشەڕی شەیتانی دوور لەڕەحمەتی خودا).

کەچی پیاوەکە پێی گوت: بۆچی لەتۆ وایە من شێت بوومو شەیتان دەستی لێ وەشاندووم؟ هەتا پەنا بگرم بەخودا لەشەیتان؟). {تاج/٥، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٤٨٤٥م}.

**ڕوونکردنەوە:**

سولەیمانی کوڕی صورەدی کوڕی ئەلجەون، هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، پیاوێکی پیاوانەی خێرۆمەند بوو، ئاییندارو خواپەرستێکی جوان بوو، لەسەردەمی نەزانیدا ناوی یەسار بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕیو ناوی نا سولەیمان، کە کووفە دروست کرا لەوێ خانوویەکی بۆ خۆی دروست کردو لەوێ بوو بەنیشتەجێی ئەوێو ماڵی چووە ئەوێ، پیاوێکی خانەدانی بەتەمەن بوو، خاوەنی ڕێزو قەدرێکی تایبەتی بوو، لەناو هۆزەکەیدا قسەی دەڕۆییو دەم سپییان بوو.

لەگەڵ سوپای عەلیدا ئامادەی شەڕی صەفین بوو، لەدژی لەشکری حەزرەتی عائیشە، لە صەفین لە موبارەزەیەکا، لە شەڕێکی دوو بەدوویدا، چووە مەیدان، بۆ حەوشەبی ذو ظەلیمو حەوشەبی کوشت. لەگەڵ خەڵکی کووفەدا، نامەیەکیان نووسی بۆ حوسەینی کوڕی عەلی، کەبچێ بۆ ناویان، ئەوان پشتگیری دەکەنو دەیپارێزن، بەڵام کاتێ حوسەین چوو، ئەوان پاشگەز بوونەوەو پشتگیرییان نەکرد، جا کاتێ حوسەین شەهید بوو، ئەوان زۆر پەشیمان بوونەوە، ئیتر لەناو خۆیانا گوتیان: تەوبەو پەشیمانیان قەبووڵ نییە، مەگەر لەسەر ئیمامی حوسەین خۆمان

بدەین بەکوشت، جا لەسەر ئەم بناغەیە لەسەرەتای مانگی رەبیعی دووەما، ساڵی شەستو پێنجی کۆچی، لەشکریان کرد، سولەیمان بوو بەسەرۆکی ئەو لەشکرە، کە ژمارەیان چوار هەزار پیاو بوو، لەشکرەکە کردیان بە فەرمانڕەوای خۆیانو ناویان نا: فەرمانڕەوای تەوبەکاران (أمير التوّابين).

ئەوجا خۆیو موسەییبی کوڕی نەجیبە، لەگەڵ لەشکرەکەدا، کە چوار هەزار کەس بوون لە تەوبەکاران کەوتنەڕێ لە شوێنێ بەناوی (عَيْنُ الوَرْدَةِ) بەرەنگاری سوپای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد بوون، لە نەبەردێکی فرە قورسو خوێناویدا، لەسەر بازگەی مەڕوان، سولەیمانو موسەییبو هەموو سوپاکەیان کوژران!

ئەو دەمەی سولەیمان شەهید بوو تەمەنی نەوەدو سێ ساڵ بوو، ئەوەی کوشتی ناوی یەزیدی کوڕی حوصەینی کوڕی بەهزبوو تیرێکی پێوە ناو بەو تیرە مرد، جا عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد، سەری سولەیمانو سەری موسەییبی بڕیو، بەدیاری بردی بۆ مەڕوانی کوڕی حەکەمی ئاغای. سولەیمان لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە.

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٤٥٤، چاپی یەکەم، ژمارە: (١٣٢٥ = ٣٢٨٢ فتح الباري + بەرگی چوارەم، ژمارە: ١٥٥١ = ٤١٠٩ فەتحولباری + بەرگی سێیەم، ژمارە: ١٠١٥ = ٢٣٠٧ فەتحولباری، ژیاننامەی مەڕوانی کوڕی ئەلحەکەم).

**١٣٦٧) مرۆڤ بەسرووشت وا دروست کراوە کە خۆی پێ رانەگیرێ.** (٦٥٩٢ - ٦٥٩٣)

**بابٌ: خُلِقَ الإنْسَانُ خَلْقاً لا يَتَمَالَكُ**

**١٧٩٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «لَمَّا صَوَّرَ اللَّهُ آدَمَ عَلَيْهِ السَلاَمْ فِي الْجَنَّةِ، تَرَكَهُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَتْرُكَهُ، فَجَعَلَ إِبْلِيسُ يُطِيفُ بِهِ، يَنْظُرُ مَا هُوَ، فَلَمَّا رَآهُ أَجْوَفَ عَرَفَ أَنَّهُ خُلِقَ خَلْقًا لاَ يَتَمَالَكُ». {الحديث: ٦٥٩٢ = ٦٦٠٨ فم}:**

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ خودا لەبەهەشتا وێنەی ئادەمی کێشا (سڵاوی خودای لێ بێ)، چەندە ئارەزوو

خواستی خودای لەسەر بوو، ئەوەندە ئەو شەکڵە، کە لەسەر شێوەی پەیکەری ئادەم بوو هێشتیەوە، جا شەیتان (واتە: ئیبلیسی نەحلەتی) دەستی کرد بەچەرخە کردنو گڕ خواردن بەدەوری ئەو پەیکەرەداو هەر سەرنجی دەدا، هەتا تەماشای کرد کە هلۆڵەو ناوسکی چۆڵە، ئیتر زانی کە بۆشو کلۆرەو وەها دروست کراوە کە خۆی پێ ڕاناگیرێو بە ئاسانی لەڕێ دەردەکرێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٤٨٣٥ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

لە فەتحولولهیمدا دەفەرموێ: (ئەگەر جەستەی مرۆڤێ بکرێ بەشتێ کە بۆشایی تیانەبێو تەنیا بمێنێتەوە ماددە ڕووتەکەیو بەبێ بۆشایی هەمووی کۆبکرێتەوە لەجێگەی یەك خاڵدا کۆدەبێتەوە، باقی مەندەی لەش هەمووی چۆڵیو بۆشاییە!). منیش عەرزتان دەکەم: بەڵێ ئێستا هەندێ کەس لە ڕۆژاوا، هەوڵ دەدەن کە لەشەکەیان لەپاش مردن بەکارەبا بسووتێنرێو ماددە ڕووتەکەی کە دەمێنێتەوە دەکەنە کەبسوولێکەوەو لەشوێنێکا بۆ یادگار دایدەنێن، یا لەناو مانگی دەسکردا، دەینێرن بۆ بۆشایی ئاسمان!

### ١٣٦٨) چاکەو تاوان. (٦٤٦٣ - ٦٤٦٤)

### بَابٌ: فِي البِرِّ وَالإِثْمِ

١٧٩٤- عَنْ النَوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقَمْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) بِالْمَدِينَةِ سَنَةً، مَا يَمْنَعُنِى مِنَ الْهِجْرَةِ إِلاَّ الْمَسْأَلَةُ، كَانَ أَحَدُنَا إِذَا هَاجَرَ لَمْ يَسْأَلْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) عَنْ شَىْءٍ، قَالَ: فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِى نَفْسِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ». {الحديث: ٦٤٦٤ = ٦٤٧٦ فم. ترمذی. زهد: ٢٣٨٩، ٢٣٨٩م. تحفة الأشراف: ١١٧١٢}:

نەوواسی کوڕی سەمعان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵێکی تەواو لەمەدینە لەخزمەت پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) مامەوە، لەبەرئەوە لەو ماوەیەدا کۆچم

نـەکرد بۆ مەدینـە، هـەتا ڕێگـەی پرسـیارکردنم لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێ نـەگیرێ، چـونکە ڕێگـە دەدرا بـە ڕێبـوارو دێنیکـارو مـرۆی لاوەکـی پرسـیار لـە پێغەمبەر بکەن، بەڵام ڕێگەی ئەنصارو کۆچکاران زۆر زۆر بەکـەمی دەدرا، ئـەوەی لەئێمە کۆچی بکردایـە لـە وڵاتـی خۆیـەوە بـۆلای پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئـیتر پرسیاری هیچی لێ نەدەکرد.

نەوواس فەرمووی: لـەبارەی چـاکەو خراپـەوە پرسـیم لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (چاکە برێتییە لەخووی شیرینو ڕەفتاری بـەرزو ڕەوشـتی جـوان، خراپەیش برێتییە لەوە کـەلێی دوودڵ بیـتو دڵ ئـاوی پـێ نەخواتـەوەو لەهـەمان کاتیشدا حـەز نەکـەیت کەکـەس بزانێـت!). {تـاج/٥، زنجیرە: ١، ژمـارە: ٤٦٥٠ چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

نەوواسی کوڕی سەمعانی الکلابی، خۆیو باوکی هاوەڵی پێغەمبەرن نەوواس لە ئەفرادی موسلیمە لە بوخاریدا فـەرموودەی نییـە. کـە یەکـەم جـار هاتـە خزمـەتی پێغەمبەر، پێغەمبـەر نـزای باشـی بـۆیکرد، ئـەویش پێڵاوەکـانی خـۆی بەخشـی بـە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر لێی قەبووڵ کرد.

**١٣٦٩) لابردنی ئازاری سەرەڕێ، وەك بەردو دارو شتی تری وا.** (٦٦١٢ - ٦٦١٧)

**بابٌ: فِيمَنْ رَفَعَ الْأَذى عَنِ الطَّرِيقِ**

١٧٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللّـهُ عَلَيـهِ وَسَلَمْ): «مَرَّ رَجُلٌ بِغُصْنِ شَجَرَةٍ عَلَى ظَهْرِ طَرِيقٍ، فَقَالَ: وَاللَّهِ لأُنَحِّيَنَّ هَذَا عَنِ الْمُسْلِمِينَ لاَ يُؤْذِيهِمْ، فَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ». {الحديث: ٦٦١٢ = ٦٦٢٩ فـم. تجريد البخـاري بـالكوردى/١، رقم: ٣٧١ = ٦٥٢،، ٢٤٧٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (دارێ لەسەرە ڕێگەیەکا بوو، لقێکی سـەرە ڕێکـەی گرتبـوو، پیـاوێ لـەوێوە ڕەتبـوو، گوتی: بەخوا دەبـێ ئـەم لقـە ببـڕم، نـەهێڵم ئـیتر ئـازاری موسـوڵمانان بـدا، جـا لقـە

دارەکەی بڕی، خودا لەپاداشی ئەوەدا بردیە ناو بەهەشت). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٢٧ ج/٢ = چاپی دووەم}.

١٧٩٦- عَنْ أَبي بَرْزَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، عَلِّمْنِي شَيْئًا أَنْتَفِعُ بِهِ، قَالَ: «اعْزِلِ الأَذَى عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ». {الحديث: ٦٦١٦ = ٦٦٣٢ فم}:

ئەبو بەرزە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی خۆشەویستم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! شتێکم فێربکە کە کاتێ ئەنجامی بدەم کەڵکی هەبێ بۆم؟ فەرمووی: (ئەوەندەی بۆت دەکرێ ئازار لەسەرە ڕێی موسوڵمانان دوور بخەرەوە!).

## ١٣٧٠) هەرچی ئازارێ تووشی موسوڵمان دەبێ لە دڕکێکەوە بیگرە، هەتا قۆرتێکی گەورە. (٦٥٠٢ - ٦٥١٦)

## بابٌ: مَايُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنَ الشَّوْكَةِ وَالْمصيبة

١٧٩٧- عَنِ الأَسْوَدِ، قَالَ: دَخَلَ شَبَابٌ مِنْ قُرَيْشٍ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، وَهِيَ بِمِنًى وَهُمْ يَضْحَكُونَ، فَقَالَتْ: مَا يُضْحِكُكُمْ؟ قَالُوا: فُلاَنٌ خَرَّ عَلَى طُنُبِ فُسْطَاطٍ، فَكَادَتْ عُنُقُهُ أَوْ عَيْنُهُ أَنْ تَذْهَبَ! قَالَتْ: لاَ تَضْحَكُوا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُشَاكُ شَوْكَةً فَمَا فَوْقَهَا إِلاَّ كُتِبَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ». {الحديث: ٦٥٠٦ = ٦٥٢١ فم}:

ئەسوەد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چەند لاوێکی قورەیشی بەدەم پێکەنینەوە لەمینا چوون بۆلای عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی پێیان: ئەوە چیتانە بۆچی پێدەکەنن؟ گوتیان: فیسارە کەسمان قاچی لە گوریسی چادرێ هەڵکەوت، خەریکبوو ئەستۆی بشکێ، یا وەخت بوو چاوی کوێرببێ!

عائیشە فەرمووی: بەشتی وا پێمەکەنن، چونکە من بۆ خۆم لە پێغەمبەرم ژنەوتووە (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانێ تووشی هەرچی ئازارێ ببێو هەر ناخۆشییەك بێتە ڕێگەی، لە تێهەڵچەقینی دڕکێکەوە بیگرە هەتا زیاتر، خودا بەهۆی ئەوەوە پایەیەکی بەرزی پێ دەداو گوناهێکیشی لێ هەڵ دەوەرێنێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٢٩٣٦ ج/٤}.

## ١٣٧١) هەرچی تووشی موسوڵمان دەبێ لە خەم‌و پەژارەو کفتی‌و شەکەتی. (٦٥٠٢ - ٦٥١٦)

## بابٌ: مَايُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنَ الْوَصَبِ وَالحزَنِ

١٧٩٨- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الخدرى وَأَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا) أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَقُولُ: «مَا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنْ وَصَبٍ وَلاَ نَصَبٍ، وَلاَ سَقَمٍ، وَلاَ حَزَنٍ حَتَّى الْهَمِّ يُهَمُّهُ إِلاَّ كُفِّرَ بِهِ مِنْ سَيِّئَاتِهِ». {الحديث: ٦٥٠٣ = ٦٥٢٨ فم. تجريد البخاری بالکوردی/٥، رقم: ١٨٥٧ = ٥٦٤١، ٥٦٤٢ فتح الباری}:

ئەبو سەعیدی خودری‌و ئەبو هورەیرە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: لە پێغەمبەرمان بیست، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەرچی تووشی ئیماندار دەبێ لە شەکەتی‌و کفتی‌و نەخۆشی‌و خەم‌و پەژارەو خەفەت‌و ئێش‌و ئازار، تەنانەت پەژارەیەکیش کە زۆری بۆ دێنێ، ئەمانە هەموو خودای گەورە دەیانکات بەسەرپۆش‌و پەردەو کەفارەت بۆ گوناهو خراپەکانی!). {تاج/٣، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٢٩٣٥}.

١٧٩٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ)، بَلَغَتْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مَبْلَغًا شَدِيدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «قَارِبُوا وَسَدِّدُوا، فَفِى كُلِّ مَا يُصَابُ بِهِ الْمُسْلِمُ كَفَّارَةٌ حَتَّى النَّكْبَةِ يُنْكَبُهَا أَوِ الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا». {الحديث: ٦٥١٤ = ٦٥٢٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: {مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ — النساء — ٤/١٢٣}:

واتە: هەرکەسێ هەر خراپەیێ بکا تۆڵەی ئەوەی لێ دەستێنرێ).

کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی کە ئەم هەڕەشە گەورەیەی واتیادا، کارێکی سەختی لە موسوڵمانان کردو دڵی خستنە لەرزە، خۆشەویستیش لەم لایەنەوە، بۆ دڵدانەوەیان فەرمووی: (میانەڕەوو کار دروست بن‌و بەردەوام مشت لەکاری باش بگرن، بشزانن کە هەرچی ئێش‌و ئازارو ناخۆشییەك تووشی موسوڵمان دەبێ، گەورەو بچووکی، هەمووی دەبێ بە پەردەو کەفارەت بۆی، تەنانەت هەر مەینەتێ بێتەڕێی، یا

دڕكێكی تێهەڵچەقێ، بۆی دەبێ بە پەردەو برێتیو كەفارەتی گوناهو بەر خراپەكانی دەكەوێو بەرەبەرە كارە خراپەكانی دەسڕێتەوەو لەمەترسی هەڕەشەی ئەم ئایەتە كەم دەكاتەوە!).

### ١٣٧٢) پێشگیریی لە بەخیلی بردنو، لە رقەبەریو پشتكردنە یەكتریی. (٦٤٧٣ - ٦٤٧٧)

### بابٌ: النَّهْىُ عَنِ التَّحَاسُدِ وَالتَّبَاغُضِ وَالتَّدَابُرِ

١٨٠٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ». {الحديث: ٦٤٧٣ = ٦٤٨٦ فم. تجريد البخاري بالكوردی/٥، رقم: ١٩٤١ = ٦٠٦٥، ٦٠٧٦. أبو داود. أدب: ٤٩١٠. تحفة الأشراف: ١٥٣٠}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (رقو كینەو دەغەز لەیەكتری مەكێشنو پشت مەكەنە یەكتریو لەیەكتریی لووتەلا مەبن، وەك برا باشو تەباو بەندەی باشی خودا بن، دروست نییە بۆ موسوڵمان كە زیاتر لەسێ رۆژ قسە لەبرای ئایینی خۆی دابڕێ). {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٢٧١، ژمارە: ١٥٧٠ ج/٢ = چاپی دووەم}.

### ١٣٧٣) باشترینیان ئەوەیانە كە لەپێشدا سلاو دەكا. (٦٤٧٨ - ٦٤٨١)

### بابٌ: خَيْرُهُمَا الَّذِى يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ

١٨٠١- عَنْ أَبِى أَيُّوبَ الأَنْصَارِىِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ، فَيُعْرِضُ هَذَا، وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِى يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ». {الحديث: ٦٤٧٨ = ٦٤٩٢ فم. تجريد البخاري بالكوردی/٥، رقم: ١٩٤٥ = ٦٠٧٧، ٦٢٣٧}:

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دروست نییە بۆ موسوڵمان، چ پیاوبێ چ ژن، كە زیاتر لەسێ شەو قسە دابڕێ، لەبرای موسوڵمانی، یا لە خوشكی موسوڵمانیو قسەی لەگەڵ نەكا، گریمان

ئەگەر لەشوێنێ تووشی یەكتری بوون، ئەمیان بەم لاداو ئەویان بەولادا روو وەرگێڕێ!

باشترینی ئەم دوو موسوڵمانە لەیەك تۆراوانە، كە قسەیان بەیەكەوە نییە، ئەوەیانە كە لەپێشدا ئاشت دەبێتەوەو رۆژ باشیو سلاو لەوی تریان دەكا).
{ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٠، ژمارە: ١٥٩٢}.

**١٣٧٤) باسی قینەبەریو قسە لەیەك دابڕان.** (٦٤٩٠ - ٦٤٩٣)
**باب: فِي الشَّحْنَاءِ وَالتَّهَاجُرِ**

١٨٠٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا، إِلاَّ رَجُلاً كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيُقَالُ: أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا، أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا، أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا». {الحديث: ٦٤٩٠ = ٦٥٠٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو رۆژی دوو شەممەو پێنج شەممەیێ دەرگاكانی بەهەشت دەكرێنەوە، خودا لەهەموو بەندەیێ خۆش دەبێ، بەمەرجێ هاوەڵی بۆ خودا دانەنابێ، تەنها خودا لەو دوو كەسە خۆش نابێ، كە رقو قینیان لە یەكتری گرتووەو لەناو خۆیانا ناكۆكنو قینیان لە یەكترییە، خودا بە فریشتەكان دەفەرموێ: گوناهەكانی ئەم دوو كەسە مەكوژێننەوە، با بمێنن تا لەناو خۆیاندا ئاشت دەبنەوە، ئەوسا گوناهەكانیان بكوژێننەوە). {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٢٦٩، ژمارە: ١٥٦٨}.

**١٣٧٥) پێشگیریی لە سیخوڕیو بەر بەرەكانێو گومانی بەد.** (٦٤٨٢ - ٦٤٨٦)
**بَابُ: النَّهْىُ عَنِ التجسُّسِ والتنافُسِ وَالظَّنّ**

١٨٠٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلاَ تَحَسَّسُوا وَلاَ تَجَسَّسُوا، وَلاَ تَنَافَسُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا». {الحديث: ٦٤٨٢ = ٦٤٩٦ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٤١ = ٦٠٦٥، ٦٠٧٦ فتح الباري}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی: (دووربن لەگومانی خراپ، چونکە گومانی خراپ رێـك وەك قسەی درۆ وایـەو وەك درۆی خـراپ تـاوانێکی گەورەیـە، هەستیش هەڵمـەگرن بـەنیازی خـراپو، بەشوێن نەنگو عەیبو کـەموکوورِی خەڵکدا مەگـەرِێنو، سـیخورِیو جاسووسـی مەکـەنو، بەربەرەکانیو ڤینەبەری مەکەنو، بەخیلی بەیـەکتری مەبـەنو، کینـەو دەغـەز لـە یـەکتری مەکێشـنو، پشـت مەکەنـە یـەکتری، وە وەك بـرا تـەبابنو پشـتی یـەکتری بگــرنو بەنــدەی باشــی خــودابن!!).** {تــاج/٥، زنجــیرە: ١٦، ژمــارە: ٤٧٦٤ ج/٤} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٦٩، ژمارە: ١٥٦٧}.

**روونکردنەوە:**

لــە فەتحولولهیمــدا راگــوێز لــە فــەتحولباری ئیمــامی عەســقەلانییەوە دەکــا، دەفــەرموێ: (جاسووســی دوو جــۆری هەیــە، بەهــەق، بەناهــەق) پوختــەی ئــەم فەرمایشتەی عەسقەلانییە ئەمەیە:

١- بەشێوەی گشتی جاسووسیو سیخورِی کارێ خراپـەو تـاوانێکی گەورەیـەو لـە قورئانو سوننەتدا، نەهیو پێشگیری لێ کراوەو مرۆڤی باشو موسوڵمانی ساخ دەبێ خۆیی لێ بپارێزێ.

٢- بــەڵام جاروبــار، کــەدەبێ بــەهۆی پاراســتنی خــوێنی کەســێ، یــا بــەهۆی رزگارکردنی کەسێ، ج هی گیانی، ج هی سامانی، ج هـی نامووسـی، یـا دەبـێ بـەهۆی پاراستنی ئاشتیو ئارامی وڵاتو سەرکەوتنی سوپای ئیسلامو زیانـدان لـە دوشمنـی ئـایین، ئالــەم جــۆرە بــارو دۆخانــەدا، هەســت هــەلگرتنو ســیخورِیو جاسووســی دروستەو نادروست نییە.

٣- کورتو پوخت: (هەست هەلگرتنی نارِەواو سیخورِی نادروسـت ئەوەیـە کـەبۆ ئـابرِو بردنـی خـەڵك بـێو تـەنیا بۆئـەوە بـێ کـە بـەنارِەوا پـەردەی خـودا لەسـەر بەندەکانی هەڵبدرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەبەر مەبەستێکی کۆمەڵایـەتی باشـبێ، بـەر جاسووسی نارِەوا ناکەوێ).

٤- بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە بڕوانە:

أ- تاجول ئوصول، بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ٤٠١ بە عەرەبی، چاپی چوارەم، دارولفیکر بیرۆت هەتا لاپەڕە: ٤٠٢ بەتایبەتی ئەم سێ سەرباسە (الرُسُلُ لاَ تقْتَلُ) و (الجاسوس يُقْتَلُ) و (بَعْثُ العُيُونِ مَطْلُوبٌ).

ب- تاجول ئوصول، بەرگی چوارەم بەکوردی، چاپی چوارەم، زنجیرە: (٧٨ - نوێنەر ناکوژرێ) و (٧٩ — سیخوڕو خەفی دەکوژرێ) و (٨٠ — خەفێ ناردن پەسەندە). واتە لە ژمارە: (٤٥٦٠) وە هەتا ژمارە: (٤٥٦٤) + {تاج/٣، زنجیرە: ١٠، لاپەڕە: ٦٠١، ج/٤، ژمارە: ٣٣١٣} + {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، لاپەڕە: ٥١٩، ج/٤، ژمارە: ٣٢١٣} + {ژمارە: ١٧٢٠ کە لەپێشەوە رابورد}.

## ١٣٧٦) هەوڵدانی شەیتان بۆ تێکبەردانی نوێژکەران. (٧٠٣٤ - ٧٠٤١)

## بابٌ: في تحريش الشَّيْطَانِ بَيْنَ الْمُصَلِّينَ

١٨٠٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: سَـمِعْتُ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيـهِ وَسَـلَّمْ) يَقُولُ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ فِى جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَلَكِـنْ فِـى التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ». {الحديث: ٧٠٣٤ = ٧٠٥٩ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (شەیتان لەوە نائومێد بووە، کە جارێکی تر لەناو دانیشتوانی دوورگەی عەرەبدا، نوێژکەران بیپەرستن و بەندەیی بۆ بکەن، وەك لەسەردەمی نەفامی پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا شتی وا رووی دەداو، بە فەرمانی شەیتان خەڵکەکە لە دوورگەی عەرەبدا، بت و دارو بەردیان دەپەرست، بەڵام شەیتان هەوڵ دەدا کە موسوڵمانان لەناو خۆیاندا، تێکیان بەرداو دووبەرەکی و دوژمنایەتییان لەنێوانا بەرپا بکا). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٥٢٥٢}.

### ١٣٧٧) هەموو ئادەمیزادێ شەیتانێکی لەگەڵدایە. (٧٠٣٤ - ٧٠٤١)

### بابٌ: مَعَ كُلِّ إِنْسَانٍ شَيْطَانٌ

١٨٠٥- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): حَدَّثَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا لَيْلاً. قَالَتْ: فَغِرْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ فَرَأَى مَا أَصْنَعُ، فَقَالَ: «مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ أَغِرْتِ؟». فَقُلْتُ: وَمَا لِي لاَ يَغَارُ مِثْلِي عَلَى مِثْلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «أَقَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ»؟ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوَمَعِيَ شَيْطَانٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ». وَقُلْتُ: مَعَ كُلِّ إِنْسَانٍ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قُلْتُ: وَمَعَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ، وَلَكِنْ رَبِّي أَعَانَنِي عَلَيْهِ حَتَّى أَسْلَمَ». {الحديث: ٧٠٤١ = ٧٠٦٤ فم}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵە نازدارو بەڕێزەکانی بێ) فەرمووی: (شەوێ نۆرە شەوی خۆم بوو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای من بوو، لە شەودا دەرچووە دەرەوە منیش ئەوەم لەبەر گران بوو، جا کەهاتەوەو زانی من دەرچوونەکەی ئەوم لەبەر گرانە. فەرمووی: (ئەی عائیشە! ئەوە چیتە؟ ئەوە ژار لە هەوێکانت دەکێشیت؟).

گوتم: جا بۆچی ئەگەر لەسەر تۆ ژاریشیان لێ بکێشم هەقی خۆم نییە؟! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە چیتە؟ شەیتانەکەت سەری لێ داویت؟). گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی من شەیتانم لەگەڵدایە؟ فەرمووی: (بەڵێ).

گوتم: دیارە هەموو کەسێ شەیتانێکی هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ وایە). گوتم: هەتا تۆیش شەیتانت لەگەڵدایە؟ فەرمووی: (بەڵێ، منیش شەیتانێکم هەبوو، بەڵام من خودا زاڵی کردووم بەسەریداو شەیتانەکەم موسوڵمان بووەو رزگارم بووە لەزیانی).

### ١٣٧٨) پێشگیریی لە پاشملە گۆیی. (٦٥٣٦)

### باب: النهى عَنْ الغِيبَةِ

١٨٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ». قِيلَ:

أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ». {الحديث: ٦٥٣٦ = ٦٥٥٣ فم = ف.م = فتح الملهم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئەرێ ئێوە دەزانن کە غەیبەتو پاشملە گۆیی چییە؟). گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا باشی دەزانن، فەرمووی: (ئەوەیە کە باسی برای ئاییینیت بەجۆرێکی وابکەی کە خۆی باسکردنی بەو شێوەیەی پێ ناخۆش بێ!).

عەرزی کرا: ئەی ئەگەر ئەو قسەیەی کەمن دەیکەم، لە براکەما هەبوو ئەوە چۆنە؟ ئەوەیش هەر غەیبەتو پاشملە گۆیی نادروستە؟ فەرمووی: (غەیبەت ئەوەیە کە ئەو نەنگەی تۆ دەیلێییت لە پاشملە تیادابێ، دەنا ئەگەر تیادا نەبێ، ئەوە رێك بوختانی بۆ دەکەی!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٤٧٥٣ چ/٤}.

## ١٣٧٩) نەییکردن لەدوو زمانی. (٦٥٧٩)

## بابٌ: فِي النَّمِيمَةِ

١٨٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ مَا الْعَضْهُ؟ هِيَ النَّمِيمَةُ الْقَالَةُ بَيْنَ النَّاسِ»، وَإِنَّ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِنَّ الرَّجُلَ يَصْدُقُ حَتَّى يُكْتَبَ صِدِّيقًا وَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ كَذَّابًا». {الحديث: ٦٥٧٩ = ٦٥٩٦ فم}:

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەتی موحەممەدی خۆشەویستو نازدار** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (با پێتان بڵێم کە هەلاتو بوختیانی زۆر گەورەی ناڕەوای وا، کە بۆنی خوێنی لێ دێ کامەیە؟) فەرمووی: (بریتییە لەدوو زمانیو بەد گۆییو وتی وتی زۆرو زۆر بڵێیی کەدەبێ بەهەوێنی تێکدانی نێوانی مەردومو سەر دەکێشێ بۆ خوێنڕێژی!).

وە هەروەها فەرمووی: حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەڕاستی ڕەحمەت دەبارێ، راستی بکەن بە پیشە، چونکە راستی ئادەمیزاد دەخاتە سەر رێگەی چاکە، کردەوەی چاکەیش ئادەمیزاد دەخاتە سەر رێگەی بەهەشت!

پیاوی وا هەیە ئەوەندە راستگۆیەو ئەوەندە سۆراخی راستی دەکاو ئەوەندە عەودالّی راستیو راستگۆییە، هەتا لەلای خودا بە پیاوی راستو راستالّو راستگۆ دەنووسریّ، وە نەکەن درۆبکەن، چونکە درۆ مرۆڤ دەخاتە سەر ریّگەی خراپە، کردەوەی خراپەیش پیاو دەخاتە سەر ریّگەی ئاگری دۆزەخ، پیاوی واهەیە ئەوەندە زۆر درۆ دەکاو ئەوەندە منەیی درۆ دەکا، هەتا لەلای خودا بەدرۆزن دەنووسریّ). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٥٤} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٧٥١} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٧، ژمارە: ١٥٣٨ چ/٢}. {بڕوانە: ژمارە: ١٨٠٩ لەدواوە}.

## ١٣٨٠) دووزمان ناچێتە بەهەشت. (٢٨٦ - ٢٨٨)

## بابٌ: لاَ يَدْخُلُ الجنَّةَ قتَّاتٌ

١٨٠٨- عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فِي الْمَسْجِدِ، فَجَاءَ رَجُلٌ حَتَّى جَلَسَ إِلَيْنَا، فَقِيلَ لِحُذَيْفَةَ: إِنَّ هَذَا يَرْفَعُ إِلَى السُّلْطَانِ أَشْيَاءَ. فَقَالَ حُذَيْفَةُ إِرَادَةَ أَنْ يُسْمِعَهُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ». {الحديث: ٢٨٧ =تجريد/٥، لاپەڕە: ٢١٤، چ/١، رقم: ١٩٣٩ = ٦٠٥٦، ٥٧٠٩ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٤٨٧١. ترمذي. بروصلة: ٢٠٢٦. تحفة الأشراف: ٣٣٨٦}:

هەممامی کوڕی حاریث (رەحمەتی خودای لیّ بیّ) فەرمووی: جاریّ لەلای حوزەیفە لە مزگەوت دانیشتبووین، پیاویّ لەولاوە هاتو ئەویش لەگەڵمانا دانیشت، عەرزی حوزەیفە کرا: کە ئەم پیاوە قسەو باس دەباتەوە بۆ دەستەلاتداری ولات، کە ئیمامی عوثمانە (رەزای خودای لیّ بیّ). حوزەیفەیش (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی بەکابرا: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) دەیفەرموو: (مرۆی دوو زمان دوو پیّی ناچێتە ناو بەهەشت!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٧٤٨. ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٧، ژمارە: ١٥٣٦ چاپی دووەم}.

## ١٣٨١) باسی دوو ڕووو - بابٌ: في ذي الوجهين

بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: (١٧٤٤) کە لەزنجیرە: ١٣٢٦ دا ڕابورد، لەپیشەوە لەم پەڕاوە پیرۆزەدا.

## ١٣٨٢) باسی ڕاستیو درۆ، کە یەکەم چەند جوانەو دووەم چەند ناشیرینە. (٦٥٨٠ - ٦٥٨٣)

## بابٌ: في الصِّدْقِ وَالكِذْبِ

١٨٠٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ، وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا. وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ، حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا». {الحديث: ٦٥٨١ = ٦٥٩٧ فم}:

ئەم فەرموودەیە بە تەواوی، وەرگەڕاوە کوردییەکەی لە ژمارە: (١٨٠٧)دا ڕابورد.

## ١٣٨٣) درۆی ڕەوا. (٦٥٧٦ - ٦٥٧٨)

## باب: مَايَجُوزُ فِيهِ الكَذِبُ

١٨١٠- عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عُقْبَةَ بْنِ أَبِى مُعَيْطٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ اللاَّتِى بَايَعْنَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ)، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) وَهُوَ يَقُولُ: «لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِى يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ وَيَقُولُ خَيْرًا وَيَنْمِى خَيْرًا». قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَلَمْ أَسْمَعْ يُرَخَّصُ فِى شَىْءٍ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ كَذِبٌ إِلاَّ فِى ثَلاَثٍ: الْحَرْبُ، وَالإِصْلاَحُ بَيْنَ النَّاسِ، وَحَدِيثُ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ، وَحَدِيثُ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا. وَفِي رِوَايَةٍ قَالَتْ: وَلَمْ أَسْمَعْ يُرَخَّصُ فِى شَىْءٍ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ إِلاَّ فِى ثَلاَثٍ. {الحديث: ٦٥٧٦ = ٦٥٩٣ فم. تجريد البخاری بالکوردی/٣، رقم: ١١٢٦ = ٢٦٩٢. أبو داود. أدب: ٤٩٢٠. ترمذي. بروصلة: ١٩٣٨. تحفة الأشراف: ١٨٣٥٣}:

ئوم كولثومی كچی عوقبەی كوڕی ئەبو موعەیط (رەزای خودای لێ بێ) كە یەكێ بوو لەژنە كۆچكارە پێشینەكان، كە پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) {بڕوانە: ژمارە: ٤٢٨ لەپێشەوە}.

فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم بیست، دەیفەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): (بەو كەسە ناگوترێ درۆزن، كە میانەی خەڵك ڕێك دەخاو، قسەی باش لەنێوانیاندا دەهێنێو دەبا، بەنیازی نێوان ڕێكخستنیان‌و نێوان خۆش بوونیان‌و بە مەبەستی ئاشتكردنەوەیان، با ئەو قسانەیش كە لەو بەینەدا دەیانكات، خۆی دروستیان بكات!).

ئیبنو شەهاب – واتە: ئیمامی زوهری – دەفەرموێ: نەم بیستووە لەكەس، كە مەردوم ڕێگەی درۆكردنیان پێ بدرێ، مەگەر لەم سێ شتەدا:

١- بۆ جەنگ.

٢- ڕێكخستنی نێوانی خەڵك.

٣- قسەی خۆشی ژن‌و پیاو، كە لەنێوانی خۆیانا دوو بەدوو دەیكەن، بۆ ڕابواردن‌و نێوان خۆشكردن.

لە گێڕانەوەی ژمارە (٦٥٧٧)دا:ئوم كولثوم فەرمووی: نەم بیستووە لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كە مۆڵەتی درۆكردن بەكەس بدا مەگەر بۆ ئەم سێ مەبەستە: جەنگ‌و نێوان ڕێكخستن‌و قسەی خۆشی نێوانی ژن‌و مێرد بۆ یەكتری). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٤٩ + ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ١، ٢، ٣، + تاج/٣، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ٢٤٩٦} + {تاج/٥، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٤٨٢٣ چ/٤}.

**ڕوونكردنەوە:**

ئوم كلثوم لە موسوڵمانە هەرە پێشینەكانە، پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، لەساڵی حودەیبییەدا لە مەككەوە بەپێ، كۆچی كرد بۆلای پێغەمبەر لەمەدینە، كەهات مێردی نەبوو، زەیدی كوڕی حاریثە مارەیكرد، كە زەید شەهید بوو زوبەیری كوڕی عەوام مارەیكرد، كچێكی لە زوبەیر بوو ناوی زەینەب بوو، لەپاش

زوبەیر شوویکرد بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، لەویش کوڕێکی بوو ناوی ئیبراهیم بوو، کە ئەوڕەحمان مرد، شوویکرد بە عەمری کوڕی عاص، یەك مانگ لەلای ما ئیتر ئوم کلثوم عەمری خودای کرد.

**١٣٨٤) پێشگیریی لە بانگەوازی سەردەمی نەفامی.** (٦٥٢٥ - ٦٥٢٧)

**بَابُ: النَّهْيُ عَنْ دَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ**

**١٨١١- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) فِي غَزَاةٍ فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا لَلأَنْصَارِ، وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «مَا بَالُ دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ»؟! قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ. فَقَالَ: «دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ». فَسَمِعَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَقَالَ: قَدْ فَعَلُوهَا؟! وَاللَّهِ: لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. قَالَ عُمَرُ: دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ: «دَعْهُ لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ». {الحديث: ٦٥٢٦ = ٦٥٤٣ فم. بخاري. تفسير: ٤٩٠٥، ٤٩٠٧ فتح الباري. ترمذي. تفسير القرآن/٣٣١٥. تحفة الأشراف: ٢٥٢٥}:**

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لە غەزای تەبووکا لەخزمەتی حەزرەتدا بووین** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پیاوێ لە کۆچکاران، شەقێکی هەڵدا لە پیاوێکی ئەنصاری، ئەنصارییەکەیش وەك کاتی سەردەمی نەفامی (جاهیلییەت) هاواری کرد: ئەی کۆمەڵەی ئەنصار! هاوار، فریام کەون!!**

**کۆچکارەکەیش هاواریکرد: هاوار! ئەی کۆمەڵەی کۆچکاران! فریام کەون!!**

**پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کە لەکارەکە ئاگادار بوو، فەرمووی: (ئەم بانگەوازو هاتو هاواری خووی سەردەمی نەفامیو نەزانییە چییە زیندووی دەکەنەوە!!؟).**

**عەرزیانکرد: قوربان! مەسەلەکە ئاوایە: ئەم پیاوە کۆچکارە شەقێکی هەڵدا لەو پیاوە ئەنصارییەو ئیتر بوو بەم هاتو هاوارە. فەرمووی: (ئەم جۆرە بانگەوازە، کە**

لەرەفتاری بەدی سەردەمی نەفامییە وازی لێ بهێنن، چونکە بەڕاستی کاری چەپەڵو بۆگەنە).

جا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، کە سەرۆکی ناپاکان بوو، ئەمەی بەرگوێ کەوتو بەهەلی زانیو گوتی: ئاوای لێ هات، کۆچکاران ئەمەشیان کرد! دەسا بەو خودایە، کاتێ گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، کێمان ئازاو بە دەسەڵات بێ، لە ئێمەو لە کۆچکارانی شاری مەدینە، بە کونیو بێ دەسەڵاتەکانمان چۆڵ دەکەین!

کاتێ ئەم باسو خواسو قسە ژەهراوییە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزرەتی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) هەڵسایە سەرپێ، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لێم گەڕێ بابدەم لەگەردنی ئەم دوو رووی ناپاکە. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (وازی لێ بهێنە، با خەڵك نەڵێن: موحەممەد، وەفای بۆ کەس نییە، ئەوەتانێ هاوەڵو هاوڕێکانی خۆی دەکوژێ!). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤١٧٠} + {ژمارە: ١٨٣٢ کە لەدواوە دێ لە زنجیرە: ١٣٩٧دا}.

## ١٣٨٥) نەهیکردن لە شەڕە جنێوو جمێندان بە یەکتری. (٦٥٣٤)

## باب: النهيُ عَنِ السِّبَاب

١٨١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالاَ، فَعَلَى الْبَادِئِ مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ». {الحديث: ٦٥٣٤ = ٦٥٥١ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گوناهی شەڕە جمێن، کە لەنێوانی دوو کەسدا رودەدا، هەرچی دەڵێن، گوناهەکەی بەملی ئەوەیانە کە لەپێشەوە جمێنەکە دەست پێ دەکا، بەمەرجێ ناهەقی لێکراوەکە پێی لێ هەڵ نەبڕێو پتر لە مافی خۆی جمێنی پێ نەدا). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٦٦، ژمارە: ١٥٦١}.

## ١٣٨٦) نەهیکردن لە جنێودان بە ڕۆژگار. (٥٨٢٣ - ٥٨٧)
## بابٌ: النَّهْيُ عَنْ سَبِّ الدَّهْرِ

١٨١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَقُولُ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَلاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَإِنِّي أَنَا الدَّهْرُ، أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ، فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا». {الحديث: ٥٨٢٥ = ٥٨١٨ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٤، رقم: ١٦٩٤ = ٤٨٢٦، ٦١٨١، ٧٤٩١}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئادەمیزاد ئازاری من دەدات، کاتێ جنێو بە چەرخ‌و گەردوون دەدات، وەك کاتێ هەست بە ئێش‌و ئازارێ دەکا، لەداخی دڵی خۆی نا سوپاسی دەکاو دەڵێ: داخ لەدەست زەمانە، ئەی فەلەك واوات لێ بێ، ئەی گەردوونی چەپگەرد! ئەی ڕۆژگاری ناهەموار نائومێد خۆت!

دەی باکەستان ئەم جۆرە قسانە نەکاو نەڵێ: ئەی فەلەك! کۆستت کەوێ، بەشت نائومێدی بێ، چونکە گەردوون، یا فەلەك، یا چەرخ، یا ڕۆژگار، هیچی بەدەست نییە، ئەوەی کە ئێوە دەیدەنە پاڵ گەردوون‌و ڕۆژگارو دەڵێن: گوایە هەموو کاروباری، چەرخ‌و گەردوون هەڵی دەسووڕێنێ ئەوە وانییە، بەڵکوو من خۆم هەموو شتێ هەڵ دەسووڕێنم، گەردوون وەك هەموو شتێکی تر من دروستم کردووە، ئەو چی بەدەستە، هەموو کارێ بەدەستی خۆمە، خۆم ئەم شەوو ڕۆژەم دروست کردووە، خۆم تاوتوویان دەکەم‌و بەردەوام، بە شێوەیەکی ڕێك‌و پێك، بەشوێنی یەکا دەیانهێنم‌و دەیانبەم! وە هەرکاتێ ئارەزوو بکەم دەیان پێچمەوەو نایانهێڵم). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٤٠٩١ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

وشەی ڕۆژگارو چەرخ‌و گەردوون‌و فەلەك، هەر یەکەیان بەپێی دانانی زمان‌و زمانەوانی، واتای تایبەتی خۆی هەیە، لەسەر ڕووی ڕاستینە، بەڵام لەهەمان کاتا، بە مەجازیش بەزۆر واتای تر دەگوترێن‌و هەر لەکۆنەوە گلەیی‌و سەر زەنشت‌و

سەركۆنە لە چەرخو گەردوونو زەمانەو رۆژگاری رەشو چەرخی چەپگەرد كراوەو دەكرێ. وە لەم لایەنەوە زانایان دەفەرموون:

١- بیرو باوەڕو رەفتاری سەردەمی نەفامی، بەشێوەیەكی سەرەكی دەبن بەدوو بەشەوە:

بەشی یەكەم: هەڵەی رووتەو ئیسلام قەدەغەو نادروستی كردووەو بەهیچ شێوەیێ دروست نییە، كاری پێ بكرێ، وەك: فرە خواییو كاریگەری بورجو ئەستێرەو فاڵچێتیو پەرستنی بتو دارو بەردو خۆرو مانگ یا وەك: مارەكردنی خوشكو باوەژنو مەحرەمو ژنهێنانی بێ سنوور، یا وەك: خواردنی سوودو قومارو ئارەقو خوێنو مردارو زیندە بەچاڵكردن!

بەشی دووەم: فرە واتایە، واتای جیا جیا هەڵ دەگرێ، ئەمانەیش وەك جنێودان بە زەمانەو بە رۆژگارو بەگەردوون، یا وەك: حەجو عەمرەو ژنهێنانو ژن تەڵاقدانو ظیهارو رێزی مانگەكان.

ئەم بەشەیان بەواتای سەردەمی نەفامی، لە ئیسلاما نادروستو تاوانو ناڕەوان، وەك: كەسێ باوەژنی خۆی مارەبكا بۆ خۆی، یا كار بە ئەزلام بكا، یا هاموو شۆی فاڵچیو كۆڵەنانیو فالگرەوە بكاو باوەرشی پێ بكا، یا بەبێ شمار ژنی خۆی تەڵاق بداو دوایی بیگێرێتەوە بۆ ژێر ركێفی خۆی، یا ژن بەژن بكا لەسەر شێوازی نەفامی. بەڵام ئەم بەشەیان هەیانە بە شێوازێكی تر، ئیسلام چەسپاندوویەتی، وەك حەجو عەمرەو تەوافی ماڵی خواو مارەو تەڵاقو كەلەپوور گرتنو خواردنی گۆشتو ئاژەڵ سەربڕین لەسەر شێوازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، نەك لەسەر شێوازی كۆنی كاتی نەفامی!

كەواتە: ئەم بەشەیان بە واتە كۆنەكەو لەسەر شێوازە نەفامییەكە ناڕەواو نادروستە، بەڵام لەسەر شێوازە نوێ ئیسلامییەكە، دروستە، بگرە زۆرجار پێویستو واجبە، وەك حەجو عەمرە، یا سوننەتە وەك: ژنهێنانو خەڵوە كێشانو خزمەتی ماڵو میوان، گەلێ جاریش رەوایە، نە پێویستە، نە سوننەتە، وەك مەبەست لە

زەمانەو گەردوون و ڕۆژگارو چەرخ! چەپاڵەی ڕەشی ستەمكاریی و هانە بردنە بەر خودایی، كەخودا هەقت لەناهەقیكار بستێنێ.

مەحوی لەم ڕوانگەوەو لەم بوارەدا دەفەرموێ:

زەمانـــەی ســـوفلە پـــەروەر، وا ڕەواجـــی ســـوفلەیی داوە
كـە دائـیم ئـەو دەمـە سوێرە لەگـەڵ نـان و نمـەك دەدوا

یا دەفەرموێ:

مومەییز چەرخی كە چڕەوبێ، نەكـەی (مـەحوی) كـەماڵت خـەرج
زوبـانی تیغـی ئـەو دەرحـەق بـە حـەرفی مـن لـە حـەك دەدوێ!

منیش لە سكاڵای حاڵا دەڵێم:

ئـــەی كـــوردی بێكـــەس! ئـــای بێكەســـی تـــۆ
بـــۆمن بووەتـــە خـــەمی كـــۆن و نـــۆ
بـــووی بـــەگۆی مەیـــدان ڕۆژگـــاری نامـــەرد
پێـــت دەكـــا شـــەقێن، بەدارشـــەقی بـــەرد
ڕۆژێ ئینگلیـــــزو ڕۆژێ ئـــــەمریكا
ڕۆژێ كـــوردی خـــۆت یاریـــت پـــێ دەكـــا
گـــەر دەســـتم دەڕۆی بەســـەر ڕۆژگـــارا
ڕۆژی هـــەزارجار دەمكـــرد بـــەدارا!
واقـــی وڕمـــاوم بۆچـــی زەمانـــە
هەمیشـــە پیشـــەی دژی ویژدانـــە
خوایـــە! بیـــبڕی ئـــەم گوزەرانـــە
دەڵێـــی ڕزقمـــان بەدەســـت شـــەیتانە

١٨١٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «لاَ تَسُبُّوا الدَّهْرَ، فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الدَّهْرُ». {الحديث: ٥٨٢٧ = ٥٨٢٠ فم} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (جمێن بەڕۆژگار مەدەن، چونكە خودا خۆی ڕۆژگارە!).

**ڕوونكردنەوە:**

نەوەوی لەشیكردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا، دەفەرموێ: (واتە: جمێن بەبكەری كارەساتەكان مـەدەن، چـونكە ئەگـەر جمـێن بـە بكـەری كارەســاتەكان بـدەن، جمێنەكەتان دەچێتەوە بۆ خودا، چونكە خودا بكەری كارەساتەكانە).

### ١٣٨٧) نەییکردن لە رووکردنی چەك لەبرای موسوڵمان. (٦٦٠٩ - ٦٦١١)

### بَابٌ: النَّهْىُ أَنْ يُشِيرَ الرَّجُلُ إِلَى أَخِيهِ بِالسِّلاَحِ

١٨١٥- عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «لاَ يُشِيرُ أَحَدُكُمْ إِلَى أَخِيهِ بِالسِّلاَحِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِى أَحَدُكُمْ لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِى يَدِهِ فَيَقَعُ فِى حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ». {الحديث: ٦٦١١ = ٦٦٢٧ فم. تجريد البخارى بالكوردى/ ٥، لاپەڕە: ٣٥٦، رقم: ٢٠٩٦ = ٧٠٧٣ فتح البارى}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (ئەی موسوڵمانینە! نە بەڕاستو نە بەدرۆ، کەستان رووی چەك مەکەنە برای ئایینی خۆتان، چونکە دوور نییەو رێی تێدەچێ کە شەیتان هەڵەیەکی پێ بکاو، لەدەستی دەربچێو براکەی بپێکێو، بەهۆی ئەوەوە رەهەنەی ناو ئاگردانی دۆزەخ ببێ!). {ریاضی صالحین/٤، لاپەڕە: ١٦٥، زنجیرە: ٢٥٧، ژمارە: ١٧٨٣} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٣٧ چ/٤} + {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٣٥٧، ژمارە: ٢٤٨}.

### ١٣٨٨) دەست گرتن بەنووکی تیرەوە لەناو مزگەوتا. (٦٦٠٤ - ٦٦٠٨)

### بَابٌ: فِي إِمْسَاكِ السِّهَامِ بِنِصَالِهَا فِي المَسْجِدِ

١٨١٦- عَنْ جَابِرِ بْنُ عَبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): أَنَّهُ أَمَرَ رَجُلاً كَانَ يَتَصَدَّقُ بِالنَّبْلِ فِى الْمَسْجِدِ أَنْ لاَ يَمُرَّ بِهَا إِلاَّ وَهُوَ آخِذٌ بِنُصُولِهَا. {الحديث: ٦٦٠٦ = ٦٦٢٢}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ، لەناو مزگەوتا دەمە تیری دەبەخشیەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێی کرد: کە لەکاتی وادا بادەست بگرێ بە نووکەکانیەوە). {تاج/١، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٧٢٤ چ/٤}.

١٨١٧- عَنْ أَبِى مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِى مَجْلِسٍ أَوْ سُوقٍ وَبِيَدِهِ نَبْلٌ فَلْيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا، ثُمَّ لِيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا، ثُمَّ لِيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا». قَالَ: فَقَالَ أَبُو مُوسَى: وَاللَّهِ مَا مُتْنَا حَتَّى سَدَّدْنَاهَا بَعْضُنَا فِى وُجُوهِ بَعْضٍ. {الحديث: ٦٦٠٧ = ٦٦٢٣ فم}:

**ئەبو مووسا** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (ئەگەر کەسێکتان چەكو تیرو شیرو نێزەو شتی تری وەهای پێ بوو، وە ڕۆیشت بۆ کۆڕو دانیشتنگاکان، یا چوو بۆ بازاڕ، بادەستی بگرێ بەنووکەکەیەوە). سێ جار خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕستەی (بادەستی بگرێ بە نووکەکەیەوە) دووبارە کردەوە، فەرمووی: ئەوجا ئەبو موسا فەرمووی: خۆ دەبینن کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەندە دەربەستی ئەوە بوو، کە ئێمە بە هەڵەیش خوێنی یەکتری نەڕێژین و لەم جۆرە کاتانەدا بەچەك ئازاری یەکتری نەدەین، کەچی بەداخەوە، ئەوەتا نەمردین، هەتا لەم شەڕی ناوخۆیەدا، لەپاش شەهیدبوونی عوثمان، رووی چەکمان کردە یەکتری و چەکەکانمان ئاڕاستەی سینگی خۆمان کرد).

**ڕوونکردنەوە:**

لە تەجریدی بوخاریدا، وەرگەڕاوە کوردییەکەی دەفەرموێ:

(دیارە کە چەکی نوێش، وەك تفەنگو دەمانچەو شەستیرو گشت جۆرە چەكو تەقەمەنییەکی تریش، هەمان بڕیاری بۆ هەیە، مەبەست لەدەست گرتن بەنووکی شیرو تیرو نێزەوە، نموونە هێنانەوەیە، بۆ پاراستنی خەڵك لەزیانی ئەم جۆرە چەکانە، دەنا مەبەست قەید نییە، چونکە ئەگەر قەید بێ، بەغەیری دەست پێوەگرتن چاری نییە، کەواتە: پاراستنی ئادەمیزاد لە زیانی چەك، وەك: دەمانجەو تفەنگو مین و نارنجۆكو شتی وا، بەوە دەبێ کە زامنەکەی دابخەی، یا خاڵی بکەیتەوە لە تەقەمەنی).

### ١٣٨٩) نەییکردنی لە لێدانی دەمو چاو. (٦٥٩٤ - ٦٥٩٩)

### بابٌ: النَّهْيُ عَنْ ضَرْبِ الْوَجْهِ

١٨١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلاَ يَلْطِمَنَّ الْوَجْهَ». {الحديث: ٦٥٩٦ = ٦٦١٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٠٩٣ = ٢٥٥٩ فم. تحفة الأشراف: ١٢٧٩٦} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاتی شەڕو شۆڕو ناکۆکیو تەمێ کردنو شتی وادا، کە گەڵێ جار لەنێوانی ئێوەو برای ئایینی خۆتانا روودەدا، خۆتان بپارێزن لە لێدانی روخساری لێدراوەکە، بەتایبەتی ئەگەر بۆ تەمێو تەسکینیو شتی وا، لە نۆکەرو مناڵو خوار دەستی خۆتاندا). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٢٣٨٣}.

١٨١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيَجْتَنِبِ الْوَجْهَ، فَإِنَّ اللَّهَ خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ».
{الحديث: ٦٥٩٨ = ٦٦١٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر شەڕتان بوو لەگەڵ برای ئایینی خۆتانا، لەرووی مەدەن، چونکە خودای گەورە ئادەمی دروست کردووە لەسەر شێوەی خۆی!).

**روونکردنەوە:**

هەندێ وشەو رستە هەن، کە هەم بۆ خوداو، هەم بۆ ئادەمیزادو هەم بۆ شتی تر بەکاردەهێنرێن، وەك: دەستو پێو روخسارو چاوو نەفسو رۆحو ئەندامی تر.

کورتو پوخت، بەکوردی پەتی: ئێمە بڕوامان بەم زاراوانە هەیە، بەپێی مەبەستی خودای گەورە لێیان، وە خۆمان بەم جۆرە شتانەوە زۆر خەریك ناکەین، چونکە پێش هەموو شتێ ئێمە بیرو باوەڕمان وایە کە هیچ شتێ لەوێنەو لەشێوەی خودا نییە!

### ١٣٩٠) هەڕەشە کردن لە نەفرینو نەحلەتکردن لە ئاژەڵ. (٦٥٤٧ - ٦٥٥٦)
### باب: فِي لَعْنِ الْبَهَائِمِ وَالتَّغْلِيظ فِيه

١٨٢٠- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ وَامْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ عَلَى نَاقَةٍ، فَضَجِرَتْ، فَلَعَنَتْهَا، فَسَمِعَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ)، فَقَالَ: «خُذُوا مَا عَلَيْهَا، وَدَعُوهَا فَإِنَّهَا مَلْعُونَةٌ».

قَالَ عِمْرَانُ: فَكَأَنِّى أَرَاهَا الآنَ تَمْشِى فِى النَّاسِ مَا يَعْرِضُ لَهَا أَحَدٌ. {الحديث: ٦٥٤٧ = ٦٥٦٤ فم}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە سەفەرێکا، لەخزمەتی حەزرەتدا بووین، ژنێکی ئەنصاری سواری وشترە مێنگەیێ بوو، بەدەستیەوە وەڕس بوو، ئەوەندە لاساری دەکرد، لەبەرئەوە ژنەکە لەعنەتی لە وشترەکە کرد.

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کورتانو جلو بارەکەی لێ بکەنەوەو بەرەڵای بکەنو وازی لێ بهێنن، چونکە ئەو وشترە لەعنەت لێکراوە!).

عیمران دەیفەرموو: ئێستایش هەر دەڵێی ئەو وشترەم لەبەرچاوە کە بەناو عەشاماتەکەدا دەسووڕایەوە، کەسیش لاقەی نەدەکرد هەقی نەبوو بەسەریەوە! {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٢٦٤، ژمارە: ١٥٥٧، ١٥٥٨ + تاج/٤، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٤٤٠٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٣٩١) فرە ناباشە کەپیاو نەفرینکەربێ. (٦٥٤٧ - ٦٥٥٦)
## باب: الكراهِيَةُ لِلرَّجُلِ أَنْ يَكُونَ لَعَّاناً

١٨٢١- عَنْ أَبِى الدَّرْدَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) يَقُولُ: «إِنَّ اللَّعَّانِينَ لاَ يَكُونُونَ شُهَدَاءَ وَلاَ شُفَعَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث: ٦٥٥٣ = ٦٥٧٠ فم}:

ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەفرینکەران لەڕۆژی دوا رۆژدا، نەپایەی شەهیدانو نە پایەی تکاکارانیان پێ نادرێ). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٦٤، ژمارە: ١٥٥٤ ج/٢ = چاپی دووەم}.

١٨٢٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ عَلَى الْمُشْرِكِينَ. قَالَ: «إِنِّى لَمْ أُبْعَثْ لَعَّانًا وَإِنَّمَا بُعِثْتُ رَحْمَةً». {الحديث: ٦٥٥٦ = ٦٥٧٣ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا: قوربان! نزای شەڕبکە لە موشریكو هاوەڵ پەیداکەرەکان بۆ خودا. فەرمووی: (لەڕاستیدا شتی وا لە رەوشتی منەوە دوورە، نەفرەتکردن لە خەڵك لەمن ناوەشێتەوە، من خودا بۆ شتی وا رەوانەی نەکردووم، بەڵکوو بۆ ئەوە کردوومی بە

پێغەمبەرو رەوانەی کردووم بۆسەر ئێوە هەتا ببم بەمایەی سۆزو رەحمەتو میهرەبانیی بۆتان). {تاج/٥، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٤٧٩٦}.

### ١٣٩٢) باسی کەسێ بەناڕەوا تانەی خراپبوون لە خەڵك بدا. (٦٦٢٦ - ٦٦٢٧)

### باب: في الذي يقولُ هَلَكَ الناس

١٨٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِذَا قَالَ العبد: هَلَكَ النَّاسُ فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ»، قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: (وهو ابن محمد بن سفيان) لاَ أَدْرِي «أَهْلَكَهُمْ» بِالنَّصْبِ أَوْ «أَهْلَكُهُمْ» بِالرَّفْعِ. {الحديث: ٦٦٢٦ = ٦٦٤٢ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو کەسەیەی کەهەر لەخۆیەوە بە ناڕەوا حەزی لەشکاندنی خەڵکەو دەڵێ: خەڵك خراپ بوون، خەڵك بە فەتارەت چوون، ئەوە خۆی لەهەموویان خراپترو سەرتیاچووترە). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٤٧٩٠ چ/٤}.

### ١٣٩٣) ئەوانەی شت زۆر قووڵ دەکەنەوە تیادەچن. (٦٧١٧ - ٦٧٢٥)

### بابٌ: هَلَكَ المتنطعُونَ

١٨٢٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَسْعُود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ». قَالَهَا ثَلاَثًا. {الحديث: ٦٧٢٥ = ٦٧٤٠ فم}:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سێجار لەسەر یەك فەرمووی: (ئەوانەی شت زۆر قووڵ دەکەنەوەو لە گوتارو کردارا سنوور دەبەزێنن، سەریان تیادەچێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٤٨٧٧}.

**١٣٩٤) نزاو دووعای شەڕی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئیمانداران، دەبێتە مایەی پاکەوەبوونو سۆزو میهرەبانی بۆیان. (٦٥٥٧ - ٦٥٧٢)**

**بابٌ: فِي جَعْلِ دُعَاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى المؤْمِنِينَ زَكَاةً وَرَحْمَةً**

١٨٢٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّه (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) رَجُلَانِ، فَكَلَّمَاهُ بِشَيْءٍ لاَ أَدْرِي مَا هُوَ؟ فَأَغْضَبَاهُ، فَلَعَنَهُمَا وَسَبَّهُمَا، فَلَمَّا خَرَجَا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَنْ أَصَابَ مِنَ الْخَيْرِ شَيْئًا، مَا أَصَابَهُ هَذَانِ. قَالَ: «وَمَا ذَاكِ»؟ قَالَتْ: قُلْتُ: لَعَنْتَهُمَا وَسَبَبْتَهُمَا! فَقَالَ: «أَوَمَا عَلِمْتِ مَا شَارَطْتُ عَلَيْهِ رَبِّي؟ قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، فَأَيُّ الْمُسْلِمِينَ لَعَنْتُهُ أَوْ سَبَبْتُهُ فَاجْعَلْهُ لَهُ زَكَاةً وَأَجْرًا». {الحديث: ٦٥٥٧ = ٦٥٧٤ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٨٧ = ٦٣٦١ فتح الباري}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو پیاو هاتن بۆماڵەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەشتێ کە نازانم چی بوو، قسەیان لەگەڵدا کرد، پێغەمبەریان تووڕە کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفرینو نەحلەتی لەهەردووکیان کردو جمێنی پێیاندا، کە دوو پیاوەکە لە خزمەتی دەرچوون، عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! هەموو کەسێ لەخزمەتی تۆدا، ئەگەر لە خێر بێبەش نەبووبێ، هەرکەسێ بووبێ، بەڵام ئەم دوانە لە خزمەتی تۆدا ئەوەی خێربێ دەستیان نەکەوت، بەڵکوو بەر نەفرینو جمێنی تۆ کەوتن!

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بۆچی لەبەرچی؟) عەرزیم کرد: لەبەرئەوە کە نەفرینت لەم دوانە کردو جمێنت پێیاندا. فەرمووی: (ئەدی نازانی کەمن مەرجم کردووە لەگەڵ خودای خۆماو بەڵێنم لێی وەرگرتووە؟ عەرزی پەروەردگاری خۆمم کردووە: پەروەردگاری نازدارم! بەڵێن بێ لەتۆی وەردەگرم، تۆقەت لە بەڵێنی خۆت پەشیمان نابیتەوە، پەروەردگارا! تۆ خۆت باش دەزانیت: کەمنیش هەر مرۆڤو ئادەمیزادم، گەلێ جار تووڕە دەبمو لەسەر تووڕەیی نزای خراپ لەیەکێ لەگەلی موسوڵمانی خۆم دەکەم، یا ئازارێکی دەدەم، جا داوات لێ دەکەم کە بەڵێنم پێ بدەیت: کە هەر موسوڵمانێ، لەبەر هەر هۆیێ نەفرەتو نەحلەتم لێکرد، یا جمێنێکم داپێی، یا جەڵدەم لێیدا، یا هەر جۆرە ئازارێکی ترمدا، وە ئەو موسوڵمانە

شایستەی ئەوە نەبوو، ئەوا ئەو ئازاردانو جمێنو قسەیەی منەی، بۆبکە بە مایەی پاکەوە بوون لە تاوانو، بە نوێژو زەکاتو پاکەوەکەری گوناهو، بیکە بەهۆی نزیکبوونەوەی ئەوکەسە لە سۆزو میهرەبانیو رەحمەتی خۆتەوەو، بیکە بەهۆی پاداشی باشی گەورە بۆی لەرۆژی قیامەتدا، پەروەردگاری گەورەم ئەم بەڵێنەی داپێم!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٥٠٣٩}.

**روونکردنەوە:**

١- لە بەکوردی کردنی ئەم فەرموودەیەدا، بەهرە لەهەموو گێڕانەوەو شەرحە گەورەکان وەرگیراوە، سوپاس بۆ خودا.

٢- بەپێی ئەم فەرموودەیە، وەك لە فەتحولمولهیمدا ئاماژەی بۆ دەکا، دەبێ موسوڵمان خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بکا بەپێشەواو سەر مەشقو، وەك ئەو، لەکاتی پاڕانەوەدا، عەرزی پەروەردگاری خۆی بکا: (خودایە! هەر نزایەکی شەڕ لەخۆم، یا لەماڵو منالم، یا لە دۆستو برادەرم، یا لەدەرو دراوسێم، یا لەهەر موسوڵمانێکی تر دەکەم، یا لە ولاتو گەلو نیشتمانو نەتەوەی خۆم دەکەم، یا نەفرینو نەحلەتی لێ دەکەم، گیرای نەکەیتو بەڵکوو بۆی بکەی بەمایەو هۆی پاداشی باشی لای خۆت لەهەردوو جیهانا). ئامین. خودایە. {٢١/ رەمەزانی/١٤٣٢ کۆچی. بەرابەر بە ٢٠١٠/٨/٣١ زاینی}.

١٨٢٦- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَتْ عِنْدَ أُمِّ سُلَيْمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) يَتِيمَةٌ، وَهِيَ أُمُّ أَنَسٍ، فَرَأَى رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) الْيَتِيمَةَ، فَقَالَ: «آنْتِ هِيَهْ؟ لَقَدْ كَبِرْتِ لاَ كَبِرَ سِنُّكِ». فَرَجَعَتِ الْيَتِيمَةُ إِلَى أُمِّ سُلَيْمٍ تَبْكِي، فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: مَا لَكِ يَا بُنَيَّةُ؟ قَالَتِ الْجَارِيَةُ: دَعَا عَلَيَّ نَبِيُّ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَنْ لاَ يَكْبَرَ سِنِّي، فَالآنَ لاَ يَكْبَرُ سِنِّي، أَوْ قَالَتْ: قَرْنِي، فَخَرَجَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ مُسْتَعْجِلَةً تَلُوثُ خِمَارَهَا حَتَّى لَقِيَتْ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ)، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «مَا لَكِ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ»؟ فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللّهِ أَدَعَوْتَ عَلَى يَتِيمَتِي؟ قَالَ: «وَمَا ذَاكِ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ؟». فَقَالَتْ: زَعَمَتْ أَنَّكَ دَعَوْتَ أَنْ لاَ يَكْبَرَ سِنُّهَا، وَلاَ يَكْبَرَ قَرْنُهَا. قَالَتْ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) ثُمَّ قَالَ: «يَا أُمَّ سُلَيْمٍ أَمَا تَعْلَمِينَ أَنَّ

شَرْطِي عَلَى رَبِّي؟ أَنِّي اشْتَرَطْتُ عَلَى رَبِّي فَقُلْتُ: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَرْضَى كَمَا يَرْضَى الْبَشَرُ، وَأَغْضَبُ كَمَا يَغْضَبُ الْبَشَرُ، فَأَيُّمَا أَحَدٍ دَعَوْتُ عَلَيْهِ مِنْ أُمَّتِي بِدَعْوَةٍ لَيْسَ لَهَا بِأَهْلٍ أَنْ تَجْعَلَهَا لَهُ طَهُورًا وَزَكَاةً وَقُرْبَةً يُقَرِّبُهُ بِهَا مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». وَقَالَ أَبُو مَعْنٍ: (يُتَيِّمَةٌ) بِالتَّصْغِيرِ فِي الْمَوَاضِعِ الثَّلَاثَةِ. {الحديث: ٦٥٧٠ = ٦٥٨٧ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کچۆڵەیەکی هەتیو، لەلای دایکم بوو، کە ناسراوە بە ئوم سولەیم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە بچکۆلەیی دەیبینێ، لەپاش ماوەیێ کە دەیبینێتەوە، خەریکەبێ نەیناسێتەوە، وا کچۆڵەکە درێژ بووەو هەڵچووە، لەبەرئەوە دەفەرموێ: (ئەوە تۆ ئەویت، بەراستی گەورە بوویت، ئەی پێ نەگەیت!).

جا کچۆڵەکە بەگریانەوە دەگەڕێتەوە بۆلای ئوم سولەیمی دایکم، دایکم پێی دەڵێ: کچم چیتە، بۆچی دەگریت؟ کچۆڵەکە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نزای تەمەن کورتی لێ کردم، کەواتە قەت تەمەن درێژ نابم و تەمەن کورت دەبم، بۆئەوە دەگریم.

ئوم سولەیم بەپەلە خۆی پێچایەوەو چارشێوی گرتەوەو لەچکەکەی ئالان بەسەریەوە، رۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەستی کرد کە ئوم سولەیم ئاسایی نییەو کەمێ شەڵەژاوە، لەبەرئەوە پێی فەرموو: (ئەوە چیتە ئەی ئوم سولەیم! بۆوا مات و پەشۆکاوی؟).

ئوم سولەیم گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا نزای تەمەن کورتیت لەو کچۆڵە هەتیوەی من کردووە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: نزای تەمەن کورتی چی، بۆ شتی وابووە، ئەی ئوم سولەیم! دایکم عەرزی دەکا: بەقسەی خۆی بێ گوایە تۆ نزات لێ کردووە کە تەمەن درێژ نەبێت و فەرمووتە پێی: ئەی پێ نەگەیت، بەکوێدا وا گەورەبوویت!؟

ئوم سولەیم فەرمووی: جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێکەنی لەپاشا فەرمووی: (ئەی ئوم سولەیم! ئەدی نازانی کەمن لەم کات و هەل و مەرجانەدا، مەرجم کردووە لەگەڵ خودای خۆما؟ دەی با ئەو مەرجەت پێ بڵێم و بۆتی روون

بكەمەوە: من مەرجم كردووە لەگەڵ پەروەردگارماو عەرزيم كردووە: خودايە! خۆت دەزانى كە منيش ئادەميزادم، ملكەچم بۆ ئەو بارودۆخە سروشتيانەى كە ئەوان ملكەچن بووى، وەك چۆن هەموو ئادەميزادێ، لەهەندێ شت رازى دەبێو، لە هەندێ شت توورە دەبێ، منيش هەروەها لەهەندێ شت رازى دەبمو، لەهەندێ شت توورە دەبم، رێك وەك ئەوان، دەى خودايە هەركەسێ لەگەلى موسوڵمانى خۆم، نزايەكى خراپم لێ كرد، كە لەڕاستيدا شايانى ئەو نزاى شەڕەى منە نەبێ، دەى خودايە! تۆ لەلاى خۆتەوە ئەو نزا شەڕەى منەى بۆ بكە بە مايەى خاوێنىو پاكىو پيرۆزىو بيكە بە طاعاتو عيبادەت بۆىو لەرۆژى قيامەتا، پايەو پلەى ئەوى لەخۆتەوە پێ نزيك بكەرەوە!).

١٨٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنْتُ أَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ)، فَتَوَارَيْتُ خَلْفَ بَابٍ، قَالَ: فَجَاءَ فَحَطَأَنِى حَطْأَةً، وَقَالَ: «اذْهَبْ، وَادْعُ لِى مُعَاوِيَةَ». قَالَ: فَجِئْتُ فَقُلْتُ: هُوَ يَأْكُلُ. قَالَ: ثُمَّ قَالَ لِىَ: «اذْهَبْ وَادْعُ لِى مُعَاوِيَةَ». قَالَ: فَجِئْتُ فَقُلْتُ: هُوَ يَأْكُلُ، فَقَالَ: «لاَ أَشْبَعَ اللَّهُ بَطْنَهُ». قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: قُلْتُ لأُمَيَّةَ: مَا (حَطَأَنِى)؟ قَالَ: قَفَدَنِى قَفْدَةً. {الحديث: ٦٥٧١ = ٦٥٨٨ فم}:

ئيبنو عەبباس (رەزاى خودايان لێ بێ) فەرمووى: جارێ لەناو مناڵانا وازيم دەكرد، كۆمەڵێ مناڵ بووينياريمان دەكرد، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) تەشريفى هات، منيش شەرمم لێى كرد، لەپشتى دەرگايەكەوە خۆم لێ شاردەوە، بەلام پێغەمبەر پێى زانيم، هات لەپێكى مالى بەناو شانماو فەرمووى: (بڕۆ موعاوييەم بۆ بانگ بكە)، فەرمووى: چووم بۆلاى موعاوييەو فەرمانەكەى پێغەمبەرم پێ راگەياندو هاتمەوە بۆ خزمەتىو عەرزيمكرد: موعاوييە نان دەخوا. پاش كەمێ پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرموويەوە پێم: (بڕۆ موعاوييەم بۆ بانگ بكە). منيش چوومەوەو هاتمەوەو ديسان عەرزيمكردەوە: كە موعاوييە خەرێكى نانخواردنە!

ئەمجارەيان حەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (دەى خودا ورگى تێر نەكا!).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٣- نامەی زۆرو ستەم
## كِتَابُ الظُّلْمِ

{بڕوانە: ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٢٦، لە ژمارە: ٢٠٣وە هەتا ژمارە: ٢٢١ + تەجریدی بوخاری بە کوردی/٣، ژمارە: ١٠٥٧ هەتا ١٠٧٤ + تاج/٥، زنجیرە: ١٠ لەژمارە: ٤٧٢٦}.

### ١٣٩٥) باسی نارەوایی زۆرو ستەم‌و فەرمانکردن بە پاڕانەوەو تۆبە کردن.
### (٦٥١٧ - ٦٥٢٤) بابٌ: فِي تَحْرِيمِ الظُّلْمِ وَالْأَمْرِ بِالإِسْتِغْفَارِ وَالتَّوْبَةِ

١٨٢٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) فِيمَا رَوَى عَنِ اللّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَّهُ قَالَ: «يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلاَ تَظَالَمُوا، يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ، يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ، فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ، يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ، فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ، يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ، يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي، يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا، يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا، يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ، يَا عِبَادِي إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ، أُحْصِيهَا لَكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللّهَ عَزَّ وَجَلَّ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ». قَالَ سَعِيدٌ: كَانَ أَبُو إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِيُّ إِذَا حَدَّثَ بِهَذَا الْحَدِيثِ جَثَا عَلَى رُكْبَتَيْهِ. {الحديث: ٦٥١٧ = ٦٥٣٢ فم}:

ئەبو زەڕ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا: خودای پیرۆزو گەورە دەفەرموێ: ئەی عەبدەکانم! من

زوڵم و زۆرو ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردووەو، لەناو ئێوەیشا حەرامم کردووە، کەواتە ئێوە زۆرو ستەم لەیەکتری مەکەن، ئەی بەندەکانم! ئێوە هەمووتان سەرلێشێواوو گومڕان، مەگەر ئەوانەتان کەمن خۆم بیخەمە سەر ڕێگەی راستو ڕێی هەقی پێ نیشان بدەم، کەوایە داوای ڕێنموونیو ڕێنمایی هەر لەخۆم بکەن، هەتا ڕێنماییتان بکەم، ئەی بەندەکانم! هەمووتان ڕەشو رووتو برسین، ئەوانەتان نەبێ کە خۆم نانو ئاوو بەرگو پۆشاکی پێ بدەم، کەواتە داوای ئەم شتانە هەر لەخۆم بکەن هەتا پێتان بدەم، ئەی بەندەکانم! ئێوە بەشەوو بەڕۆژ گوناه دەکەن، وەلحاڵ من لەدەستم دێ کە لەهەموو گوناهێ خۆش ببم، کەوابوو داوای لێخۆشبوون هەر لەخۆم بکەن، ئەی بەندەکانم! ئێوە ناگەنە ئەو رادەیەو رادەتە، کە بتوانن زیانێ، یا سوودێ، بەمن بگەیەنن، کەواتە مەبەست لەم پەندو تەمێو ئامۆژە، سوود، یا زیانی ئێوەیە، نەوەك سودو زیانی من، ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئێوە لە یەکەم کەستانەوە بیگری، هەتا دواکەستان، بە ئادەمیزادو پەریتانەوە، بە خاسو خراپتانەوە، یەك بەیەکتان پیاوی باشو لەخواترس بن، وەك لەخودا ترسترین کەسی ئێستاتان، بەوە هیچ لەسامانو موڵكو گەورەیی من زیاد ناکات، هەروەها ئەگەر لە یەکەم کەستانەوە بیگری هەتا دواهەمین کەستان، بە ئادەمیزادو پەریو جنۆکەتانەوە، بە خاسو خراپتانەوە، یەك بەیەکتان، پیاوی خراپ بن وەك: لەخودا دوورترینی کەسی ئێستاتان، بەوە هیچ لە سامانو موڵكو گەورەیی من کەم نابێتەوە، واتە: بوونو نەبوونی ئێوە بۆ خوایەتی من یەکسانەو چون یەکەو جیاوازیی نییە بۆ من!

ئەی بەندەکانم! ئەگەر بێتو لە یەکەم کەستانەوە هەتا دواهەمین کەستان، بە ئادەمیزادو جنۆکەو پەریتانەوە، لە دەشتێکا رابوەستنو لەیەك کاتا، لە یەك دەمو چرکە ساتا، هەر کەسەتان داوای شتێکم لێ بکا، وە لەیەك هەناسەدا، هەر کەسەتان دڵخوازی خۆیی پێ بدەم بەوە هیچ لە گەنجینەی من کەم نابێتەوە، چۆن دەرزییەك بژەنی بە ئاوی دەریایەکا، هیچ کەم ناکا ئاوا!!

ئەی بەندەکانم! هەرچی دێتەوە ڕێتان کردەوەی خۆتانە، من زۆر بەوردی، سەر ژمێریان دەکەمو ژمارەو چەندیو چۆنییان رادەگرمو دوایی بەتەواوی پێتانی دەدەمەوە!

جا هەرچی هاتەوە ڕێتان کردەوەی خۆتانە، ئەگەر باش بوو، ئەوا سوپاسی خودای لەسەر بکەن، خۆئەگەر بە جۆرێکی تر بوو، ئەوا سەرزەنشتی خۆتان بکەنو بەس، کە ئەوکارە بەدەتان لەوەپێش لەکاتی خۆیدا کردووە).

سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیز، کە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، لە ڕەبیعەی کوڕی یەزیدەوە، لەئەبو ئیدریسی خەولانییەوە، لە ئەبو زەڕەوە لە پێغەمبەرەوە، ئەم سەعیدە دەیفەرموو: هەموو جارێ کە ئەبو ئیدریسی خەولانی، ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە، دەهات بەچۆکاو لەوکاتەدا زۆر بەڕێزەوە لەسەر چۆك دادەنیشتو دەیگێڕایەوە بۆ شاگردەکانی!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ١١١ چ/٢ + تاج/٥، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ٥١٣٤ م. چاپی چوارەم}.

١٨٢٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا الشُّحَّ فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ». {الحديث: ٦٥١٩ = ٦٥٣٦ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆتان لەزۆرو ستەم بپارێزن، بەڕاستی زۆرو ستەم، تەمو مژو تاریکی زۆرن لە ڕۆژی قیامەتاو، زۆردارەکە دەکەوێتە ناویانو، وەك کوێری مزمەعیل بەهیچ لایەکا سەر دەرناکا، هەروەها خۆشتان لە پیسکەییو چرووکیو ڕژدیی بپارێزن، چونکە چرووکیو پیسکەیی بوون بەهۆی لەناوچوونی نەتەوەو میلەتەکانی پێش ئێوە، بەرە بەرە وای لێکردن، کە لەسەر ماڵی دنیاو سامانی جیهان، خوێنی یەکتری بڕێژنو حەڵاڵو حەرام نەزانن و نارەوا بەڕەوا دابنێن). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٠٣ چ/٢} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٣٠ چ/٤}.

١٨٣٠- عَنْ أبن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يُسْلِمُهُ، مَنْ كَانَ فِى حَاجَةِ أَخِيهِ، كَانَ اللَّهُ فِى حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً، فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». {الحديث: ٦٥٢١ = ٦٥٣٨ فم. تجريد البخارى/٣، رقم: ١٠٥٩ = ٢٤٤٢، ٦٩٥١. أبو داود. أدب: ٤٨٩٣. ترمذى. حدود: ١٤٢٦. تحفة الأشراف: ٦٨٧٧}:

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:**
**(موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو ستەمی لێ بکا، یا بیدات بەدەست ناحەزو دوژمنی خۆیەوە، یا پشتی لەزەوی بدات، هەرکەسێ مشووری کاری برایەکی ئایینی خۆی بخواتو بچێ بە دەنگیەوە، بەپێی توانای خۆی، بۆ جێبەجێ بوونی ئەوکارە، یاریدەی بدات، خودایش مشووری کاری ئەو دەخواتو، لەکاتی پێویستدا، دەچێت بەدەنگیەوە، هەرکەسێ موسوڵمانێ لە تەنگانەیێ رزگار بکا، خودایش ئەو لەتەنگانەیەك لە تەنگانەکانی رۆژی ژینەوەو زیندوو بوونەوە رزگار دەکات، وە هەرکەسێ موسوڵمانێ پۆشتە بکاتەوە بەجلو بەرگ لەشی بپۆشێ، خوایش لەرۆژی قیامەتدا ئەو پۆشتەو پەرداخ دەکاتەوە، یا بۆ رەزای خودا نەنگو نهێنی موسوڵمانێ بپۆشێ، خودایش لە تۆڵەی باشی ئەوەدا لە قیامەتدا، نەنگو نهێنی ئەو دادەپۆشێ!!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٢٧، ج/٢ + تاج/١، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ١٠٠ ج/٤ = چاپی چوارەم + تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٢٩}.**

## ١٣٩٦) مۆڵەتدانی پیاوی زۆردارو ستەمکار. (٦٥١٧ - ٦٥٢٤)
## بابٌ: فِي الإِمْلاَءِ لِلظَّالِمِ

١٨٣١- عَنْ أَبِى مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُمْلِى لِلظَّالِمِ، فَإِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ»، ثُمَّ قَرَأَ: (وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِىَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ). {الحديث: ٦٥٢٤ = ٦٥٤١ فم. تجريد

البخاری بالکوردی/٤، رقم: ١٦٦٧ = ٤٦٨٦ فتح الباری. ترمذی. تفسیر: ٣١١٠، ٣١١٠ م. تحفة الأشراف: ٩٠٣٧}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە راستیدا خودای گەورەو سەروەر، مۆڵەتی پیاوی زۆردارو ستەمکار دەداتو، تا ماوەیێ جڵەوی بۆ شل دەکات، هەتا بزانێ پەشیمان دەبێتەوە یانا، لەوانەکانی رۆژگار پەندو ئامۆژگاری وەردەگرێ یانا، بەڵام کە کاسە پڕبوو، ئەوسا قورتمی دەگرێ، ئیتر قوتاری نابێ لەچنگیو تۆڵەی بەرو دوای لێ دەستێنێ!).

ئەنجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پشتیوانی ئەم فەرمایشتەی ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ - هود — ١١/١٠٢}:

واتە: ئاوەها پاش مۆڵەتو ماوە پێدان، خودای تۆ ئەی خۆشەویست! ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری من! سزای سەخت دەنێرێو، قارو خەشمو غەزەب دەگرێ، لە دانیشتوانو خەڵکی ئەو وڵاتو دێهاتانە، کە زۆرو ستەم پەرە دەستێنێ لەناویاناو، ناهەقیو بێدادیو نارەوایی لەناویاندا دەبێ بەباو، دەبن بەزۆردارو ستەمکارو، دەڵێی گوندو شارەکان سەرجەم بوون بەلانەو خانەی زۆرداریو ستەمکاری!

وەلێ لەمەکری خودا ئەمین مەبن، چونکە بەڕاستی کاتێ خودای تۆ قورتمی زالم دەگرێ، ئێشی پێ دەگەیەنیو برسی دەبڕێ!). {ریاض/١، زنجیره: ٢٦، ژمارە: ٢٠٦ چ/٢} + {تاج/٤، زنجیره: ١٢، ژمارە: ٣٩٢٢ چاپی چوارەم}.

### ١٣٩٧) باپیاو بە هەقو بە ناهەق یاریدەی برای خۆی بدا. (٦٥٢٥ - ٦٥٢٧)

### بَابٌ: لِيَنْصُرْ الرَّجُلُ أَخَاهُ ظَالِماً أَوْ مَظْلُوماً

١٨٣٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اقْتَتَلَ غُلاَمَانِ: غُلاَمٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَغُلاَمٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَنَادَى الْمُهَاجِرُ أَوِ الْمُهَاجِرُونَ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ. وَنَادَى الأَنْصَارِيُّ: يَا لَلأَنْصَارِ.

فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) فَقَالَ: «مَا هَذَا دَعْوَى أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ»؟! قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِلاَّ أَنَّ غُلاَمَيْنِ اقْتَتَلاَ، فَكَسَعَ أَحَدُهُمَا الآخَرَ. فَقَالَ: «لاَ بَأْسَ، وَلْيَنْصُرِ الرَّجُلُ أَخَاهُ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا، إِنْ كَانَ ظَالِمًا فَلْيَنْهَهُ فَإِنَّهُ لَهُ نَصْرٌ، وَإِنْ كَانَ مَظْلُومًا فَلْيَنْصُرْهُ». {الحديث: ٦٥٢٥ = ٦٥٤٢ فم. بخاري. مناقب: ٣٥١٨، ٤٩٠٥}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دوو لاوی موسوڵمان، لاوێ لە کۆچکاران‌و لاوێ لە یاریدەدەران (ئەنصار) بوو بەشەڕو هەرایان، جا کۆچکارەکە، یا کۆچکارەکان بانگەوازی کرد: هاوار ئەی کۆچکارینە فریام کەون!

ئەنصارییەکەیش هاواری لە کۆمەڵەی خۆی کردو بانگەوازی کرد: هاوار ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران (ئەنصار)! فریام کەون!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو، فەرمووی: (ئەوە چییە ئەمە بانگەوازی سەردەمی نەفامییە، بۆچی زیندووی دەکەنەوە؟).

عەرزیان کرد: هیچ نەبوو، ئەی پێغەمبەری خودا! شتی وا رووی نەداوە، ئاژاوەی گەورەی لێ بکەوێتەوە، بەس ئەوەندە بوو: دوو گەنج بووە بەشەڕیان، یەکێکیان شەپاڵێکی لەوی تریان داوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر هەرئەوە بێ قەیدی نییە، با مرۆڤ یاریدەی برای خۆی بدا، براکەی لەسەر هەق بێ، یا لەسەر ناهەق بێ هەر یاریدەی بدات، لەسەر ئەم شێوەیە: ئەگەر براکەی لەسەر ناهەق بوو، نەهێڵێ ئەو ناهەقییە بکا، ئەوە باشترین یارمەتیە بۆی! خۆ ئەگەر براکەی زۆر لێکراو بوو، ئەوە بایارمەتی بداو نەهێڵێ زۆرو ستەمی لێ بکرێ!). {ریاض/١، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٣٧} + {بڕوانە: ژمارە: ١٨١١ کە لەپێشەوە رابورد لە زنجیرە: ١٣٨٤دا}.

## ١٣٩٨) سزای ئەوانە کە ئازاری خەڵك دەدەن لەجیهانا. (٦٦٠٠ - ٦٦٠٣)

## بابٌ: فِي الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ النَّاسَ

١٨٣٣- عَنْ عُرْوَةَ بن الزبير عَنْ هِشَامِ بْنِ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: مَرَّ بِالشَّامِ عَلَى أُنَاسٍ وَقَدْ أُقِيمُوا فِي الشَّمْسِ، وَصُبَّ عَلَى رُءُوسِهِمُ الزَّيْتُ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قِيلَ: يُعَذَّبُونَ فِي

الْخَرَاجِ. فَقَالَ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ فِي الدُّنْيَا». {الحديث: ٦٦٠٠ = ٦٦١٦ فم}:

عوروەی کوڕی زوبەیر فەرمووی: هیشامی کوڕی حەکیم (ڕەزای خودای لێ بێ) لەشام، لەلای چەن وەرزێرێکەوە ڕەت دەبێ، دەڕوانێ ڕۆنی داخ کراوە بەسەر سەریاناو لەبەر هەتاوی سوور ڕاگیر کراوون!

هیشام فەرمووی: ئەمە چییە؟ ئەمانە بۆچی وایان لێ دەکرێ، لەسەرچی ئەم ئەشکەنجەیە دەدرێن؟

دەڵێن: ئەوە لەسەر باجو سەرانە ئەم ئازارو ئەشکەنجەیە دەدرێن؟ هیشامیش دەفەرموێ: ئەدی من بەگوێی خۆم لەدەمی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودا سزاو ئازاری ئەوانە دەدا، کە بەناهەق لە جیهاندا سزاو ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکی بێ تاوان دەدەن!).

**ڕوونکردنەوە:**

هیشامی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزامی کوڕی خووەیلید، برازازای حەزرەتی خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەرە، چونکە حیزامی باپیرەی برای دایکە خەدیجەیە. لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا ئیسلام بووە، خۆیو باوکی لەسەحابە ناودارو ناسراوەکانی پێغەمبەر بوون، چیرۆکەکەی ئەوو حەزرەتی عومەر بوو بەهۆی دابەزینی حەوت قیرائەتەکە). {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٣٦٨١ ج/٤} + {تجرید/٤، ژمارە: ١٧٢٤ = ٤٩٩٢ فتح الباری} + {صحیح مسلم: صلاة المسافرین: فضائل القرآن وَما یتعلّقُ بها: ١٨٩٦ - ١٨٩٧} + {مختصر صحیح مسلم للحافظ النذری. ژمارە: ٢١١٥ = ١٨٩٦ صحیح مسلم. شیحا}.

هیشام هەمیشە سەرگەرمی فەرمانکردن بەچاکەو نەییکردن لەخراپە بوو، عومەری کوڕی خەطاب، کاتێ کارێکی ناشایستەی بەرگوێ بکەوتایە دەیگوت: بەمەرجێ منو هیشامی کوڕی حەکیم مابین شتی وا ڕوونادات!).

لە ئیستیعابا، ئیبنو عەبدولبەڕ دەڵێ: هیشام وەك سەیاحو گەڕیدە دەگەڕا، ماڵو منداڵو ژنی نەبوو، لەپێش باوکیدا، بەشەهیدیی، لە جەنگی ئەجنادیندا دەمرێو شەهید دەبێ.

بڕوانە: ژیاننامەی حەکیمی کوڕی حیزام، تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی دووەم، ژمارە: ٦٨٥ = ١٤٢٧ فەتحولباری. هەروا بڕوانە: ژمارە: ٧٠ پوختەی صەحیحی مسلم = ٣١٩ صەحیحی موسلیم، کە لەپێشەوە لەبەرگی یەکی ئەم کتێبەدا رابورد.

**١٣٩٩) مەڕۆنە ناو وڵاتو نیشتەمەنو جێگەی زۆرو ستەم لەخۆکەرانەوە، مەگەر بەگریانەوە.** (٧٣٨٩ - ٧٣٩٢)

**بابٌ: لا تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الذينَ ظَلَمُوا أنفُسَهُمْ إلاَّ أن تكُونُوا بَاكِين**

١٨٣٤- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، وَهُوَ يَذْكُرُ الْحِجْرَ مَسَاكِنَ ثَمُودَ، قَالَ سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: مَرَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) عَلَى الْحِجْرِ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «لاَ تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ إِلاَّ أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ حَذَرًا أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ». ثُمَّ زَجَرَ فَأَسْرَعَ حَتَّى خَلَّفَهَا. {الحديث: ٧٣٩٠ = ٧٤٢٥ فم. تجريد البخاري بالكوردى/ ٤، رقم: ١٣٥٧ = ٣٣٨٠ فتح الباري}:

ئیبنو شەهاب، کە ناسراوە بە زوهری، باسی وڵاتی حیجری دەکرد، کە حیجر وڵاتی هۆزی ثەموودە، فەرمووی: سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: لە غەزای تەبووکا، کاتێ لەخزمەت پێغەمبەردا، گەیشتینە خاکی حیجر، بە ئێمەی فەرموو: (مەڕۆنە ناو شوێنەوارو شوێنو هەواری ئەم گەلە دوابڕاوەوە، کە زۆرو ستەمیان لەخودی خۆیان کردووە، مەگەر بەگریانەوە، مەبادا ئەوەی کە تووشی ئەوان بووە، تووشی ئێوەیش ببێو بەسەرهاتە ناخۆشو پڕ ناسۆرەکەی ئەوان لەئێوەیش روودات).

ئەوجا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەیی لە وشترەکەی زێری کردو تێی خوڕیو بەپەلە تێپەڕی هەتا خاکی حیجری بەجێ هێشت. {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٣٩٤١ ج/٤}.

**١٤٠٠) ئاو هەڵگۆستن لەبیری سزادراوان.** (٧٣٨٩ - ٧٣٩٢)

**باب: في الإستسقاء من آبار المعذبين**

**١٨٣٥-** عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّاسَ نَزَلُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) عَلَى الْحِجْرِ أَرْضِ ثَمُودَ، فَاسْتَقَوْا مِنْ آبَارِهَا، وَعَجَنُوا بِهِ الْعَجِينَ، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَنْ يُهَرِيقُوا مَا اسْتَقَوْا وَيَعْلِفُوا الإِبِلَ الْعَجِينَ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْتَقُوا مِنَ الْبِئْرِ الَّتِي كَانَتْ تَرِدُهَا النَّاقَةُ. {الحديث: ٧٣٩١ = ٧٤٢٦ فم}:

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی:** لەغەزای تەبووکدا، کاتێ پێغەمبەرو هاوەڵانی، گەیشتنە خاکی حیجر، کە وڵاتی هۆزی ثەموودە، لەوێ دابەزین‌و لایاندا، لەوێ هاوەڵان ئاویان لەبیرەکانی هەڵگۆزی‌و هەویریان پێکرد، **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (نە لەئاوی بیرەکانی بخۆنەوەو نە ئاویان لێ بگرن).

عەرزیانکرد: ساخۆ هەویریشمان پێ شێلاوەو ئاویشمان لێیان هەڵگرتووە! **پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمانی پێ کردن:** کە ئاوەکە بڕێژن‌و هەویرەکەیش لەباتی ئالیك فڕێدەنە بەروشترەکان).

**خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمانی پێیانکرد:** کە لەو بیرە ئاو بگرن، کە وشترەکە دەچووە سەری ئاوی لێ دەخواردەوە!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٣٩٤٢ ج/٤} . سوورەتی حیجر.

**١٤٠١) تۆڵە سەندنەوەو دانەوەی مافەکان لە ڕۆژی دواییدا.** (٦٥١٧ - ٦٥٢٤)

**بَابٌ: القِصَاصُ وَأَدَاءُ الحُقُوقِ يَوْمَ القِيَامَةِ**

**١٨٣٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ»؟ قَالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لاَ دِرْهَمَ لَهُ وَلاَ مَتَاعَ. فَقَالَ: «إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلاَةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا، وَقَذَفَ هَذَا، وَأَكَلَ مَالَ هَذَا، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا، وَضَرَبَ هَذَا، فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ

فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ، قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ، فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ». {الحديث: ٦٥٢٢ = ٦٥٣٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (سەرو ماڵو منداڵو رۆحو گیانو هەستو نەست هەمووی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێو صەلاتو سەلامو دروودو رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێ) فەرمووی: (ئەرێ ئێوە دەزانن کە نابووت کێیە؟) . گوتیان: لەناو ئێمەدا نابووت ئەو کەسەیە، کە پارەو پوولو ماڵی نەبێ!

فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): (بەڵام نابووتی ئۆمەتی من ئەوکەسەیە، کە لەرۆژی قیامەتدا، دێ بۆ دیوانی خودا بۆ لێپرسینەوە، لەلایەکەوە نوێژی کردووەو رۆژووی گرتووەو زەکاتی داوەو، بەشی خۆی چاکەی هەیە، لەلایەکی تریشەوە جنێوی بەمو بەو داوە، یا بوختانی بۆ کەسێ کردووە، یا ماڵی ئەمو ئەوی بەنارەوا خواردووە، یا خوێنی خەڵکی بەناهەق رشتووە، یا لەخەڵکی داوە، یا خراپەی تری کردووە، جا لەبەرئەوە، ئەم چاکەیەی دەدرێ بەمو ئەو چاکەیەی تری دەدرێ بەوی تر، لەجیاتی هەقی خۆیان، جا ئەگەر چاکەکانی هەموو تەواو بوونو بەشی دانەوەی ئەو هەقانەیان نەکرد، کەوان لەسەری، ئەوا ئەوجا لە گوناهو تاوانەکانی ئەو خاوەن هەقانە، دەهێننو فرەیان دەدەنە سەر ئەم، ئەوسا کلکی دەگرنو بەبێ نرخیو ترۆیی، توورِی دەدەنە ناو دۆزەخ!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٣١ چ/٤} .
جۆرەکانی کردەوەی خراپە، خراپترین خراپە زۆرو ستەمە.

١٨٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ». {الحديث: ٦٥٢٣ = ٦٥٤٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەرۆژی قیامەتا، هەموو خاوەن مافێ، مافی خۆی وەردەگرێو، مافی کەس لەسەر کەس نامێنێ، تەنانەت تۆڵەی بزنی کۆڵ لەبزنی شاخدار دەسەنرێ بۆی!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٣٢ چاپی چوارەم} .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٥٤- نامەی خواکردو چارەنووس (قەزاو قەدەر)
## كِتَابُ الْقَدَرِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەکوردی، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٥١٥٧ هەتا ٥١٩٩ + تاج/١، زنجیرە: ٦، لە ژمارە: (٣٧)وە هەتا ژمارە(٥٤) + تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٨٥ — نامەی چارەنووس. لە ژمارە: ٢٠٤٣ وە هەتا ژمارە: ٢٠٤٧ = ژمارە: ٦٥٩٦ هەتا ٦٦١٧ فەتحولباری شەرحی صەحیحی بوخاری}.

### ١٤٠٢) فەرمایشتی خودای گەورە: {إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ}. (٦٦٩٣ - ٦٦٩٤)
### بَابٌ: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: {إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ}

١٨٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ مُشْرِكُو قُرَيْشٍ يُخَاصِمُونَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) فِي الْقَدَرِ. فَنَزَلَتْ: (يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ إِنَّا، كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ) {الحديث: ٦٦٩٤ = ٦٧٠٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بتپەرستەکانی هۆزی قورەیش، کە هۆزی پێغەمبەرن، دەهاتن لەگەڵ پێغەمبەردا، لەبابەت چارەنووس‌و سەرنویشتەوە ملە ملێ‌و بەربەرەکانێیان لەگەڵ دەکرد، دەیانگوت: چارەنووس‌و سەرنڤیشت‌و قەزاو قەدەر، ئەصڵی نییەو شت هەتا ڕوونەدا خودا ئاگای لێی نییەو نایزانێ. جا بۆ پەرچی ئەم بۆچوونە پووچەیان ئەم ئایەتە لە قورئانی پیرۆزدا، هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ:

{يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ. إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ — القمر — ٤٥/٤٨ - ٤٩}:

واتە: لەو ڕۆژەدا، کە لەناو ئاگری دۆزەخدا، لەپەڕوو بەسەر دەم‌و چاودا، ڕادەکێشرێن‌و بەناو ئەو ئاگرە سوورەدا، لەسەر ئەم دۆخی داماوییە، بەکێش دەکرێن، بەتەوسەوە پێیان دەڵێن: بچێژن پیاچزانی ئاگری سوور، بێگومان ئێمە

هەموو شتێكمان بەپێی سەرنقیشتو چارەنووسی خودایی‌و قەزاو قەدەر دروست كردووە، ئایا ئێستایش هەر باوەڕتان بە چارەنووس نییە؟).

### ١٤٠٣) هەموو شتێ بەپێی نەخشەی چارەنووسە. (٦٦٩٣ - ٦٦٩٤)

### بابٌ: كلُ شيئ بِقدَرٍ حتىَّ العجز والكيس

١٨٣٩- عَنْ طَاوُسٍ أَنَّهُ قَالَ: أَدْرَكْتُ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَقُولُونَ: كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ. قَالَ: وَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ حَتَّى الْعَجْزُ وَالْكَيْسُ أَوِ الْكَيْسُ وَالْعَجْزُ». {الحديث: ٦٦٩٣ = ٦٧٠٨ فم}:

طاووس (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخزمەت چەند كەسێ لە یارانی پێغەمبەری خودا، گەیشتووم، دەیانفەرموو: هەموو شتێ بەپێی نەخشەی چارەنووسە. هەروا تاووس دەیفەرموو: بەتایبەتی لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرم بیست (رەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەموو شتێ بەپێی سەرنقیشتو خواكردو چارەنووسە، تەنانەت گیلی‌و ژیریش). یا فەرمووی: (ژیری‌و گێلیش). {تاج/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٤١ ج/٤}. باسی: باوەڕ بە چارەنووس.

### ١٤٠٤) فەرمان بە تەوانایی‌و وازهێنان لە تەمبەڵی. (٦٧١٦)

### بَابٌ: فِي الأَمْرِ بِالْقُوَّةِ وَتَرْكِ الْعَجْزِ

١٨٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلاَ تَعْجِزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللَّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ (لَوْ) تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ». {الحديث: ٦٧١٦ = ٦٧٣٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (موسوڵمانی تواناو بەهێز لە موسوڵمانی ناتەواناو بێ هێز باشترە، هەردوو لایش مادەم موسوڵمانن‌و ئەهلی ئیمانن زۆر باشن، هەرچی سوودی ڕەوای هەردوو جیهانی هەیە بۆت، سوورو مجێزبە لەسەری‌و تێکۆشە بۆی، هەمیشە یارمەتی لە خودای گەورە داوابکەو، بە پشتی خودا دەست بدەرە کاری خێرو تەمبەڵ‌و تەوەزەل مەبەو، خاوە خاوو سستە سستی تیامەکە، خودا دەتگەیەنێ بە ئاوات، چونکە خۆی بەڵێنی ئەوەی داوەو دەفەرموێ: {وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّـهِ فَهُوَ حَسْبُهُ} : ئەوەی بەڕاستی پشت بەخودای خۆی ببەستێ، خودای بەسەو، کاری بەکەسی تر نییە).

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەگەر تووشی شتێکیش بووی مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە واوا دەبوو، ئەم کارەساتەم تووش نەدەبوو، یا ئەو شتە باشەم بۆ دەبوو! بەڵام بڵێ: ئەمە چارەنووسی خودا بوو، چارەنووسی خودایش ڕەتبوونەوەی بۆ نییەو خودا خواست‌و ویستی لەسەر هەرشتێ بێ دەیکاو روو دەداو دەبێ ببێ، چونکە ئەگەر بڵێیت ئەگەر وام بکردایە وادەبوو ئەم جۆرە (ئەگەر)ە دەرگا بۆ کاری شەیتان دەکاتەوەو سەردەکێشێ بۆ خراپەگرتن لە چارەنووسی خوایی‌و قەزاو قەدەر. کەواتە: خۆت بدە دەست ئەمری خوداو لەدوای چووە مەچۆ!). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤١٩٨ چاپی چوارەم}. سوورەتی: {هَلْ أَتى}.

**١٤٠٥) لەپێش دروستبوونی بوونەوەردا چارەنووسی هەموو شتێ نووسراوەو سەرنویشتی دیاریکراوەو براوەتەوە.** (٦٦٨١ - ٦٦٩١)

**بابٌ: كتب المَقَادِير قَبْلَ الْخَلْق**

١٨٤١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا) قَـالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَقُولُ: «كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلاَئِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّموَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ». {الحديث: ٦٦٩٠ = ٦٧٠٤ فم}:

**عەبدوڵڵای کوڕی عـەمری کـوڕی عـاص** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فـەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) **فــەرمووی: (خــودای گــەورە بــە پــەنجا هــەزار ســاڵ، لــەپێش دروســتکردنی ئاسمانــەکانو زەویــدا، چــارەنووسو سەرنویشــتی هــەموو شــتێکی نووسیوە).**

**خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (لەوەپێش تـەختو بارەگا (عـەرش)ی خودا لەسەر ئاو بوو!).**

## ١٤٠٦) چەسپانی چارەنووسو دەمە قاڵێی ئادەمو مووسا (درودی خودایان لەسەر بێ). (٦٦٨٤ - ٦٦٩١)

## باب: فِي إِثْبَاتِ الْقَدَرِ وَتحَاجّ آدَمَ وَمُوسى (عليهما السَّلاَمُ)

١٨٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيـهِ وَسَلَمْ): «احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ عِنْدَ رَبِّهِمَا، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى. قَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَسْجَدَ لَكَ مَلاَئِكَتَهُ، وَأَسْكَنَكَ فِي جَنَّتِـهِ، ثُـمَّ أَهْبَطْـتَ النَّـاسَ بِخَطِيئَتِـكَ إِلَـى الأَرْضِ، قَـالَ آدَمُ: أَنْـتَ مُوسَـى الَّـذِي اصْـطَفَاكَ اللَّـهُ بِرِسَالَتِهِ، وَبِكَلاَمِهِ، وَأَعْطَاكَ الأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شَيْءٍ وَقَرَّبَكَ نَجِيًّا، فَبِكَمْ وَجَـدْتَ اللَّـهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْـلَ أَنْ أُخْلَـقَ؟ قَـالَ مُوسَـى: بِـأَرْبَعِينَ عَامًـا. قَـالَ آدَمُ: فَهَـلْ وَجَـدْتَ فِيهَـا: (وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى)؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلاً كَتَبَهُ اللَّـهُ عَلَـيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً»، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى». {الحديث: ٦٦٨٤ = ٦٧٠٠. بخاري. قدر: ٦٦١٤. أبو داود. السنة: ٤٧٠١}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسـەر بێ) **فـەرمووی: (ئادەمو مووسا (درودی خودایان لەسەر بێ) لەخزمـەتی پەروەردگاریانـدا بـوو بـە دەمەقاڵێیان، لە ئەنجامدا ئادەم مووسای بۆڕدا، مووسا فەرمووی: تۆ ئەو ئادەمەی کە خودای گەورە بەدەستی خۆی دروستی کردیو لەگیانو ڕەحمەتی خۆی گیـانی کـرد بە بەرتاو، بـە فریشتـەکانی خـۆی فـەرموو کوڕنووشـیان بـۆ بـردیو، لـە بەهەشـتی**

خۆیدا دایناى، کەچى بەتاقە گوناهێ ئەم خەڵکەت لە بەهەشت دەرکردو، داتپەڕاندن بۆسەر زەوى!).

ئادەمیش فەرمووى: تۆیش ئەو مووسایەى کە خودا پەسەندى کردىو هەڵیبژاردىو کردیتى بە پێغەمبەرو قسەى لەگەڵدا کردىو لەچەند تەختە لەوحێکا تەوراتى بۆ ناردى، کە باسو خواسى هەموو شتێکیان تیادا بوو، سەرەڕاى ئەمانەیش نزیکى کردیتەوە لەخۆیەوەو رازو گوفتوگۆى لەگەڵ کردى.

ئادەم فەرمووى: باشە، ئەدى وەك لە تەوراتا دیوتە بەچەند ساڵ لەپێش دروستکردنى مندا خودا تەوراتى نووسیوە؟ مووسا فەرمووى: بەچل ساڵ. ئادەم فەرمووى: باشە ئەم ئایەتەت لە تەوراتا دیوە کە دەفەرموێ: {وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى - طه – ٢٠/١٢١}. واتە: ئادەم لە فەرمانى خودا دەرچوو، وە ئەو ئاواتە جوانە، کە برێتى بوو لە مانەوەى ئێجگارى لە بەهەشتا، لەدەستى دەرچوو، فەرمووى: بەڵێ. فەرمووى: دە ئیتر چۆن سەرزەنشتم دەکەى لەسەرکردنى کارێ کە خودا بەر لەوە کەمن دروست بکا، بەچل ساڵ لەسەرى نووسیوم کە ئەوکارە بکەم؟).

پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (جا ئاوا ئادەم مووساى بەزاندو بۆڕیدا). {تاج/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٩، ج/٤}. باسى: باوەڕ بەچارەنووس.

**١٤٠٧) دەستپێشکەریى چارەنووسو باسى فەرمایشتى خوداى گەورە: {وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا}. {٦٦٦٥ - ٦٦٨٣}**

**باب: في سبق المقادير وقوله تعالى: {وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا}**

١٨٤٣- عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ الدِّئَلِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عِمْرَانُ بْنُ الْحُصَيْنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَرَأَيْتَ مَا يَعْمَلُ النَّاسُ الْيَوْمَ وَيَكْدَحُونَ فِيهِ، أَشَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى عَلَيْهِمْ مِنْ قَدَرِ مَا سَبَقَ، أَوْ فِيمَا يُسْتَقْبَلُونَ بِهِ مِمَّا قَدْ أَتَاهُمْ بِهِ نَبِيُّهُمْ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَثَبَتَتِ الْحُجَّةُ عَلَيْهِمْ؟ فَقُلْتُ: بَلْ شَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى عَلَيْهِمْ، قَالَ: فَقَالَ: أَفَلاَ يَكُونُ ظُلْمًا؟ قَالَ: فَفَزِعْتُ مِنْ ذَلِكَ فَزَعًا شَدِيدًا وَقُلْتُ: كُلُّ شَيْءٍ خَلْقُ اللَّهِ وَمِلْكُ يَدِهِ فَلاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ. فَقَالَ لِي: يَرْحَمُكَ اللَّهُ إِنِّي لَمْ أُرِدْ بِمَا سَأَلْتُكَ إِلاَّ لأَحْزُرَ عَقْلَكَ، إِنَّ

رَجُلَيْنِ مِنْ مُزَيْنَةَ أَتَيَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ مَا يَعْمَلُ النَّاسُ الْيَوْمَ وَيَكْدَحُونَ فِيهِ أَشَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى فِيهِمْ مِنْ قَدَرٍ قَدْ سَبَقَ، أَوْ فِيمَا يُسْتَقْبَلُونَ بِهِ مِمَّا أَتَاهُمْ بِهِ نَبِيُّهُمْ وَثَبَتَتِ الْحُجَّةُ عَلَيْهِمْ؟ فَقَالَ: «لاَ، بَلْ شَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ، وَمَضَى فِيهِمْ، وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: (وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا)». {الحديث: ٦٦٨١ = ٦٦٩٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢٠٤٣ = ٦٥٩٦، ٧٥٥١ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٠٨٧٠}:

ئەبولئەسوەدی دوئەلی (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عیمرانی کوڕی حوصەین (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی پێم: ئەرێ پێم نالێیت، ئەمەی کە ئەمڕۆ ئەو خەڵکە دەیکەن‌و ئەنجامی دەدەن، لە ئیش‌و کاری هەردوو جیهان، لە چاك‌و لە خراپ‌و خۆیانی بۆ ماندوو دەکەن‌و هەوڵ‌و رەنجی بۆ دەدەن، ئایا ئەمە شتێکە کە لە ئەزەلا، لە لەوحولمەحفووظا لەسەریان نووسراوەو بەپێی نەخشەی ئەو چارەنووسە کۆن‌و پێشینە، ئەمان ئێستا بەبێ زیادوکەم بەناچاری ئەنجامی دەدەن، یا چارەنووس‌و سەرنویشت نییەو ئەوەی کەئەم خەڵکە ئەمڕۆ دەیکەن‌و ئەنجامی دەدەن، لەکاری چاکەو خراپە، لەوەپێش لەسەریان نە نووسراوەو کاروبار تا روونەدا کەس پێی نازانێ، تەنانەت بە عیلم‌و زانستی خوداشا تێ نەپەڕیوەو ئەوەی کە ئەمڕۆ ئەو خەڵکە دەیکەن‌و ئەنجامی دەدەن، بەپێی نەخشەی لەوەوپێش نییە، بەڵکوو بەپێی پێشهاتەکانە لە ئاییندەدا، خەڵکەکە خۆیان دروستی دەکەن‌و نەخشەو پلانی بۆ دادەڕێژن، ئەمەیش لەسەر ئەو بنەڕەت‌و بنەمایە، کە پێغەمبەری خودا ئەوەی پێیان راگەیاندووەو بووە بە بەڵگەو بورهانی رۆشن لەسەریان؟

منیش ئاوا وەڵامی ئەم پرسیارەی عیمرانم دایەوە: نەخەیر! بەپێی نەخشەی نوێ نییە، بەڵکوو بەپێی نەخشەی چارەنووسیانەو شتێکە لەوەوپێش لەسەریان نووسراوە. ئەبولئەسوەد فەرمووی: عیمران فەرمووی: دەی ئەگەر وابێ ئەوە دانانرێ بەناهەقی‌و زۆرو ستەم؟ ئەبولئەسوەد فەرمووی: منیش لەم قسەی عیمرانە تۆقیم‌و راچەنیم‌و زۆر دیژوار بوو بەلامەوەو گوتم: هەموو شتێ موڵك‌و

دروستکراوی خودا خۆیەتیو بەدەستی توانایی خۆی دروستی کردووە، خودا هەرچی بکا، کەس مافی نییە لێی بپرسێتەوە، بەڵکوو ئەو خەڵکە لەبەردەمی دادگای خوادا بەرپرسیارن.

ئیتر عیمران پێی فەرمووم: بەر رەحمەتو سۆزو میهرەبانی خودای گەورە بکەویت، من مەبەستم لەم پرسیارە کەلێم کردیت، ئەوەبوو کە ژیریو ئەقڵت تاقی بکەمەوە، چونکە دوو پیاو لەهۆزی موزەینە، هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیانکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئەمەی کە ئەمڕۆ ئەو خەڵکە دەیکەنو بە هەوڵو تێکۆشان، لەکاری چاکەو خراپە، ئەنجامی دەدەن، کارێکە لەسەرەتاوە، لەپێش دروستکردنی بوونەوەردا، لەسەریان نووسراوە، یا ئەمەی کە ئەمڕۆ ئەو خەڵکە ئەنجامی دەدەن، بەپێی چارەنووسی دێرینو نەخشەو پلانی پێشین نییە، بەڵکوو بەپێی پێشهاتەکانە لە ئاییندەداو خەڵکەکە خۆیان سەربەخۆ نەخشەو پلانی بۆ دادەڕێژنو بەپێی ئەو نەخشەو پلانە نوێیە ئەنجامی دەدەن؟ ئەمەیش لەسەر ئەو بنەڕەتە: کە پێغەمبەری خودا ئەوەی پێیان راگەیاندووەو بووە بە بورهانو قەواڵەو بەڵگەی رۆشن لەسەریان؟

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وەڵامی ئەم پرسیارەی ئەم دوو پیاوەدا فەرمووی: (نەخەیر! بەپێی نەخشەی نوێ نییە، بەڵکوو بەپێی پلانو نەخشەی چارەنووسی پێشینە، کە لەپێش دروستکردنی بوونەوەردا، رەنگی رێژراوەو ئێستا ئەوان هەنگاو بەهەنگاوو قۆناغ بەقۆناغ، زۆر بەوردی، بەبێ زیادوکەم پیادەی دەکەن). ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پشتیوانیو پشتگیریی فەرموودەکەی خۆی فەرمووی: (پێوەری راستیو دروستی ئەوە، کەکار ئێستا بەپێی نەخشەی چارەنووسی پێشینە، ئەم فەرمایشتەی قورئانی نامەی خودایە کە دەفەرموێ: {وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا—الشمس—٩١ — ٧/٨}. واتە:

سوێندم بەگیانو بەوەی کە رێکی خستووە، ئەوجا یا خستوویەتیە سەر رێگەی بەدکاریو خراپە، یا خستوویەتیە سەر رێگەی چاکەو لەخوا ترسی). {تاج/٥، زنجیرە: ٦، لاپەڕە: ٣٥١، ژمارە: ٥١٦١ ج/٤}. باسی: خواکردو چارەنووس.

## ١٤٠٨) باسی چارەنووس و چارە رەشی و بەختەوەری. (٦٦٦٥ - ٦٦٨٣)

## بَابٌ: فِي الْقَدَرِ وَالشَّقَاوَةِ وَالسَّعَادَةِ

١٨٤٤- عَنْ عَلِيّ كَرَّمَ اللهُ وجهه قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ فَنَكَّسَ، فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلاَّ وَقَدْ كَتَبَ اللَّهُ مَكَانَهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، وَإِلاَّ وَقَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً». قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نَمْكُثُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ؟ فَقَالَ: «مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ، فَقَالَ: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ، أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ». ثُمَّ قَرَأَ: (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى، وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى). {الحديث: ٦٦٧٣ = ٦٦٨٧ فم. تجريد البخاري بالكوردي/ ٢، رقم: ٦٤٦ = ١٣٦٢، ٤٩٤٥، ٤٩٤٦، ٤٩٤٧، ٤٩٤٨، ٤٩٤٩، ٦٢١٧، ٦٦٠٥، ٧٥٥٢ فتح الباري}:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ تەرمێکابووین، لە گۆڕستانی بەقیعولغەرقەد، لەمەدینە، بەڕێمان دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات لەلامان دانیشت، ئێمەیش لەدەوری دانیشتین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داردەستێکی بەدەستەوە بوو، سەری دانەواندو مات بوو، خۆش خۆش داردەستەکەی دەخشاند لە زەوییەکە، وەك کەسێ پەرۆشی شتێ بێو بیری لێ بکاتەوە ئاوا، ئەوجا فەرمووی: (یەك بەیەکتان، یەك بەیەکی گیانە دروستکراوەکان، لەسەرەتاوە، واتە: لە ئەزەلدا، خودا جێگەی ئەوی هەم لەبەهەشتاو، هەم لە دۆزەخدا نووسیوە، هەروا نووسراوە کە بەدبەختە یا بەختەوەرە).

فەرمووی: پیاوێ لە یارانی عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! جا کەوایە بۆ بەو نووسراوەمان پشت نەبەستین و ئیتر پشتی لێ نەدەینەوەو واز لەکارو کردەوەی

چاکە بهێنین، ئێمە چی بکەین‌و چی نەکەین، بێ سوودە، چونکە جێگەمان لەبەهەشتا، یا لەدۆزەخدا لەپێشدا، لە بێسەرەتا (ئەزەل)ەوە دیاریکراوە؟

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئێوە لەکاری چاکە سارد مەبنەوەو کارو کردەوەی خۆتان بکەن، قەدەر (چارەنووس) سڕێکی خودایە، چارەنووس رازێکی خودایە، هۆش‌و ئەقڵی ئێوە ئێستا دەرکی حیکمەت‌و دانایی ئەو نهێنییە ناکات، هەرکەسێ لە ئەزەلدا، لەزانستی خودادا بۆ کوێ دروستکرابێ رێگەی ئەو شوێنە دەگرێ جا لەسەر ئەم بنیاتە بەختیار رێگەی چاکە دەگرێ‌و بەدکار رێگەی خراپە دەگرێ، بەم پێیە کاری باش نیشانەی بەهەشتەو کاری خراپ نیشانەی دۆزەخە!).

ئینجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پشتیوانی ئەم بابەتە، ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: {فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى. وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى. فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى. وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى. وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى. فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى – الليل – ٩٢/٥ - ١٠}.

واتە: جا هەرکەسێ ماڵی خۆی لەرێگەی خودادا بداو، زەکات‌و سەرفترەو بەشی بەشدارانی لێ بداو، لەخودا بترسێ‌و، کۆ لەگوناهو تاوان بکاتەوە، پەلاماری سەرو ناموس‌و ماڵی خەڵکی نەدا، وە لەهەمان کاتا باوەڕی وابێ کە چاکە چاکەیەو خراپە خراپەیەو حەڵاڵ‌و حەرام بزانێ، ئەوە ئێمەیش کە خودای بەهەقی ئێوەین، ئەو کەسە دەخەینە سەر رێگەی چاکەو ئامادەی دەکەین بۆ گەیشتن بە پلەی باش، کە شادبوونە بەدیداری خودای گەورەو سەروەرو چوونە ناو بەهەشتی بەرینە. بەڵام کەسێ کە رژدو چرووک بێ‌و خۆی بەداراو دەوڵەمەند بزانێ‌و پێی وابێ کە پێویستی بەکەس نییەو بێنیازە لەخوداو لەبەندەکانی خوداو، لەهەمان کاتا باوەڕی بە چاکەو خراپە نەبێ‌و جیاوازی لەنێوانی حەڵاڵ‌و حەراما نەکا، ئەوە ئێمەیش دەیخەینە سەر رێگەی خراپەو ئامادەی دەکەین بۆ سزای سەخت‌و قورس‌و گران). {تاج/٤، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٤٢١٥ ج/٤} . سوورەتی لەیل.

## ١٤٠٩) كردەوە بەپێی سەرەنجامیەتی. (٦٦٦٥ - ٦٦٨٣)

## بَابٌ: فِي خَوَاتِيمِ الأَعْمَالِ

١٨٤٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ الزَّمَنَ الطَّوِيلَ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، ثُمَّ يُخْتَمُ لَهُ عَمَلُهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ الزَّمَنَ الطَّوِيلَ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، ثُمَّ يُخْتَمُ لَهُ عَمَلُهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ». {الحديث: ٦٦٨٢ = ٦٦٩٦ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوی واهەیە ڕۆژگارێکی دوورو درێژ، کردەوەی بەهەشتییەکان دەکاو بەدیمەن بەپێی کردەوەکەی بێ بەهەشتییە، بەڵام لەزانستی خوادا بە دۆزەخی لە قەڵەم دراوە، لەبەرئەوە لە ئەنجاما، دەست دەکا بەو جۆرە کردەوە خراپانە کە دۆزەخی بۆ مسۆگەر دەکەن‌و دەبێ بەدۆزەخی، پیاوی وایش هەیە، بە پێچەوانەوە ڕۆژگارێکی دوورو درێژ، بەدیمەن کردەوەی دۆزەخیەکان دەکا، بەڵام چونکە لەلای خودا بە بەهەشتی لە قەڵەم دراوە، سەرەنجام دەست دەکا بەوجۆرە کردەوە باشانە کە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەکەن‌و دەبێ بە بەهەشتی). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٥١٧٩} . کردەوە بەپێی سەرئەنجامیەتی.

## ١٤١٠) ئاکام‌و ڕزق‌و ڕۆژیی هەر لەسەرەتاوە دیاریکراون‌و سنووریان بۆ دانراون. (٦٧١٢ - ٦٧١٥)

## بَابٌ: فِي ضَرْبِ الآجَالِ وَقَسْمِ الأَرْزَاقِ

١٨٤٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: اللَّهُمَّ مَتِّعْنِى بِزَوْجِى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) وَبِأَبِى أَبِى سُفْيَانَ، وَبِأَخِى مُعَاوِيَةَ. قَالَ: فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «إِنَّكِ سَأَلْتِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ، وَآثَارٍ مَوْطُوءَةٍ، وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ، لاَ يُعَجِّلُ شَيْئًا مِنْهَا قَبْلَ حِلِّهِ، وَلاَ يُؤَخِّرُ مِنْهَا شَيْئًا بَعْدَ حِلِّهِ، وَلَوْ سَأَلْتِ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ مِنْ عَذَابٍ فِى النَّارِ، وَعَذَابٍ فِى الْقَبْرِ لَكَانَ خَيْرًا لَكِ». قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: الْقِرَدَةُ وَالْخَنَازِيرُ هِىَ مِمَّا مُسِخَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «إِنَّ

اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يُهْلِكْ قَوْمًا أَوْ يُعَذِّبْ قَوْمًا فَيَجْعَلَ لَهُمْ نَسْلاً، وَإِنَّ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ». {الحديث: ٦٧١٤ = ٦٧٢٦ فم} :

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان، کە خوشکی موعاوییە بوو، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، ئوم حەبیبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (خودایە! هەتاسەر ئەم سێ کەسەم پێ ڕەوا ببینە: یەکەم: پێغەمبەری هاوسەرم. دووەم: ئەبو سوفیانی باوکم. سێیەم: موعاوییەی برام.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەمانەی کەتۆ ئەی ئوم حەبیبە! لەخودا داوایان دەکەی، هەموو ئاکامو ماوەیان بۆ دیاری کراوەو ڕۆژو کاتیان بۆ دانراوە: لە مێژەوە ڕێگەو شوێنیان بۆ نیشانە کراوەو، ڕزقو ڕۆژییان، بەپێی چارەنووسی خودایی بۆ بڕاوەتەوەو، تۆ بڵێیتو نەڵێیت هەتا کاتی هاتنی خۆیان نەیێت، خودا هیچیان پێش ناخات، کاتێ کاتی هاتنی خۆشیان هات خودا هیچیان دوا ناخات، کەواتە: داوای ئەوە لەخودا بکە، کە لەسزای ئاگرو لەسزای گۆڕ بتپارێزێ، ئەمەیان بۆ تۆ زۆر باشترە!).

پیاوێکیش گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم مەیموونو بەرازانەی کە ئێستا هەن ئایا ئەمانە لەوەچەی ئەو ئادەمیزادانەن، کە خودا لەکاتی خۆیدا کردوونی بە جانەوەرو کردوویانی بە مەیموونو بەراز یانا؟

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودای گەورەو سەروەر هەر هۆزێکی فەوتاندبێ) یا فەرمووی: (هەر هۆزێکی سزا دابێ بنەبڕی کردوونو وەچەی لێ نەخستوونەتەوە، سەرەڕای ئەوەش، مەیموونو بەراز لەوەپێشیش هەربوون). {تاج/٥، زنجیرە: ٨، لاپەڕە: ٣٦٠، ژمارە: ٥١٦٨} . ئاکامو ڕزقو ڕۆژی، هەر لەسەرەتاوە دیاریکراون.

## ١٤١١) چۆنێتی دروستکردنی ئادەمیزادو باسی بەدبەختیو بەختەوەری.
(٦٦٦٥ - ٦٦٨٣)

## بَابٌ: فِي الخَلْقِ يُخْلَقُ وَالشَّقَاوَةِ وَالسَّعَادَةِ

١٨٤٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ، فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَوَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا». {الحديث: ٦٦٦٥ = ٦٦٨٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٢٩٤ = ٣٢٠٨، ٣٣٣٢، ٦٥٩٤، ٧٤٥٤ فتح الباري}:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری ڕاستگۆ کە باوەڕپێکراوەو فەرمایشتی جێگەی باوەڕە، دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەریەکێ لەئێوە کە خودای گەورە دروستی دەکا، چل ڕۆژ بە تۆمەیی (نوطفەیی) لەسکی دایکیا کۆدەکرێتەوەو دەمێنێتەوە، ئینجا بەچل ڕۆژی تریش دەبێ بە پارچە خوێنێکی مەییو (واتە: دەبێ بە عەلەقە)، ئینجا بەچل ڕۆژی تریش دەبێ بە پارچە گۆشتێ بەقەد پارووێ، (واتە: دەبێت بە موزغە، کە پارچە گۆشتێکە لەدەما دەجوورێ). ئینجا گیانی بەبەردا دەکرێ.

جا خودای گەورە فەرمان بەو فریشتەیە دەکا، کە گیان دەکا بەبەریدا ئەم چوار وشەیە بنووسێ:

یەکەم: ڕزقو ڕۆژی ئەم منالە چییەو چی نییە.

دووەم: ئەجەلو ئاکامی کەیەو کەی نییە.

سێیەم: کارو کردەوەی، چی ئەکاو چی ناکا.

چوارەم: بەدبەختو بەدکار دەبێ، یا کامەرانو بەختیار دەبێ.

دەسا بەو تاقە خودایە، کە هەرخۆی خودایە، کەسی واهەیە کە کردارو رەفتاری وەك کردارو رەفتاری بەهەشتی وایە، بەلاّم نامەی چارەنووسی دەست پیشکەری لیٚ دەکاو، دەست دەکا بەکردنی کاری خەلّکی دۆزەخو دەچیٚتە ناو دۆزەخەوە، کەسی وەهاشتان هەیە بەکردارو رەفتاریٚ لە دۆزەخی دەچیٚ، لە خەلّك وایە کە جەهەننەمییە، بەلاّم نامەی چارەنووسی پیٚش دەستی لیٚ دەکاو، خاتیمەی بەخیٚر دەگەریٚو دەست دەکا بەکردنی کاروکردەوەی باشو دەچیٚتە ناو بەهەشتی بەرینی جاویدانی نەبڕاوەو دەبیٚ بە بەهەشتی!). {تاج/١، زنجیرە: ٦ باسی باوەڕ بە چارەنووس، ژمارە: ٤٠ چ/٤}.

١٨٤٨- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «يَدْخُلُ الْمَلَكُ عَلَى النُّطْفَةِ بَعْدَ مَا تَسْتَقِرُّ فِى الرَّحِمِ بِأَرْبَعِينَ أَوْ خَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً فَيَقُولُ: يَا رَبِّ أَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ؟ فَيُكْتَبَانِ، فَيَقُولُ: أَىْ رَبِّ أَذَكَرٌ أَوْ أُنْثَى؟ فَيُكْتَبَانِ، وَيُكْتَبُ عَمَلُهُ، وَأَثَرُهُ، وَأَجَلُهُ، وَرِزْقُهُ، ثُمَّ تُطْوَى الصُّحُفُ، فَلاَ يُزَادُ فِيهَا وَلاَ يُنْقَصُ».{الحديث:٦٦٦٧=٦٦٨٢فم} :

حوذەیفەی کوڕی ئەسید (رەزای خودای لیٚ بیٚ) دەفەرمویٚ: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەفەرمویٚ: (لەپاش جیٚگیربوونی تۆمە، لەناو سکی دایکا، لەناو منالّدانا، بەچل رۆژ) یا فەرمووی: (بەچلو پیٚنج رۆژ، فریشتەکە دەچیٚتە ژوورەوە بۆلایو لە خودای گەورە دەپرسیٚو دەلّیٚ: ئەی پەروەردگارم! ئەم منالّە کە لەم تۆمەیٚ پەیدادەبیٚ، ئایا بەدبەختو بەدکارە، یان کامەرانو بەختیارە، کامیانە هەتا بینووسم؟

جا ئەگەر لەزانستی خودادا بە بەدکارو بەدبەختو چارە رەش نووسرابوو، ئەوا فەرمان دەکا بە فریشتەکە کە بنووسیٚ: (ئەم مندالّە بەدبەختە) بەلاّم ئەگەر لەزانستی خودادا بە بەختەوەرو کامەران نووسرابوو، ئەوا فەرمان دەکا بەفریشتەکە کە بنووسیٚ ئەم مندالّە بەختەوەرو کامەرانە).

ئەوجا فریشتەکە عەرزی پەروەردگار دەکا: ئەی پەروەردگارم! ئایا نیٚرینەیە یان میٚیینەیە؟

جا ئەگەر لەزانستی خودادا بە نێرینە نووسرابێ، فریشتەکەش بە فەرمانی خودا دەنووسێ: (نێرینەیە) بەڵام ئەگەر لە ئەزەلدا، لە زانستی خودادا، لە لەوحولمەحفوظدا بە مێینە نووسرابوو، ئەوا فریشتەکەیش بەفەرمانی خودا دەنووسێ (مێیینەیە).

هەروا کردەوەی چی ئەبێو چی نابێ دەنووسرێ، هەروا شوێنەواری، هەروا ئاکامی، هەروا رزقو رۆژیی ئەمانە گشتیان دەنووسرێنو لەسکی دایکیدا دیاری دەکرێن، ئەوجا تۆمارەکەی کە ئەم ژیاننامەی منداڵەی تیادا نووسراوە، دەپێچرێتەوەو مۆر دەکرێ، نەلێی زیاد دەکرێو نە لێی کەم دەکرێ، چۆن نووسراوە ئاوا روودەدات وەك خۆی!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٥١٥٨}.

**روونکردنەوە:**

حوزەیفەی کوڕی ئەسید، کەسناوەکەی ئەبو سەریحەیەو بەوە ناسراوە، هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، لە موسوڵمانە پێشینەکانە، ئامادەی رێکەوتننامەی حودەیبییە بووە، یەکێکە لەوانەی کە لەژێر درەختی شەجەرەتول ریضوانا، پەیمانی دا بە پێغەمبەرو ئامادەی پەیمانی خۆشنوودی بووە، لەکووفە جێنشین بوو، موسلیمو ئەصحابی سونەن فەرموودەی ئەویان دەرهێناوە، لە کووفە مردووە، لەچلو دووی کۆچیدا، زەیدی کوڕی ئەرقەم نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

١٨٤٩- عَنْ عَامِرَ بْنَ وَاثِلَةَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: الشَّقِيُّ مَنْ شَقِيَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ، وَالسَّعِيدُ مَنْ وُعِظَ بِغَيْرِهِ، فَأَتَى رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) يُقَالُ لَهُ حُذَيْفَةُ بْنُ أَسِيدٍ الْغِفَارِيُّ فَحَدَّثَهُ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ: وَكَيْفَ يَشْقَى رَجُلٌ بِغَيْرِ عَمَلٍ؟ فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: أَتَعْجَبُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) يَقُولُ: «إِذَا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتَانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً، بَعَثَ اللَّهُ إِلَيْهَا مَلَكًا، فَصَوَّرَهَا وَخَلَقَ سَمْعَهَا وَبَصَرَهَا وَجِلْدَهَا وَلَحْمَهَا وَعِظَامَهَا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ فَيَقْضِي رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ أَجَلُهُ؟ فَيَقُولُ رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ رِزْقُهُ؟ فَيَقْضِي رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ،

ثُمَّ يَخْرُجُ الْمَلَكُ بِالصَّحِيفَةِ فِي يَدِهِ فَلاَ يَزِيدُ عَلَى مَا أُمِرَ وَلاَ يَنْقُصُ». وَزَادَ فِي رِوَايَة: «أَسَوِيٌّ أو غَيْرَ سَوِيٌّ؟ فيجعله الله سوياً أو غير سوي». {الحديث: ٦٦٦٨ – ٦٦٨٣ فم} :

عاميرى كورِى واثيله فەرمووى: له عەبدوڵڵاى كورِى مەسعوودم بيست (رەزاى خوداى لێ بێ) دەيفـەرموو: بەدبـەخت هـەر لەسـكى دايكيـدا بـە بەدبـەخت دەنووسـرێ، بەختەوەريش ئەو كەسەيە كە لەيەكێكى ترەوە تەمێ وەربگرێ).

عامير دەڵێ: چووم بۆلاى پياوێ له هاوەڵانى پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نـاوى حوزەيفـەى كـورِى ئەسـيدى ئـەلغيفارى بـوو، گوتەكـەى ئيبنـو مەسـعوودم بـۆى گێرِايەوە، وە گوتم پێى: پێم ناڵێى كەسێ كه هێشتا هيچ كارێكى خراپى نـەكردبێ، چۆن چۆنى دەبێ بە بەدبەخت؟!

پياوەكە كه حوزەيفەى كورِى ئەسيد بوو، پێى گوتم: بۆ ئـەوەت لـەلا سـەيرە؟! سەيرت لەمە نەيەت، دەسا مـن بـۆ خـۆم بەڵگـەى راسـتىو دروسـتيى ئـەم قسـەيەى ئيبنو مەسعوودم لـەدەمى پێغەمبـەر خـۆى (دروودى خوداى لەسەر بێ) بيسـتووە، دەيفـەرموو (دروودى خوداى لەسەر بێ): (كاتێ چلو دوو شەو بەسەر تۆمەدا تێ دەپەرِێ، خودا فريشـتەيێ دەنێرێ بۆسـەرى، وێنـەى دەكێشـێو گـوێو چاوو پێسـتو گۆشـتو ئێسـكەكانى بـۆ دروست دەكا. ئـەوجا فريشـتەكە دەڵـێ: ئـەى پـەروەردگارم! نێـرە يـا مێيـە؟ ا خـودا لەزانسـتى خۆيـدا، لـە بێسـەرەتا (ئـەزەل)دا چـى برِيـار دابـوو، بـە فريشـتەكەى دەفەرموێ، وە ئەويش دەينووسێ نێرە، يا دەينووسێ مێيە.

ئـەوجا دەفـەرموێ: ئـەى پـەروەردگارم! تەمـەنى چـەندە؟ ديسـان خـودا چـى بفەرموێ، گورج فريشتەكە دەينووسێ. لەپاشا دەفەرموێ: ئەى پەروەردگارم! رزقو رۆژى چييەو چى نييە؟! ديسانەوە خودا چى برِياردابێ بە فريشتەكەى دەفەرموێ، ئـەويش دەينووسـێ، ئـەوجا فريشـتەكە لـە رەحـم (مناڵـدان) دێتـە دەرەوە، ئـەو دەفتـەرەى كـە ئـەو بـاسو خواسـەى لێ نووسـراوە هـەروەها لەدەسـتيدا كـە دێتـە دەرەوە! وە پەردەى نهێنى لەسەر لادەبرێو حاڵەكە بـۆ كەسـى خـۆى ئاشـكرا دەبـێ،

نـەلێی زیـاد دەکـاو نەکـەم). {تـاج/٥، زنجـیرە: ٦، لاپـەڕە: ٣٤٨، ژمـارە: ٥١٥٧. باسـی خواکردو چارەنووس – قەزاو قەدەر}.

لەگێڕانـەوەی ژمـارە: (٦٦٧٠) لـە صـەحیحی موسـلیما، لـە تـەرقیمی مامۆسـتا خەلیل مەئموون شیحادا، ئەمەی پـترە: فریشـتەکە دەفـەرموێ: ئـەی پـەروەردگارم! ئایا ساخو سەلیم بێ، یا نەخۆشو ناتەواو؟!

جا خودا بڕیار دەدا کە ساخو تەندروست بێ، یا ناساخو ناتەواو).

**١٤١٢) هەموو ئادەمیزادێ بەشی خۆی داوێنپیسی لەچارەی نووسراوە.**

**(٦٦٩٥ - ٦٦٩٦)**

**بَابٌ: كُتِبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ نَصِيبُهُ مِنَ الزِّنَا**

١٨٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «كُتِبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ نَصِيبُهُ مِنَ الزِّنَا مُدْرِكٌ ذَلِكَ لاَ مَحَالَةَ، فَالْعَيْنَانِ زِنَاهُمَا النَّظَرُ، وَالأُذُنَانِ زِنَاهُمَا الاسْتِمَاعُ، وَاللِّسَانُ زِنَاهُ الْكَلاَمُ، وَالْيَدُ زِنَاهَا الْبَطْشُ، وَالرِّجْلُ زِنَاهَا الْخُطَا، وَالْقَلْبُ يَهْوَى وَيَتَمَنَّى، وَيُصَدِّقُ ذَلِكَ الْفَرْجُ وَيُكَذِّبُهُ». {الحديث: ٦٦٩٦ = ٦٧١٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٦٧ = ٦٢٤٣، ٦٦١٢ فتح الباري}:

ئەبو هورەیـرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (هەموو ئادەمیزادێ خودا بەشی خۆی داوێنپیسی لەچارەی نووسیوە، خـواه نـاخواه دەشێ تووشی ئەوە ببێ، داوێنپیسی چاو برێتییە لە روانینی نـاڕەوا، وە داوێنپیسـی گوێ برێتییە لە گوێگرتن لەشتی نادروست، وە داوێنپیسی زمان برێتییە لە گوتـەو قسـەکردنی نادروسـت، وە داوێنپیسـی دەسـت برێتییـە لەدەسـت وەشـاندنو شـت بەناهـەق بـردن، وە داوێنپیسـی پـێ برێتییـە لـە رۆیشـتن بـۆ ئیشـی نـاڕەوا، وە داوێنپیسی دەم برێتییە لە ماچو مۆچ، وە دڵ ئـارەزووی ئـەو بـێ شـەرعییە دەکـاو، دەروونو نەفسیش ئـاواتی ئـەوە دەخـوازێ. جـا ئینجا دامـەن (فـەرج – عـەورەت - شەرمگا)یش ئەمە بەدی دەهێنێ، بە کردەوە، یا رەفزی دەکا). {ریـاض/٤، زنجیرە: ٢٩٠، ژمارە: ١٦٢٢ – تەماشاکردنی ناڕەوا}.

**١٤١٣) جلەوی دڵ وا لەدەستی خودادا، چۆن ئارەزوو دەکا هەڵی دەسووڕێنێ.**

**(٦٦٩٢) بَابٌ: تَصْرِيفُ اللَّهِ الْقُلُوبَ كَيْفَ يَشَاءُ**

١٨٥١- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) يَقُولُ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَقُولُ: «إِنَّ قُلُوبَ بَنِى آدَمَ كُلَّهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ! صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ». {الحديث: ٦٦٩٢ = ٦٧٠٦ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لە خۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (بێگومان دڵی هەموو ئادەمیزادەکان وان لەنێوانی دوو پەنجە لە پەنجەکانی خودای میهرەباندا، وەك یەك دڵ، خۆی چۆن ئارەزوو دەکا ئاوا هەڵی دەسووڕێنێ!).

ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەی خودایە! ئەی هەڵسووڕێنەری دڵان! دڵمان بەرەو تاعەتی خۆت وەرچەرخێنە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧٠ = جوامع الكلم. ژمارە: ٥٠٥١ + تاج/٥، زنجیرە: ٩ = جلەوی دڵ لەدەستی خودادایە. ژمارە: ٥١٧٠}.

**١٤١٤) هەموو منداڵێ، کاتێ لەدایك دەبێ، بە سروشت، بە خودا کرد، ئامادەیە بۆ خواناسین. (٦٦٩٧ – ٦٧١١ فم) بَابٌ: كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَة**

١٨٥٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ، وَيُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ»؟ ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِى فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ) الآيَةَ. {الحديث: ٦٦٩٧ = ٦٧١١ فم. تجريد البخارى بالكوردى/ ٢، رقم: ٦٤٤ = ١٣٥٩، ١٣٥٨، ١٣٨٥، ٤٧٧٥، ٦٥٩٩. تحفة الأشراف: ١٣٢٥٨}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو منداڵێ کاتێ لەدایك دەبێ، بە سروشت، بە خودا کرد، ئامادەیە بۆ

قەبووڵی ئایینی پاك، ئامادەیە بۆ خواناسین، ئەگەر وازی لێ بهێنرێ بەردەوام دەبێ لەسەر خواناسی، بەڵام لەوەدوا باوك‌و دایكی‌و نەریت‌و دەستوورو باوی ناو كۆمەڵ‌و دەوروبەر دەیگۆڕن‌و لەڕێ دەری دەكەن، جا هەیە باوك‌و دایك، یا دەوروبەر دەیكەن بە جوولەكە، یا دەیكەن بەگاور، یا دەیكەن بە ئاگر پەرست، یا دەیكەن بەشتێ تر.

بەڵێ هەموو منداڵێ لە سەرەتاوە، بە خوداكرد، لەسەر ئایینی ڕاست‌و دروست‌و پاك‌و پوخت لەدایك دەبێ‌و ئامادەیی تەواوی تیایە بۆ وەرگرتنی یەكتاپەرستی، هەروەك چۆن بەچكەی ئاژەڵ‌و ماڵات لەسەرەتاوە، بە شێوەی گشتی، بە تەواوی‌و بەبێ كەم‌و كووڕی لەدایك دەبن، ئەوەتانێ نابینن كە بەچكەیێ لەو بەچكانە، لەكاتی لەدایكبووندا، لووتی بڕابێ، یا گوێی قرتابێ، یا كەمیی‌و كورتی‌و ناتەواوییەكی هەبێ، بەڵام پاش لەدایكبوون لێیان كوڵ دەكرێ، یا لووت‌و گوێ‌و دەست‌و قاچ‌و شاخی هەندێكیان دەكرێ، یا دەقرتێ).

ئینجا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر حەزیش دەكەن بۆ پشتیوانی ئەم باسە، كەوا لەم فەرموودەیەدا ئەم ئایەتە بخوێننەوە:

{فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ — الروم — ٣٠/٣٠}:

واتە: ئەو ڕەوشت‌و سروشتە پاكە خوداكردە بگرن، كە خودای گەورە هەر لەسەرەتاوە، بەرەی ئادەمیزادی لەسەر دروست كردووە، ئەوە ئایینی ڕاست‌و دروستی دەستكردی خودا خۆیەتی، بۆیەكا هەرگیزاو هەرگیز گۆڕینی بۆ نییە لەلایەنی خوداوە. {تاج/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٨. باوەڕ بەچارەنووس (قەدەر)}:

**١٤١٥) چی لەبارەی منالانی بێباوەڕان‌و بتپەرستانەوە هاتووە.** (٦٦٩٧ - ٦٧١١)

**بابٌ: مَا ذُكِرَ فِي أَوْلَادِ الْمُشْرِكِينَ**

١٨٥٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) عَنْ أَطْفَالِ الْمُشْرِكِينَ؟ قَالَ: «اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ إِذْ خَلَقَهُمْ». {الحديث:

٦٧٠٧ = ٦٧٢١ فـم. تجريد البخاري بالكوردي/ ٢، رقم: ٦٦٠ = ١٣٨٣، ١٣٨٤، ٦٥٩٧، ٦٥٩٨، ٦٦٠٠ فتح الباري. أبو داود. سنة: ٤٧١١. نسائي. جنائز: ١٩٥٠، ١٩٥١. تحفة الأشراف: ٥٤٤٩}:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی:** لەبارەی منالآنی ناموسولمانەكانو بتپەرستانو هاوبەش پەیداكەرەكانەوە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) **پرسیار كرا:** ئایا منداڵی ئەمانە كە بەمنداڵی دەمرن، بەهەشتین یا دۆزەخین؟ **فەرمووی** (دروودی خودای لەسەر بێ): **(خودا خۆی باش دەزانێ كە ئەو مندالآنە ئەگەر گەورە ببوونایەو ئەركو تەكلیفیان لەسەر بوایە، كارو كردەوەیان چی دەبوو، بەلآم چونكە لەپێش رەسیدە بوونو باڵقبوونا مردوون، ئەوە ئەركو تەكلیفی ئایینیان لەسەرنییە، كەوابوو لەبەرئەوە بەهەشتین).** {تاج/٥، زنجیرە: ١٠، لاپەڕە: ٣٦٢، ژمارە: ٥١٧٣. ئەوەی لەبارەی منداڵی نا موسولمانەكانەوە، لە ئاییندا روونكراوەتەوە}.

**روونكردنەوە:**

أ- چەند بڕیاری جیا جیا لەبارەی جێگەی منالآنی بێباوەڕانەوە كە بەمنداڵی مردوون، یا دەمرن هەیە، وەك:

١- بەهەشتین، ئەمە مەزهەبی راستو دروستی جەماوەری زانایانەو بەلگەی رۆشن بەزۆری لەسەری هەیە.

٢- پاشكۆی باوكو دایكیانن‌و ئەمانەیش وەك ئەوان دۆزەخین، بەلآم بەلگەی ئەم رایە لاوازە.

٣- لەبەرزەخێكا دەبن لەنێوانی بەهەشتو دۆزەخا، ئەم رایەیش بەلگەی دەقداریان نییە.

٤- لە بەهەشتا دەبن بەنۆكەرو كارەكەری بەهەشتییەكان، بەلگەی ئەم رایەیش دیسان لاوازە. بەلگەی ئەم رایەیش كێشەی زۆرە.

٥- لە دۆزەخدا تاقی دەكرێنەوەو ئەوەی لە ئەزموونەكەدا دەرچوو بەهەشتییە، ئەوەی كە دەرنەچوو دۆزەخییە.

تـاقى كردنەوەكـەيش ئاوايـە: (پارچـەيێ لـە ئـاگرى دۆزەخ جيادەكرێتـەوە، لـە قيامەتدا، فەرمان دەكرێ بەم چوار جۆرە كەسـە: بەمنـدالّى نابـالّق‌و بـە شـێت‌و بـە ئەهلى فەترەت (كە ئەوانەن لەسەردەمى نەمانى پێغەمبەرايەتيدا ژياون)و بـەپيرى خەلّەفاو، پێيان دەگوترێ: ئادەى بڕۆنە ناو ئـەم ئـاگرە سـوورەوە، خـودا خـۆى ئـەم فەرمانەيان پـێ دەكا، جـا ئەوانـەى كـە لـەم چـوار جـۆرە كەسـە بەدبـەخت‌و چـارە رەشبن، ناچنە ناوى‌و دەمە دەمێ لەگەلّ پەروەردگارا دەكەن‌و دەلّێن: ئەى خودايـە! چۆن دەمانخەيتە نـاو ئـەم ئـاگرەوە ئێمـە لێـى دەترسين‌و ناچينە نـاوى. خـودايش پێيان دەفەرموێ: ئێوە ئێستا فەرمانى خۆم دەشكێنن‌و بەگوێى خۆم ناكـەن، ديـارە لەدنيادا زياتر بێگوێيى پێغەمبـەرانى منتـان دەكـرد. جـا ئەمانـە دۆزەخـين. بـەلاّم ئەوانەى كە لەم چوار جۆرە كەسە بەختەوەربن بەگوێى خودا دەكەن‌و بـەبێ سـێ‌و دوو، زوو بـەزوو فەرمانەكـەى خـودا بـەجێ دەهێـنن‌و خۆيـان هـەلّ دەدەنـە نـاو ئاگرەكـەوە! ئـيتر خـودا لێيـان رازى دەبـێ‌و لـە تاقيكردنەوەكـەدا سـەردەكەون‌و بەهەشتى بەرينى نەبڕاوە مسۆگەر دەكەن بۆ خۆيان هەتا هەتايە).

ب- چەند بڕيارێكى جيا جيايش سـەبارەت بـە منـدالاّنى موسولّمانان، كـە بـە مندالّى مردوون‌و بەنا بالّقى تەمەنيان تەواو بووە:

١- بەكۆى دەنگى ئەوانەى كە لە زانايانى موسولّمانان، بايەخ‌و نـرخ بـۆ راكانيـان هەيە، منالاّنى موسولّمانان، كە بەمندالّى، پـێش رەسـيدە بـوون دەمـرن بەهەشـتين، لەزۆر لە مەلّبەندەكانى دوا رۆژا فرياى باوك‌و دايكيان دەكەون.

٢- هەنـدێ لـەم پرسـەدا ئێسـت دەكـەن‌و دەلّـێن: منداڵەكـەى حـەزرەتى خـدرى زينـدە كوشـتى، خـۆى كـافرو بـێ بـاوەڕ بـوو، دۆزەخـى بـوو، بـەلاّم بـاوك‌و دايكـى موسولّمان بوون‌و بەهەشتى بوون چەند رايێ تريش هەيە، پێويست بە نووسـينيان ناكا، لەبەر زۆر لاوازييان.

## ١٤١٦) باسی ئەو مێرد منداڵەی کە حەزرەتی خدری زیندە کوشتی، وەك لە سوورەتی کەهفا باسکراوە. (٦٦٩٧ - ٦٧١١)

## باب: فِي الغُلاَمِ الَّذِي قَتَلَهُ الخضر

١٨٥٤- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «إِنَّ الْغُلاَمَ الَّذِى قَتَلَهُ الْخَضِرُ طُبِعَ كَافِرًا، وَلَوْ عَاشَ لأَرْهَقَ أَبَوَيْهِ طُغْيَانًا وَكُفْرًا». {الحديث: ٦٧٠٨ = ٦٧٢٢ فم. رواه الترمذى وصححه ورَوَاهُ أبو داود في القدر – هامش الحديث الرقم: ٣٩٧٥ تسلسل: ١، تاج/٥ – سورة الكهف}:

ئوبەییەی کوڕی کەعب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو کوڕەی کە خدری زیندە کوشتیو سەری هەڵپچڕکان، ئەو ڕۆژەی کە خودا دروستی کردو مۆری پیادانا، بەکافری دروستی کردو مۆری کافریی پیادانا، گریمان ئەو منداڵە بمایە، دایكو باوکی خۆی لەخشتە ەبردو لەڕێگە دەری دەکردنو ئەوانیشی وەك خۆی بەدکێشو بەد ئەندیشو بێباوەڕو کافر دەکردا). {تاج/٤، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٩٧٥ = سوورەتی کەهف}.

## ١٤١٧) کەسانێك هەر لەپشتی باوکیانا بۆ بەهەشت دروست کراون، کەسانێکیش هەر لەپشتی باوکیانا بۆ دۆزەخ دروستکراون. (٦٦٩٧ - ٦٧١١)

## باب: فِي ذكر مَنْ مَاتَ مِنَ الصِّبْيَانِ وخلق أهلِ الجنة والنار وَهُمْ فِي أصْلاَبِ آبَائِهِمْ

١٨٥٥- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: دُعِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) إِلَى جَنَازَةِ صَبِىٍّ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ طُوبَى لِهَذَا، عُصْفُورٌ مِنْ عَصَافِيرِ الْجَنَّةِ لَمْ يَعْمَلِ السُّوءَ وَلَمْ يُدْرِكْهُ، قَالَ: «أَوَغَيْرَ ذَلِكَ يَا عَائِشَةُ؟ إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلاً، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِى أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ، وَخَلَقَ لِلنَّارِ أَهْلاً خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِى أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ». {الحديث: ٦٧١٠ = ٦٧٢٤ فم. أبو داود. سنة: ٤٧١٣. نسائى. جنائز: ١٩٤٧. تحفة الأشراف: ١٧٨٧٣}:

عائیشەی دایکی باوەڕداران (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەریان بانگکرد بۆسەر تەرمی منالێ لە یاریدەدەران کە ناسراون بە ئەنصار، منیش عەرزیم کرد:

قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم منداڵە خۆشی لەخۆی چۆلەکەی بەهەشتە، چونکە بێ گوناهەو فریای کردنی خراپە نەکەوتووە، کەچی خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی بۆ بەبارێکی تردا نەبێ‌و چۆلەکەی بەهەشت نەبێ‌و دیاری دۆزەخ بێ؟ ئەی عائیشە! چونکە خودا کەسانێکی دروست کردووە بۆ بەهەشت، هەر لەپشتی باوکیاندا بۆ ئەوێی دروست کردوون، وە کەسانێکی تری دروست کردووە بۆ ئاگری دۆزەخ، هەر لەپشتی باوکیاندا بۆ ئەوێی دروست کردوون!).
{تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٥١٧٤ — لەبارەی منداڵی ناموسوڵمانەکانەوە لە ئایینـدا روونکراوەتەوە}.

**روونکردنەوە:**

بەبۆنەی ئەم بابەتی چارەنووس‌و قەزاو قەدەرەوە، ئەم چەند شیعرەتان عەرزدەکەم، کە ئاوێنەی باڵانمان، بۆ ئەم باسە پڕ تەلیسم‌و رازو نهێنی‌و ئاڵۆزە:

پەپوولە پایزەی دەمی رەشەبا
مەرخوا بزانێ با بۆ کوێت دەبا
رووکەرە ژیان بەرووی خۆشەوە
تادوا خۆشەکەی بیکە کۆشەوە
خۆت بێ ئاگاکەو خەمی پاش و پێش
مەخۆو ساویلکە بژی وەک دەروێش
وادانێ تیری لەکەوان دەرچووی
ئاوڕی بەرودوا مەدە، گەر تیاچووی
چارەنووس دەریای بێ پەیە، قوربان!
پەیی پێ نابا زانا وەک نەزان!
زانای سروشت و کوچک و دارو بەرد
پەیی پێ نابا، دەکوتێ ئاسنی سەرد
لە لەوحولمەحفووز نووسی بەپێنووس
خواوەندی مەزن: باسی چارەنووس
بەحرێ بێ کەنار: ئەم دەلیا پانە
بۆ هەموو لایێ جێی سەر سوڕمانە

بەڵگەو قیاسی خاوەن هۆش و گۆش
جیاوازی نییە لەگەڵ هی بێ هۆش!
هیچ کەس نایزانێ، بێجگە لەیەزدان
نەفریشتەو پەری، نە پێغەمبەران!
لەباسی قەدەر، لێکدانەوەی زۆر
دەتکا بەماسی گیراوی ناو تۆڕ
برا! چیت داوە! لەم دانەو داوە
بۆ خۆت دەخەیتە کایەی دۆڕاوە!
بیکە بەویردی شەوو ڕۆژی خۆت
ئەم شیعرە جوانەی وادەیخوێنم بۆت!
هەمیشە هەوڵی مەردانەم داوە
ورەم بە قەومان قەت نەڕووخاوە
دوایش هەرچی هات لەلای خوداوە:
خەڵاتی خوایە، جیچگەی سەرچاوە
تەوقیفە باسی قەدەر سەراسەر
کۆڵیتەوە لێی، لێت دەدا زەرەر!
تەسلیمی قەزاو قەدەری خوابە
بۆ ڕێگەی چاکە چەشنی چرابە
لەکاری خراپ دوورو کلابە
بۆ چاکەکاران چەشنی برابە!
کاتێ داترنی کفنی لەش لەگیان!
ئەوسا تێ دەگەی ئەم باسە جوان جوان[1]!
سەرجەم بوونەوەر موڵکی خوایە
هەرچی لێ دەکا، هەق و ڕەوایە
ڕەخنە لەکاری زۆر نابەجایە
پیشەی مرۆڤی زۆر بێ بڕوایە
بەدەیان زانا، بەسەدان دانا
بۆ ئەم بابەتە کتێبیان دانا

---

[1] ئاماژەیە بۆ ئایەتی {لَقَدْ كُنت فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ} (سورە ق، ئایە٢٢).

کێشـــەی چـــارەنووس حـــەل نـــەبوو بۆیـــان
پرســـەکان مـــانۆ، لەجێگـــەی خۆیـــان!
بڵـــێین و نـــەڵێین حـــەل نـــابێ بۆمـــان
واباشـــە دەرگـــای داخـــەین لـــەخۆمان!
بـــەڵام براڵـــە! گوێـــت لـــەبرات بـــێ
هەســـت و هـــۆش و دڵ تـــەواو لـــەلات بـــێ:
قســـەیێ دەکـــەم بـــەینی خۆمـــان بـــێ
نـــەزان نەیبیســـتێ، رەخنـــەی لێمـــان بـــێ:
بەرژەوەنـــــدمان خـــــودای میهرەبـــــان
چـــاتر دەیزانـــێ، باشـــتر لـــەخۆمان
هـــاتن و چـــوونت بەدەســـت خـــۆت نییـــە
بڵێـــی دەیگـــۆڕم، هـــەرگیز بـــۆت نییـــە
تـــۆ گـــۆی مەیـــدان و قـــەدەر شـــەقێنکەر
دەتبـــاو دەتهێنـــێ، ئـــەم ســـەرو ئـــەو ســـەر
لێ چـــونکە ئەمـــە خواســـتی خوایـــە
بەرژەوەنـــدی تـــۆی بێگومـــان تیایـــە!!
گـــەر دەڵێـــی: کاکـــە! لەمـــە حـــاڵی نـــیم
پێـــت دەڵـــێم: منـــیش لـــەم را قـــاڵی نـــیم!
بـــەڵام پـــێم نـــاڵێی مـــن و تـــۆی هـــەزار
ئایـــا حـــاڵی بـــووین: یـــەکێ لەهـــەزار؟!
دەبیـــا هەشـــتەش لـــەبانی نـــۆبێ
پرســـی بـــێ وەڵام لـــەلامان کـــۆبێ
دەرچـــی و دەرنەچـــی لـــە ئـــەزموون، ئـــەنجام
هەریەکـــە، ئـــیتر بـــاقی (والسَّـــلام)



# ٥٥- نامەی زانین

## كِتَابُ العِلْمِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول بەكوردی، بەرگی یەكەم، زنجیرە: ١٤، لاپەڕە: ٦٩، ژمارە: ٩٨ هەتا ژمارە: ١٣٧ لەزنجیرە: ١٤ وە هەتا زنجیرە: ١٩ + ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤١، لە ژمارە: ١٣٧٦ وە هەتا ژمارە: ١٣٩٢ + تەجریدی بوخاری بەكوردی، بەرگی/١، لە ژمارە: ٥٣ وە هەتا ژمارە: ١٠٨}.

### ١٤١٨) لەئاخر زەمانا زانست لادەبریێو نامێنێ، نەزانی باوی دەبێ. (٦٧٢٦ - ٦٧٤٠)

### باب: في رفع العِلْمِ وَظُهُورِ الجَهْلِ

١٨٥٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَلاَ أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) لاَ يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِى سَمِعَهُ مِنْهُ: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنَا، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَذْهَبَ الرِّجَالُ، وَتَبْقَى النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمٌ وَاحِدٌ». {الحديث: ٦٧٢٧ = ٦٧٤٢ فم}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا فەرموودەیێ دەگێڕمەوە بۆتان، كە لەپاش من كەس نەیگێڕێتەوە بۆتان، خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (یەكێكە لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی قیامەت: كە بەرە بەرە زانینی ئایینیو عیلمی دینینی هەڵدەگیرێو نامێنێو، جەهلو نەزانی بەكارو باری ئایینی پەرە دەستێنێو بڵاودەبێتەوەو (قانوونی وەضعی جێگەی شەریعەتی خودا دەگرێتەوە)و ئارەق بەزۆریو بەئاشكرا دەخورێتەوەو شەڕواڵ پیسیو داوێنپیسی دەبێ بەباوو ئاشكرا دەبێ، وە بەهۆی شەڕو شۆڕو ئاشووبەوە پیاو كەم دەبێو ژن زۆر دەبێ، هەتا وای لێ دێ كە پەنجا ژن تاكە یەك پیاو دەبێ بە سەرپەرشتیان!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥١. باسی تۆڵەی شەڕواڵپیسی}.

## ١٤١٩) باسی وەرگرتنەوەی زانین. (٦٧٢٦ - ٦٧٤٠)

## بَابٌ: فِي قَبْضِ الْعِلْمِ

١٨٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ، وَيُقْبَضُ الْعِلْمُ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ، وَيُلْقَى الشُّحُّ، وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ». قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: «الْقَتْلُ». {الحديث: ٦٧٣٣ = ٦٧٤٨ فم. تجريد البخارى بالكوردى/١، رقم: ٧٤ = ٨٥، ١٠٣٨، ١٤١٢، ٣٨٠٨، ٣٦٠٩، ٣٦٤٣، ٤٦٣٥، ٦٠٣٧، ٦٥٠٦، ٦٩٣٥، ٧٠٦١، ٧١١٥، ٧١٢١ فتح البارى. أبو داود. فتن: ٤٢٥٥ تحفة الأشراف: ١٢٢٨٢} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (رۆژگار تەنگ دەبێتەوەو بەری رۆژگار تەنگەبەر دەبێتو خەڵك لەبەر سەرقاڵیو سەر جەنجاڵیو هەوڵو تەقەلاو خەمو خەفەتو پەرۆشی، هەست بە تێپەڕبوونی ناکەن، بەرە بەرە زانستو عیلمی ئایینی هەڵدەگیرێو نامێنێو جەهلو نەزانی بە کاروباری ئایینی پەرە دەستێنێو بڵاو دەبێتەوە، فەرتەنەو ئاژاوە پەرە دەستێنن، رژدیو چرووکی لەدڵا رەگو ریشە دائەکوتێو مەردوم رژدو رەزیلو چرووك دەبن، راوو رووتو تاڵانیو بڕۆ زۆردەبن، دنیا دەبێ بە ئاخورانو بخوران، عەرزیانکرد: قوربان! ئاخورانو بخوران چییە؟ فەرمووی: (کوشتو بڕە!). {تاج/١، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٦. دەستوورو ئادابی زانین + ریاضی صالحین/٣/٢٦٥، زنجیرە: ٢٤١، ژمارە: ١٣٩٢ — نامەی زانین}.

## ١٤٢٠) نەمانی زانین بەهۆی نەمانی زانایانەوە. (٦٧٢٦ - ٦٧٤٠)

## بَابٌ: فِي قَبْضِ الْعِلْمِ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ

١٨٥٨- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يَتْرُكْ عَالِمًا، اتَّخَذَ النَّاسُ رُءوسًا جُهَّالاً، فَسُئِلُوا، فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا». {الحديث: ٦٧٣٧ = ٦٧٥٢ فم. تجريد

البخاري بالكوردي/١، رقم: ٨٥ = ١٠٠، ٧٣٠٧. ترمذي. علم: ٢٦٥٢. ابن ماجة. مقدّمة: ٥٢. تحفة الأشراف: ٨٨٨٣} :

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە نەبێ کە خودا لەپڕ، عیلمو زانین لە بەندەکانی خۆی، لەو خەڵکە بگرێتەوە، وەك چۆن جلێ گورج لەبەر داکەنرێ، ئاوا لەناکاوا بەسڕین بیسڕێتەوە لەسینگیان، بەڵام خودا بەرە بەرە، بەرودوا زاناکان دەباتەوە بۆلای خۆی، تا وای لێ دێ عیلمو زانین نامێنێو هەڵ دەگیرێ، جا کاتێ نەزانین ماو نەزانا ما، ئەوجا ڕەشە خەڵکەکە سەرۆکی نەزانو نەدان بۆ خۆیان دادەنێنو دەست دەکەن بە پرسیارکردن لێیان، جا ئەوانیش بە نەزانیو نادانی خۆیان فەتوایان بۆ دەدەن، ئیتر هەم خۆیان لەڕێ دەردەچنو هەم خەڵکی تریش لەڕێ دەردەکەن!). {تاج/١، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٦. دەستوورو ئادابی زانین + ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤١، ژمارە: ١٣٩٢. نامەی زانین} .

## ١٤٢١) کەسێ لەسەردەمی ئیسلاما ڕەوشتو یاسایەکی جوان، یا ناشیرین دابهێنێ. (٦٧٤١ - ٦٧٤٥)

## بابُ: مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً أَوْ سَيِّئَةً فِي الإِسْلَامِ

١٨٥٩- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) عَلَيْهِمُ الصُّوفُ، فَرَأَى سُوءَ حَالِهِمْ قَدْ أَصَابَتْهُمْ حَاجَةٌ، فَحَثَّ النَّاسَ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَأَبْطَئُوا عَنْهُ حَتَّى رُئِيَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ، قَالَ: ثُمَّ إِنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ جَاءَ بِصُرَّةٍ مِنْ وَرِقٍ، ثُمَّ جَاءَ آخَرُ، ثُمَّ تَتَابَعُوا حَتَّى عُرِفَ السُّرُورُ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ كُتِبَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا وَلاَ يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ كُتِبَ عَلَيْهِ مِثْلُ وِزْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا، وَلاَ يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ». {الحديث: ٦٧٤١ = ٦٧٥٦ فم} :

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ خەڵك لە عارەبی سارانشین هاتن بۆ خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جلی خورییان لەبەردا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕوانی حاڵیان زۆر شڕە، بەڕاستی نەداراو ئاتاجن، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گاڵی خەڵکەکەیدا، لەسەر خێرکردنو بەخشین، بەڵام خەڵکەکە بەسستی هاتن بەدەنگیەوە، تەنانەت لەڕووی دیاربوو کە خەڵکەکە لەم ڕووەوە سستن، تا لەپاشا پیاوێ لە یاریدەدەران (لە ئەنصار) یەك پریاسکەی پڕ لەدرەمی زیوینی هێنا، پاش ئەو پیاوێ تر هەروا، ئەوجا خەڵکەکە بەشوێن ئەوانا بەگەرمی دەستیانکرد بەخێرکردن، هەتا ڕووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە خۆشییانا گەشایەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەسەردەمی ئیسلاما، ڕەوشتو یاسایەکی جوان دابهێنێ، وەخەڵك چاوی لێ بکەنو ڕەفتاری پێ بکەن، چ لەژینیا، چ لەپاش مەرگی، ئەوە لەپاداشی ئەوەدا، کەبووە بە پێشەواو سەر مەشقێ جوان بۆکەسانی تر، بەقەد پاداشی ئەو کەسانە کەبەو یاسایە کاردەکەن خێرو پاداشیش بۆ ئەو کەسە داهێنەرە دەنووسرێ، بەبێ ئەوە کەهیچ لەخێری ئەوان کەم بکاتەوە، وە هەرکەسێ لە ئیسلاما یاسایەکی ناشیرین، یا ڕەفتارێکی بەد، دابهێنێو خەڵکی تر چاوی لێ بکەنو ڕەفتاری پێ بکەن، چ لەژیانی خۆیا، چ لەپاش خۆی، ئەوە بەقەد گوناهی ئەوانەی کاری پێ دەکەن، گوناهیش بۆ ئەو کەسە دەنووسرێ، بەبێ ئەوە کە هیچ لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە).

### ١٤٢٢) کەسێ ڕێگەی ڕاست نیشانی خەڵك بدات یا ڕێگەی خراپ. (٦٧٤١ - ٦٧٤٥)

### مَنْ دَعَا إِلى هُدَىً أَوْ ضَلَالَةَ

١٨٦٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ، كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا». {الحديث: ٦٧٤٥ = ٦٧٦٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ ڕێگەی ڕاست نیشانی خەڵك بداو ببێ بە مامۆستای چاکە بۆیان، خۆشی بەقەد ئەو کەسانەی کە بەگوێی دەکەنو شوێنی دەکەون خێری دەگا، بەبێ ئەوە کەهیچ لەخێری ئەوانەی پەیڕەوی دەکەنو چاوی لێ دەکەن کەم بکاتەوە، وە هەرکەسێ ڕێگەی خراپ پیشانی خەڵك بداو ببێ بە نیشاندەرو داهێنەری خراپەو گومڕایی، خۆشی بەقەد ئەوکەسانە کە بەگوێی دەکەنو چاوی لێ دەکەن، گوناهو تاوانی دەگا، بەبێ ئەوە کە هیچ لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٧٤ — ڕێگەی خێر نیشاندان بە خەڵك + تاج/١، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٣٧ — شوێنەواری عیلمو زانست هەتا هەتایە دەمێنێ}.

**ڕوونکردنەوە:**

بەوێنە: زۆر شت لە قورئانو سوننەتدا، وەسپی جوانی کراوە، بەڵام بەشێوەی گشتی، نەوەك بەشێوەی تایبەت. وەك پەخشی زانستو ڕۆشنبیریو خەڵك فێری زانستو زانینو هونەری باشی جوان، کاری ڕەواو پەسەندە لە یاسانامەی خوادا، کەسێ لەم ڕوانگەوە، چاپخانەیێ بکاتەوەو ببێ بەناوەندێکی پەخشی زانستی بەسوودو ڕۆشنبیری باش، لە وڵاتدا ئەوە خاوەنی ئەو چاپخانەیە هەتا ڕۆژی قیامەت خێری ئەو داهێنانە باشەی دەگات، هەروا بە پێچەوانەیشەوە، ئەوانەی کە بوونو، یا لە ئاییندەدا دەبن بەداهێنەری خراپەو گەندەڵی ڕەوشتیو دەبن بەسەرمەشقێ بەد بۆکاری خراپەو خەڵك فێری بەرەڵاییو گۆرانی پیسو سەماو هەڵپەرکێ دەکەن مەردوم پۆل پۆل لە ئایین دەردەکەنو فێری نامەردیو داوێنپیسیو دزیو حیزبیان دەکەنو لەژێر ناوی گەورە گەورەو جواندا، ئەم زەهری هەلایهەلەی خۆیان دەڕێژن، وەك: هونەرمەندو مۆسیقارو... تاد، ئەمانەو وێنەی ئەمانە (أئِمَّةُ الضَّلاَله)نو لەدنیاو قیامەتا ڕوورەشو ڕوو زەردی لای خوداو لای ملەتن!

لەڕاستیدا زۆرینەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، لە وڵاتە ئیسلامییەکانا، بە جۆری نووسراوو بیسراوو بینراویانەوە، بلوێرو زوڕنای شەیتانن‌و بەر مەنطوق‌و مەفهوومی ئەم فەرمووده پیرۆزانه دەکەون، خۆزگەم بەوەی کە بەسەدان فرسەخ لێیانەوە دووره، بەشداریکردن‌و کارکردن لەو دەسگایانەدا، کەبوون بەسەرچاوەی گەندەڵی‌و بەر بەرەڵایی، هۆی مسۆگەر کردنی خەشم‌و قارو رق‌و قینی خودایە!

لەهەمووی سەیرتر کارمەندو بەڕێوەبەرانی ئەم دەسگا راگەیەنێرانە، بەتایبەتی لە وڵاتە موسوڵمانەکاندا، کۆمەڵێ موراهیق‌و لەزەت پەرست‌و ئارەقخۆرو چڵکاو خۆری شەیتان‌و ئاشقی لۆتی بازی‌و چەقەنە سازی‌و سات‌و سەمتوورو سەمان!!

**١٤٢٣) باسی نووسەرانی قورئان‌و هەڕەشەکردن لە درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ). (٧٤٣٤ - ٧٤٣٥)**

**باب: فِي كتبة القرآنء وَالتحذيرِ مِنَ الكَذِبِ عَلَى رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**

١٨٦١- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «لاَ تَكْتُبُوا عَنِّى، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّى غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ، وَحَدِّثُوا عَنِّى وَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ (قَالَ هَمَّامٌ: أَحْسِبُهُ، قَالَ: مُتَعَمِّدًا) فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ». {الحديث: ٧٤٣٥ = ٧٤٧٠ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرەتاوە بە هاوەڵانی خۆی دەفەرموو: (هەرچی دەبیستن لەمن مەینووسن بێجگە لە قورئان، ئەگەر بێجگە لە قورئان شتی ترتان لەمن بیست‌و نووسیتانەوە بیکوژێننەوە، باشتی تر، لە ڕێگەی هەڵەو نەشارەزاییەوە تێکەڵی قورئان نەبێ!

ئەمەیش واتای وانییە کە فەرموودەکانی من پشتگوێ بخەن‌و بایەخیان پێ مەدەن‌و مەیانگێڕنەوە بۆ یەکتری، بەڵکوو بە پێچەوانەوە فەرموودەکانی من لەبەربکەن‌و بۆیەکتری بگێڕنەوە، شتی وا زۆر باشەو قەیدی نییە. لەهەمان کاتدا ئەوەیشتان لەبەرچاوبێ هەرکەسێکیش بەدەم منەوە درۆبکا، باجێگەی خۆی

لەدۆزەخا خۆش بکا). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤١، ژمارە: ١٣٨٠ — نامەی زانین} + {تاج/١، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٥ — دەستوورو ئادابی زانین}.

هەممام کە مامۆستای مامۆستا (شێخی شێخ)ەکەی ئیمامی موسلیمە، لەگێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا، دەفەرموێ: وادەزانم فەرمووی: (هەرکەسێکیش بەدەم منەوە بەقەستی، واتە: بە ئارەزوو، درۆبکاو قسەیێ بەدرۆ بداتە پاڵ من، کەمن ئەو قسەیەم نەکردبێ باجێگەی خۆی لە ئاگری دۆزەخا خۆش بکا).

١٨٦٢- وَعَنْ وَالْمُغِيرَةُ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) يَقُولُ: «إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، فَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ». {الحديث: ٥ = ٦ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٢، رقم: ٦٢٠ = ١٢٩١ فتح الباري. ترمذي. جنائز: ١٠٠٠. تحفة الأشراف: ١١٥٢٠}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیزو نازدارم بیست دەیفەرموو: (درۆکردن بەدەم منەوە، وەك درۆکردن بەدەم کەسی ترەوە نییە، هەرکەسێ بەقەستی بە ئارەزوو بەدەم منەوە درۆ هەڵبەستێو بیکا، باجێگە قنگی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆش بکات!). {تاج/١، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٤ — دەستوورو ئادابی زانین}.

١٨٦٣- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ وَعَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «مَنْ حَدَّثَ عَنِّى بِحَدِيثٍ يُرَى أَنَّهُ كَذِبٌ فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبِينَ». {الحديث المقدمة قبل الحديث ذى الرقم الواحد}:

سەموورەی کوڕی جوندوبو موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ فەرموودەیێ بەدەم منەوە بگێڕێتەوەو سوور بزانێ کە ئەوە درۆیەو بەدەم منەوە هەڵبەستراوە، ئەوە خۆشی یەکێکە لەو درۆزنانە کەئەو درۆیەیان هەڵبەستووەو دەماو دەم دەیگێڕنەوەو بڵاوی دەکەنەوە!).



# ٥٦- نامەی نزاو پاڕانەوە

## كِتَابُ الدُّعَاءِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول بەكوردی، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٥٨ هەتا زنجیرە: ٩٤، لە ژمارە: ٤٩٣٩ وە هەتا ژمارە: ٥١٥٦ م + ریاضی صالحین/٣ بەكوردی لە زنجیرە: ٢٤٤ وە هەتا زنجیرە: ٢٥٤، لە ژمارە: ١٤٠٨ وە هەتا ژمارە: ١٥١٠ + تەجرید بوخاری بەكوردی/٥، زنجیرە: ٨٣، لە ژمارە: ١٩٧٥ وە هەتا ژمارە: ١٩٩٣}.

### ١٤٢٤) ناوە پیرۆزەكانی خوداو كەسێ سەرژمێرییان بكا. (٦٧٥٠ - ٦٧٥١)

### بَابٌ: فِي أَسْمَاءِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَفِيمَنْ أَحْصَاهَا

١٨٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مَنْ حَفِظَهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ». {الحديث: ٦٧٥٠ = ٦٧٦٥ فم. بخاری. دعوات: ٦٤١٠، ٧٣٩٢. ترمذی. دعوات: ٣٥٠٨. تحفة الأشراف: ١٣٦٧٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە، لەسەد یەك كەم، هەركەسێ لەبەریان بكاو كار بە واتاو مەبەستیان بكا، دەچێتە بەهەشت! خودا خۆی تاقەو حەز لە تاق دەكا). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤٩٥٨ — ناوە جوانەكانی خودا}.

**ڕوونكردنەوە:**

خودا خۆی تاكو تەنهایە، نەهاوەڵی هەیە، نەهاو جووتو نە باوكو دایكو كوڕو كچو نەكەس، بەڵام دروستكراو جووتن، وەك ژنو مێردو باوكو كوڕو دایكو كچ. ئەو شتانەیشی كە تاكنو خودا حەزی لێیانە، وەك: پێنج نوێژە، طەوافو سەعی حەوتن، ڕەجمی شەیتان حەوت بەردە، خۆ پاك كردنەوە بەسێ بەردە، ئاسمانەكانو زەمینەكان حەوتن، حەفتە حەوت ڕۆژەو شتانی تری تاكی لەم بابەتە.

**١٤٢٥) نزاو پاڕانەوەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ). (٦٨٣٣ - ٦٨٥٠)**
**باب: دُعاءُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)**

١٨٦٥- عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ الأَشْجَعِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْها) عَمَّا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَدْعُو بِهِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ». {الحديث: ٦٨٣٣ = ٦٨٥١ فم}:

فەروەی کوڕی نەوفەلی ئەشجەعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم پرسی: ئەی دایکی باوەڕداران! پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) چۆنی چۆنی دەپاڕایەوە لەخوداو لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا چی دەفەرموو؟

فەرمووی: زۆر جاران دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ: خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لەشەڕی هەموو کردەوەیەکی خۆمو، لە شەڕی کردەوەی کەسێکی تریش). {تاج/٥، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٥٠٦٧ — ئەو گوتە حەدیسییانەی کە بەکاردەهێنرێن بۆ پەناگرتن بەخودا} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٥٠، ژمارە: ١٤٧٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

لە غایەتولەئموولی شەرحی تاجول ئوصولا دەفەرموێ: (بەکەمێ گۆڕانەوە):

١- ئەوەی کە پێغەمبەر کردوویەتی ئەگەر کارێ خراپ بووبێ، ئەوە پەنا بەخودا گرتن لێی کارێ ئاشکرایە. وەك چیرۆکەکەی پێغەمبەرو عەبدوڵڵای کوڕی مالیك، ناسراو بە ئیبنو ئوم مەکتوومو هاتنی سەرەتای سوورەتی (عَبَسَ وَتَوَلَّى أَنْ جَاءَهُ الأَعْمَى). {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٦٢، لاپەڕە: ٥٥٦، ژمارە: ٤٢٠٣ — سوورەتی عەبەسە}.

وەك چیرۆکی نەییکردنی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لە موتوربەکردنی خورماو پووچەڵبوونی بەرەکەی. {بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ٤٧١، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٣١٦٩ — ڕای پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئیشو کاری دنیایی}.

٢- ئەوەی کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کردوویەتی، ئەگەر فەمانبەریو کاری باشو تاعەت بووبێ، ئەوە پەناگرتن بەخودا لە شەڕی ئەم جۆرە کارەباشە، لەو

رووەویە کەدەبێ بەهۆی لەخۆبایی بوونو بەهۆی بەخۆوە نازینو ریابازیو شتی تری ناپەسەندی لەم بابەتە.

٣- لەشەڕی ئەوەیشی کە نەییکردووە، مەبەست ئەوەیە کە خودا لە ئایینـدەدا بیپارێزێ لـە تووشـبوونی کردنـی ئـەو کـارە خراپـە. یـا لەشـەڕی ئـەوەی کـەخۆی نەیکردووەو کەسێکی تر کردوویەتی یا دەیکا، بەڵام لەوانەیە کە پریشکی ئـەویش بگرێتەوە، وەك خودای گەورە دەفەرموێ: {وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِـنكُمْ خَآصَّةً — أنفال — ٨/٢٥}.

واتـە: ئـەی موسـوڵمانینە! خۆتـان بپـارێزن لـەوجۆرە کـارو کـردارو ڕەفتارانـەی کەسەر دەکێشن بۆ ئاژاوەو کە تاوانبارو بێ تاوان دەگرنەوەو زەرەرو زیانیـان تـەنیا بۆ تاوانکارانو ستەمکاران نییەو بەس، بەڵکوو تەڕو وشك پێکەوە دەسووتێنن).

١٨٦٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيـهِ وَسَـلَّمْ) كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْـتُ، وَبِـكَ خَاصَـمْتُ، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنْـتَ أَنْ تُضِـلَّنِى، أَنْـتَ الْحَـىُّ الَّـذِى لاَ يَمُـوتُ، وَالْجِـنُّ وَالإِنْسُ يَمُوتُـونَ». {الحديث: ٦٨٣٧ = ٦٨٥٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢١٢٧ = ٧٣٨٤، ١٦٩٧ = ١٦٩٧ تەجرید = ٤٨٤٨ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٦٥٥٠}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو دەیفەرموو:

«اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْـتُ، وَبِـكَ خَاصَـمْتُ، اللَّهُـمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِى، أَنْتَ الْحَـىُّ الَّـذِى لاَ يَمُـوتُ، وَالْجِنُّ وَالإِنْسُ يَمُوتُونَ»:

ئەی خودایە! خۆم سپارد بەتۆو بـاوەڕم هەیـە بـەتۆ، پشـتو پـەنام هـەر تـۆیو پشتم بەست بەتۆ، دالْدەم هێناوەتەوە بەرتۆ، بە پشـتی تـۆ دەچم بەگژی ناحـەزی خۆما، ئەی خودایە! من هەمیشە پەنا دەگرم بە گـەورەییو سـەروەریی تـۆ، خـودای تـر نییـە تۆنـەبێ، پـەنا دەگـرم بـە گـەورەیی تـۆ لـەوەی کـە سـەرم لێ بشـێوێنیو

سەرگەردانم بکەیت، تۆ ئەو زیندووە نەمرەیت کە هەرگیز نامریت، هەموو زیندوویێ بێجگە لەتۆ، بەجنۆکەو پەریو فریشتەو مرۆڤیشەوە، هەموو دەمرن‌و کۆتایی بە ژیانیان دێو تەنها هەر خۆت دەمێنیی‌و بەس!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٥٠٤٧ — نزایێ کە خێرو خۆشی هەردوو جیهانی تیابێ + تاج/١، زنجیرە: ١٨٤، ژمارە: ٩٨٦ — خوێندنی قورئان‌و نزاو پاڕانەوە لەشەودا} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٥٠، ژمارە: ١٤٨٠ — نامەی نزاو پاڕانەوە}.

١٨٦٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) كَانَ إِذَا كَانَ فِى سَفَرٍ وَأَسْحَرَ يَقُولُ: «سَمَّعَ سَامِعٌ بِحَمْدِ اللَّهِ وَحُسْنِ بَلاَئِهِ عَلَيْنَا، رَبَّنَا صَاحِبْنَا، وَأَفْضِلْ عَلَيْنَا، عَائِذًا بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ». {الحديث: ٦٨٣٨ = ٦٨٥٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەردا، لەکاتی دەمی بەیانیدا دەیفەرموو: (با ئەوەی کە گوێی لەم وشانەی منە، لەبارەی حەمدو سوپاس‌و نزاو پاڕانەوەوە، با رایبگەیەنێ بە موسوڵمانانی تریش، هەتا ئەوانیش لەم بەرە بەیانەدا، سەرگەرمی یادی خودابن‌و لەخودا بپاڕێنەوە، ئەی پەروەردگارمان! خۆت لەم سەفەرەماندا هاوڕێمانبەو بەچاوی سۆزو میهرەبانی ئاگاداریمان بفەرموو، بەهرەو نازو بەخششی خۆت بڕێژە بەسەرمانا، لەهەمان کاتا کە ئەمەت عەرزدەکەم، پەناش دەگرم بەتۆ ئەی خودایە! لە ئاگری دۆزەخ).

١٨٦٨- عَنْ أَبِى مُوسَى الأَشْعَرِيِّ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى خَطِيئَتِى، وَجَهْلِى، وَإِسْرَافِى فِى أَمْرِى، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى جِدِّى وَهَزْلِى، وَخَطَئِى وَعَمْدِى، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِى، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ». {الحديث: ٦٨٣٩ = ٦٨٥٧ فم. تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى بالكوردى/٥، رقم: ١٩٩١ = ٦٣٩٨ فتح البارى = ١٦٤١ تجريد = ٤٥٢٢ فتح البارى}:

ئەبو مووساى ئەشعەرى (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) جاران ئەم نزایەی دەكردو دەیفەرموو:

«اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى خَطِيئَتِى، وَجَهْلِى، وَإِسْرَافِى فِى أَمْرِى، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى جِدِّى وَهَزْلِى، وَخَطَئِى وَعَمْدِى، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِى، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ»:

واتە: ئەی خودایە! ئەی پەروەردگاری گەورەم! لێم خۆشبە، خۆشبە لە تاوانم، لە نادانیو نەفامیم، لە زیادە ڕەویمو پێلێهەڵبڕینم لە هەموو كارێكما، لەوەی كەتۆ باشتری دەزانی لەمن، خودایە! تاوانەكانم هەموو بپۆشە، چ هی بەڕاستیم بێ، چ هی بەگاڵتەمەوە بێ، چ هی هەڵەو نەزانیم بێ، چ هی ئەنقەس بێ، وە ئەم جۆرە تاوانەیشم هەموو هەن! ئەی خودایە! تاوانی كۆنو نوێم هەموو بپۆشە وە تاوانی نهێنیو ئاشكرام بپۆشە، ئەو تاوانانەیشم بپۆشە كەتۆ خۆت باشتر لێی دەزانیت، پێشخستنو پاشخستن هەر بەدەستی خۆتە، پێشخەرو پاشخەر هەر تۆی، وە هەموو شتێ بۆ تۆ ئاسانە، تۆ دەستەلاتی هەموو شتێكت هەیەو هیچ شتێ لەچنگی تۆ قوتار نابێو هیچ شتێ لەدەستی تۆ دەرناچێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٥٠٤٢ — نزایێ كە خێرو خۆشی جیهانی تیادا بێ} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤٢٤}.

١٨٦٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِى دِينِىَ الَّذِى هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِى، وَأَصْلِحْ لِى دُنْيَاىَ الَّتِى فِيهَا مَعَاشِى، وَأَصْلِحْ لِى آخِرَتِى الَّتِى فِيهَا مَعَادِى، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِى فِى كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِى مِنْ كُلِّ شَرٍّ». {الحديث: ٦٨٤١ = ٦٨٥٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزاى خوداى لێ بێ) دەفەرموێ: جاران خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم نزایەی دەخوێند، دەیفەرموو:

«اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِى دِينِىَ الَّذِى هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِى، وَأَصْلِحْ لِى دُنْيَاىَ الَّتِى فِيهَا مَعَاشِى وَأَصْلِحْ لِى آخِرَتِى الَّتِى فِيهَا مَعَادِى، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِى فِى كُلِّ خَيْرٍ وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِى مِنْ كُلِّ شَرٍّ»:

واتــه: ئــەی خــودای مــن! دینەکــەم، کــە مایــەی خۆشــیی‌و باشــیی هــەموو کاروبارێکمە، ڕێك‌و پێکی بخە بۆم، وە دنیاکەم کەتیا دەژیـم‌و گـوزەرانی تیادەکـەم، سازی بکە بۆم، وە دوارۆژم، کـە تیازینـدوو دەبمـەوە، باشـی بکـە بـۆم، خودایـە! ئـەم ژیانەی ئەم دنیایەم بۆبکە بەهۆی هـەموو زیـادە خێـرێ، وە مردنیشـم بـۆ بکـە بـە دەستمایەی سەرفرازی‌و حەسانەوە لەدەستی هەموو شەڕێ!). {ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٥٠. نامەی نزاو پاڕانەوە، ژمارە: ١٤٧٢ + تاج/٥، زنجـیرە: ٧٠، ژمـارە: ٥٠٤٤ — نـزایێ کە خێرو خۆشی هەردوو جیهانی تیابێ}.

١٨٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَسْعُود (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمْ): أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ الْهُدَى، وَالتُّقَى، وَالْعَفَـافَ وَالْغِنَـى». {الحـديث: ٦٨٤٢ = ٦٨٦٠ فم}:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) گەلێ جار دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ الْهُدَى، وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى»: واتە:

ئەی خودای من! داخوازی ئەم خەڵاتانەت لێ دەکـەم: ڕێگـەی ڕاسـتم پـێ نیشان بدە، لەخودا ترسیی‌و تـەقوام پـێ نیشـان بـدە، ڕوو سـووریم پـێ خـەڵاتکە، دارایـی‌و دەوڵەمەنـدیی دڵ‌و دەروون‌و مـاڵم پـێ خـەڵات بکـە). {تـاج/٥، زنجـیرە: ٧٠، ژمـارە: ٥٠٤٣}.

١٨٧١- عَنْ زِياد بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: لاَ أَقُولُ لَكُمْ إِلاَّ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمْ) يَقُولُ، قَالَ: كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِى تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْـرُ مَـنْ زَكَّاهَـا، أَنْـتَ وَلِيُّهَـا وَمَوْلاَهَا، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا». {الحديث: ٦٨٤٤ = ٦٨٦٢ فم}:

زەیدی کوڕی ئـەرقەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبـەر خـۆی (درووودی خودای لەسەر بێ) چۆن ئـەم نـزایـەی دەخوێنـد، منـیش ئاوەهـا بۆتـانی دەخـوێنم، دەیفـەرموو (درووودی خودای لەسەر بێ):

«اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِى تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاَهَا، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا».
واته:

خودایه! پەنا دەگرم لە بێکارەیی‌و تەوەزەلی‌و ترسنۆکی‌و رژدی‌و چرووکی‌و ئیفتادەیی‌و ئازاری گۆڕ، خودایه! ترسی خۆت بخەرە ناو دڵمەوەو دەروونم کەیل کە لە تەقواو پاك‌و تەمیز رایبگرە، چونکە تۆ خۆت لەهەموو کەسێکی تر، باشتر پاك‌و خاوێنی دەکەیتەوە، لەڕاستیدا تۆ هەر خۆت گەورەو سەروەرو خاوەنی خودی منیت. خودایه! پەنا دەگرم بەتۆ لە زانستی بێ کەڵك‌و بێ سوودو، لە دڵی بێ ئاگای بێ ترس‌و، لە دەروونی چاو برسی‌و، لەدووعاو نزاو پاڕانەوەیێ کە گیرانەبێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٥٠٦٦ — ئەو گوتە حەدیسییانەی کە بەکاردەهێنرێن بۆ پەناگرتن بەخودا}.

**١٤٢٦) نزاو پاڕانەوەی ... خودایه! لێم ببوورەو رەحمم پێ بکەو ئاسوودەییم پێ ببەخشەو رزق‌و رۆژی باشم بدەرێ.** (٦٧٨٣ - ٦٧٩٢)

**بابٌ: الدُّعاءُ ... اللهمَّ اغفِرْ لِی وَارْحَمْنِی وَعَافِنِی وَارْزُقْنِی**

١٨٧٢- عَنْ أَبِي مَالِك الأشجعي عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِىَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) وَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَقُولُ حِينَ أَسْأَلُ رَبِّى عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَ: «قُلِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى وَارْحَمْنِى، وَعَافِنِى وَارْزُقْنِى، وَيَجْمَعُ أَصَابِعَهُ إِلاَّ الإِبْهَامَ، فَإِنَّ هَؤُلاَءِ تَجْمَعُ لَكَ دُنْيَاكَ وَآخِرَتَكَ». {الحديث: ٦٧٩١ = ٦٨٠٧ فم}:

ئەبو مالیکی ئەشجەعی (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: گوێم لێ بوو پیاوێ هات لە پێغەمبەری پرسی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کاتێ لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوەو داوای لێ دەکەم چی بڵێم‌و چۆن بڵێم؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): بڵێ: «قُلِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى وَارْحَمْنِى، وَعَافِنِى وَارْزُقْنِى»: واتە: ئەی خودایه! خۆشبە لێم‌و لە گوناهەکانم ببوورەو بەزەویت بێتەوە پیاماو رەحمم

پێبکەو (ڕێگەی ڕاستم پێ نیشان بدەو) بێوەیو سەر ئاسوودەم کەو رزقو رۆژییەکی حەڵاڵی سەروبەرم پێ بدە). هەموو جارێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکێ لەم چوار وشەیەی دەفەرموو، پەنجەیەکی خۆیی دەنووقان، بەس پەنجە کەڵەی مایەوە کە نەینووقاندبوو، چوار وشەکە ئەمانەن:

١- اغفر لی. ٢- وارحمنی. ٣- وَعَافِنِی. ٤- وارْزُقْنی.

ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پیاوەکەی فەرموو: (نزاو پاڕانەوە بەم وشانە، خێرو خۆشی هەردوو جیهانت بۆ کۆدەکاتەوە!). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٥٠، ژمارە: ١٤٦٩ — نامەی نزاو پاڕانەوە}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو مالیکی ئەشجەعی، ناوی سەعدی کوڕی طاریقی کوڕی ئەشیەمە، خۆی تابیعییە، متمانەیە، طاریقی باوکی سەحابەیە، ئیمامی موسلیم دەفەرموێ: یەك راوی هەیە کە ئەبو مالیکی کوڕی خۆیەتی، دوو فەرموودەی لە موسلیمدا هەیە. لە ئیصابەدا دەفەرموێ: ئەبو مالیکی ئەشجەعی دەفەرموێ: گوتم بە باوکم: بابە! تۆ خۆت لەپشتی پێغەمبەرەوە نوێژی بەیانیت کردووە، هەروەها لە پشتی عومەرو ئەبوبەکرو عوثمانەوە، هەرکەسەیان لەکاتی جێنشینی خۆیاندا، لەپشت عەلیشەوە لە کووفە، نزیکی پێنج ساڵ نوێژی بەیانیت کردووە، جا ئایا ئەم زاتانە، لە جەماعەتی نوێژی بەیانیدا قونووتیان دەخوێند، یان نا؟ باوکم لەوەڵامی ئەم پرسیارەمدا فەرمووی: (شتی وا نەبووە، قونوت خوێندن لە نوێژی بەیانیدا، لەدوا ئەوان داهێنراوە!).

عەسقەلانی دەفەرموێ: تەرمەزی ئەم فەرموودەیەی بە صەحیح داناوە. لە تەهذیبو تەهذیبا دەفەرموێ: ئەبو مالیك هەتا دەوروبەرو سنووری ساڵی سەدو چلی کۆچی ژیاوە، ئیبنو عەبدولبەڕ دەفەرموێ: کەسێ لە زانایانی فەرموودە گومان نابەم کە بەمتمانەو زانای دانەنێ!

**١٤٢٧) نزاو پاڕانەوەی ... خودایە! لەهەردوو جیهانا باشمان بۆبکەو لەسزای دۆزەخ بمانپارێزە.** (٦٧٨١ - ٦٧٨٢)

**بابٌ: الدُّعاء ... اللهُمَّ آتِنَا في الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفي الآخِرةِ حَسَنَةً وقِنَا عذابَ النَّارِ**

١٨٧٣- عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ - وَهُوَ ابْنُ صُهَيْبٍ – قَالَ: سَأَلَ قَتَادَةُ أَنَسًا: أَيُّ دَعْـوَةٍ كَـانَ يَدْعُو بِهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَكْثَرَ؟ قَالَ: كَـانَ أَكْثَـرُ دَعْـوَةٍ يَـدْعُو بِهَـا يَقُـولُ: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِى الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِى الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ». قَالَ: وَكَانَ أَنَـسٌ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ بِدَعْوَةٍ دَعَا بِهَـا فَـإِذَا أَرَادَ أَنْ يَـدْعُوَ بِـدُعَاءٍ دَعَـا بِهَـا فِيـهِ). {الحديث: ٦٧٨١ = ٦٧٩٦ فم. تجريد البخـاري بـالكوردي/٥، رقـم: ١٩٩٠ = ٦٣٨٩، ٤٥٢٢ فـتح الباري} :

عەبدولعەزیزی کوڕی صوهەیب فەرمووی: قەتادە لە ئەنەسی کوڕی مالیکی پرسی: زۆرتـر پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـەکام نزایـە نـزای دەکـرد؟ فـەرمووی: زۆرتـرینـی کـات پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـەم نزایـە نـزای دەکـردو دەیفـەرموو: {اللَّهُمَّ – رَبَّنَا آتِنَا فِى الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِى الآخِرَةِ حَسَـنَةً وَقِنَـا عَـذَابَ النَّـارِ – البقـرة – ٢/٢٠١}.

واتە: خودایە! ئەی پەروەردگاری ئێمە! هەم لەجیهاناو هەم لەڕۆژی پاشە ڕۆژا، بەشی باشمان پێ بدەو، لەهەردوو جیهاندا چاکمان بۆبکـە، وە بمانپـارێزە لـە سـزای دۆزەخ). {تـاج/٤، زنجـیرە: ٣، ژمـارە: ٣٧٢٨ – ئـەوەی لـەبارەی سـوورەتی بەقـەرەوە هاتووە}.

فەرمووی: هەرکاتێ ئەنەس بیویستایە، کە نزایـەکی کورتو پوخـت بکـا، بـەم نزایە دەیکردو دەیفەرموو: {رَبَّنَا آتِنَا فِى الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَـا عَـذَابَ النَّارِ} بەلام کاتـێ کـە دەیویسـت زۆر بپارێتـەوەو نـزای دوورو درێـژبکا، لـەناو ئـەو پاڕانەوەو نزا درێژەدا، ئەم نزایەشی تیا دەخوێندو ئەم ئایەتەیشی دەکرد بە بەشێ لە نزاو پاڕانەوە درێژەکەی.

### ١٤٢٨) نزا بۆ ڕێنمایی‌و شارەزایی. (٦٨٣٣ - ٦٨٥٠)
### بابٌ: الدُّعاءُ بِالهِدايَةِ وَالسَّداد

١٨٧٤- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «قُلِ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي، وَسَدِّدْنِي، وَاذْكُرْ بِالْهُدَى هِدَايَتَكَ الطَّرِيقَ، وَالسَّدَادِ سَدَادَ السَّهْمِ». {الحديث: ٦٨٤٩ = ٦٨٦٧ فم}:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (بڵێ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي: خودایە! ڕێگەی ڕاستم لە ئایینی خۆتدا پێ نیشان بدەو ئاراستەی هەموو کارێکی باشم بفەرموو).

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی نزا خوێن بەم دوو وشە پیرۆزە! گرنگی بە نزاکەت بدە، بەم ڕەنگە کاتێ دەڵێیت: (اهْدِنِي) ئەوە بهێنەرە بەرچاوی خۆت، کەچۆن ئەگەر لە ڕێگەی ڕاستو ڕەوا شارەزاو قاڵ ببیت، ئیتر ڕێگەکە هەڵە ناکەیتو لێت تێك ناچێ، ئاوەهایش خودای گەورە لەڕێگەی ڕاستو دروستی ژیانو ئایینیدا شارەزات بکا، هەتا قەت بەهەڵەدا نەچیت.

هەروەها ئەی نزا خوێن! کاتێ دەڵێیت: (سَدِّدْنِي) لەدڵی خۆتدا، بیرلەوە بکەرەوەو بەباشی ئەوە بهێنەرە بەرچاوی خۆت کەچۆن ئەگەر تیر بەباشی ئاراستەی نیشان بکرێ، بەباشی دەیپێکێو هەڵە ناکا، ئاوەهایش خودا لەهەموو بوارێکی باشی ژیانا، بەرەو چاکەو خێر ئاراستەت بکا، هەتا لە هەڵەبوونو نەپێکان بەدوور بیت!).

### ١٤٢٩) کردنی کاری چاکە لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا، بەدەست کەلاو بەهۆی گیرابوونی. (٦٨٨٤ - ٦٨٨٦)
### بابٌ: الدُّعاءُ بِما عَمِلَ مِنَ الأَعْمالِ الصّالِحَة

١٨٧٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَنَّهُ قَالَ: «بَيْنَمَا ثَلَاثَةُ نَفَرٍ يَتَمَشَّوْنَ أَخَذَهُمُ الْمَطَرُ، فَأَوَوْا إِلَى غَارٍ فِي جَبَلٍ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غَارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجَبَلِ، فَانْطَبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالاً عَمِلْتُمُوهَا صَالِحَةً لِلَّهِ فَادْعُوا اللَّهَ تَعَالَى بِهَا لَعَلَّ اللَّهَ يَفْرُجُهَا عَنْكُمْ، فَقَالَ

أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ وَامْرَأَتِي، وَلِيَ صِبْيَةٌ صِغَارٌ أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا أَرَحْتُ عَلَيْهِمْ، حَلَبْتُ فَبَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ فَسَقَيْتُهُمَا قَبْلَ بَنِيَّ، وَأَنَّهُ نَأَى بِي ذَاتَ يَوْمٍ الشَّجَرُ، فَلَمْ آتِ حَتَّى أَمْسَيْتُ، فَوَجَدْتُهُمَا قَدْ نَامَا، فَحَلَبْتُ كَمَا كُنْتُ أَحْلُبُ، فَجِئْتُ بِالْحِلاَبِ فَقُمْتُ عِنْدَ رُءُوسِهِمَا، أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا مِنْ نَوْمِهِمَا، وَأَكْرَهُ أَنْ أَسْقِيَ الصِّبْيَةَ قَبْلَهُمَا، وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ دَأْبِي وَدَأْبَهُمْ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا فُرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ، فَفَرَجَ اللَّهُ مِنْهَا فُرْجَةً فَرَأَوْا مِنْهَا السَّمَاءَ. وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَتْ لِيَ ابْنَةُ عَمٍّ أَحْبَبْتُهَا كَأَشَدِّ مَا يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءَ، وَطَلَبْتُ إِلَيْهَا نَفْسَهَا، فَأَبَتْ حَتَّى آتِيَهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَتَعِبْتُ حَتَّى جَمَعْتُ مِائَةَ دِينَارٍ، فَجِئْتُهَا بِهَا، فَلَمَّا وَقَعْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا، قَالَتْ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَفْتَحِ الْخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ، فَقُمْتُ عَنْهَا، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا فُرْجَةً، فَفَرَجَ لَهُمْ. وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنِّي كُنْتُ اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا بِفَرَقِ أَرُزٍّ، فَلَمَّا قَضَى عَمَلَهُ قَالَ: أَعْطِنِي حَقِّي، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ فَرَقَهُ، فَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَرًا وَرِعَاءَهَا، فَجَاءَنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَظْلِمْنِي حَقِّي. قُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ وَرِعَائِهَا فَخُذْهَا، فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَسْتَهْزِئْ بِي، فَقُلْتُ: إِنِّي لاَ أَسْتَهْزِئُ بِكَ، خُذْ ذَلِكَ الْبَقَرَ وَرِعَاءَهَا، فَأَخَذَهُ فَذَهَبَ بِهِ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مَا بَقِيَ، فَفَرَجَ اللَّهُ مَا بَقِيَ). {الحديث: ٦٨٨٤ = ٦٩٠٤ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٠٠٥ = ٢٢٧٢ فتح الباري}

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ سێ کەس بە ڕێگایەکا دەڕۆیشتن، لەنەتەوە پێشینەکان بوون، باران دایگرتن، جا شەوێ پەنایان بردە ناو ئەشکەوتێ لەکێوێ، تاوێرێ لە کێوەکەوە بەربۆوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی قەپاتکرد، جا لەناو خۆیاندا گوتیان: ئادەی سەیربکەن بزانن چی کردەوەیەکی باشتان کردووە بۆ خودا، بەو کردەوانە لەخودا بپاڕێنەوە، سا بەشکوو خودا بەهۆی ئەو کردەوە باشانەوە دەرووتان لێ بکاتەوەو لەم گابەردە رزگارتان بکا.

یەکێکیان گوتی: خودایە! خۆت ئاگات لێیەو ئاگاداریت کە من باوك‌و دایکێکی پیرو ئیختیارم هەبوون‌و لەگەڵ ژنێك‌و چەند منداڵێکی وردا، شوانیم بۆیان دەکردو بەشوانی بەخێوم دەکردن، هەموو جارێ کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە، رانەکەم دەکردە پەچەوەو شیرم دەدۆشی‌و لەپێشدا دەرخواردی دایك‌و باوکم دەدا، ئەوجا بەشی منداڵەکانی خۆشم لە شیرەکە دەدا، تا رۆژێ بەشوێن لەوەڕی باشا دوورکەوتمەوەو درەنگم بەسەرهات‌و کە هاتمەوە شەو بوو، روانیم کەوا باوك‌و دایکم نووستوون، منیش وەك جاران شیرم دۆشی‌و بۆیانم بردو بەدیار سەریانەوە راوەستام هەتا کەی خەبەریان بۆوە شیرەکەیان بخۆنەوە، بەڵام حەزم نەکرد کە خەبەریان بکەمەوەو پێشم ناخۆش بوو کە بەرلەوان شیر بدەم بە ژن‌و منداڵەکانم، منداڵەکانیش لەو ماوەیەدا لەبەرپێما لەبرساندا هەر دەزرووکانەوە، هەتا شەبەقیدا ئەمە حاڵمان بوو، جا ئەی خودایە! تۆ خۆت دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندیی تۆ کردووە، ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوەو کەلەبەرێکمان بۆ بکەرەوە، کە ئاسمانی لێوە ببینین.

جا خودا کەلەبەرێکی بۆ کردنەوەو ئاسمانیان لێوەی بینی‌و تاوێرەکە تۆزێ خزا بەڵام نەیانتوانی لێوەی دەربچن.

یەکێکی تریان گوتی: خودایە! خۆت ئاگاداری کە کچێکی ئامۆزام هەبوو، چەندە پیاو حەز لە ئافرەت دەکا ئەوەندە حەزم لێی بوو، کە داوای ئیشی خراپەم لێکرد خۆی نەدا بەدەستەوە، هەتا ساڵێکیان دووچاری گرانی‌و قات‌و قڕی بوو، وە بەناچاری خۆی هات بۆلام، دیسان خۆی نەدا بەدەستەوە تاسەد دیناری زێڕی پێ نەدەم، منیش تێکۆشام‌و خۆم ماندووکرد تا ئەو پارەیەم کۆکردەوەو بۆم بردو دام پێی لەباتی ئەوەی کە خۆیم بدا بەدەستەوە، ئەویش وایکرد، جا کاتێ دەستم لێی گیربوو، وە لەناو کۆشیا دانیشتم‌و ویستم بەدەستی بگرم، کچەکە گوتی: ئامۆزا! ئەی عەبدەڵلا! ئەی بەندەی خودا! لەخودا بترسەو ئەم مۆرە بەناڕەوا مەشکێنە!

ئیتر منیش هەڵسام‌و وازم لێ هێناو پارەکەیشم داپێی بەخۆڕایی بۆ خۆی، وە لەو کاتەیشدا لەهەموو کاتێ زیاتر حەزم لێی بوو، جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی

ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندیی تۆ کردووە، ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوەو لەم سەخڵەتییە رزگارمان بفەرموو، ئیتر خودا دەروویەکی تری لێکردنەوەو تا دوو بەش لەسێ بەشی تاوێرەکە خزاو لەسەر دەرگاکە لاچوو، بەڵام کەلەبەرەکە وەها گەورە نەبوو کە بتوانن لێوەی بچنە دەرەوە!

سێیەمیان گوتی: ئەی خودایە! تۆ خۆت ئاگات لێیە، کەمن جارێ بەقرناخێ برنج کرێکارێکم بەکرێ گرت، کە ئیشەکەی تەواو کرد، گوتی: کرێکەمم پێ بدە، منیش گوتم: کرێکەت ئەوەتانێ، کەچی بەدڵی نەبوو، وەری نەگرت، منیش کەئەو رۆیی پارەو کرێی کرێکارەکانی ترم هەموودا، وە چەڵتووکەکەی ئەویشم هەموو وەرزێ دەچاندو بەرهەمم دەهێنا، تاوا زۆر بوو گاگەلێك و وشترو مەڕو چەند بەندەیەکی شوانم پێی کڕی، تا رۆژێ کرێکارەکە هاتەوە بۆلام، گوتی: لەخودا بترسە کرێکەمم پێ بدە. منیش گوتم پێی: بڕۆ ئەو رانە وشترو گاگەل و رانە مەڕو شوانەکانیان ببە بۆ خۆت، هەمووی هی کرێکەتە، گوتی: ئەی عەبدی خودا! لەخودا بترسە گاڵتەم پێ مەکە. منیش گوتم: بەڕاستمە، گاڵتەت پێ ناکەم، هەمووی هی خۆتە بڕۆ بیبە بۆ خۆت. ئیتر ئەویش هەمووی برد بۆ خۆی و رۆیشت. جا ئەی خودایە! تۆ خۆت دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر خاتری تۆ کردووە، ئەوا دەرگای ئەشکەوتەکەمان بەتەواوی بۆ بکەرەوە، جا خودای گەورە بەهۆی ئەم کردەوە باشانەیانەوەو بەهۆی نیازی پاکیانەوە دەرگای ئەشکەوتەکەی بە تەواوی بۆیان کردەوەو تاوێرەکە تەواو خزاو هاتنە دەرەوەو بە رێگەی خۆیانا رۆیشتن!).

{ریاضی صالحین/١، زنجیره: ١، ژماره: ١٢ — باسی نیازو نیازپاکی + تاج/١، زنجیره: ١١، ژماره: ٨٥ — نیازو نیازپاکی}.

## ١٤٣٠) نزای کاتی مەینەتی و سەخڵەتی. (٦٨٥٨ - ٦٨٦١)

## بابٌ: الدُّعَاءُ عِنْدَ الكَرْبِ

١٨٧٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ نَبِيَّ اللَّـهِ (صَلَّى اللّـهُ عَلَيـهِ وَسَلَّمْ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: «لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ رَبُّ الْعَرْشِ

الْعَظِـيمِ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ رَبُّ السَّـمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَـرْشِ الْكَـرِيمِ». {الحـديث: ٦٨٥٨ = ٦٨٧٧ فم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري/٦، رقم: ١٩٨٥ = ٦٣٤٥، ٦٣٤٦، ٧٤٢٦، ٧٤٣١ فتح الباري. ترمذي. دعوات: ٣٤٣٥}:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لەکاتی سەخڵەتیو دڵتەنگیو مەینەتو لێقەوماندا، کەخەم دایدەگرت دەیفەرموو:

«لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ». واتە:

خودای راستو دروستو بەهەق هەر یەزدانی پاکەو بەس، خودای تر نییە بێجگە لەخۆی، کە خودایەکی گەورەو هێمنو خاوەنی حیلمو حەوسەڵەیە، خودای بەهەق هەر یەزدانی پاکە، کە خاوەنی عەرشی مەزنە، کە تەختو بارەگای حوکمڕانی خۆیەتی، خودای بەهەق بەس یەزدانی پاکە، کە خاوەنی یەك بەیەکی گشت ئاسمانەکانو زەمینە، کە خاوەنی عەرشو بارەگای نازداری خودای گەورەو سەروەرە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٥٠٧٨ — نزاکانی مەینەتبار}.

## ١٤٣١) نزای بەندە گیرادەبێ بەمەرجێ پەلەنەکا. (٦٨٦٩ - ٦٨٧١)
## بَابٌ: يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَالَمْ يَعْجَلْ

١٨٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَنَّـهُ قَالَ: «لاَ يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ مَا لَمْ يَسْتَعْجِلْ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا الاسْتِعْجَالُ؟ قَالَ: «يَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ وَقَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ أَرَ يَسْتَجَابُ لِي، فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذَلِكَ وَيَدَعُ الدُّعَاءَ». {الحديث: ٦٨٧١= ٦٨٩١ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٨٤ = ٦٣٤٠ فتح الباري}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو:** (هەمیشە نزاو پاڕانەوەی بەندە قەبووڵ دەبێو خودای گەورە گیرای دەکا،

بەمەرجێ دووعای ناهەق نەبێ، وەك ئەوە نزا بۆ بڕینی ڕشتەی خزمایەتی بکا، بەڵام بەمەرجی ئەوەیش کە پەلەنەکا).

عەرزی خۆشەویست کرا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پەلە پەل وەکوو چی؟ فەرمووی: (وەك نزا خوان بڵێ: من هەر دووعاو نزا دەکەمو هەرگیرا نەبوو، ئیتر بەرە بەرە نائومێد دەبێو کۆڵ دەداو واز لە نزاکردن دەهێنێو نزاکەی گیرا نابێ!).

**ڕوونکردنەوە:**

واتە: بەردەوام بوون لەسەر پاڕانەوەو، وڕك گرتن لە خودای گەورەو میهرەبان کە بێت بەهاوارتەوەو کۆڵ نەدان لە نزاو دووعا، نیشانەی گیرابوونیەتی!

**١٤٣٢) بەجەخت نزاکردنو نەڵێ: ئەگەر حەزدەکەیت.** (٦٧٥٢ - ٦٧٥٤)
**بَابٌ: الْعَزْمُ فِي الدُّعَاءِ، وَلا يَقُلْ إِنْ شِئْتَ**

١٨٧٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمُ: اللَّهُمَّ اغفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ، اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ، لِيَعْزِمْ فِي الدُّعَاءِ، فَإِنَّ اللَّهَ صَانِعٌ مَا شَاءَ، لاَ مُكْرِهَ لَهُ». {الحديث: ٦٧٥٤ = ٦٧٦٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٨٣ = ٦٣٣٩، ٧٤٧٧ فتح الباري}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەستان مەڵێن لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا: خودایە! ئەگەر خۆت ئارەزوو دەکەی لێم خۆشبە، خودایە! ئەگەر خۆت ئارەزوو دەکەی ڕەحمم پێ بکە، داواکەتان یەك لایی بکەنەوەو سووربن لەسەریو بەجەخت داوا لەخودا بکەنو ئەگەرو مەگەر لە نزاو پاڕانەوەدا مەکەن، بەڵکوو بەبێ مەرجو بەستنەوە بەشتێکەوە، ڕێكو ڕاست داوای شت لەخودا بکەن، وەك ئەوە بڵێن بەبێ قەید: خودایە! لە گوناهمان خۆشبە، زیندوومان سەلامەتکە، لە مردوومان خۆشبە، شیفای نەخۆشمان بدە، دڵو ماڵو وڵاتمان ئاوەدان بفەرموو، چونکە کەس زۆری لەسەر خودا نییە، تۆ بڵێیتو نەڵێیت خودا ئەگەر مەیلی لەسەر شتێ نەبێ نایکا). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٥٠١٩}.

**١٤٣٣) هەموو شەوێ کاژێرێکی تایبەتی واتیادا نزای تیا گیرایە. (١٧١٤ - ١٧٧٥)**

**بَابٌ: فِي اللَّيْلِ سَاعَةٌ يُسْتَجَابُ فِيهَا**

١٨٧٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) يَقُولُ: «إِنَّ فِي اللَّيْلِ سَاعَةً، لاَ يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ». {الحديث: ١٧٦٧ = }:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەشەودا کاژێرێ هەیە، هەر پیاوێکی موسوڵمان، ئەو کاژێرەی بەنسیب ببێ، داوای هەر خێرێ لە کاروباری جیهان، یا لەکاروباری دواڕۆژ لەخودا بکات مسۆگەر خودا پێی دەدا، ئەو کاژێرە لەهەموو شەوێکا هەیە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٥٠٢٢ + تاج/١، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ٨٧٦، ٨٧٧، ٧٧٨، ٨٧٩ + تاج/١، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ٨١٩ — خێرو گەورەیی رۆژی هەینی}.

**١٤٣٤) هاندان لەسەر نزاو یادی خودا لەکۆتایی شەوداو گیرابوونی نزا تیایدا. (١٧١٤ – ١٧٧٥)**

**بَابٌ: التَّرْغِيبُ فِي الدُّعَاءِ وَالذِّكْرِ فِي آخِرِ اللَّيْلِ وَالإِجَابَةِ فِيهِ**

١٨٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي كُلِّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، وَمَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، وَمَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ». {الحديث: ١٧٦٩ =تجريد البخارى بالكوردى/١، رقم: ٥٧٢ = ١١٤٥، ٦٣٢١، ٧٤٩٤ فتح البارى. أبو داود. صلاة: ١٣١٥. ترمذى. دعوات: ٣٤٩٨. تحفة الأشراف: ١٣٤٦٣}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە سێیەکی دوایی شەودا، هەموو شەوێ، ساڵ دوازدە مانگە، خودای پەروەردگاری پیرۆزو گەورەمان، دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی خواروو، دەفەرموێ: کێ لەم دەمەدا لێم دەپاڕێتەوە تابچم بە هاوارییەوە، کێ لەم دەمەدا داوای شتم لێ دەکا تا بەشی باشی پێ بدەمو بێبەشی نەکەم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکا تا لێی خۆشم بم!).

**روونکردنەوە:**

شێخی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەڕاڤەو ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا، زۆر زانایانەو مەلایانە، لە هاتنە خوارەوەی خودا بۆ ئاسمانی خواروو دەدوێ، وەڕاو بۆچوونی زاناو لایەنو کۆمەڵە مەزهەبییەکان باس دەکا. یەکێ لەو زاتانە ئیبنو عەرەبییە، کە دەفەرموێ: (من ڕام لەسەر تەئویلی ئەم جۆرە فەرموودانەیە، کە بۆنی جیهەتو لاو جێگەو شوێنیان لێ دێ).

**١٤٣٥) نزا لەکاتی خوێندنی کەڵەبابدا. (٦٨٥٧)**

**بابٌ: الدُّعاءُ عِنْدَ صِياحِ الدِّيكَةِ**

١٨٨١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ، فَاسْأَلُوا اللَّهَ تَعَالَى مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا، وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَانًا». {الحديث: ٦٨٥٧ = ٦٨٧٦فم. تجريد البخارى بالكوردى/٣، رقم: ١٣٣٢ = ٣٣٠٣ فتح البارى. أبو داود. أدب: ٥٦٠٢. ترمذى. دعوات: ٣٤٥٩. تحفة: ١٣٦٢٩} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گوێتان لە قووقەی کەڵەشێر بوو، داوای بەهرەو بەخشش لە خودای گەورە بکەن، چونکە ئەوە بۆیە دەخوێنێ چونکە فریشتەی دیوە، کاتێ گوێتان لەزەڕەی کەریش بوو، پەنابگرن بەخودا لەشەڕی شەیتان، وەك ئەوە بڵێن: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: پەنادەگرم بە ڕەحمەتی خودا لە شەڕی شەیتانی بێبەش لە ڕەحمەتی خودا) چونکە کەر کە دەزەڕێنێ شەیتان دەبینێ، یا شەیتان دێتە بەرچاوی!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧٧، ژمارە: ٥٠٩٦ — گوتەی کاتی خوێندنی کەڵەباب} .

**١٤٣٦) خێرو باشیی نزایێ کە لەڕوو نەبێ. (٦٨٦٦)**

**بابٌ: الدُّعاءُ لِلْمُسْلِمِ بِظَهْرِ الغَيْبِ**

١٨٨٢- عَنْ صَفْوَانَ - وَهُوَ ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ - وَكَانَتْ تَحْتَهُ أُمَّ الدَّرْدَاءِ، قَالَ: قَدِمْتُ الشَّامَ فَأَتَيْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فِى مَنْزِلِهِ، فَلَمْ أَجِدْهُ، وَوَجَدْتُ أُمَّ الدَّرْدَاءِ، فَقَالَتْ: أَتُرِيدُ

الْحَجَّ الْعَامَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ. قَالَتْ: فَادْعُ اللَّهَ لَنَا بِخَيْرٍ، فَإِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) كَانَ يَقُولُ: «دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ، عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ، كُلَّمَا دَعَا لأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: آمِينَ وَلَكَ بِمِثْلٍ». قَالَ: فَخَرَجْتُ إِلَى السُّوقِ، فَلَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَقَالَ لِي مِثْلَ ذَلِكَ، يَرْوِيهِ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ).

{الحديث: ٦٨٦٦ = ٦٨٨٥ فم}:

صەفوانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی صەفوان، کە مێردی دەردائی کچی ئەبو دەرداء بوو، دەفەرموێ: چووم بۆ شام، لەوێ چووم بۆ ماڵی ئەبو دەردائی خەزوورم، خۆی لەماڵ نەبوو، خەسووم ئوم دەرداء لەماڵ بوو، خەسووم گوتی: ئەمساڵ دەچیت بۆ حەج؟ گوتم: بەڵێ. فەرمووی: (دەی لەلای خودای گەورە نزای باشمان بۆبکە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نزاو دۆعای موسوڵمان بۆ خوشكو برای ئایینی خۆی، کە لەروونەبێو لە پاشەملە بێ، دووعای وا گیرایە لەلای خوا، لە راسەریەوە فریشتەیێ هەیە، ئەوەی پێ راسپێراوە، گشت جارێ کە ئەو نزایەکی باش، لەنادیارو پاشەملە بۆ برای ئایینی خۆی بکا، چ پیاوبێ، چ ژن، فریشتەکەیش دەفەرموێ: ئامین، یاخوا نزاکەت گیرابێ، وە ئەوەندەی ئەوەیش بۆ تۆبێ!).

صەفوان فەرمووی: جاچووم بۆ بازاڕ، لەوێ تووشی ئەبو دەردای خەزوورم بووم، ئەویش هەمان شتی پێم فەرموو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وایفەرمووە). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٥١. ژمارە: ١٤٩٤، ١٤٩٥ — خێری نزایێ لەروو نەبێ} + {تاج/٥، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٥٠٣٢ — نزای گیراو نزای پەسەند}.

### ١٤٣٧) ناباشیی نزای پێشخستنی تۆڵە لە جیهاندا. (٦٧٧٦ - ٦٧٧٩)

### بابٌ: كراهيَةُ الدُّعاءِ بتعْجيلِ العُقوبَةِ في الدُّنْيا

١٨٨٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) عَادَ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ قَدْ خَفَتَ فَصَارَ مِثْلَ الْفَرْخِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «هَلْ كُنْتَ تَدْعُو بِشَيْءٍ أَوْ تَسْأَلُهُ إِيَّاهُ»؟ قَالَ: نَعَمْ، كُنْتُ أَقُولُ: اللَّهُمَّ مَا كُنْتَ مُعَاقِبِي بِهِ

فِي الآخِرَةِ، فَعَجِّلْهُ لِي فِي الدُّنْيَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «سُبْحَانَ اللَّهِ لاَ تُطِيقُهُ أَوْ لاَ تَسْتَطِيعُهُ، أَفَلاَ قُلْتَ: اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ». قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ لَهُ فَشَفَاهُ. {الحديث: ٦٧٧٦ = ٦٧٩١ فم. ترمذي. دعوات: ٣٤٨٧. تحفة الأشراف: ٣٩٣}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی برد بۆ هەواڵپرسی پیاوێکی موسوڵمان، کە نەخۆش بوو، وەك بەچکەی مەل ئاوەڕووت بکرێ ئاوا داماڵا بوو، دەتگوت چیلکەی رەق و تەقە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئایا هیچ نزایەك دەکەی، یاخود داوای شتێکت لەخودا دەکرد لەمەوپێش؟).

پیاوە نەخۆشەکە گوتی: بەڵێ، قوربان! هەر دەمگوت: خودایە! تۆڵەی ئەو جیهانیشم لەم جیهانەدا لێ بستێنە!

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوبحانەڵڵا لەم کارە سەیرە! بەرگەی ئەوە ناگری). یا فەرمووی: (توانای ئەوەت نییە، دەبوو بتگوتبایە: اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ: خودایە! ئەی پەروەردگاری ئێمە! لەهەردوو جیهاندا، بەشی باشمان پێ خەڵات بفەرموو، وە لەسزای دۆزەخ بمانپارێزە!).

فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆی پاڕایەوەو خودا چاکی کردەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٥٠٤١ – نزایێ کە خێرو خۆشی هەردوو جیهانی تیابێ} + {تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٧٢٨ – سوورەتی بەقەرە}.

### ١٤٣٨) خۆزگە خواستن بۆ مەرگ لەکاتی ناخۆشیداناباشە. بەڵکوو لەهەموو دۆخێکا نزای باش باشە. (٦٧٥٥ - ٦٧٦٠)

### فِي كَرَاهِيَة تمني الموت لضُرٍّ ينزل به والدعاء بالخير

١٨٨٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ مُتَمَنِّيًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ

الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي». {الحديث: ٦٧٥٥ = ٦٧٧٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٨٦٦ = ٥٦٧١، ٦٣٥١، ٧٢٣٣. فتح الباري. أبو داود. جنائز: ٣١٠٨. ترمذي. جنائز: ٩٧١. نسائي. جنائز: ١٨٢٠. ابن ماجة. زهد: ٤٣١٩. تحفة الأشراف: ٩٩١}:

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرمویٚ:**

**(ئەگەر یەکێکتان دووچاری زیانێ بوو، یا تووشی ناخۆشییەك بوو، خۆزگە بۆ مردن نەخوازیٚو مەرگ بەئاوات نەخوازیٚ، ئەگەر هەر ناچاربوون، شتی وابکەن بلّێن: خودایە! هەتا ژیانم بۆم باشترە بم ژێنە، کەییش مردنم باشتربوو بۆم بم مرێنە!).**

**١٨٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ): «لاَ يَتَمَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ، وَلاَ يَدْعُ بِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَهُ، إِنَّهُ إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ، وَإِنَّهُ لاَ يَزِيدُ الْمُؤْمِنَ عُمْرُهُ إِلاَّ خَيْرًا». {الحديث: ٦٧٦٠ = ٦٧٧٥ فم}:**

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرمویٚ:**

**(مەرگ بەئاوات مەخوازن، وە مەڵێن ئەی خودا مەرگ! پێش ئەوەی کە مەرگ خۆی بگاتە سەرتان، چونکە کاتێ کەسێ لەئێوە دەمرێ، هەموو کردەوەیەکی کۆتایی دێت، بێگومان مرۆڤی موسوڵمان تازیاتر تەمەنی، درێژبێ، زیاتر خێری بۆ مسۆگەر دەبێ!).**

**روونكردنەوە:**

**أ/ گرنگترینی دەستوورەکانی نزاو پاڕانەوەو دووعاکردن:**

**١. لەکاتی پاڕانەوەو نزاکردندا، بەپێی بواری گونجاو، ئەگەر دەستی دەدا بۆی، لەشی پاك بێ، جلەکانی پاك بێ، دەستی بە دەستنوێژبێ، نزاو پاڕانەوە زۆر زۆر بکات.**

**٢. رووی لەرووگەبێو بەرەو قیبلە دابنیشێ، یا بەپێوە رابوەستێ، یا بەرێزەوە رابکشێ، بەپێی حالّ.**

**٣. بۆ ژنو بۆ پیاو بەرگی شەرعی پاکی حەلاڵی لەبەردابێ.**

٤. هەردوو دەستی هەتا ئاستی هەردوو سەرشانی لەسەرەتای نزاو پاڕانەوەکەوە هەتا کۆتایی، هەردوو دەستی هەڵبڕێ، بە پاکی، حیکمەتی ئەو دەست بەرزکردنەوەیش ئەوەیە کە نزا خوێن بەدڵو بەکوڵ پەنا دەباتە بەرخودا، وەك کەسێکی غەرقبوو لەناو دەریادا، دەست بەرزدەکاتەوە هەتا کەسێ دەستی بگرێو لەخنکان رزگاری بکا.

٥. کە نزاکە تەواو بوو، بەری هەردوو دەستی بهێنێ بە دەمو چاویدا.

٦. بەپێی حاڵ زیکرو دوعاو نزاو پاڕانەوەکە بەنهێنیو بە شێنەییو بە کوڵو بەدڵ بێو وڕکی تیابێ لەخوا کە ئیشەکەی بۆبکا.

٧. ئەگەر پێشەوای کەسانی تربوو، ئەوە واباشە کە بەپێی شوێن دەنگ هەڵبڕێ، هەتا نزاخوێنەکانی تریش شوێن ئەو بکەونو بەرەوانی نزاکە بخوێننو هەڵەی تیادا نەکەن، وەك کاتی قونووت لەناو نوێژی بەیانیو لە نوێژی وەتری رەمەزاندا. هەرکاتێ خۆیان فێربوون با بەدەنگی نزم نزاکە بخوێنێو ئەوانی تریش خۆیان بەدەنگی نزم نزاکە بخوێنن.

٨. لەسەرەتای دەستپێکردنەوە، سوپاسو ستایشی خودا بکاو بیسمیللا بکا، باشترین شت، زیکری باقیات الصالحاتە، کە ئەمە دەقەکەیەتی: (سُبْحَانَ اللّهِ وَالحمدُ لِلّهِ وَلا إله إلاّ اللّهُ وَاللّهُ أكبَرُ).

٩. هەروا لەسەرەتاوە، لەپاش ناوهێنانو سوپاسو ستایشی خودای گەورە درووود بنێری بۆ گیانی پیرۆزی پێغەمبەرو سەلاواتی لەدیاربدات، وەك ئەوە بڵێ:
(اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى سَيِّدِنَا محمدٍ وَعَلَى آلِ سَيِّدِنا محمد، كَمَا صَلَّيْتَ وَسَلَّمْتَ وَبارَكْتَ عَلَى سيدِنا إبراهيمَ وَآلِ سَيِّدنا إبراهيم فِي العَالمينَ. إنَّكَ حَمِيدٌ مجيد).

یا بەکوردی بڵێ: (درووودو سلاو بۆ گیانی پیرۆزی پێغەمبەری خۆشەویستو کەسوکارو هاوەڵانی).

١٠. لەکۆتاوە حەمدو سوپاسەکە دووبارەبکاتەوە، وەك ئەوە بەتێگەیشتنەوە، لەناخی دڵەوە بڵێ: (وَآخِرُ دَعْوَانَا أنِ الحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ العَالمين).

١١. هەروا لەکۆتاوە درووودو سەڵاواتو سەلامەکە دووبارە بکاتەوە.

١٢. لەكاتێكا كە هێشتا دەستەكانی بەرزەوە كردووەو بەری هەردوو لەپی هەر لەئاسمانە، كە رووگەو قیبلەی نیازمەندان و نزاكارانە، بە كوڵ و بەدڵ، لەناخی دڵەوە بڵێ: (ئامین) ئەگەر چەند جارێكیش دووبارەی بكاتەوە قەیدی نییە. ئامین واتە: خودایە! ئەم نزایەمان گیرابفەرموو، قبووڵی بكە لێمان، بە عەرەبیش یا بەكوردیش دەبێ كە مرۆڤ بڵێ: (اللهم تَقَبَّلْ مِنَا = خودایە! وەری بگرە لێمان).

١٣. بە دڵێكی بەئاگای پڕ لەئومێدی گیرابوونەوە نزاكە بكرێ، جەختی تیابكا، ورك لەخودا بگرێ، كەدڵی ئەم بەندە زەبوونەی خۆی نەشكێنێ و بەجۆرەها شێوە باسی زەبوونیی و داماوی و ئاتاجی خۆی بكاو بەخوشوع و خوضوعەوە بێ.

١٤. وەك گوتمان لەكاتی نزاكردنەكەدا دەست هەڵبڕێ و بەبەری دەست داوای بەخشش و خەڵات و نازو بەهرە لەخودا بكا، بەڵام ئەگەر ویستی خودا بەڵایەكی لەكۆڵ بخات، یا پەنابگرێ بەخودا لە ئێش و ئازارو دەردو بەڵا، با لەم كاتانەدا، پشتی دەستی بكاتە ئاسمان، وەك كەسێ پاڵ بە بەڵایەكەوە بنێ و ئێش و ئازارێ لەخۆی دوور بخاتەوە ئاوا، بەڵام ئەگەر پشتی دەستی نەكاتە ئاسمان قەیدی نییە.

١٥. لەخۆیەوە دەست پێ بكا، حەزرەتی پێغەمبەر ئیبراهیم (درودی خودای لەسەر بێ) بكا بەسەر مەشق بۆ خۆی كە دەفەرموێ: {رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ – ١٤/٤١}.

واتە: ئەی پەروەردگاری گەورەمان! خۆشبە لەخۆم و لە باوك و دایكم و لەهەموو ئیمانداران لەرۆژی لێپرسینەوەدا، كەهەموو كەسێ دادگایی دەكرێ و لەدیوانی خوادا رادەوەستێ بۆ دادگایی و لێپرسینەوە).

١٦. نزاو پاڕانەوە تا سێجار دووبارە بكرێتەوە.

١٧. هەندێ نزاو پاڕانەوە تایبەتن بەكات و بە شوێن و بەبۆنەی تایبەتەوە، وەك نزای قنووت، یا نزای طەوافی بەیت و طەوافی صەفاو مەروەو نزای كاتی ژنهێنان و شووكردن و منداڵبوون و كاتی سەفەرو هاتنەوە لە سەفەرو رۆژی

هەینیو ڕۆژی جەژنو کاتی سواربوونو دابەزینو کاتی سەردانی نەخۆشو ناشتنی دارو درەختو دەستکردن بەخوێندنو بە دەرسو زۆر شتی تر، لەگەڵ دووبارە بوونەوەی بۆنەکانا، نزاکەش دووبارە دەبێتەوە، دەنانا.

١٨. متمانەو باوەڕی تەواوی وابێ کەخودا نزاکەی گیرا دەکاو نائومێدی ناکا، جا یاخودا خودی داواو مەبەستەکەیی بۆ جێبەجێ دەکا، یا بەشتێ تر هەقی بۆ دەکاتەوە، جا لەم جیهاندابێ یا لەوجیهاندا بێ خودا هەقی بۆ دەکاتەوە.

١٩. واباشە دووعای مەئثوور، کەئەو جۆرە نزاو پاڕانەوەو داخوازییانەن کە لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەرو فەرمایشتی هاوەڵانی پێغەمبەردا هاتوون، بەهەمان شێوەو لەفظو شەکڵو شێوەی خۆیان کە لەقورئانو سوننەتدا هاتوون ئاوا دووبارە بکرێنەوە، بەبێ کەمو زیاد. بەڵام دروستە بە وەرگەڕاوو تەرجەمەکەشیان نزابکرێ، گرنگ ئەوەیە کەدڵی لەلای نزاکەبێ.

ب/ گرنگترینی مەرجەکانی گیرابوونی نزاو پاڕانەوە:

١. داواو مەبەست (مطلوب)ەکە، ڕەواو شەرعی بنو، گوناهو تاوانو ناهەقی نەبن.

٢. نزا خوێن حەڵاڵخۆربێو خۆی لەهەموو حەرامو بێ شەرعیو گوناهێ بپارێزێ، تەنانەت نابێ نزای باش بۆکەسێ بکا کە شایانو شایستەی ئەو نزایە نەبێ!!

٣. ئەرکە ئایینییەکان بەجێ بهێنێ، وەك: نوێژو ڕووژو حەجو زەکاتو پابەندبوون بە شەریعەتی خوداوە.

٤. پاکیو خاوێنی ئاشکراو نهێنی، وەك: دڵو دەروونو جەستەو جلو بەرگو شوێنو نیازی پاك.

ج/ گرنگترینی کاتەکانی نزاکردن بەشێوەی گشتی:

١. باشترین کات بۆ نزاو پاڕانەوەو سکاڵای حاڵ، لەلای خودای گەورە: سێیەکی کۆتایی شەوە، بەتایبەتی دەمەوبەیان.

٢. لەپاش نوێژە فەرزەکان، بەتایبەتی لەپاش پێنج فەرزە.

٣. لەنێوانی بانگو قامەتداو لەرۆژی عەرەفەداو لەرۆژی هەینیدا.

٤. لەکاتی کوڕنووشداو لەناو سوجووددا.

٥. شەوو رۆژی هەینیو مانگی رەمەزانو ئەحواڵە شەریفەکان بەهەل بزانێ، وەك: کاتی بارانبارینو کاتی کردنی نوێژە فەرزەکان.

٦. لەکاتی جێبەجێ کردنی طاعەتدا، وەك کاتی حەجو عەمرەو سەردانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرو کاتی بەرۆژوو بوون.

٧. لەکاتی سەخڵەتیو خەمو خەفەتو زەبوونیدا.

٨. لەکاتی بۆنەکاندا، ئەو نزایێ بخوێنرێ کە ئەو بۆنەیە دانراوە بۆی.

٩. لەکاتی دلگەرم بوونو هەست کردن بەکەشێکی گیانی پیرۆزی وا کە چاوو دڵی پێ رۆشن دەبێتەوەو هەست بە بارینی سۆزو میهرەبانی خودا دەکرێ.

١٠. لەکاتی رەمەزانو زمانی بەڕۆژووەوەو کاتی بەربانگ.

١١. لەپاش خوێندنو خەتمەی قورئانی پیرۆزەوە.

١٢. لەپاش خەتمەی زیکری خوداوە، وەك: خەتمەی (لا إله إلا الله) یا خەتمەی (قُلْ هُوَ اللّهُ).

١٣. نزا لەکاتی خوێندنی کەڵەبابدا.

د/ باشترین شوێن بۆ نزاکردن:

١. لە مەسجیدولحەرام لەمەککە، لەدەوری کەعبەو حەجەرول ئەسوەد.

٢. لە جێگە مناسکەکانی حەجدا، وەك: جەبەلورەحمەو کێوی عەرەفەو میناو موزدەلیفەو مزگەوتی عائیشەو شوێنە پیرۆزەکانی تری مەککەو مەدینەو مەسجیدو ئەقصا.

٣. لەخزمەت ئارامگای پیرۆزی پێغەمبەردا.

٤. لەسەر بەرماڵ، بەتایبەتی لە کۆتایی تەحیاتی کۆتاییدا.

٥. ناو مزگەوت بەشێوەی گشتی، بەتایبەتی لەپاش نوێژی تەحییەتولمەسجیدو لەپاش پێنج فەرزەو نوێژی تری سوننەت وەك: وەترو تەراویح، کە لەناو مزگەوتا بکرێن.

هـ/ خوێنەری ئازیزو بەڕێز، ئەمە بەکورتیو بەکوردی، پوختەی دەستوورو مەرجو جێگەی نزابوو، ئەمەیش بەکورتی چۆنێتی نزاو پاڕانەوەو دۆعایە:

١. بەزارو بەدەم، واتە: بەس بەگوتن‌و بەخوێندن، وەك: ئەو نزايانەی كە لەم پەڕاوەو پەڕاوی تاجول ئوصول‌و موختەصەری صەحيحی بوخاريدا هاتوون‌و تۆماركراون.

٢. بەنووسين دەنووسرێن، بە قەڵەمی پاك لەسەر شتی پاك، دەستوورو مەرج‌و كات‌و شوێنی نزای نووسراوو نووشتە، رێك وەك دەستوورو مەرج‌و كات‌و شوێنی نزای خوێنراوە، مەگەر شتەكە نەگونجێ لەگەڵ حاڵی نووسيندا.

٣. دروستە نووشتەكە، يا نووسراوەكە، بەنيازی سوودو بەهرەو كەڵكی، لەشوێنێكا هەڵبگيرێ، يا بەبەرگ‌و سەرينی پەيوەنديدارەوە هەڵبواسرێ. بەمەرجێ نووشتەكە شەرعی بێ. {تاج/٥، زنجيرە: ٨٢، ژمارە: ٥١٠٨} .

جا پاش ئەمە عەرزم ئەمەيە:

(برای بەڕێزم! خوشكی ئازيزم! جەنابيشت دەتوانی پەيڕەوی ئەم دەستوورو ئادابانە بكەيت‌و نزاو نووشتە بكەيت‌و بە دڵنياييەوە چاوەڕوانی گيرابوون‌و هاتنەدی مرازو نيازت بيت. ئيتر پەنا بەخودا).

دوا وتە لەم بابەتەوە:

(ئەمەی گوتراو نووسرا، شێوازی هەرە پەسەندی نزاكردن‌و پاڕانەوەيە. بەڵام بەبێ گومان دوعای هەموو كەسێ، لە هەر بارو دۆخ‌و كات‌و شوێنێكا بێت دەبێ‌و دروستە كەخودا لێی قەبووڵ بكات. لەبەرئەوە هەتا دەتوانين لەنزاو پاڕانەوە، لەكات‌و ناكاتا، درێغی‌و كۆتايی مەكە. لە إحيادا دەفەرموێ: خودا نزای ئيبليسی گيراكردووە، كە دەڵێ: (رَبِّ أَنْظِرْنِي إلى يَوْمِ يبعثون!. قال: إنك من المنظرين).

ئەمەی كە نووسيومە لەم شوێنەدا، لەبابەتی نزاوە، لەخۆمەوە نەمگوتووە، بەڵكوو راگوێزم كردوون لەسەرچاوەی باوەڕپێكراوەوە. بەتايبەتی بڕوانە:

١- الأذكار للإمام النووی. باب: في آداب الدعاء. ص٣٥٣.

٢- إحياءُ علُومِ الدِّين. المجلد الأول. مبحث آداب الدُّعاء وهی عشرة. ص٢٧٤.

٣- غاية المأمول — شرح التاج الجامع للأصول. المجلد الخامس الطبعة الرابعة. الصَفحة: ١١. مبحث (آداب الدُّعَاء) + لەژمارە: ٥٠١٠ وە هەتا ژمارە: ٥٠٢٧ + تاج/٥، لاپەڕە: ٢٣١، زنجيرە: ٨٢، ژمارە: ٥١٠٨ — نزای ترس شكاندن‌و خەوزڕان.



# ٥٧- نامەی یادی خودای گەورە

## كِتَابُ الذِّكْرِ

{بڕوانە: ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤٤، لە ژمارە: ١٤٠٨ وە هەتا ژمارە: ١٤٦٤ + تاج/٥، زنجیرە: ٥٨، لاپەڕە: ١٣٦ لە ژمارە: ٤٩٣٩ وە هەتا ژمارە: ٥٠٠٠ ج/٤}.

### ١٤٣٩) هاندان لەسەر یادی خوداو خۆ نزیك كردنەوە لێیو بەردەوامی یادی خودا. (٦٧٤٦ - ٦٧٤٩)

### بَابٌ: الترغيب في ذكر الله والتقرب اليه ودوام ذكره

١٨٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ هُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا، تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا، تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً». {الحديث: ٦٧٤٦ = ٦٧٦١ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢١٢٩ = ٧٤٠٥، ٧٥٠٥، ٧٥٣٧}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (خودای گەورەو سەروەر، لە فەرموودەیەكی پاكی پیرۆز (حەدیثێكی قودسی)دا دەفەرموێ: بەندەی من، خۆی گومانی چۆن بێ، من وادەبم لەگەڵیدا، گومانی باش بێ بەمن، ئەوا منیش باش دەبم بۆی، ئەو گومانی خراپ بێ بەمن، ئەوا منیش خراپ دەبم بۆی. لەو دەمەدا كەئەو ناوی من دەباو یادو زیكری من دەكا، ئا لەودەمەدا من خۆم وام لەگەڵیدا، جا ئەگەر ئەو بەتەنیا هەر خۆی یادو زیكری من بكا، ئەوا منیش هەرخۆم بەنهێنی یادی ئەو دەكەم، ئەگەر ئەو لەناو كۆمەڵێكا یادو زیكری من بكا، ئەوا منیش بە ئاشكرا لەناو دەستەیەكا، لەناو كۆمەڵێكا، كە لەوان باشترین، یادی ئەو دەكەم. ئەگەر بەندە بستێ لەمن نزیك ببێتەوە، من باڵێ لەو

نزيك دەبمەوە، ئەگەر ئەو باڵێ لەمن نزيك بێتەوە، من دوو باڵ لەو نزيك دەبمەوە، ئەگەر ئەو بەڕۆيشتنی ئاسايی بێ بۆلای من، من بە لۆقە دەچم بەپيريەوە. واتە: هەتا بەندەی من خۆی بەتاعەت لەمن نزيك بكاتەوە، منيش رەحمەتی خۆم زياتر لەو نزيك دەكەمەوە). {تاج/٥، زنجيرە: ٥٨، ژمارە: ٤٩٣٩ — گەورەيی يادو زيكری خودا + رياضی صالحين/٣، لاپەڕە: ٢٩٣، زنجيرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤٣٥ — بەهرەی زيكرو يادی خوداكردن}.

**١٤٤٠) بەردەوامبوون لەسەر زيكرو يادی خوداو وازنەهێنان لێی.** (٦٩٠٠ - ٦٩٠٣)

**بَابٌ: فِي الدَّوَامِ عَلَى الذِّكْرِ وَتَرْكِهِ**

١٨٨٧- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ عَنْ حَنْظَلَةَ الأُسَيِّدِيِّ (قَالَ: وَكَانَ مِنْ كُتَّابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: لَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ الصديق (رضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ: كَيْفَ أَنْتَ يَا حَنْظَلَةُ؟ قَالَ قُلْتُ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ! قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ! مَا تَقُولُ؟ قَالَ قُلْتُ: نَكُونُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ حَتَّى كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلاَدَ وَالضَّيْعَاتِ فَنَسِينَا كَثِيرًا. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَوَاللَّهِ إِنَّا لَنَلْقَى مِثْلَ هَذَا، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ الصدّيق حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ). قُلْتُ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «وَمَا ذَاكَ»؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَكُونُ عِنْدَكَ تُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ حَتَّى كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِكَ عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلاَدَ وَالضَّيْعَاتِ نَسِينَا كَثِيرًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنْ لَوْ تَدُومُونَ عَلَى مَا تَكُونُونَ عِنْدِي وَفِي الذِّكْرِ لَصَافَحَتْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ عَلَى فُرُشِكُمْ وَفِي طُرُقِكُمْ، وَلَكِنْ يَا حَنْظَلَةُ سَاعَةً وَسَاعَةً». ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. {الحديث: ٦٩٠٠ = ٦٩٢١ فم. ترمذي. صفة القيامة/٢٤٥٢. ابن ماجة. زهد/٤٢٣٩، تحفة الأشراف: ٣٤٤٨}:

ئەبو عوثمانی ئەل — نەهدی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەنظەلەی ئەل-ئوسەيدی (رەزای خودای لێ بێ) كە ميرزايەكی باش بوو، وەيەكێك لە نووسەرەكانی

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەر بێ و ڕەزای خودایش لەوبێ) فەرمووی: جارێ ئەبوبەکری صەدیقم پێ گەیشت، فەرمووی: تۆ چۆنیت ئەی حەنظەلە؟! فەرمووی: گوتم: حەنظەلە ناپاکی (مونافیقی) سەری لێ هەڵداوە! فەرمووی: سوبحانەڵلا! ئەوە دەڵێی چی، مەبەستت چییە لەم قسەیەت؟ گوتم: کە دەچین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی بەهەشتو دۆزەخمان بۆ دەکا، دڵ دادەهێنینو وامان لێ دێ، دەڵێی بەچاوی خۆمان تەماشایان دەکەینو وان بە بەرچاومانەوە، بەڵام کەلای حەزرەتمان چۆڵکردو چووینەوە بۆ ناو ماڵو پلکاین بە خاوو خێزانەوەو مشووری مەڕو ماڵاتو خەلەو خەرمانو گوزەرانمان خوارد، ئیتر دەچینە حاڵو دۆخێکی ترەوەو زۆرمان لە ئامۆژگارییەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبیر دەچێ!

دەی ئەگەر ئەمە دوو ڕوویی و مونافقی نییە، ئەی چییە؟ ئەبوبەکر فەرمووی: خۆ ئەگەر بۆ ئەمە بڵێی، دەسا بەخودا هەمووومان هەروایین!

ئیتر منو ئەبوبەکری صدیق چووین بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! حەنظە ناپاکیو دوو ڕوویی سەری لێ هەڵداوە! فەرمووی: (ئادەی چۆن؟).

منیش چیم عەرزی ئەبوبەکری صەدیق کرد، ئەوەم بەبێ زیادو کەم، عەرزی ئەویش کرد. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بەو کەسە کەگیانی منی بەدەسە، کە یەزدانی پاکە، ئەگەر بەردەوام سەرگەرمی یادو زیکری خودابن، پەردە لەنێوانی ئێوەو فریشتەکاندا هەڵدەگیرێ، ئیتر لەهەموو جێگەیێ، تەنانەت لەسەر نوێنو لەرێگەو بانیش، فریشتەکان چاکو چۆنیو تەوقەیان لەگەڵدا دەکردنو دەبوون بەهاودەمو هاوڕێتان!).

ئینجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی حەنظەلە! ئەوە قەیناکاو، ئەوە نیفاقو دوو ڕوویی نییە، چونکە ژیانەکە خۆی ئاوایە: تاوێ بۆ خوداو، تاوێ

بۆ پەیداکردنی گوزەران و، تاوێکیش بۆ پشوودان و حەسانەوەو وچان!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٩٤٧ — گەورەیی یادو زیکری خوداو پایە بەرزیی زیکرکاران}.

**ڕوونکردنەوە:**

حەنظەلەی ئەل- ئوسەیدی ناوی حەنظەلەی کوڕی ڕەبیعی الکاتبە، نووسەری پێغەمبەر بوو، ئامادەی نەبەرد (مەعرەکە)ی قادسیە بووە، لە شەڕی ئەهلی بەصرەدا، لەڕۆژی نەبەردی ئەلجەمەلدا، دواکەوت لە عەلی و ئامادەی ئەم شەڕە نەبوو، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، کۆچی دوایی کرد.

**١٤٤١) کۆبوونەوە بۆ خوێندن و دەورکردنەوەی نامەی خودای گەورە کە قورئانی پیرۆزە.** (٦٧٩٣ - ٦٧٩٧)

**بابٌ: فِي الإِجْتِمَاعِ عَلَى تِلاَوَةِ كِتَابِ اللّهِ تَعَالَى**

١٨٨٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْـهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمْ): «مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِى الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ فِى الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَاللَّهُ فِى عَوْنِ الْعَبْدِ، مَا كَانَ الْعَبْدُ فِى عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا، سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ». {الحديث: ٦٧٩٣ = ٦٨٠٩ فم. أبو داود. أدب: ٤٩٤٦. ترمذي. دعوات: ٣٣٧٨. تحفة الأشراف: ١٢٥١٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ موسوڵمانێ، لە مەینەتێ لە مەینەتەکانی جیهان ڕزگار بکا، خودای گەورە لەپاداشی ئەوەدا، مەینەتێ لە مەینەتەکانی ڕۆژی قیامەتی بۆ چارەسەر دەکاو، لە سەختەتێ لە سەختەتییەکانی دوا ڕۆژ ڕزگاری دەکا، لە

تەنگانەیێ لە تەنگانەکانی ڕۆژی دوایی قوتاری دەکات، وە هەرکەسێ دەسگیرۆیی هەژارێ، نەدارایێ بکا، لە جیهانو لەدوا ڕۆژدا، خودایش دەسگیرۆیی ئەو دەکا، وە هەرکەسێ عەیبو نەنگی موسولمانێ بپۆشێ، یا جەستەو لەشی بە پۆشاکێ داپۆشێ، ئەوە خودایش ئەو کەسە لەهەردوو جیهاندا بە بەرگی ڕەحمەتی خۆی دادەپۆشێ، وە خودا لەپشتی ئەو بەندەیەکە پشتی برای ئایینی خۆی دەگرێ، هەرکەسێ ڕێگەی زانین بگرێو وێڵی دوای زانستو زانین بێ، خودای گەورە ڕێگەی بەهەشتی بۆ خۆش دەکا، وە هەرکۆمەڵێ لەماڵێ لە ماڵەکانی خودادا کۆببنەوەو نامەی خودا کە قورئانی پیرۆزە بخوێننو لەناو خۆیاندا دەوری بکەنەوەو واتاو مانای لێك بدەنەوە، بێگومان کەوا پەری میهرو دڵنیایی، بەسەریاندا دادەبارێو ڕەحمەتو سۆزو میهرەبانی دایان دەپۆشێو، فریشتەی ڕەحمەت دەوریان لێ دەدەن، وە خودایش لەبارەگای خۆی، لەلای مەلەئی ئەعلا، لەناو ئەنجوومەنی هەرە باڵادا، باسی چاکیو چاکەکەیان دەکا، وە هەرکەسێ کارو کردەوەی خۆی دوای بخات، بنەچەو بنەماڵەی پێشی ناخات). {تاج/١، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ١٠٠ – فەزڵو گەورەیی زانینو زانایان + ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٤٥. گەورەیی جێبەجێکردنی کارو ئیشی موسوڵمانان}.

**١٤٤٢) کەسانێ کە کۆڕ دەبەستن بۆ یادو سوپاسی خودا، خودا شانازییان پێوە دەکات بەسەر فریشتەکاندا. (٦٧٩٣ - ٦٧٩٧)**

**بابٌ: مَنْ جَلَسَ يَذْكُرُ اللّٰهَ وَيَحْمَدُهُ يُبَاهِي بِهِ المَلَائِكَةَ**

١٨٨٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجَ مُعَاوِيَةُ عَلَى حَلْقَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: مَا أَجْلَسَكُمْ؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ. قَالَ: آللَّهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ؟ قَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَمَا كَانَ أَحَدٌ بِمَنْزِلَتِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَقَلَّ عَنْهُ حَدِيثًا مِنِّي، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: «مَا أَجْلَسَكُمْ؟». قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا لِلإِسْلاَمِ وَمَنَّ بِهِ عَلَيْنَا. قَالَ: «آللَّهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ؟». قَالُوا:

وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: «أَمَا إِنِّى لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَلَكِنَّهُ أَتَانِى جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَلاَمْ فَأَخْبَرَنِى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُبَاهِى بِكُمُ الْمَلاَئِكَةَ». {الحديث: ٦٧٩٧ = ٦٨١٣ فم. ترمذى. صفة القيامة: ٢٤٥٢. ابن ماجة. زهد: ٤٢٢٩، تحفة الأشراف: ٣٤٤٨} :

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: معاوییە (رەزای خودای لێ بێ) چوو بەسەر کۆڕێکی زیکردا، لەناو مزگەوتدا ئەڵقەیان دابوو. فەرمووی: بۆچی دانیشتوون؟ فەرموویان: دانیشتووین یادو زیکری خودا دەکەین. فەرمووی: توخوا هەر بۆ ئەوە دانیشتوونو بەس؟ فەرموویان بەڵێ بەخودا هەر بۆئەوە دانیشتووینو بەس. فەرمووی: دەبزانن کەمن لەبەرئەوە ئێوەم سوێند نەدا کە باوەڕتان پێ نەکەم، بەڵکوو باوەڕم بە قسەکەتان هەیە، بەڵام لەبەر شتێکی تر ئێوەم سوێنددا، کە ئێستا بۆتانی باس دەکەم، لەلایەکی تریشەوە کەس نییە کەوەك من پایەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نزیك بووبێو لەگەڵ ئەوەیشدا، وەك من ئاوا فەرموودەو فەرمایشتی ئەو زاتە کەم بگێڕێتەوە، چونکە من ژنبرای پێغەمبەر بوومو نووسەری سرووشی بوومو زۆریش لە خزمەتیدا بووم، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا فەرموودەیێ تانەچمە بنجو بنەوانیو بەباشی لێم روون نەبێ کە ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەر خۆیەتی نایگێڕمەوە.

ئینجا موعاوییە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو، رۆیشت بۆ مزگەوت، لەوێ چوو بەسەر دەستەیێ لە هاوڕێیانیدا، بە ئەڵقە کۆڕی زیکریان دابەستبوو، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بۆچی دانیشتوون؟). فەرموویان: دانیشتووین یادو زیکری خودا دەکەین، حەمدو سوپاسی خودا دەکەین لەسەرئەوە کە شارەزای کردووین بۆ ئایینی ئیسلامو ئەم بەهرە گەورەیەی پێمان بەخشیوە.

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (توخوا هەر ئەوەیە هۆی دانیشتنەکەتانو هیچی تر؟). فەرموویان: ئەرێ بەخودا هەربۆ ئەوە دانیشتووینو بەس.

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دبزانن کەمن لەبەرئەوە سوێندم نەدان کە باوەڕتان پێ نەکەم، بەڵکوو رێ خۆشکردنە بۆ ئەم موژدە خۆشە: جوبرائیل تەشریفی هات بۆلام، فەرمووی پێم: کە خودای گەورەو سەروەر شانازیتان پێوە دەکا، لەلای فریشتەکان!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٩٤٦ — گەورەیی یادی خودا}.

**١٤٤٣) باسی خێری کۆڕی زیکری خودای گەورەو سەروەرو باسی نزاو پاڕانەوەو داوای لێبووردنو لێخۆشبوونی گوناهو تاوان.** (٦٧٨٠)

**بَابُ: فَضْلُ مَجَالِسِ الذكر للّه عزَّ وَجَلَّ والدُّعاءُ والإستغفار**

١٨٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِنَّ لِلَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى مَلاَئِكَةً سَيَّارَةً فُضْلاً يَتَبَّعُونَ مَجَالِسَ الذِّكْرِ، فَإِذَا وَجَدُوا مَجْلِسًا فِيه ذِكْرٌ قَعَدُوا مَعَهُمْ وَحَفَّ بَعْضُهُمْ بَعْضًا بِأَجْنِحَتِهِمْ، حَتَّى يَمْلَئُوا مَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَإِذَا تَفَرَّقُوا عَرَجُوا وَصَعِدُوا إِلَى السَّمَاءِ. قَالَ: فَيَسْأَلُهُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: مِنْ أَيْنَ جِئْتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: جِئْنَا مِنْ عِنْدِ عِبَادٍ لَكَ فِي الأَرْضِ يُسَبِّحُونَكَ، وَيُكَبِّرُونَكَ، وَيُهَلِّلُونَكَ، وَيَحْمَدُونَكَ، وَيَسْأَلُونَكَ. قَالَ: وَمَاذَا يَسْأَلُونِي؟ قَالُوا: يَسْأَلُونَكَ جَنَّتَكَ. قَالَ: وَهَلْ رَأَوْا جَنَّتِي؟ قَالُوا: لاَ أَيْ رَبِّ. قَالَ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا جَنَّتِي. قَالُوا: وَيَسْتَجِيرُونَكَ. قَالَ: وَمِمَّ يَسْتَجِيرُونَنِي قَالُوا: مِنْ نَارِكَ يَا رَبِّ. قَالَ: وَهَلْ رَأَوْا نَارِي؟ قَالُوا: لاَ. قَالَ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا نَارِي؟ قَالُوا: وَيَسْتَغْفِرُونَكَ. قَالَ: فَيَقُولُ: قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ فَأَعْطَيْتُهُمْ مَا سَأَلُوا، وَأَجَرْتُهُمْ مِمَّا اسْتَجَارُوا، قَالَ: فَيَقُولُونَ: رَبِّ فِيهِمْ فُلاَنٌ عَبْدٌ خَطَّاءٌ إِنَّمَا مَرَّ فَجَلَسَ مَعَهُمْ. قَالَ: فَيَقُولُ: وَلَهُ غَفَرْتُ، هُمُ الْقَوْمُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ». {الحديث: ٦٧٨٠ = ٦٧٩٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٩٦ = ٦٤٠٨ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٢٧٥٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە، چەشنە فریشتەیەکی گەڕۆکی بەڕێزو نازداری تایبەتی هەیە، ئیشیان ئەوەیە بەڕێو باناو بەملاو بەولادا دەسووڕێنەوەو بەشوێن ئەهلی زیکردا

دەگەڕێن، منەی کۆڕەکانی یادی خودا دەکەن، کاتێ کۆڕێکی زیکریان دۆزییەوەو دییان کەوا کۆمەڵێ لە شوێنێکا، یادی خودا دەکەنو کۆڕی زیکریان دابەستووە، قاو لەیەکتری دەکەنو یەکتری بانگ دەکەنو دەڵێن: وەرن بەلای کاری خۆتانەوە، ئەمە ئەوەیە کەئێوە بۆی دەگەڕێنو ئیتر ئەوانیش دێن لەناو کۆڕی دانیشتنەکەدا، لەگەڵ ئەوانا دادەنیشنو کەڵەکە دەکەن لەدەوریانو هەتا ئاسمانی یەکەم بەباڵ دەخولێنەوە بەسەریاناو، ناوەندی خۆیانو ناوەندی ئاسمانی خواروو پڕدەکەن!

کاتێ کۆڕی زیکرەکە تەواو دەبێو بلاوەی لێ دەکەن، فریشتەکانیش بەرزدەبنەوەو سەردەکەون بۆ ئاسمان، جا پەروەردگاریان لێیان دەپرسێ – گەرچی خۆی زۆر باش لە حاڵەکە ئاگادارە – لێیان دەپرسێ: لەکوێ بوونو لەکوێوە هاتوون؟ دەڵێن: لەلای کۆمەڵێ بەندەی باشی تۆوە هاتووین، کە لەسەر زەوی، سەرگەرمی (سُبْحَانَ اللَّه) کردن بوونو تۆ بە پاكو پیرۆزو بێ گەردو بێ خەوش دەزاننو (الله اكبر) دەکەنو تۆ بەگەورەو سەروەر دادەنێنو خودای خۆیان بە گەورە دەگرنو بەشانو شکۆی تۆدا هەڵ دەدەنو (لا إلـهَ إلاّ الله) دەکەنو بەس تەنها ئەڵلا بەخودای خۆیان دەزاننو باوەڕیان بەهیچ خودایەکی تر نییەو (الحمدُ لِلّه) دەکەنو بەکوڵو بەدڵ سوپاسو ستایشی یەزدانی پاك دەکەنو داوای هەموو خێرو بێرو نازو بەهرەیەکت لێ دەکەن.

خودا دەفەرموێ: داوای چیم لێ دەکەن بەتایبەتی؟ دەفەرموون: داوای بەهەشتت لێ دەکەن. دەفەرموێ: ئایا بەهەشتیان دیوە؟ دەفەرموون: نەخەیر، بەهەشتی تۆیان نەبینیوە ئەی خودایە! دەفەرموێ: ئەی ئەگەر بەهەشتی من ببینن چۆنە؟

دەفەرموون: ئەی خودایە! داوای داڵدەو پەنات لێ دەکەن. دەفەرموێ: لەچی دەیانەوێ کەمن پەنایان بدەم؟

دەفەرموون: داوات لێ دەکەن کە لەئاگری دۆزەخی خۆت پەنایان بدەیتو ببیت بەداڵدەیان. دەفەرموێ: ئایا ئاگری دۆزەخی منیان دیوە؟ دەفەرموون: نەء،

نەیاندیوە! دەفەرموێ: ئەی ئەگەر ئاگری دۆزەخی من ببینن چۆنە؟ دەفەرموون: ئەی خودایە! داوای لێبووردنو لێخۆشبوونی تاوان و گوناهانت لێ دەکەن. فەرمووی: دەفەرموێ: دەی ئێوە بەشایەت بن، ئەوا من لێیان خۆش بوومو داوای چی دەکەن دەیدەم پێیانو لەترسی چی پەنا دەگرن بەمن ئەوا دالْدەو پەنام دان. فەرمووی: دەفەرموون: ئەی خودای گەورەو سەروەر! کابرایەکیان لەناودایە، بەندەیەکی گونهکارە لەوان نییە، پیاوێکی خراپە بۆ زیکری خودا نەهاتبوو، بە رێکەوت لەوێوە رەت بوو، لەگەڵیان دانیشت؟ فەرمووی: دەفەرموێ: مەجلیس مەجلیسی زیکرە، ئەوەی لێی دابنیشێ لەپیتو فەڕی بێ بەش نابێ، وا لەویش خۆشبووم، کۆمەڵی کۆڕی وا هاونیشینیشیان لەبەر خاتری ئەوان، لەبەدبەختی رزگاری دەبێو بەهۆی ئەوانەوە ئەویش خۆش بەخت دەبێ!. {ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤٧، ژمارە: ١٤٤٧ و تاج/٥، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٩٤٠ — باسی گەورەیی یادو زیکری خودا ...} .

### ١٤٤٤) ئەو پیاوو ژنانەی کە سەرگەرمی یادو زیکری خودان. (٦٧٤٩ - ٦٧٤٩)
### بَابٌ: فِي الذَّاكِرِينَ وَالذَّاكِرَاتِ

١٨٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) يَسِيرُ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ، فَمَرَّ عَلَى جَبَلٍ يُقَالُ لَهُ (جُمْدَانُ) فَقَالَ: «سِيرُوا هَذَا جُمْدَانُ، سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ». قَالُوا: وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ». {الحديث: ٦٧٤٩ = ٦٧٦٤ فم} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەرێگەی مەککەوە دەرۆیشت گەیشتە کێوێ، ناوی (جومدان) بوو، فەرمووی: (بەتەنها ماوەکان پێشکەوتنو گرەوی خۆیان بردەوەو براوەن!) گوتیان: قوربان! بەتەنها ماوەکان کێن، کە ئەم پلەو پایەیە گەورەیان بۆ خۆیان دابین کردووەو تۆ ئەم مژدە خۆشەیان دەدەیتێ؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەو چلە کێشە تەمەن درێژانەن، کە لەکۆڕی هیچو پووچی مەردوم کەنار دەگرنو بەردەوام سەر گەرمی یادو زیکری خودان، لە پیاوانو لە ژنان!).

واته: ئەو ژنو پیاوانەن کە خودای گەورە بەم ئایەتە پەسنو تاریفیان دەکا، دەفەرموێ: {وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا — ٣٣/٣٥}:

واته: ئەو پیاوو ژنانەی کە بەزمانو بەدڵ هەمیشە یادو زیکری خودا دەکەن، بە پەنامەکیو بە ئاشکرا، ئەوانە خودا خۆی لێخۆشبوونی خۆیو خەڵاتی گەورەی خۆی ئامادە کردووە بۆیان!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٩٤٥ + ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤٣٦ — نامەی زیکرو یادی خودا}.

## ١٤٤٥) لاَ إِلَهَ إلاّ اللّه کردنو تەلیلە کردن. (٦٨٣٢ - ٦٨٥٠)

## بابٌ: فِي التَّهْلِيل

١٨٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) كَانَ يَقُولُ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ، أَعَزَّ جُنْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَغَلَبَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ، فَلاَ شَيْءَ بَعْدَهُ». {الحديث: ٦٨٤٨ = ٦٨٦٦ فم. تجريد البخاری بالكوردی/٤، رقم: ١٥٥٢ = ٤١١٤ فتح الباری}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو بەزۆری دەیفەرموو:

(لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ أَعَزَّ جُنْدَهُ وَنَصرَ عَبْدَهُ وَغَلَبَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ فَلاَ شَيْءَ بَعْدَهُ).

واته:

هەر خودا خۆی خودایەو بەس، لەشکری خۆی لەرۆژی گەلە کۆمەکەدا، کە ناسراوە بەرۆژی ئەحزاب سەرخست، بەندەکەی خۆی کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵایە، کە پێغەمبەری خودایە سەرخست، بەتەنها خۆی لەشکری ئەحزابی بەزاندو تێكو پێکی شکاند، کە ناسراوە بە غەزای خەندەق، خۆی نەبێ هەموو شتێ هیچو پووچە، بێجگە لەخۆی هەمووشتێ بوونی نەبوونە). {تاج/٤، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٤٦٠٣ — غەزای خەندەق}.

## ١٤٤٦) دەنگ بەرزكردنەوە لەیادی خودا. (٦٨٠٢ - ٦٨٠٩)
## باب: في رَفْعِ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ

١٨٩٣- عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) فِي سَفَرٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَجْهَرُونَ بِالتَّكْبِيرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، إِنَّكُمْ لَيْسَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا، إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعًا قَرِيبًا وَهُوَ مَعَكُمْ». قَالَ: وَأَنَا خَلْفَهُ، وَأَنَا أَقُولُ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، فَقَالَ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ؟». فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «قُلْ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ». {الحديث: ٦٨٠٢ = ٦٨٢٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٣، رقم: ١٢٢٥ = ٢٩٩٢، ٤٢٠٥، ٦٣٨٤، ٦٤٠٩، ٦٦١٠، ٧٣٨٦}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لە خزمەتی خۆشەویستدا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) گشت جارێ کە دەگەیشتینە سەر بەرزاییەك، کە دەیڕوانی بەسەر شیوو دۆڵێکا، دەستمان دەکرد بەگوتنی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) و (الله أكبر) بەدەنگی بەرز، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! بەزەویتان بەخۆتانا بێتەوە، ئەم هاتو هاوارەی پێناوێ، خۆ ئێوە هاوار لەکەڕو لاڵ، یا لەنادیار ناکەن، ئێوە بانگی کەسێ دەکەنو لەکەسێ دەپاڕێنەوە، کە ئاگای لەخشەی مارو مێروە، کە خودای گەورەیە، کە هەموو شتێ دەبیستێو لەهەموو شتێ نزیکترە).

ئەبو مووسا فەرمووی: من لەم کاتەدا لەدوایەوە بووم، خۆش خۆش دەمگوت: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ: هێزو تەوانایی هەربەدەستی خودا خۆیەتیو بەس). خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی عەبدوڵلای کوڕی قەیس! ئەی ئەبو مووسا! هۆشیاربە، با گەنجینەیێ لەگەنجینەکانی بەهەشتت پێ نیشان بدەم؟). گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! دڵم لەلاتە، فەرمووی: وشەی پیرۆزی (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ) گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت!). {تاج/٥، زنجیره:

٦٣، ژماره: ٤٩٧٥ – ذیکری لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بِاللَّهِ} + {تاج/١، زنجیره: ٦٣، ژماره: ٤٣٢ + تاج/٥، زنجیره: ٦٣، ژماره: ٤٩٧٩ ذیکری لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بِاللَّهِ...}.

## ١٤٤٧) نزای ئیواران. (٦٨٣٣ - ٦٨٥٠)

## بابٌ: مَايُقَالُ عِنْدَ المَسَاءِ

١٨٩٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَسْعُود (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) إذَا أَمْسَى قَالَ: «أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَخَيْرِ مَا فِيهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ وَسُوءِ الْكِبَرِ، وَفِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الْقَبْرِ». (قَالَ الحسن بن عُبَيْدُ الله: وزادني فيه زُبَيْدٌ عَنْ إبراهيم بن سُويد عَنْ عبدالرحمن بن يزيد عَنْ عبدالله رَفَعَهُ أَنَهُ قَالَ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ». وَفِي رِوَايَة: إذَا أَصْبَحَ قَالَ ذَلِكَ أَيْضًا: «أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ». {الحديث: ٦٨٤٧، ٦٨٤٦ = ٦٨٦٥ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) کاتی ئێواران دەستووری وابوو، دەیفەرموو:

«أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَخَيْرِ مَا فِيهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ وَسُوءِ الْكِبَرِ، وَفِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الْقَبْرِ».

واتە: ئەوا ئێوارە داهات، هەموو بەردەوام موڵکی خوداین، سوپاس بۆ خودا، هەر خودا خودایەو بەس، بێجگە لە یەزدانی پاك هیچ خودایەکی تر تییە، خودایەکی تاكو تەنهاو بێ هاوەڵو بێ هاوبەشە، ئەی خودایە! من لەتۆ داواکارم کە لەخێرو بێرو خۆشی ئەم شەوە بێ بەشم نەکەی، هەروا لەو خێرەیش کەوا تیادا بەشی باشمان پێ خەڵات بفەرمووی، وەپەنا دەگرم بە پەنای تۆ لەشەڕو ئێشو ئازاری ئەم شەوە، هەروا پەنا دەگرم بە پەنای تۆ لەو شەڕو ئێشو ئازارەی

کەوا لەم شەوەدا، ئەی خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لە تەمبەڵیو تەوەزەلیو، لەپیریو لە کەفتەکاری کاتی ئیختیاری! هەروا پەنا دەگرم بەپەنای تۆ لە ئاژاوەو فەرتەنەو ئاشووبی ئەم جیهانەو لەسزای گۆڕ!).

ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بەدوو ڕشتە دەیگێڕیتەوە، ڕشتەی یەکەمیان نزاکە لێرەدا کۆتایی دێ، ئەم ڕشتەی یەکەمە ئاوایە:

١- مسلم. ٢- لە ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبەوە. ٣- لە حوسەینی کوڕی عەلییەوە. ٤- لە زائیدەوە. ٥- لە حەسەنی کوڕی عوبەیدوڵلاوە. ٦- لە ئیبراهیمی کوڕی سووەیدەوە. ٧- لە عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزیدەوە. ٨- لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ).

ئەمەیش ڕشتەی دووەمە، کە حەسەنی کوڕی عوبەیدوڵلا، ئەم فەرموودەیە لە مامۆستایەکی تری خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کە ناوی زوبەیدە، لەسەر ئەم شێوەیە:

١-. موسلیم. ٢- ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبە. ٣- حوسەینی کوڕی عەلی. ٤- زائیدە. ٥- حەسەنی کوڕی عوبەیدوڵلا. ٦- زوبەید. ٧- ئیبراهیمی کوڕی سووەید. ٨- عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید. ٩- عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ).

جا لەم گێڕانەوەی دووەمەدا حەسەنی کوڕی عوبەیدوڵلا دەفەرموێ: زوبەیدی مامۆستام، ئەم وشانەیشی لەم فەرموودەیە پتر کردبوّم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویانی، ئاوەها: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ).

واتە: هەر خودای تاكو تەنها تاقە خودایەو بەس، خودای تر نییە، هاوەڵو هاوبەشی نییە، بێ هاوەڵو بێ هاوبەشە، پاشاییو داراییو خاوەنی لەسەر ڕووی ڕاستی هەربۆ ئەوەو بەس، سوپاسو ستایش لەڕاستی دا هەر بۆ ئەوەو بەس، خودایەکی وایە، خاوەنی دەستەڵاتی بێ سنوورە، دەستەڵاتو توانایی هەموو شتێکی هەیە، هیچی لەدەست دەرناچێ!).

لە گێڕانەوەی ژمارە: (٦٨٤٦)دا، لە کۆتایەکەیدا عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەفەرموێ: هەروا جاران، پێغەمبەری خودا دەستووری وابوو، بەیانانیش، کە بەیانی دەکردەوە، دەیفەرموو: (أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ) هەتا (وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ)، واتە: ئێواران چی دەفەرموو، بەیانیانیش هەرئەوەی دەفەرموێ، بەڵام لەجیاتی (أَمْسَيْنَا) کە بەواتای ئەوا ئێوارەمان لێ داهات، دەیفەرموو: (أَصْبَحْنَا....) تادوایی.

### ١٤٤٨) گوتەی کاتی نووستنو راکشان لەسەرجێ. (٦٨٥١ - ٦٨٥٦)
### بَابٌ: مَا يَقُولُ عِنْدَ النَّوْمِ وَأَخْذِ الْمَضْجَعِ

١٨٩٥- عَنِ عَلِيٍّ بْنُ أَبِي طَالِبْ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) اشْتَكَتْ مَا تَلْقَى مِنَ الرَّحَى فِي يَدِهَا، وَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) سَبْيٌ، فَانْطَلَقَتْ فَلَمْ تَجِدْهُ، وَلَقِيَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها)، فَأَخْبَرَتْهَا، فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) أَخْبَرَتْهُ عَائِشَةُ بِمَجِيءِ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) إِلَيْهَا. فَجَاءَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) إِلَيْنَا، وَقَدْ أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْنَا نَقُومُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «عَلَى مَكَانِكُمَا». فَقَعَدَ بَيْنَنَا، حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمِهِ عَلَى صَدْرِي، وَقَالَ: «أَلاَ أُعَلِّمُكُمَا خَيْرًا مِمَّا سَأَلْتُمَا؟ إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا؟ أَنْ تُكَبِّرَا اللَّهَ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ، وَتُسَبِّحَاهُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتَحْمَدَاهُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ». وَزَادَ فِي أخرى: قَالَ عَلِيٌّ: مَا تَرَكْتُهُ مُنْذُ سَمِعْتُهُ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ). قِيلَ لَهُ: وَلاَ لَيْلَةَ صِفِّينَ؟ قَالَ: وَلاَ لَيْلَةَ صِفِّينَ). {الحديث: ٦٨٥٣، ٦٨٥٥ = ٦٨٧٣ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٤٦٢ = ٣٧٠٥، ٣١١٣، ٥٣٦١، ٥٣٦٢، ٦٣١٨. أبو اود. أدب: ٥٠٦٢}:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: فاطیمە (رەزای خودای لێ بێ) تەنیا باڵ بوو، هەرخۆی ئیشو کاری ناوماڵی دەکرد، سکاڵای بوو لەدەست شت هاڕین بە دەستاڕ، ناولەپی دەستاڕ بردبووی، ئەوەندەی دەستاڕ کردبوو جا کۆمەڵێ ژنی دیلی بەتاڵان گیراوی جەنگیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فاتیمە بە

ئومێدی ئەوەی کە باوکی لەوژنە دیلانـە، کارەکـەرێکی پـێ بـدا، هـەتا لەماڵـەوە بـۆ ئیش‌و کار یاریدەی بدا، چوو بۆلای باوکی، بـەڵام بـاوکی لـەماڵ نـەبوو، عائیشـەی زرِدایکی لەماڵ بوو، عەرزی ئەوی کرد کە بۆ شتێ واهـاتووە، کاتـێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هاتـەوە، عائیشـە داخوازییەکـەی فاطیمـەی پـێ گـوت، عـەرزی دەکـا کـە فاتیمـەی کچـت هـاتبوو بـۆلات بـۆ ئیشـێکی ئاوەهـا، داوای کارەکـەرێکی لێ کردیت، بەڵام تۆ لەماڵ نەبووی!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلامان، لەوکاتەدا ئێمە راکشابووین، دەمانویست بخەوین، من ویستم کە لەبەری هەڵسم، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لـە جێگەی خۆتان مەجووڵێن). جا لەبەینی من‌و لەبـەینی فاطیمـەی کچیدا دانیشت، تەنانەت هەستم کرد بە فێنکایی قاچـەکانی، کـە دەکـەوتن لـە سینگم. فـەرمووی: (ئـەدیی بـا شـتێکتان فێربکـەم، زۆر لـەوە باشـترە کـەئێوە داوایتـان لـەمن کـردووە! ئەویش ئەمەیە: کاتێ کە راکشان لەسەر نوێنەکانتان بۆ خەوتن، سیی‌و چوار جار ئەڵڵاهو ئەکبەر بکەن‌و سیی‌و سێ جـار سوبحانـەڵلا بکـەن‌و سیـی‌و سـێ جـار بڵـێن (الحمد لله) ئەمە زۆر باشترە بۆ ئێوە لە کارەکەرو نۆکەر!).

لـە گێرِانـەوەی (٦٨٥٥)دا ئەمـەی پـترە: عـەلی فـەرمووی: ئـەوەتی ئـەم فەرموودەیەی پێغەمبەرم بیستووە، لەپێش نووستندا ئەم وشانەم تەرك نەكردووە. گوترا بە عەلی: ئایا لەشەوی شەرِی صەفینیشدا، لـەو نەبـەردە قـورس‌و گرانەیشـدا، ئـەم وشـانەت واز لێ نـەهێناوە؟ فـەرمووی: بـەڵێ، تەنانـەت لەشـەوی نەبـەردی صەفینیشدا ئەم ویردانەم تەرك نەكردووە. {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٩، ژمارە: ١٤٥٩}.

**روونکردنەوە:**

١- شەوی صەفین، یەکێکە لە نەبەردە خوێناوییـەکانی نێـوانی موسـوڵمانان، کـە لـەپاش جـەنگی جەمـەل، لەبـەینی لەشـکری ئیمـامی عـەلی‌و لەشـکری موعاوییـەدا روویدا، صەفین جێگەیەکە لەنزیك روبـاری فوراتـەوە، دەوری شـەش حـەوت مـانگ لەوێ شـەرِ بـوو لـەنێوانی لەشـکری عـەلی‌و لـەنێوانی لەشـکری موعاوییـەدا، لەسـەر

فەرمایشتی ئیبنو کەثیر لە (البدایة والنهایة)دا، حەفتا هەزار کەس کوژراوە، چل‌و پێنج هەزار لە خەڵکی شام‌و بیست‌و پێنج هەزار لەخەڵکی عێراق.

٢- بەبۆنەی ئەم دەستاڕ کردنەی حەزرەتی فاتیمە، کە دەستی زامار بووە، دەڵێم زۆر مناڵ بووم، لەدەوروبەری جزمی (تبارك)دا بووم، لە گوندی خۆمان لەبرایماوە، کات کۆتایی وەرزی بەهار بوو، رۆژێ هەرەوەز بوو، بۆ دەسکەنەی شکارتەی نۆکیماڵی مەلای دێکەمان، کەناوی مامۆستا مەلا موحەممەدی تاڵ بوو، ماڵی مامۆستا خۆیان‌و کۆمەڵێ کچی دێکە، لەگەڵ پێنج شەش قوتابی وردیلەدا، چووین بۆ دەسکەنەی نۆکی ماڵی مامۆستا مەلا موحەممەد، کە لەبەری سێدارەبوو، دەستمان کرد بە دەسکەنە کردن، کچەکان بەجیا، مناڵەکان بەجیا، مامۆستاو مامۆستا ژنیش کەناوی ئامینە خان بوو، سەرپەرشتی کارەکەیان دەکرد!!

مامۆستا ژن ئامینە خان هات بۆلام، بەسەر سامییەوە گوتی: ئەیرۆ! نوری ئەوە چییە بەدەستتەوە؟ ئەوە خوێنە؟ ئادەی دەستت بێنە. کە تەماشایکرد هەردوو بەری لەپم تلۆقیان کردووەو بەهۆی سوێری‌و زبری لاسکی نۆکەکەوە خوێنیان لێ دەتکێ، بەلام من واماندوو شەکەتم، بەباشی هەست بەکارەکە ناکەم، دیارە لەوەیش دەترسام کە باوەڕم پێ نەکەن!

مامۆستا ژن ئامینە خان، بانگی مامۆستای کرد: مەلا! مەلا! وەرە بزانە دەستی نووری دەسکەنەکە چی لێکردووە؟ جا ئێوارێ چی بەمام فارس بلێین؟!

مامۆستا مەلا موحەممەد (رەحمەتی خودای لێ بێ) هەندێ خۆڵە سوورەی بەچمکی مەندیلەکەی بێژایەوەو دەستەکانمی بەو تەپ‌و تۆزە برژاندەوەو فەرمووی: (واز لەدەسکەنە بهێنە، بچۆ بێشکەی کوڕەکە راژەنە) مامۆستا ژن ئەنوەری کوڕی لە بێشکەکەدا تێرکرد لە شیرو ئەوجا منیش دەستم کرد بەراژەندنی‌و هەردوکمان خەومان لێ کەوت، جا بۆئەوەی کە زام‌و تلۆقەکانی دەستەکانم زۆر زەق‌و بەرچاوی نەبن، هەردوو دەستم‌و سەرمیان گرتە خەنە!!

چونکە گەرچی بێ دایك بوومو زۆر بەمندالّی دایکم مردبوو، تەنانەت سەبارەت بە مەرگی دایکم هیچم لەبیر نییە، بەلاّم چوار خوشکم هەبوو، هەر چواریان لەمن گەورەتر بوون، لەبەرئەوەی کە قورئان خوێنیش بوومو قوتابی ئایینی بووم زۆر ناسكو نازدار بووم، شەوو رۆژ بە باوەشو بە کۆڵیانەوە بووم! زۆریان خۆش دەویستم، هەتا چوومە فەقێیەتیش قژێکی جوانم هەبوو، حەفتەی جارێ دەیانگرتە خەنە بۆم، ئەگەر ماوەیێ سەرم نەگرتایەتە خەنە سەرم دەئێشا!! ئەو چوار خوشکەم کە لەدایكو باوکی خۆم بوون، ناویان: فاطیمەو عائیشەو خاوەرو حەبیبە بوو.

مالّی مامۆستا، کە لەبنگردو ئالّیشەوە هاتبوون بۆ دێی ئێمە، برێتی بوون لە:

١- مامۆستا مەلا موحەممەدی تالّ، لە بنەڕەتدا ئێرانی بوو.

٢- مامۆستا ژنە ئامینە خان، ژنێکی زۆر خانو مان بوو.

٣- حەلاوە خانی دایکی ئامینە خان کە خەسووی مامۆستا بوو، حەلاوە خان سەیید بوو.

٤- نووری برای ئامیینە خان لە تەمەنی منابوو.

٥- مەلا فاطیمە خانی خوشکی ئامینە خان، گەورە کچ بوو.

٦- کوڕەکەی مامۆستا کەوا دەزانم ناوی ئەنوەر بوو نۆبەرەیان بوو!

چەند یادگارێ هی ئەو رۆژگارە: ئێمە هەشت نۆ منالّی دێکە بووین، زۆرتر کە مامۆستای تالّ، لەمالّ نەبوایە، یا ئیشێ، کارێکی تری ببوایە، مەلا فاتم دەرسو وانەکانی پێمان رەوان دەکرد، من یەکەم جار دەرپێیم بۆکرا نەم دەزانی بەندەخوێنەکەی ببەستم مەلا فاطم بۆی دەبەستم. گەلێ جار کە هارو هاجیمان دەکردو جزمی یەکتریمان دەدڕاند، یادەمان شاردەوە، هەتا مامۆستا لەخاوەنەکەی بدات، فاطمە خان لەسەر پێ ریزی دەکردینو لەپمان درێژ دەکرد، ئەویش یەکی سەرو چەند شوولکی دەمالّی بەناو لەپمانا، تەنانەت لەنوری برای خۆشی دەدا، کە نوری برای هەتیویش بوو، بەلاّم کە سەرە دەگەیشتە سەرمن، لەمنی نەدەدا،

منالەکان رەخنەیان لێ دەگرتو دەیانگوت: بۆچی لەنوری نادەی لەهەموومان هاروهاجترە؟ دەیگوت: ئاخر نوری بێ دایکە گوناهە!!

کاتێ گەیشتمە مریشکە رەشە، مریشکێکی گەورەی چاکی پەڕ لەپێی رەشم برد بۆ مامۆستا مەلا فاطمە خان لەگەڵ هەندێ هەناردا!

لە مامۆستاکانمدا، دوو کچیان تیادا بوو، خودا لەهەردوو دنیادا چاکەی هەردوکیان بداتەوە، دەرسی قورئانی زۆرم لە خزمەتیانا خوێندووە، یەکێکیان ئەم مەلا فاطمەیە بوو، ئەوی تریشیان مەلا سەعدەی کچی مامۆستا مەلا عەلی سەرزەل بوو، کەشووی کرد بە مامۆستا مەلا موحەممەدی کانی رۆشنایی، لەکۆتایی تەمەنیدا مەلای مزگەوتی عەبدوللا لوطفی بوو. خوا لێی خۆشبێ.

لەنووسینی ئەم یادگارانەدا، مامۆستای حالی (مفتی الدّيَارِ السُّعُودِيّة)م کردووە بەسەر مەشق، کە لەکەنالی ئیقرەئەوە، باسی منالیی خۆیی دەکرد، فەرمووی:

(منالێکی ژیر بووم، تازە خەریکبووم لەشت حالی ببم، باوکم مەلایەکی سەلەفی زۆر توندڕەو بوو، منیش کەمە کەمە دەچووم لەملا ولا، گوێم لە تیلاوەتی عەبدولفەتاح شەعشەعیو مەنشاوی دەگرتو وەك ئەوان بە مەقام قورئانم دەخوێندو لە کۆتاییدا (صَدَقَ اللّهُ العَظِيمَ)م دەکرد، جا باوکم بەمەی زانی، زۆری پێ ناخۆش بوو، رۆژێ لەلای سەرووی قادرمەیەکی چەند پلەییەوە راوەستابووم، باوکم تەحقیقی ئەوەی لێم کرد، کەڕاستە من هەڵەی وا دەکەم، منیش حەزم نەکرد کە درۆی لە خزمەتدا بکەم، راستیەکەم عەرزیکرد، ئەویش لەسەرئەوە کە یەك شەقی مزری تێهەڵدام بە قادرمەکانا هەتا خوارەوە خلۆر بومەوە!).

فەرمووی: (دراوسێیەکمان هەبوو، دیوارێ لە بەینمانا بوو، رادیۆیەکی هەبوو، دەیخستە سەر قاهیرە، باوکم لەماڵی خۆمانەوە گوێی دەنا بە دیوارەکەوەو گوێی لە قورئان خوێنە میسرییەکان دەگرت، بەرە بەرە کاریان تێ کرد، دراوسێکەمان کە بەمەی زانی، هاتە خزمەتی باوکم، عەرزیکرد: ئەگەر دەفەرمووی رادیۆکەت بۆ

دەهێنم، ئەگەر دەفەرمووی ئەوا دەیشکێنم؟! باوکم فەرمووی: نەبۆمی بهێنەو نە بیشکێنە!). {بڕوانە: ژمارە: ١٧٥٨، لە زنجیرە: ١٣٣٩دا، کە لەپێشەوە رابورد}.

ئەی خودای میهرەبان! ئەی پەروەردگاری گەورەو سەروەرم! تۆ خۆت باش باش ئاگاداری، کەمن لەو دەسکەنەی نۆکەوە هەتا ئەمڕۆ، کەتەواو پیربووم‌و سەرو ریشم بوون بەکولووی بەفر، چەندە تووشی ماندوویی‌و نارەحەتی‌و زەحمەت‌و ئەرك بووم، لە پێناوی خزمەتی ئەم ئایینە پیرۆزەی تۆدا، بگرە زۆر جارانیش لەم پێناوەدا، تووشی تانەو تەشەرو گەڕو تەشقەڵەی نەفامانی ئەم‌و ئەویش بووم!!

دەی پەروەردگار! بە رەحمەتی خۆت، ئەم ئەرك‌و خزمەتەم لێ قەبووڵ بفەرموو، بیکە بە مایەی سەر بەرزیی‌و خێرو بێرو رەحمەتی دین‌و دونیا، بۆ خۆم‌و بۆ باك‌و دایکم‌و بۆ حاجی مەلا زەکیەی هاوسەرم، بۆ خۆمان‌و بۆ منداڵمان‌و بۆ منداڵی منداڵمان‌و بۆ مامۆستاو فەقێکانمان‌و بۆوەچەو نەوەکانمان‌و بۆ هەموو موسوڵمانێ، کە خێر لەم کتێبانە دەبینێ، یا بەهەر شێوەیێ خزمەتیان دەکا، خودایە! ئەم کتێبە پیرۆزانەی کەمن خزمەتم کردوون‌و تەرجەمەم کردوون، وەك ئەصڵەکەیان بکەیت بە سەرچاوەیەکی گەورەی رەحمەت‌و بەهرەی هەردوو جیهان لە ولاتا!

ئامین. یا أرْحَمَ الرَّحمين، وَصَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَى سَيِّدِنَا محمد وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين، وَمَنْ تَبِعَهُ بِإحْسَانٍ إلى يَوْمِ الدين. وَآخِرُ دَعْوَانَا أنِ الحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ العَالمين.

هەزار ڕەحمەت لە گۆڕو گیانی ئەحمەد هەردی کە دەڵێ:

بەسەرسامی، لەسەر لووتکەی بڵندی (پیری) وەستاوم
شەریتی عەمری رابردووم، وەکوو خەو دێتە بەرچاوم

١٨٩٦- عَنْ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «إِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ، فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْلَمْتُ وَجْهِى إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِى إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِى إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِى أَنْزَلْتَ،

وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، وَاجْعَلْهُنَّ مِنْ آخِرِ كَلاَمِكَ، فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ مُتَّ وَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ». قَالَ: فَرَدَّدْتُهُنَّ لأَسْتَذْكِرَهُنَّ، فَقُلْتُ: آمَنْتُ بِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ قَالَ: «قُلْ: آمَنْتُ بِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ». {الحديث: ٦٨٢٠ = ٦٨٣٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/١، رقم: ١٧٨ = ٢٤٧، ٦٣١١، ٦٣١٣، ٦٣١٤، ٧٤٨٤. + ١٩٨٠ تجريد = ٦٣١٥ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥٠٤٦. ترمذي. دعوات: ٣٣٩٤. تحفة الأشراف: ١٧٦٣}:

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ دەچیتە سەر نوێنی نووستنەکەت، دەستنوێژی تەواو بگرە، وەك بۆ نوێژ دەستنوێژ بگری ئاواو، ئەوجا لەسەر لای ڕاست ڕاکشێو بڵێ:

(اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ):

خودایە! خۆم دایە دەستی تۆو کاری خۆم سپارد بەتۆ، پەنام هێناوە بۆ پەنای تۆو، پشتم بەستووە بەتۆ، هەروەك مەترسیم هەیە لە قارو سزای تۆ، ئومێدیشم قەوییە بە میهرەبانی تۆ، هیچ پەناو پاسارێ نییە لە قاروقینو خەشمی تۆ، مەگەر هەر لەلای خۆت هەبێ، پەنا هەر پەنای تۆیەو بەس، باوەڕم هەیە بەو نامە پیرۆزەی تۆ، کەخۆت ناردووتە خوارەوە، کە قورئانی گەورەیە، وە باوەڕیشم هەیە بەو پێغەمبەرەیشت کە خۆت ڕەوانەت کردووە بۆسەر بەرەی ئادەمیزادو بەرەی پەری!! کە حەزرەتی موحەممەدە).

ئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (جا ئەگەر لەپاش خوێندنی ئەم نزایە، دنیابوو، واڕێکەوت لەو شەوەتدا بمریت، ئەوا ئیماندەر دەبەیتو، لەسەر ئایینی پاکی ئیسلام دەمریت، وە ئەم نزایە بکە بە کۆتایی قسەی ئەو شەوەتو، کە نزاکەت خوێند ئیتر قسەی ترمەکە، هەتا خەوت لێ دەکەوێ).

بەراء فەرمووی: (خەریکبووم نزاکە لەبەربکەم، کە بۆیم دووبارە کردەوە، لەجیاتی ڕستەی (وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ) گوتم: (وَرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ) کەچی

حــەزرەت (درودی خـودای لەسـەر بـێ) بـۆی راسـت کردمـەوەو فـەرمووی: (نــەء، وا مــەڵێ ووشەکانی نزاکە لە خۆتـەوە مـەگۆڕەو رێـك وەك خـۆم پێـتم گـوت وابڵـێ: (بِنَبِيِّكَ الَّذِی أَرْسَلْتَ). {تاج/٤، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٤٢٧٠ — لەبارەی دەستوورو نەریتو دوعـاو نزای نووستنەوە} + {ریاض/٢، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٨١٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٩، ژمارە: ١٤٦٢ — گوتەی کاتی نووستن}.

١٨٩٧- عَنِ الْبَرَاءِ بْنُ عَازِبْ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ قَـالَ: «اللَّهُـمَّ بِاسْـمِكَ أَحْيَـا وَبِاسْـمِكَ أَمُـوتُ». وَإِذَا اسْـتَيْقَظَ قَـالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِی أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ». {الحديث: ٦٨٢٥ = ٦٨٤٣ فم}:

بـەرائی کـوڕی عازیـب (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (درودی خـودای لەسـەر بێ) دەسـتووری وابـوو، بەشـەو کـە دەچـووە سـەر نووسـتنگاکەی، دەسـتی راسـتی لـەژێر روومەتی خۆیـدا دادەنـاو ئـەنجا دەیفـەرموو: (اللَّهُـمَّ بِاسْـمِكَ أَحْيَـا وَبِاسْـمِكَ أَمُـوتُ): خودایە! بە پیرۆزیی نـاوی تـۆ دەژیـمو بـە پـیرۆزی نـاوی تـۆ دەمـرم، ژیـنو مـردنم بەدەسـتی خۆتـە، حەزکـەیت لـەم خەوەمـدا خەبـەرم دەکەیتـەوە، حەزکـەیت دەم مرێنیت).

کاتێ لەخەویش هەڵ دەستا، دەیفەرموو: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِی أَحْيَانَا بَعْدَ مَـا أَمَاتَنَـا وَإِلَيْـهِ النُّشُـورُ): سـوپاسو سـتایش هـەر بـۆ ئـەو خودایەیـە، کـە لـەپاش ئـەوەی کـە مراندینی، زیندووی کردینـەوە، وە لەقیامەتیشدا زیندووکردنـەوە هـەر بەدەسـتی خۆیـەتی). {تـاج/٤، زنجـیرە: ٨، ژمـارە: ٤٢٧١ — دەسـتوورو نـەریتو دوعـاو نـزای نووستن + تاج/٥، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٩٨٦} + {ریاض/٢، زنجیرە: ١٢٧، ژمـارە: ٨١٧ — دەستوورەکانی نووستنو...}+(ریاض/٣ ز:٢٤٨ ژ:١٤٥٣ — ویرد خوێندنی بەیانیان).

١٨٩٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّهُ أَمَـرَ رَجُـلاً إِذَا أَخَـذَ مَضْجَعَهُ قَالَ: «اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا، لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا، إِنْ أَحْيَيْتَهَـا فَاحْفَظْهَـا، وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ». فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَسَمِعْتَ هَذَا مِنْ عُمَرَ؟ فَقَالَ:

مِنْ خَيْرٍ مِنْ عُمَرَ، مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث: ٦٨٢٦ = ٦٨٤٤ فم}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) بە پیاوێکی فەرموو: کاتێ دەچیتە ناو نوێنەکەوەو کەچویتە سەر نوێنی نوستنەکەت بڵێ:

«اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ»:

خودایە! گیانی من تۆ خۆت دروستت کردووە، وە خۆت وەری دەگریتەوە بۆلای خۆت، مانو نەمانیو مردنو ژیانی، بەدەستی خۆتە، دەی کەوایە: ئەگەر زیندوی دەکەیتەوەو لەم خەوە خەبەری دەکەیتەوە، ئەوا بە کەرەمو میهری خۆت چاوی خێرت لێی بێو ئاگاداری بکەو بیپارێزە، خۆ ئەگەر دەیمرێنی ئەوا لێی خۆشبە، ئەی پەروەردگارم! ئەی یەزدانی پاكو بێباك! داوای خۆشیو باشیو بێوەییو ئاسودەییو لەشی ساغت لێ دەکەم).

کابرایەکیش پێی گوت: باشە ئەی ئیبنو عومەر! تۆ خۆت ئەم نزایەت لە عومەری باوکت بیستوە؟ ئیبنو عومەریش فەرمووی: بەڵکو لە کەسێکم بیستووە کە لە عومەر گەلێ باشترە، لە حەزرەتی پێغەمبەری خودا خۆیم بیستووە (درووودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەو سەروەر لە خۆیو لە کەسوکارو لە یارانو هاوەلانی بێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٤٢٧٧ - دەستورو نەریتو نزای نوستن}.

١٨٩٩- عَنْ سُهَيْلٍ قَالَ: كَانَ أَبُو صَالِحٍ يَأْمُرُنَا إِذَا أَرَادَ أَحَدُنَا أَنْ يَنَامَ أَنْ يَضْطَجِعَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ، وَرَبَّ الأَرْضِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ. اللَّهُمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ، وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ». وَكَانَ يَرْوِي ذَلِكَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث٦٨٢٧=٦٨٤٥فم}:

سـوهەيل (کەماموٚسـتای جـەریری ماموٚسـتای زوهـەیری ماموٚسـتای ئیمـامی موسلیمە، (ڕەحمەتی خـودا لـە هـەموویان بـێ) فـەرمووی: ئـەبو صالحی ماموٚستام دەیفەرموو: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: خۆشەویست (درووودو صەلاتو سەلامی خودای لێ بێ) دەیفەرموو پێمان: (کاتێ کەسێك لە ئێوە دەیەوێ کە بچێتە سەر نوێنی نوستنەکەی بڵێ:

«اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ، وَرَبَّ الأَرْضِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُـلِّ شَـيْءٍ، فَـالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُـلِّ شَـيْءٍ، أَنْـتَ آخِـذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ، وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ».

ئـەی خودایـە! ئـەی پـەروەردگاری ئاسمانـەکان، ئـەی پـەروەردگاری زەوی، ئـەی پەروەردگاری بارەگای یەزدانی مەزن! ئەی پـەروەردگاری ئێمـە، ئـەی پـەروەردگاری هەموو شتێ! ئەی ئەو کەسەی کە لەتۆمەی ڕەق و تـەق و وشك و بـرین، چـووزەرەی سـەوزو ناسـك شـین دەکـەی! وە دانەوێڵـەو ناوکـە، لـەکاتی ڕوانو سـەوزبوونا، بـە توانـایی بـێ سـنووری خـۆت لـەت دەکـەیو دەیڕوێنـی! ئـەی دابەزێنـەری تـەوراتو ئینجیلو قورئان! ئەو قورئانەی کە ڕاستو ناڕاست لـە یـەکتری جیادەکاتـەوە، پـەنا دەگـرم بـە پـەنای تـۆ لـە شـەڕی هـەموو شـتێ، کـە جڵـەوی وا لەدەسـتی تـۆدا، ئـەی خودایە! ئەی پەروەردگاری گەورەو سەروەرم! تـۆ خـۆت ئـەوەڵو یەکـەم کەسـیتو سـەرەتات بـۆ نییـەو هـیچ شـتێ لـەپێش تـۆدا نـەبووە، وە تـۆ خـۆت ئاخرەمینیتو دواهـەمین کەسـیتو لـەدوای هـەموو مـەوجوودێ هـەردەمێنی، وەتـۆ هـەم ظاهیرو ئاشکراییو هیچ شتێ باڵا دەستی تۆ نییـە، وەهـەم بـاطینو پـەنهانیتو جگـە لـەتۆ، هەموو شتێ لەژێر دەستی تۆدایە، پـەروەردگارا! ئـەی خـودای گـەورەم! بـە کـەرەمو بەخشندەیی خۆت ئەو قەرزەی کە لەسەرمانە بۆمانی بدەرەوەو بەرەحمەتی خۆت، بە ماڵی ڕەحمەتو بەزانستی باشو بە ڕەفتـاری شیرینو بـە گوتـاری زێـڕین، داراو دەوڵەمەندمان بکەو لەو فـەقرو هەژارییـەی کـەدەبێ بەمایـەی کـوفرو ناسوپاسـیو

ناشوكريی تۆ، رزگارمان بفەرموو!). {تاج/٤، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٤٢٧٥ — دەستوورو نزای نووستن}.

١٩٠٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ) قَالَ: «إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَأْخُذْ دَاخِلَةَ إِزَارِهِ فَلْيَنْفُضْ بِهَا فِرَاشَهُ، وَلْيُسَمِّ اللَّهَ، فَإِنَّهُ لاَ يَعْلَمُ مَا خَلَفَهُ بَعْدَهُ عَلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَضْطَجِعَ، فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ، وَلْيَقُلْ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبِّى، بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِى، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِى فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ». {الحديث: ٦٨٣٠ = ٦٨٤٨ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري/٥، رقم: ١٩٨٢ = ٦٣٢٠، ٧٣٩٣ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥٠٥٠ . تحفة الأشراف: ١٤٣٠٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ یەکێ لەئێوە دەیەوێ بچێتە ناو نوێنەکەیەوە، با بە چمکی ناوەوەی جلەکەی، یا بەهەر شتێکی تر، نوێنەکەی بتەکێنێ، چونکە ئێوە نازانن کە لەپاش ئێوە نوێنەکە چی تری تێدەچێ، لەوانەیە مارێ، یا دووپشکێ، یا ئازارێکی تری تێ چووبێ، جا کەنوێنەکەی تەکان، ئەوجا بڵێ: بیسمیللاو ناوی خودا بهێنێ، کاتێ ویستی کە لەسەری رابکشێ، با لەسەر لای راست رابکشێو بڵێ:

(سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبِّى، بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِى، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِى فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ):

پاکیو پیرۆزی بۆ تۆیە ئەی خودایە! ئەی پەروەردگارم بە پیرۆزی ناوی پیرۆزی تۆ، تەنیشتی خۆم لەسەر ئەم نوێنە دادەنێمو دەخەوم، وە بەپشتی تۆ بەرزی دەکەمەوەو هەڵ دەستم لەخەو. خودایە! ئەگەر گیانم دەکێشیو گلی دەدەیتەوە لەلای خۆت لەم نووستنەمدا، ئەوا بە سۆزو میهرەبانی خۆت رەحمی پێ بکەو سۆزو میهری لەگەڵ بنوێنە، وە ئەگەر بەرەڵای دەکەیتەوەو لەم خەوە خەبەرم دەکەیتەوە ئەوا بیپارێزەو، بەوەی کە ئاگاداری بەندە باشەکانی خۆتی پێ

دەکەیت، ئاگاداریی ئەویشی پێ بکە). {تاج/٤، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٤٢٧٧ — دوعاو نزای نوستن} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٩، ژمارە: ١٤٦٠ — گوتەی کاتی نووستن}.

١٩٠١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا، وَكَفَانَا وَآوَانَا، فَكَمْ مِمَّنْ لاَ كَافِيَ لَهُ وَلاَ مُئْوِيَ». {الحديث: ٦٨٣٢ = ٦٨٥٠ فم}:

ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەدەچووە سەر نوێنی نووستنەکەی دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا فَكَمْ مِمَّنْ لاَ كَافِيَ لَهُ وَلاَ مُئْوِيَ»:

سوپاس و ستایش هەربۆ ئەو خودایەیە کە نان و ئاومان دەداو، بەشێ کە سەروبەر بەشمان بکا پێمان دەداو، جێگەو ڕێگەی حەسانەوەو حەوانەوەی پێمان داوە، ئەمە لەکاتێکدا کە چەندەها کەسی واهەن کەبێ کەس و بێ دالدەو بێ جێگەو بێ شوێن و بێ لانەن!). {تاج/٤، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٤٢٧٦ — دوعاو نزا} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٩، ژمارە: ١٤٦٣ — گوتەی کاتی نووستن}.

## ١٤٤٩) سوبحانەڵلا کردن لەپاش نوێژی بەیانی. (٦٨٥١ - ٦٨٥٦)
## التسبيح بعد الصلاة الصُّبْح

١٩٠٢- عَنْ جُوَيْرِيَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ، وَهِيَ فِي مَسْجِدِهَا، ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحَى وَهِيَ جَالِسَةٌ، فَقَالَ: «مَا زِلْتِ عَلَى الْحَالِ الَّتِى فَارَقْتُكِ عَلَيْهَا»؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ».

وَفِي رِوَايَةٍ أخرى عنها قَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ». {الحديث: ٦٨٥١، ٦٨٥٢ = ٦٨٦٩ فم. ترمذي: ٣٥٥٥. نسائي: ١٣٥١}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەبەیانی، لەلای جووەیرییەی هاوسەری بوو، جووەیرییە لە نوێژگاکەیدا بوو، خەریکی یادی خودا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش کردنی نوێژی بەیانی، لەسەر ئەو حاڵە بەجێی هێشتو دەرچووە دەرەوە، لەپاشان لەکاتی چێشتەنگاودا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەگەڕێتەوە بۆلای جووەیرییە، دەبینێ هەر لەسەر نوێژگاکەی خۆی دانیشتووە، پێی دەفەرموێ: (لەوساکەوە کەمن بەجێم هێشتوویت، هەر خەریکی تەسبیحاتیت؟). فەرمووی: بەڵێ. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەسا من لەدوائەوە کەلەتۆ جیابوومەتەوە، سێ جار ئەم چوار وشەیەم گوتووە، ئەگەر هەڵبکێشرێن بەو هەموو یادو زیکرو تەسبیحاتەدا، کەتۆ لەوساکەوە ئەمڕۆ کردووتن، بەرابەریان دەکەن‌و بەقەد ئەوان پاداشیان بۆ هەیە بگرە بەزیادیشەوە، کە ئەو چوار وشانەیش ئەمانەن:

(سُبْحَانَ اللّهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ):

١. بەقەی ژمارەی دروستکراوانی خودا تەسبیحات‌و حەمدو سوپاسی خودا دەکەم.
٢. هەروا ئەوەندەی کەخودا خۆی پێی خۆش بێ تەسبیحات‌و حەمدو سوپاسی دەکەم.
٣. هەروا بەقەد سەنگ‌و کێشی تەخت‌و بارەگای خودا، تەسبیحات‌و حەمدو سوپاسی خودا دەکەم.
٤. هەروا بەقەد ژمارەی وشەکانی خودا، کە لەژمارە نایەن، تەسبیحات‌و حەمدو سوپاسی خودا دەکەم). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٣٠ — ویرد لەپاش نوێژەوە + تاج/٥، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٩٧٣، ٤٩٧٤ — ژماردنی تەسبیحات‌و ویرد} + {ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤٣٣ — نامەی یادو زیکری خودا...}.

لەگێڕانەوەی ژمارە: (٦٨٥٢)دا، ئاوایە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (سُبْحَانَ اللّهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللّهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللّهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللّهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ).

بۆ ژیاننامەی جووەیرییە بڕوانە پاش ژمارە: (١٩٠٣) کە یەکسەر وا لەپاش ئەمەوە).

١٩٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ، لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلاَّ أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ، أَوْ زَادَ عَلَيْهِ». {الحديث: ٦٧٨٤ = ٦٧٩٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٩٤ = ٦٤٠٥ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥٠٩١. ترمذي. دعوات: ٣٤٦٩. تحفة الأشراف: ١٢٥٦٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درووددو سڵاوو ڕەحمەتو میهرەبانی خودای لەسەربێو گیانو هەستو نەست بەم شەوی هەینییە، بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ سەر لەبەیانیان، یا سەر لەئێواران سەدجار بڵێ: (سُبْحَانَ اللّهِ وَبِحَمْدِهِ) لەرۆژی قیامەتدا، کەسێ تر کردەوەی وانایاب لەگەڵ خۆی ناهێنێ، بۆ مەیدانی لێپرسینەوە، کە لەبابەتی یادی خودابێ، مەگەر کەسێ کە ئەویش ئەوەندەی ئەوی گوتبێ لەو تەسبیحاتە، یالەو زیاتری کردبێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٩٨٤ — یاد خوێندنو ویرد خوێندنی... + ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٨، ژمارە: ١٤٥١ — ویرد خوێندنی بەیانیانو ...}.

**ڕوونکردنەوە:**

جووەیرییەی کچی حاریث، هاوسەری پێغەمبەرە، یەکێکە لە دایکانی باوەڕداران، لەهۆزی بەنی موصطەلیقە، لەپێشدا ناوی (بەررە) بوو، کە بەواتا (باش = چاك = خاس) پێغەمبەر مارەیکرد، ناوەکەی گۆڕیو ناوینا جووەیرییە واتە: کچۆڵە. حاریثی باوکی ئاغای هۆزی بەنی موصطەلیق بوو، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە لەبەرکردووە، لە بوخاریو موسلیمدا، لەچەند شوێنێکا، لەچەند بۆنەیەکا ناوی هاتووە، لەسەر فەرمایشتی شێخی عەینی لە عومدەتولقاریئدا: ئافرەتێکی یادکاری زمانپاراو بەیادی خودا بووە، زۆر جاران کە نوێژی بەیانی دەکرد، لەسەر جێگە نوێژەکەی دادەنیشت، کۆمەڵێ ناوکە خورما، یا بەردە وردەی

لەبەردەمی خۆیدا، دادەنا وەك تەزبیحی ئەمڕۆ، هەتا چێشتەنگاوێکی درەنگ لەباتی تەزبیح، ویردو یادو تەسبیحاتی پێ دەژمارد، لەتەمەنی شەستو پێنج ساڵیدا، لەمانگی رەبیعیی یەکەمی ساڵی پەنجاو شەشی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە (رەزاو رەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ). {تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٩١٦، لاپەڕە: ٢٩٨، چ/١}.

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

١. تاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٣٠ کە خەریکی تەسبیحات بووە ص٢١٧.
٢. تاج/٣، زنجیرە: ٣٥ ئایەتەکان کەباسی قەدرو رێزی دایکانی موسوڵمانان دەکەن.
٣. تاج/٤، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٤٦١٧ = تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٧ = باسی غەزای بەنی موصطەلیق.
٤. تاج/٥، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٩٧١، ٤٩٧٢، ٤٩٧٣، ٤٩٧٤ — باسی ژماردنی تەسبیحاتو ویردو سەرچاوەی تەزبیح.
٥. عومدەتولقاری/ شێخی عەینی، بەرگی/١١، ص١٠٦ + ص٢٨٧ + عینی/١٧، ص٣٠٤ + ٣١٤ + عینی/١٣، ص٩٥.
٦. فەتحولباری/ شێخی عەسقەلانی، بەرگی/٤، ص٢٣٢، فەرموودەی ژمارە: ١٩٨٤ = ٩١٦ تەجریدی بوخاری.
٧. الإصابة في تمييز الصَّحَبَةِ، المجلد/٤، ص٢٥٦ (جويريـة). تسلسل/٢٥١ من أسماء النساء .
٨. الإستيعاب في مَعْرِفَةِ الْأَصْحَابِ، لإبْنِ عبدِ البر، المجلّد/٤، إسم (جويريّة) من أسماء النِّسَاءِ ص٢٥٨.
٩. تاج/١، ص٢١٧ + تاج/٢، ص٢٠٢ + ص٢٧٢ + تاج/٥، ص١٠١.
١٠. صحيح مسلم بشرح الامام النووي المجلد/١٧، ص٤٤ + شرح صحيح مسلم/١٠، ص١٤٠ إلى ص١٤٥.

**راستكردنەوە:**

لە تەجریدی بوخاریدا، لە ڕاڤەو شیکردنەوەی ژمارە: (٩١٦)دا لە ژیاننامەی جووەیرییەی کچی حاریثدا، ئاماژە بۆ ژمارە: (١٧٩٧) لە زنجیرە: ١٤٩ دا، دەکات، کە لەچاپی چوارەمدا، دەکەوێتە بەرگی/٢، لاپەڕە: ٣٣٥. ئەوە هەڵەیە، هیچ پەیوەندی بەم جووەیرییەوە نییە، هەروا ئاماژە بۆ ژمارە (٢٠١٩) لە زنجیرە: ١٨دەدا دەکا، لەهەمان بەرگا، لە لاپەڕە: ٤٤٩دا، ئەویش هەر هەڵەیەو پەیوەندی بەم جووەیرییەوە نییە.

لەسەر فەرمایشتی ئیصابە مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەریش لەپێشدا ناوی (بەڕڕە) بووە، پێغەمبەر کە مارەی دەکا ناوی دەنێ: (مەیموونە = پیرۆز = پێبەخێر).

هەروا لەسەر فەرمایشتی ئیصابە زەینەبی کچی جەحشیش لەپێشا ناوی بەڕڕە بووە، پێغەمبەر کە مارەی دەکا، دەیگۆڕێ بە زەینەب.

هەروا زەینەبی هەنەزای پێغەمبەریش، کە کچی ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر بوو لەپێشا ناوی بەڕڕە بوو، پێغەمبەر گۆڕی بە زەینەب.

### ١٤٥٠) **خێرو بەهرەی** (**سُبْحَانَ اللّهِ**) **کردن**. (٦٧٨٣ - ٦٧٩٢)
### **بَابٌ: فِي فَضَائِلِ التَّسْبِيحِ**

١٩٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِى الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ». {الحديث: ٦٧٨٦ = ٦٨٠٢ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٥، رقم: ٢١٣٤ = ٧٥٦٣، ٦٤٠٦ فتح البارى. ترمذى. دعوات: ٣٤٦٧. ابن ماجة. أدب: ٣٨٠٦. تحفة الأشراف: ١٤٩٠٠}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درووودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئەم دوو وشەیە: (سُبْحَانَ اللّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللّهِ العَظِيمِ: خودا بە پاكو پیرۆز دەزانمو سوپاسو ستایشی بێ پایانی دەکەم، دیسان خودای خۆم، یەزدانی مەزن، بە

پاكو پيرۆز دەزانمو، لەمەدا هيچ گومانو سوو گومانێكم نييە). ئەم دوو وشە پيرۆزەيە سووكو خۆشو ئاسانن لەسەر زمانو، قورسنو گرانن لەناو شايان لەكاتى كيشان، كەهەموو كردەويێ لە قيامەتدا بەترازوو دەكێشرێ، خۆشەويستن لەلاى خوداى ميهرەبان). {رياضى صالحين/٣، زنجيرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤٠٨ — نامەى زيكرو يادى خوداى گەورە} .

**روونكردنەوە:**

ئەم فەرموودەيە دوايين فەرموودەيە لە صەحيحى بوخاريدا.

١٩٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ): «لأَنْ أَقُولَ سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ». {الحديث: ٦٧٨٧ = ٦٨٠٣ فم} :

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (سوێند بەخودا يەك جار بڵێم: (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ: پاكىو پيرۆزى بەتەواوى هەر بۆ خودايە، هەروا سوپاسو ستايش، تەنها يەزدانى پاك خوداى بەهەقەو بەس، خودا لە هەموو كەسێ گەورەترە). فەرمووى: (يەك جار ئەم وشە پيرۆزە بڵێم، لەلام لەهەموو موڵكو سامانو دارايى جيهان باشترو خۆشەويسترە). {رياضى صالحين/٣، زنجيرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤٠٨ — نامەى زيكردو يادى خودا...} .

## ١٤٥١) لەبارەى (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)و (الحمد للّه)و (اللّهُ أَكْبَر) كردنەوە. (٦٧٨٣ - ٦٧٩٢)
## بابٌ: فِي التَّهْلِيلِ وَالتَّحْمِيدِ وَالتكبير

١٩٠٦- عَنْ مُوسَى الْجُهَنِيُّ عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِـيَ اللهُ عَـنْهُم) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمْ)، فَقَالَ: عَلِّمْنِى كَلاَمًا أَقُولُهُ. قَالَ: «قُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ». قَالَ: فَهَؤُلاَءِ لِرَبِّى، فَمَا لِى؟ قَالَ:

«قُل: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي». (قَالَ مُوسَى: أَمَّا عَافِنِي فَأَنَا أَتَوَهَّمُ، وَمَا أَدْرِي). {الحديث: ٦٧٨٨ = ٦٨٠٤ فم}:

موسای ئەلجوهەنی فەرمووی: موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: عارەبێکی چۆڵ نشین هاتە خزمەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: قوربان! گوتارێ، فەرموودەیێ، قسەیێکم فێربکە، کە بۆ خۆم بیڵێم، هەتا سوودێکم پێ بگەیەنێ. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ)

(بڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ):

بێجگە لە خودای تاكو تەنیا خودای تر نییە، هاوبەش‌و هاوەڵی نییە، خودا لەگشت شتێ مەزنترو گەورەترە، سوپاسێکی زۆر بۆ خودای گەورە، پاکی‌و پیرۆزی‌و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، هێزو تەوانایی هەربەدەستی خودا خۆیەتی‌و بەس، کە تواناو دانایە).

پیاوە دەشتەکییەکە گوتی: ئەم وشانە سوپاس‌و ستایش‌و وەسپی خودان‌و بۆ پەروەردگاری منن، بفەرموو گوتەیەکی وایشم پێ بفەرموو کە پەیوەندی بەمنەوە بێ‌و بۆ خۆم بێ؟!

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بڵێ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي):

خودایە! لێم خۆشبەو، ڕەحمم پێ بکەو، ڕێگەی هەقم پێ نیشان بدەو، رزق‌و ڕۆژی حەڵاڵ‌و پاکم پێ بدە).

مووسای ئەلجوهەنی فەرمووی: ئایا وشەی (وَعَافنی)یش یەکێ بێ لە وشەکانی ئەم فەرموودەیە، ئەوەم لێ روون نییە، لەوە بەگومانم. {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤١٤ — نامەی زیکرو یادی خودا...}.

**روونکردنەوە:**

١- موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەخۆی‌و لە باوکی بێ) تابیعییە، لە پەیڕەوانە، گێڕانەوەی لەم زاتانەوە هەیە: لە

باوکیو له عەلیو طەلحەو عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهلو لەکەسانی تریشەوە، لەپیاوانی شەش پەڕاوەکانە، واتە: لە ریجالی سەنەدی بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجەیە، کە لەپەڕاوی (تهذیب التهذیب)ی عەسقەلانیدا، هێمای (ع)یان بۆ دانراوە. بڕوانە ئەم ژمارانە، کە لەپێشەوە رابوردوون، بۆ ژیاننامەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (٢٠٠ + ٢٩٦ + ٣١٠ + ٤٧٨) موصعەب لەساڵی (١٠٣)ی کۆچیدا مردووە.

٢- مووسای جوهەنی ناوی تەواوی: (مووسای کوڕی عەبدوڵڵای ئەلجوهەنی)یە، کەسناو (کونیە)ی ئەبو سەلەمەیە، نازناو (لەقەب)ی کووفییە، گێڕانەوەی زۆرە، متمانەیە.

یەعلای کوڕی عوبەید، لەسەر فەرمایشتی تەهذیبو تەهذیب، دەفەرموێ: لەشاری کووفە، خەڵکەکە چوار سەرۆکی خانەدانیان هەبوو کە یەکێکیان مووسای جوهەنی بوو، رۆژ بەرۆژ کەدەیت بینی، هەستت دەکر کە لەرۆژی پێشو باشترە. عەسقەلانی لە (تهذیب التهذیب)دا دەفەرموێ: ساڵی (١٤٤) سەدو چڵو چواری کۆچی مردووە (رەحمەتی خودای لێ بێ).

## ١٤٥٢) **خۆشەویسترین ویرد لەلای خودا، یادی (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)یە.**
(٦٨٦٢ - ٦٨٦٣)

## **باب: أحَبُّ الْكَلَامِ إِلَى اللهِ: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)**

**١٩٠٧**- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ): «أَلاَ أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِأَحَبِّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. فَقَالَ: «إِنَّ أَحَبَّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ». {الحديث: ٦٨٦٣ = ٦٨٨٢ فم}:

ئەبو زەڕ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (هۆشیار بە! دڵت لەلام بێ، باپێت بڵێم کە خۆشەویسترین گوتار لەلای یەزدانی پاك چییە؟).

ئەوجا فەرمووی پێم: (دڵنیابە کە بێگومان خۆشەویسترین فەرمایشتو وتار لەلای یەزدانی گەورەو سەروەر، ئەم گوتە پیرۆزەیە: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ: پاکیو پیرۆزیو بێ گەردی لەهەموو نەنگو کەمو کوڕیو ناتەواوییەك، لەگەل سوپاسو ستایشێکی جوانا، هەمووی هەر بۆ زاتی پەروەردگارە). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤١٢} + {تاج/٥، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٤٩٦٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرمویٚ: ئەمە کە ئەم یادە خۆشەویسترین وتاربێ، تایبەتە بەقسەو وتاری ئادەمیزادەوە، دەنا قورئان کە فەرمایشتی خودایە گەورەترو خۆشەویسترە، وە هەروا خوێندنیشی. وەکی تریش: ئەو یادو زیکرو نزاو دووعایانەیش کەمەئثوورنو پەیوەندییان هەیە، بەکاتو شوێنو بارو دۆخو حاڵو مەقامەوە، خەریکبوون بەوانەوە، لەکاتو شوێنو بۆنەی خۆیاندا خێری زیاترە. قسەی نەوەوی تەواو.

**١٤٥٣) کەسێ ڕۆژێ سەدجار بڵێ: (لا إلهَ إلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ). (٦٧٨٣ - ٦٧٩٢)**

**بَابٌ: فَمَنْ قَالَ: {لا إلهَ إلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ} فِي اليَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ**

١٩٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) قَالَ: «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ، يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلاَّ أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ. وَمَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ». {الحديث: ٦٧٨٣ = ٦٧٩٨ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٥، رقم: ١٩٩٢ = ٦٤٠٣، ٣٢٩٣ فتح البارى + رقم: ١٩٩٤ تجريد = ٦٤٠٥ فتح البارى}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (هەرکەسێ، هەر رۆژێ سەدجار بلێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَـهُ لَـهُ الْمُلْكُ وَلَـهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ):

هەر خودا خودای بەهەقەو بەس، خودایەکی تاكو تەنهایە، هیچ هاوبەشێکی نییە، مولْكو سامانو دارایی‌و پاشایی‌و دەسەلاتو سوپاس‌و ستایش هەمووی هەر بۆ خۆیەتی، وە ئەو خودایەکی وایە کە دەستی دەڕوا بەسەر گشت شتێکاو، توانایی هەموو شتێکی هەیە).

فـەرمووی: (هەرکەسێ لـەرۆژێکا، سـەدجار ئـەم زیکـرە بلـێ، هاوتـای خێـری ئـازادکردنی دەکۆیلـە دەکـا، سـەرەڕای ئـەوەیش سـەد چاکەی لەنامـەی کـرداردا بـۆ دەنووسرێ، وە سەد خراپەیش، لە دەفتەری کرداری کە فریشتە نووسیونی لەسەری دەکوژێتەوە، سەرباری ئەمانەیش دەبێ بەقسن‌و پەرژین‌و دژو قەلا، لەدژی شەیتان، وە ئـەو رۆژە تـا ئێـوارێ شـەیتان پێـی نـاوێرێ، وهـیچ کەسـێ لـە یادکـارانی خـودای گەورە بەقەد ئەو خێری ناگا، مەگەر کەسێ کە لەم یادو زیکرە لەو پتربکات).

وە فەرمووشی: (هەرکەسێکیش هەر رۆژێ لە رۆژان سەدجار بلێ: (سُبْحَانَ اللّـهِ وَبِحَمْدِهِ) بە فەرمانی خودا هەموو گوناهەکانی هەڵ دەوەرن، ئەگەرچی لەبـەر زۆری وەك کـەفی دەریـا ئـاوا زۆربـن!). {ریاضـی صـالحین/٣، زنجـیرە: ٢٤٤، ژمـارە: ١٤١٠ — نامەی زیکرو یادی خودا}.

## ١٤٥٤) کەسێ سەد تەسبیحات بکات لەرۆژێکا. (٦٧٨٣ - ٦٧٩٢)

## باب: فِيمَنْ سَبّح مِائَةَ تَسْبِيحَة

١٩٠٩- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاسْ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّـهُ عليـه وَسَـلَّمْ) فَقَالَ: «أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ»؟ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ قَالَ: «يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ فَيُكْتَبُ لَـهُ أَلْـفُ حَسَـنَةٍ، أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ». {الحديث: ٦٧٩٢ — ٦٨٠٨ فم}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی خۆشەویستدا (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووین فەرمووی: (ئەرێ یەکێ لەئێوە ناتوانێ کە هەموو رۆژێ هەزار چاکە بۆ خۆی دابین بکا؟) یەکێ لەدانیشتوانی خزمەتی لێی پرسی: قوربان! چۆن چۆنی یەکێ لەئێمە دەتوانێ کە رۆژێ هەزار چاکە پەیدابکا بۆ خۆی؟

فەرمووی: (سەد تەسبیحات بکات، هەم هەزار چاکەی بۆ دەنووسرێتو هەم هەزار خراپەی لێ هەڵ دەوەرێ).

**روونکردنەوە:**

١- جۆری تەسبیحات، بەو گشتە شێوازە دەبێ، کە لەسەرەتای نامەی زیکرەوە هەتا ئێرە تۆمار کراون، وەك وتنی (سُبْحَانَ اللّٰهِ) فەرموودەی ژمارە: (١٨٩٥) یا وەك ئەو داڕێژگەیەی کە لەژمارە: (١٩٠٠)دا، تۆمار کراوە لە (سبحانك اللهمَ) هەتا (عبادَكَ الصَّالحين) یاوەك ژمارە: (١٩٠٤) و (١٩٠٥) و (١٩٠٦) و (١٩٠٧).

٢- زاناکان وەك لەشەرحە گەورەکاندا دەفەرموون: مەبەست لەو تاوانو گوناهانەی کە خودای گەورە بەهۆی گوتنو کردنی ئەم جۆرە زیکرو یادو ویردانەوە، لەبەندە دەیانسڕێتەوە، ئەو جۆرە گوناهو تاوانەن کە پەیوەندییان بە مافی خوداوە هەبێ، وەك درۆیێ زیانی بۆ کەس نەبێ، یاوەك زوڵم کردن لە خودی خۆت، نەوەك گوناهێ کە پەیوەندی بەمافی خەڵکەوە هەبێ، وەك دزینی ماڵی، وەکی تریش بە ئەزموون دەرکەوتووە کەسانێ کە خوو بگرن بە خواپەرستیو زیکرو یادکردنی خوداوە، بەتایبەتی ئەم جۆرە یادە پیرۆزانە، دوورترین کەسن لە گوناهو نافەرمانی خودا.

هەروا وابەبەر چاوەوە بە تەجرەبەو ئەزموون دەرکەوتووە کە درۆزنو پیاو خراپو دزو حیزو خوێن ڕێژو خراپەکاریش دوورترین کەسن لەیادو زیکری خودا، بەتایبەتی لەکردنی ئەم جۆرە یادو زیکرە تایبەتییانە، کابرای زۆرداری ملهوڕ، نەك هەر ئەم یادو زیکرانە ناکا، بەڵکوو گاڵتەیشی پێی دێ.

مەگەر کەسێ کەخودا هیدایەتی بداو تەوبەی بەڕاستی بکا، ئەوانەیش بەخودا زۆر کەمن، چونکە بەڕاستی گوناهو تاوان بەرە بەرە وادڵو دەروونی مرۆڤ رەقو رەش دەکەن، هەتا لووتیان نەتەقێ بە بەردی ئەلحەدداو گۆڕیچەدا، سەرهۆش خۆیان نایانەوە!

زۆرمان دی لەگەڵ ئێمەدا فەقێ بوون، نوێژکارو خواناسو باشکار بوون، بگرە شەو نوێژو خەتمەی قورئانیان دەکرد، بەلاّم بەرە بەرە تێکەلاّوی دنیا بوون، گوناهو تاوان دڵی رەشو رەق کردن، وەك گەردەلوولو رەشەبایێ پووشکەو قنگەلاّشکەیێ لوولبدا، ئاوا لافاوی تاوانو گوناهو نافەرمانی، راپێچی کردن، هەتا فریای شایەتمانی سەرە مەرگ نەکەوتن، بەدەم سەرخۆشیو بەد مەستییەوە گیانیان دەرچوو!!

**ژیاننامەی ئیمامی موسلیم:**

١- ئیمامی موسلیم ناوی موسلیمی کوڕی حەجاجی کوڕی موسلیمە، کەسناو (کونیە)ی ئەبولحوسەینە، قوشەیرییە، لە ولاّتی نەیسابوور پەروەردە بووەو گەورە بووە، دانەری صەحیحی موسلیمە، کەپاش قورئان یەکەم پەڕاو: صەحیحی بوخارییە، دووەم پەڕاو: صەحیحی موسلیمە، شەرعزانێکی گەورە بوو. قوشەیر هۆزی ئیمامی موسلیمە، هۆزێکی عەرەبی ناسراوە، لەنەیسابوور گەورە بووە، کە نەیسابوور، جوانترینو خۆشترین شارە لە شارەکانی ولاّتی خوراسان، سابوور پادشایێ بووە، لەوێوە دەڕوا، نەیو قامیشی زۆری لێ دەبێ، دەڵێ: ئەمە بۆ جێگە شار باشە، نەیجە (تەرکە: قامیش)ی زۆری لێ دەبێ فەرمان دەکا (نەیجە)کە دەبڕنو شوێنەکە دەکەن بەشارو ناوی دەنێ (نەی + سابوور = نەیسابوور).

٢- پێشەوا موسلیم، لەسەر فەرمایشتی سەنگین لەشاری نەیسابوور، لەساڵی (٢٠٤) دوو سەدو چواری کۆچیدا لەدایك بووە، سەبارەت بەساڵی لەدایکبوونی راجیایی زۆر هەیە.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: (موسلیم لەو ساڵەدا لەدایك بووە، کە شافیعی تیادا مردووە. کەسێ لە زانایانێ کە گرنگییان داوە بە ژیاننامەکان، باسی مناڵیی ئەویان نەکردووە، هەروا باسی بنەماڵەشیان نەکردووە).

٣- موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) بە دەوڵەمەندی پەروەردە بووە، زۆر سەخیو بەخشندە بووە، ذەهەبی لە (السیر)دا دەفەرموێ: بازرگانێکی گەورە بوو، چاکەخوازی نەیسابوور بوو، موڵكو سامانو دارایی باشی هەبوو.

٤- حاکم دەفەرموێ: بالأیەکی تەواوی هەبوو، سەروریشی سپی بوو، لفکەی مێزەکەی بەناو شانیدا شۆڕ دەکردەوە.

٥- گەڕانی بەشوێن بیستنی فەرموودەدا، لەساڵی دووسەدو هەژدەدا دەستی کرد بە بیستنی فەرموودە، لەخزمەت یەحیای کوڕی یەحیادا، لەساڵی دووسەدو بیستدا چوو بۆ حەج، هێشتا مووی لێ نەهاتبوو لەمەککە دەستی کرد بە بیستن لەلای ئەلقەعنەبی، وەچەندین جار هاموشۆی بەغدادی کردووە، خەڵکی بەغدا، گێڕانەوەیان لەوەوە ئەنجام داوە، دواهاتنی بۆ بەغداد، لەساڵی (٢٥٩) دووسەدو پەنجاو نۆدا بوو.

٦- مامۆستایەکی زۆر زۆری بووە، کە فەرموودەی لێیان وەرگرتووە، وەك هەموو مامۆستاکانی کە صەحیحی موسلیمی لێیانەوە گێڕاوەتەوە، یەکێ لەوان: ئیمامی بوخارییە.

٧- کاتێ ئیمامی بوخاری تەشریفی هات بۆ نەیسابوور، لە سەرەتاوە، موسلیم دەستی پێی نەدەگەیشت، بەڵام لەدواییدا هۆگری بوو، وە بەزۆری هاموشۆی دەکرد.

خەطیب دەفەرموێ: موسلیم پەیڕەوی ئیمامی بوخاری کردووە، وە لەدانانی صەحیحی موسلیمدا، چاوی لە بوخاری کردووەو ئەوی کردووە بە پێشەواو سەرمەشق بۆ خۆی.

داره قوطنی دەفەرموێ: (ئەگەر بوخاری نەبوایە، موسلیم نەدەهاتو نەدەڕۆی!).

ئەحمەدی حەمدون ئەلقەصار دەڵێ: موسلیمی کوڕی حەجاجم بینی، هات بۆلای ئیمامی بوخاری، نێوانی ناوچاوەکانی ماچ کردو فەرمووی بە بوخاری: رێگەم بدە کە هەردوو پێکانت ماچ بکەم، ئەی مامۆستای مامۆستایان! ئەی سەروەری فەرمووده شوناسەکان! ئەی پزیشکی فەرموودە، بۆ دەردو نەخۆشینەکانی، ئەوجا لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە پرسیاری لێی کرد، کە باسی کەفارەتی هەڵسان لە کوڕی دانیشتن دەکا، ئەویش باسی عیللەکەیی کرد بۆی، کاتێ بوخاری لە تەقریری پرسیارەکە لێ بۆوە، موسلیم فەرمووی: (ئەوەی رقی لەتۆ بێ، دیارە بەخیل‌و حەسوودە، دەنا کەس نییە کە رقی لەتۆ بێ، شایەتی دەدەم کە وێنەی تۆ ئەمرۆ لەجیهاندا نییە).

٨- شاگردو فەقێی زۆری بوو، یەکێ لەوانە ئیمامی تەرمەزییە، یەك فەرموودەی لە موسلیمەوە ریوایەتکردووە، یەکێ تریان (أبو عوانة الأسفرانيي)یە هەروا ئیبنو خوزەیمەو ئەبو حاتەمی ئەل – رازی‌و مووسای کوڕی هاروون‌و ئەحمەدی کوڕی سەلەمەو ئیبراهیمی کوڕی ئیسحاقی صەیرەفی.

٩- پلەو پایەی. بەکۆی دەنگ زاناکان دایاننـاوە بە پێشەوایەکی گەورەی فەرموودە زان، گەورەترین بەلگەو قەواڵە لەسەر پایە بەرزیی ئەم زاتە، ئەو هونەرە بەرزەیە کە پیادەیکردووە لە دارشتنی صەحیحی موسلیمدا.

١٠- صەحیحی موسلیمەکەی بووە بەسەرچاوەیەکی زۆر گرنگ‌و لەبەرچاو، بۆ سوننەتی پێغەمبەرو، بۆ شەریعەتی ئیسلام لەپلەی یەکەمدا، هەروا بووە بەسەرچاوە بۆ فەضائیلی سەحابەکان‌و بۆ تەفسیرو زۆر لە بابەتەکانی ئایینی ئیسلام، بەتایبەتی لە بابەتی سوننەت‌و فەرموودەدا.

چەندین کتێبی لەبارەوە دانراوە، وەك شەرح‌و پوختەکردن‌و لێکۆڵینەوەو باسی پیاوانی رشتەکانی، بەناوترین شەرح لەسەری شەرحەکەی ئیمامی نەوەوییە. لە تەرجەمەی ژیانی موسلیمدا، لەسەرەتای بەرگی یەکەمی شەرحی موسلیمەوە، تەحقیقی شێخ خەلیل مەئموون شیخا، ناوی (٢٧) بیست‌و حەوت شەرح نووسراوە،

وه ناوی پێنج موختەصەری تۆمارکراوه. روباعیاتەکانی صەحیحی موسلیم بیستو پێنج فەرموودەن کە هەریەکی چوار ڕاوییان هەیەو بەس، بۆیە پێیان دەگوترێ: فەرمووده چوارینەکان، واتە لەنێوانی موسلیمو پێغەمبەردا چوار کەسی تر هەیەو بەس.

١١- ئەم ناونیشانانە لەو پەڕاوانەدا بەرچاو دەکەون، کە پەیوەندییان بە صەحیحی موسلیمەوە هەیە:

أ- شروح على أجزاءِ من صحيح مسلم.

ب- مختصرات لصحيح مسلم (پێنج موختەصەر تۆمارکراوه).

ج- الرباعيات من صحيح مسلم (٢٥ حديثا بأربعة رواة فقط).

د- كُتبٌ حوْلَ صحيح مسلم.

و- حول رُواةِ مسلم والبخارى ورواياتِهم.

ز- الجمْعُ بين رجالِ الصحيحين.

ح- أسَامي شيوخ البخارى ومسلم.

ط- شرُوحٌ لصحيحى البخارى ومسلم.

ى- الروايات المشتركة في البخارى ومسلم.

ك- المُستدرَكُ على البخارى ومسلم.

ل- الجَامِعُ بين الصحيحين.

م- أحكَامُ الصحيحين.

ن- كتابُ الكُنى والأسماء

س- زۆر پەڕاوو بابەتو سەرباسی تری لەم بابەتانە.

١٢- مردنی ئیمامی موسلیم.

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای نەیسابووری دەڵێ: بیستم لە ئەبو عەبدوڵڵا موحەممەدی کوڕی یەعقووب دەیفەرموو: بیستم لە ئەحمەدیکوڕی سەلەمە دەیفەرموو: کۆڕێ گیرا بۆ ئیمامی موسلیمی کوڕی حەججاج بۆ گفتوگۆ لەبارەی

فـەرموودەوە، فەرموودەیـەکیان بـۆ بـاس کـرد، نـەیزانیو ئاگـای لێـی نـەبوو، جـا گەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوەی، لـەوێ چـرای هـەڵکردو گـوتی بەوانـەی لـە ماڵەکـەدا بـوون: کەستان نەیەن بۆلام بۆ ئەم هۆدەیەی خۆم.

عەرزیانکرد: زەمیلەیێ خورمایان بەدیاری بۆ هێناوین. فەرمووی: بیهێنن بۆم، ئەوانیش بردیـان بـۆی، ئـیتر هەربـەدوای ئـەو فەرموودەیـەدا دەگـەڕاو لـەو زەمیلـە خورمایـەی، دەنکـە دەنکـە، دەخـوارد، هـەتا کـاتی بـەیان، ئەوسـا فەرموودەکـەی دۆزییەوە، وە زەمیلە خورماکەیش تەواو بوو بوو!

موحەممەدی کوڕی عەبـدوڵلا فـەرمووی: کەسـانی تـری بـاوەڕپێکراو، جگـە لـە ئەحمەدی کوڕی سەلەمە (کە فەقێی ئیمامی موسـلیم بـووە)، ئەمـەیان لـەم هەواڵـە زیادکرد بۆم: کەئەوە بوو بەهۆی مەرگیو بەوە مردووە.

ئیبنـو کـەثـیر دەفـەرموێ: جـا بـەهۆی ئـەو ڕووداوەوە، لەشـی قـورس دەبـێو نەخۆش دەکەوێ، لەرۆژی دوو شەممەدا، لە بیستو پێنجی مانگی رەجەبدا، لەساڵی (٢٦١) دوو سـەدو شەسـتو یـەکی کۆچیدا، لـە تەمـەنی پـەنجاو حـەوت ساڵیدا لـە نەیسابوور مـەرگ دەبـێ بـەمیوانیو دەمـرێ (رەحمەتی خودای لێ بێ)، گۆڕەکـەی هـەتا ئێسـتا زانـراوەو دەناسـرێ، موسـوڵمانان بـۆ پەنـدو ئـامۆژ، پـۆل پـۆل دینـیو سـەردانی گۆڕەکەی دەکـەن. هەنـدێ تـر دەفـەرموون: لـەرۆژی یەکشـەممەدا لـەو مێـژووەدا کـە ناومان هێنا مردووە، بەڵام لەرۆژی دوو شەممەدا بە خاك سپێرراوە، تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵ بووە.

ئیمامی نەوەوی لە (تهذيب الأسماء واللغات)دا، دەفەرموێ: لەدوا مەرگی موسلیم هەتا ئەمڕۆ کەڵە پیاوی وا هەڵ نەکەوتۆتەوە.

هەروا دەفەرموێ:

(لە گـەڕان بەشـوێن زانسـتو زانیـاریو زانینـدا، وڵاتـی زۆر چـووەو بەخزمـەت مامۆستای گەورە گەورە گەیشتووەو زانستو فەرموودەو زانستی فەرموودەی لێیـان وەرگرتووە، وەك:

١- له خۆراسان لهلای کوڕی یهحیاو ئیسحاقی کوڕی راهوهیهو کهسانی تریش، زانستو فهرمووده فێربووه.

٢- لهڕهی، له موحهممهدی کوڕی مههرانو ئهبو غهسسانو کهسانی تریش.

٣- له عێراق له ئهحمهدی کوڕی موحهممهدی کوڕی حهنبهلو عهبدوڵلای کوڕی مسلمهو کهسانی تریش.

٤- له حیجاز، له سهعیدی کوڕی مهنصوورو ئهبو موصعهبو کهسانی تریش.

٥- له میصر، له عهمری کوڕی سهوادو له حهرمهلهی کوڕی یهحیای توجیبیو کهسانی تریش.

١٣- دانراوهکانی تری ئیمامی موسلیم:

أ- له زانستهکانی فهرموودهدا، پهڕاوی زۆری داناوه، بهناوبانگترینیان صهحیحی موسلیمه، کهبووه بهمایهی خێرو بێرو پیتو فهرێکی زۆر بۆ نهتهوهی ئیسلامو بهمایهی سهر بهرزیو شانازیو ناوی جوان بۆ خۆی لهههردوو جیهاندا. ههروا پهڕاوی (الكتاب المسند الكبير عَلَى أسماء الرجال) و پهڕاوی (الجامع الكبير عَلَى الأبواب) و (كتاب الملل)و پهڕاوی (أوهَامُ المحدثين) و پهڕاوی (التمييز) و پهڕاوی (مَنْ لَيْسَ لَهُ إلاَّ رَاوٍ وَاحِلٌ) و پهڕاوی (طبقات التَّابِعِين) و پهڕاوی (الْمُخَضْرَمِينَ) و پهڕاوی تریش، وهك: (الكُنَى والأسماء) و (المنفردات والوحدان) و (رجال بن الزبير) و (الأقران) و (سؤالاتُهُ أحمدَ بنَ حَنْبَلَ) و (عمر بن شعيب).

ب- لهبابهتی تردا:

(الانتفاع بأُهَبِ السِّبَاع) و (مَشَايخ مالك) و (مشايخ الثورى) و (أولاد الصَّحَابَةِ) و (أفْرَادُ الشَّامِيِّينَ).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٨- نامەی پەناگرتن بەخوداو شتی تریش
## كتابُ التعوّذ وغيْرُه

{بڕوانە: تاج/٥، زنجيرە: ٧١ هەتا ٧٢، لەژمارە: ٥٠٦٢ هەتا ژمارە: ٥٠٧٧}.

### ١٤٥٥) پەناگرتن بەخودا لەشەڕی ئاژاوە گەل. (٦٨١٠ - ٦٨١٩)
### بَابٌ: التَّعَوُّذُ مِنَ الفِتَنِ

١٩١٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) كَـانَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الدَّعَوَاتِ: «اللَّهُمَّ فَإِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ، وَعَذَابِ النَّارِ، وَفِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَاىَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِى مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّـوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِى وَبَيْنَ خَطَايَاىَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْـرِبِ اللَّهُـمَّ فَإِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَـرَمِ، وَالْمَـأْثَمِ وَالْمَغْـرَمِ». {الحديث: ٦٨١٠ = ٦٨٢٧ فـم. تجريـد البخـارى بـالكوردى/١، رقـم: ٤٤٧ = ٨٣٢، ٨٣٣، ٢٣٩٧، ٦٣٦٨، ٦٣٧٥، ٦٣٧٦، ٦٣٧٧، ٧١٢٩. تحفـة الأشـراف: ١٦٩٨٨. ابـن ماجـة. دعـاء: ٣٨٣٨. أبـو داود. الصلاة: ٨٨٠}:

عائيشە (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فـەرمووی: پیٚغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) بـەم وشـانە نـزای دەكرد، دەيفەرموو:

«اللَّهُمَّ فَإِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ، وَعَـذَابِ النَّـارِ، وَفِتْنَـةِ الْقَبْـرِ، وَعَـذَابِ الْقَبْـرِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَاىَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِى مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْـتَ الثَّـوْبَ الأَبْـيَضَ مِـنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِى وَبَيْنَ خَطَايَاىَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللَّهُـمَّ فَـإِنِّى أَعُـوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ»:

ئەی خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لە بەڵاو ئاژاوەی ئاگری دۆزەخو، لەسزای ئاگری دۆزەخو لە ئاژاوەی گۆڕو، لەسزای گۆڕو، لەشەڕی ئاژاوەی دەوڵەمەندیو، لەشەڕی ئاژاوەی هەژاری، پەنادەگرم بەتۆ لەشەڕی ئاژاوەی جەجاڵە کوێرەی هەلاتباز. خودایە! بەرەحمەتی خۆت گوناهەکانم بەئاوی بەفرو تەرزە بشۆرەوە، وەك چۆن شتێ بەئاوو بەئاوی بەفرو بە تەرزە بشۆردرێ تەواو پاك دەبێتەوە ئاوا، دڵم لەتاوان پاك بکەرەوە، وەك بلووری بێ گەردو بلووریی سپی، هەروا لەتاوان دوورم بخەرەوە وەك دووریی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا لەیەکرتی. ئەی خودایە! من پەنا دەگرم بەتۆ لە تەمەڵیو تەوەزەلیو، لە ئیفتادەیی کاتی پیرییو لە گوناهباریو تاوانباریو، لەباری ژێر قەرزاریو قەرز کوێری!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٥٠٦٤ — ئەو گوتە حەدیسییانەی کە بەکاردەهێنرێن بۆ پەناگرتن بە خودای گەورە}.

### ١٤٥٦) پەناگرتن بەخودا لە تەمەڵیو تەوەزەلی. (٦٨١٠ - ٦٨١٩)
### بابٌ: في التعوُّذ من العجز والكسل

١٩١١- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ وَالْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ». {الحديث: ٦٨١٢ = ٦٨٢٩. تجريد البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٦٦٩ = ٤٧٠٧ فتح الباري، ٢٨٢٣، ٦٣٦٧، ٦٣٦٩، ٦٣٧١. أبو داود. الصلاة: ١٥٤٠. نسائي. اسْتعاذة: ٥٤٦٧. تحفة الأشراف: ٨٣٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی پەناگرتن بەخوادا دەیفەرموو:

«اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ وَالْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»:

واتە: ئەی خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لە بێکارەییو تەوەزەلیو، لە ترسنۆکیو، لە کەفتەکاریی کاتی ئیختیارییو، لە چرووکیو رەزیلی، وە پەنادەگرم بەتۆ لە سزای ناو گۆڕو، لە گیرۆدەبوونو گرفتار بوون بەدەست فەرتەنەو ئاژاوەی ژیانو

مردنـەوە). {تـاج/٥، زنجـیرە: ٧١، ژمـارە: ٥٠٦٦ – ئـەو گوتـە حـەدیثییـانـەی کـە بەکار...}.

## ١٤٥٧) پەناگرتن بەخودا لە چارەنووسی خراپو لە تووشبوونی نەگبەتی. (٦٨١٠ - ٦٨١٩)

## بَابٌ: التعوذ مِنْ سُوءِ القضاءِ ودرْكِ الشّقاءِ

١٩١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ سُوءِ الْقَضَاءِ، وَمِنْ دَرَكِ الشَّقَاءِ، وَمِنْ شَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ، وَمِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ. (قَالَ عَمْرٌو فِي حَدِيثِهِ قَالَ سُفْيَانُ: أَشُكُّ أَنِّي زِدْتُ وَاحِدَةً مِنْهَا). {الحديث: ٦٨١٦ = ٦٨٣٣ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٨٦ = ٦٣٤٧، ٦٦١٦. نسائي. إستعاذة: ٥٤٩١. تحفة الأشراف: ١٢٥٥٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: یاسـاو دەسـتووری پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، گەلێ جار ئاوا پەنای دەگرت بەخودا، دەیفەرموو:

«اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ دَرَكِ الشَّقَاءِ، وَمِنْ شَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ، وَمِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ»:

واتـە: ئـەی خودایـە! پـەنادەگرم بـە پـەنای تـۆ لـە چارەنووسـی خـراپو، لـە تووشبوونی نەگبەتیو، لە یەخەگرتنی چارە رەشیو، لـە پێخۆشـبوونو شـادەکامی دوشمنانو ناحەزانو، لەبەڵای بڕسبڕ!).

ئـەم فەرموودەیـە ئیمـامی موسـلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) لـەدوو مامۆسـتای خۆیـەوە دەیگێڕێتەوە، لـە عـەمری ئەلناقیـدەوەو، لـە زوهـەیری کوڕی حەربـەوە، ئـەوانیش لەمامۆسـتای خۆیانـەوە دەیگێڕنـەوە کـە سـوفیانی کـوڕی عویەینەیـە، جـا موسـلیم دەفەرموێ: عەمر فـەرمووی: وا دەزانم، کەشـتە پـەنا لێگیراوەکـان سـیان بـوون، مـن یەکێکم بەهەڵە لێ پتر کردوونو بون بەچوار!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٥٠٦٢ – ئەو گوتـە حەدیسییانە کـە بـەکاردەهێنرێن...} + {ریـاض/٣، زنجـیرە: ٢٥٠، ژمـارە: ١٤٧١ – نامەی نزاو پاڕانەوە}.

## ١٤٥٨) پەناگرتن بەخودا لەپشت تێکردنی بەهرەو نازو نیعمەتی خودا. (٦٨٧٢ - ٦٨٨٣)

## بابٌ: التعوُّذُ منْ زَوالِ النِّعَمِ

١٩١٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ». {الحديث: ٨٧٩ = ٦٨٩٩ فم. أبو داود. صلاة: ١٥٤٥. تحفة الأشراف: ٧٢٥٥}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: زۆر جاران خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم نزایەیشی دەکرد، دەیفەرموو:

«اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ»:

واتە: ئەی یەزدانی پاك! پەنادەگرم بەتۆ لەوە کەخوا نەخواستە بەهرەو نازو نیعمەتی تۆ رووم لێ وەرگێڕنو پشتم تێ بکەن، لەوەیش کە ئەو ئاسوودەییەی داوتە پێم لێم بسەنێتەوەو تووشی دەردو مەینەتیو سەخڵەتی ببم، هەروا پەنادەگرم بەتۆ لەوەی کە لەپڕ لەناکاودا، رووبەڕووی تۆڵەی سەختی ناگەهانی تۆ ببم، پەنادەگرم بەهەرچی شتێ کە ببێ بەمایەی ناڕەزاییو زویری تۆ). {تاج/٥، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٥٠٦٨ — ئەو گوتە حەدیثییانەی کە بەکاردەهێنرێن بۆ پەناگرتن بەخودا}.

## ١٤٥٩) نزای باش بۆ پژمیو کە سوپاسی خودای کرد. (٧٤١١ - ٧٤١٩)

## بابٌ: تشميتُ العاطسِ إذا حَمِدَ

١٩١٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: عَطَسَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلَانِ، فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا، وَلَمْ يُشَمِّتِ الآخَرَ، فَقَالَ الَّذِى لَمْ يُشَمِّتْهُ: عَطَسَ فُلَانٌ فَشَمَّتَّهُ، وَعَطَسْتُ أَنَا فَلَمْ تُشَمِّتْنِى، قَالَ: «إِنَّ هَذَا حَمِدَ اللَّهَ، وَإِنَّكَ لَمْ تَحْمَدِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ». {الحديث: ٧٤١١ =

٧٤٤٦ فم. تجريد البخاری = الترجمة الكردية/٥، رقم: ١٩٦٢ = ٦٢٢١، ٦٢٢٥ فتح الباری. أبو داود. أدب: ٥٠٣٩. ترمذی. أدب: ٢٧٤٢. تحفة: ٨٧٢} :

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو پیاو پژمین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای خێری بۆ یەكێكیان كردو نزای خێری بۆ ئەوی تریان نەكرد، جا ئەوەیان كە نزای بۆ نەكرد، گوتی: بۆ كە ئەو پژمی نزات بۆیكرد، كەچی كەمن پژمیم نزات بۆم نەكرد؟

فەرمووی: (چونكە ئەو لەپاش پژمینەكەی سوپاسی خودای كرد، بەلاّم تۆ كە پژمیت سوپاسی خودات نەكرد). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٤٢، ژمارە: ٨٨١ — سوننەتە ئەگەر پژمیو ستایشی...} + {تاج/٥، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٣٧٧ — پژمینو نزای باش بۆ پژمیو}.

**روونكردنەوە:**

واباوە كە یەكێ دەپژمێ پێی دەگوترێ: (يَرْحَمُكَ اللّه: ڕەحمەتی خودات لێ بێ) بەم نزایە لەزاراوی یاسا نامە (شەرع)دا دەگوترێ: (تشمیت).

١٩١٥- عَنْ إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَطَسَ رَجُلٌ عِنْدَهُ، فَقَالَ لَهُ: «يَرْحَمُكَ اللَّهُ». ثُمَّ عَطَسَ أُخْرَى، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الرَّجُلُ مَزْكُومٌ». {الحديث: ٧٤١٤ = ٧٤٤٩ فم = ف.م = فتح الملهم بِشَرْحِ صحيح الإمَام مسلم. أبو داود. أدب: ٥٠٣٧. ترمذی. إستئذان: ٢٧٤٣. تحفة الأشراف: ٤٥١٣} :

ئیاسی كوڕی سەلەمەی كوڕی ئەكوەع (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی پێم: جارێ پیاوێ لەلای پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پژمی، گوێم لێ بوو، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (يَرْحَمُكَ اللّه: بەر سۆزو بەزەیی خودا كەوی).

دیسان پیاوەكە جارێكی تریش پژمییەوە، ئەمجارەیان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (وا دەرئەكەوێ كە ئەم پیاوە هەلاّمەتیەتی). واتە: ئیتر پێویست

بـه تـەشميط ناكا. {تـاج/٥، زنجيره: ٥٨، ژمـاره: ٥٣٨٣ ج/٤ — تاچـەند جار نـزا بـۆ پژميو دەكرێ}.

## ٥٩- نامەی پەشيمانیو قەبووڵی پەشيمانیو بەروالآیی سۆزو بەزەيی خوداو شتانی تريش
## كِتَابُ التوبَةِ وقبولها وَسِعَةِ رَحمةِ اللّه وَغير ذلك

{برِوانـه: تـاج/٥، زنجـيره: ٨٩، لـه ژمـاره: ٥١٢٧. م هـەتا: ٥١٥٦.م، زنجـيره: ٩٣} + {رياضی صالحين/١، زنجيره: ٢، لەژماره: ١٣ وه هەتا ژماره: ٢٤}.

### ١٤٦٠) فەرمانكردن بە ژيوانبونەوەو تەوبەكردن. (٦٧٩٩ - ٦٨٠١)
### باب: فِي الأَمْرِ بِالتَّوْبَةِ

١٩١٦- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: سَمِعْتُ الأَغَرَّ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) يُحَدِّثُ ابْنَ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ): «يَـا أَيُّهَـا النَّـاسُ تُوبُوا إِلَى اللَّهِ فَإِنِّي أَتُوبُ فِي الْيَوْمِ إِلَيْهِ مِائَةَ مَرَّةٍ». {الحديث: ٦٧٩٩ = ٦٨١٤ فـم. ف.م = فتح الملهم بشرح صحيح الامام مسلم}:

ئەبو بوردە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەغەرری موزەنی، كە يەكێ بوو لـە يـارانی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو يارانی بێ) گـوێم لێ بـوو كـە ئەغـەر فـەرموودەی دەگێڕايـەوە بـۆ ئيبنـو عومـەر، فـەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بێگومان كەمنيش هەر ئادەميزادمو هەنـدێ جار گەرد لەدڵم دەنيشێو دڵم گەرد دەگرێ).

جابۆيە هەموو رۆژێ سەدجار، بگرە پتريش لەخودای خـۆم دەپاڕێمـەوەو داوای لێبووردنو لێخۆشبوونی لێ دەكەمو تەوبەی لـەلا نـوێ دەكەمـەوە، كەوايـە ئێـوەيش بگەڕێنـەوە بـۆلای خـوداو ژێـوان نـوێ بكەنـەوە لەخزمەتيـداو داوای چاوپۆشـیو تاوانپۆشی لێ بكەنو هەميشە تەوبە لەخزمەتی خودادا تازە بكەنەوە!). {ريـاض/١،

زنجیره: ٢، ژماره: ١٤ — تەوبەو پەشیمانی + تاج/٥، زنجیره: ٩٠، ژماره: ٥١٣٧ — گەورەیی تەوبەو پەشیمانی}.

**روونکردنەوە:**

ئەغەڕی کوڕی یەساری ئەل — موزەنی، یان: ئەل — جوهەنی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لە کۆچکارانە (لە موهاجیرینە) ئیمامی موسلیم‌و ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داوودو نەسائی، لەڕێگەی ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەرییەوە، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، زۆر بێ هەوا بوو.

### ١٤٦١) **هاندان لەسەر ژێوانبوونەوە.** (٦٨٨٧ - ٦٨٩٦)
### **بابٌ: الحَضُّ عَلَى التَّوْبَةِ**

١٩١٧- عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ أَعُودُهُ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَحَدَّثَنَا بِحَدِيثَيْنِ: حَدِيثًا عَنْ نَفْسِهِ، وَحَدِيثًا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ مِنْ رَجُلٍ فِي أَرْضٍ دَوِيَّةٍ مَهْلَكَةٍ مَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ، فَنَامَ، فَاسْتَيْقَظَ، وَقَدْ ذَهَبَتْ، فَطَلَبَهَا حَتَّى أَدْرَكَهُ الْعَطَشُ ثُمَّ قَالَ: أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِي الَّذِي كُنْتُ فِيهِ فَأَنَامُ حَتَّى أَمُوتَ. فَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى سَاعِدِهِ لِيَمُوتَ فَاسْتَيْقَظَ وَعِنْدَهُ رَاحِلَتُهُ وَعَلَيْهَا زَادُهُ وَطَعَامُهُ وَشَرَابُهُ، فَاللَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ الْعَبْدِ الْمُؤْمِنِ مِنْ هَذَا بِرَاحِلَتِهِ وَزَادِهِ». {الحديث: ٦٨٩٠ = ٦٩١٠ فم = ف.م = فتح الملهم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية/٥، رقم: ١٩٧٨ = ٦٣٠٨. ترمذي. صفة القيامة: ٢٤٩٧. تحفة: ٩١٩٠}:

حاریثی کوڕی سووەید فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) نەخۆش بوو، چووم بۆلای بۆ سەردان‌و هەواڵپرسینی، دوو فەرموودەی گێڕایەوە بۆمان، یەکێکیان فەرمایشتی خۆی بوو، ئەوی تریان فەرموودەی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ).

عەبدوڵڵا فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودای گەورە زیاتر شادمان دەبێ، بەژێوانو پەشیمانیو تەوبەی بەندەی باوەڕداری خۆی، کاتێ پەشیمان دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆلای خودا، هەتا ئەو پیاوەی کە لەچۆڵەوانییەکی کاکی بەکاکی، پڕمەترسی دادەبەزێ، وڵاخێکی پێ دەبێ، نانو ئاوەکەی بەسەر وڵاخەکەیەوە دەبێ، سەرخەوێ دەشکێنێ، کە هەڵ دەستێ دەڕوانێ وڵاخەکەی بەنانو ئاوەکەیەوە، ڕۆیشتووەو گوم بووەو نەماوە!

جاکاتێ بەدوایدا دەگەڕێو تەواو ماندوو وشەکەت دەبێو توونێتی زۆری بۆ دەهێنێ، لەدڵی خۆیدا دەڵێ: دەگەڕێمەوە بۆ شوێنەکەی خۆم کەلێی بووم، لەوێ دەخەوم هەتا دەمرم!!

جا سەری لەسەر باسکی دادەنێ هەتا بخەوێو بمرێ، خەوی لێ دەکەوێ، کە خەبەری دەبێتەوەو سەری هەڵدەبڕێ، دەبینێ وڵاخەکەی بەنانو ئاوەکەیەوە، لەلایا، بەدیاریەوە راوەستاوە، خودای گەورە بەتەوبەی بەندەی ئیمانداری خۆی زیاتر شادمان دەبێ، هەتا ئەم پیاوە بەدۆزینەوەی وڵاخەکەیو نانو ئاوو توێشووەکەی!).

**ڕوونکردنەوە:**

فەرموودەکەی ئیبنو مەسعوود خۆی لە بوخاریدا ئاوایە: ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: مرۆی موسوڵمان، لەخودا دەترسێ، گوناهی خۆی وەك کێوێ دەبینێ، کە لەبنیدا دانیشتبێ، مەترسی ئەوەی هەبێکە لەپڕێکا برووخێ بەسەریدا. واتە: موسوڵمان دڵی ڕووناکە، هیچ گوناهێ بەکەم نازانێ، لەبەرئەوە هەمیشە پارێزدەکا لە گوناهو خۆی دەپارێزێ لەتاوان. ئەوجا ئیبنو مەسعوود فەرمووی: بەڵام مرۆی بەدکار، گوناهی خۆی بەکەم دەبینێ، دەربەستی نییە، بەلایەوە کە گوناهێ دەکا، وەك مێشێ بەلای لووتیدا بڕواو، بەدەستی ئاوایەکی لێ بکاو دووری بخاتەوە ئاوایە. {بڕوانە: ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١٥ —

تەوبـەو پەشـیمانی + تـاج/٥، زنجـیرە: ٩٠، ژمـارە: ٥١٣٦. م — گـەورەیی تەوبـەو پەشیمانی}.

**١٤٦٢) باسی تەوبەی راستو دروستو فەرمایشتی خودای گەورە: {وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ}.** (٦٩٤٧ - ٦٩٥٠)

**باب: فِي الصِّدْقِ بِالتَّوْبَةِ وَقَوْلِه عَزَّ وَجَلَّ: {وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ}**

١٩١٨- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: «ثُمَّ غَزَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَزْوَةَ تَبُوكَ، وَهُوَ يُرِيدُ الرُّومَ وَنَصَارَى الْعَرَبِ بِالشَّامِ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ كَعْبٍ كَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ حِينَ عَمِىَ. قَالَ سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ يُحَدِّثُ حَدِيثَهُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى غَزْوَةِ تَبُوكَ، قَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ: لَمْ أَتَخَلَّفْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى غَزْوَةٍ غَزَاهَا قَطُّ إِلاَّ فِى غَزْوَةِ تَبُوكَ، غَيْرَ أَنِّى قَدْ تَخَلَّفْتُ فِى غَزْوَةِ بَدْرٍ، وَلَمْ يُعَاتِبْ أَحَدًا تَخَلَّفَ عَنْهُ، إِنَّمَا خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْمُسْلِمُونَ يُرِيدُونَ عِيرَ قُرَيْشٍ حَتَّى جَمَعَ اللَّهُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ عَدُوِّهِمْ عَلَى غَيْرِ مِيعَادٍ، وَلَقَدْ شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ حِينَ تَوَاثَقْنَا عَلَى الإِسْلاَمِ. وَمَا أُحِبُّ أَنَّ لِى بِهَا مَشْهَدَ بَدْرٍ، وَإِنْ كَانَتْ بَدْرٌ أَذْكَرَ فِى النَّاسِ مِنْهَا، وَكَانَ مِنْ خَبَرِى حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى غَزْوَةِ تَبُوكَ أَنِّى لَمْ أَكُنْ قَطُّ أَقْوَى وَلاَ أَيْسَرَ مِنِّى حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْهُ فِى تِلْكَ الْغَزْوَةِ، وَاللَّهِ مَا جَمَعْتُ قَبْلَهَا رَاحِلَتَيْنِ قَطُّ، حَتَّى جَمَعْتُهُمَا فِى تِلْكَ الْغَزْوَةِ، فَغَزَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى حَرٍّ شَدِيدٍ وَاسْتَقْبَلَ سَفَرًا بَعِيدًا وَمَفَازًا، وَاسْتَقْبَلَ عَدُوًّا كَثِيرًا، فَجَلاَ لِلْمُسْلِمِينَ أَمْرَهُمْ لِيَتَأَهَّبُوا أُهْبَةَ غَزْوِهِمْ، فَأَخْبَرَهُمْ بِوَجْهِهِمُ الَّذِى يُرِيدُ، وَالْمُسْلِمُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَثِيرٌ، وَلاَ يَجْمَعُهُمْ كِتَابُ حَافِظٍ - يُرِيدُ بِذَلِكَ الدِّيوَانَ -. قَالَ كَعْبٌ: فَقَلَّ رَجُلٌ يُرِيدُ أَنْ يَتَغَيَّبَ يَظُنُّ أَنَّ ذَلِكَ سَيَخْفَى لَهُ، مَا لَمْ يَنْزِلْ فِيهِ وَحْىٌ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. وَغَزَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تِلْكَ الْغَزْوَةَ حِينَ طَابَتِ الثِّمَارُ وَالظِّلاَلُ فَأَنَا إِلَيْهَا أَصْعَرُ، فَتَجَهَّزَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ، وَطَفِقْتُ أَغْدُو لِكَىْ أَتَجَهَّزَ مَعَهُمْ، فَأَرْجِعُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا، وَأَقُولُ

فِى نَفْسِى: أَنَا قَادِرٌ عَلَى ذَلِكَ إِذَا أَرَدْتُ، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ يَتَمَادَى بِى حَتَّى اسْتَمَرَّ بِالنَّاسِ الْجِدُّ، فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) غَادِيًا وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ، وَلَمْ أَقْضِ مِنْ جِهَازِى شَيْئًا، ثُمَّ غَدَوْتُ فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ يَتَمَادَى بِى حَتَّى أَسْرَعُوا وَتَفَارَطَ الْغَزْوُ، فَهَمَمْتُ أَنْ أَرْتَحِلَ فَأُدْرِكَهُمْ، فَيَا لَيْتَنِى فَعَلْتُ، ثُمَّ لَمْ يُقَدَّرْ ذَلِكَ لِى، فَطَفِقْتُ إِذَا خَرَجْتُ فِى النَّاسِ بَعْدَ خُرُوجِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَحْزُنُنِى أَنِّى لاَ أَرَى لِى أُسْوَةً إِلاَّ رَجُلاً مَغْمُوصًا عَلَيْهِ فِى النِّفَاقِ أَوْ رَجُلاً مِمَّنْ عَذَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الضُّعَفَاءِ: وَلَمْ يَذْكُرْنِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَتَّى بَلَغَ تَبُوكًا، فَقَالَ وَهُوَ جَالِسٌ فِى الْقَوْمِ بِ(تَبُوكَ): «مَا فَعَلَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ؟». قَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِى سَلِمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ حَبَسَهُ بُرْدَاهُ وَالنَّظَرُ فِى عِطْفَيْهِ، فَقَالَ لَهُ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: بِئْسَ مَا قُلْتَ، وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ إِلاَّ خَيْرًا، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَبَيْنَمَا هُوَ عَلَى ذَلِكَ رَأَى رَجُلاً مُبَيِّضًا يَزُولُ بِهِ السَّرَابُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «كُنْ أَبَا خَيْثَمَةَ»، فَإِذَا هُو أَبُو خَيْثَمَةَ الأَنْصَارِىُّ. وَهُوَ الَّذِى تَصَدَّقَ بِصَاعِ التَّمْرِ حِينَ لَمَزَهُ الْمُنَافِقُونَ. فَقَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ: فَلَمَّا بَلَغَنِى أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ تَوَجَّهَ قَافِلاً مِنْ تَبُوكَ، حَضَرَنِى بَثِّى، فَطَفِقْتُ أَتَذَكَّرُ الْكَذِبَ وَأَقُولُ: بِمَ أَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ غَدًا؟ وَأَسْتَعِينُ عَلَى ذَلِكَ كُلَّ ذِى رَأْيٍ مِنْ أَهْلِى، فَلَمَّا قِيلَ لِى: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ أَظَلَّ قَادِمًا، زَاحَ عَنِّى الْبَاطِلُ، حَتَّى عَرَفْتُ أَنِّى لَنْ أَنْجُوَ مِنْهُ بِشَىْءٍ أَبَدًا. فَأَجْمَعْتُ صِدْقَهُ، وَصَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَادِمًا، وَكَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ لِلنَّاسِ، فَلَمَّا فَعَلَ ذَلِكَ جَاءَهُ الْمُخَلَّفُونَ فَطَفِقُوا يَعْتَذِرُونَ إِلَيْهِ، وَيَحْلِفُونَ لَهُ، وَكَانُوا بِضْعَةً وَثَمَانِينَ رَجُلاً، فَقَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلاَنِيَتَهُمْ، وَبَايَعَهُمْ، وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ، وَوَكَلَ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللَّهِ، حَتَّى جِئْتُ، فَلَمَّا سَلَّمْتُ تَبَسَّمَ تَبَسُّمَ الْمُغْضَبِ ثُمَّ قَالَ: «تَعَالَ»، فَجِئْتُ أَمْشِى حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ لِى: «مَا خَلَّفَكَ؟ أَلَمْ تَكُنْ قَدِ ابْتَعْتَ ظَهْرَكَ؟». قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّى وَاللَّهِ لَوْ جَلَسْتُ عِنْدَ غَيْرِكَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا لَرَأَيْتُ أَنِّى سَأَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ بِعُذْرٍ، وَلَقَدْ أُعْطِيتُ جَدَلاً، وَلَكِنِّى وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لَئِنْ حَدَّثْتُكَ الْيَوْمَ حَدِيثَ كَذِبٍ تَرْضَى بِهِ عَنِّى لَيُوشِكَنَّ

اللَّهُ أَنْ يُسْخِطَكَ عَلَيَّ، وَلَئِنْ حَدَّثْتُكَ حَدِيثَ صِدْقٍ تَجِدُ عَلَيَّ فِيهِ، إِنِّي لأَرْجُو فِيهِ عُقْبَى اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كَانَ لِي عُذْرٌ، وَاللَّهِ مَا كُنْتُ قَطُّ أَقْوَى وَلاَ أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْكَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَمَّا هَذَا فَقَدْ صَدَقَ، فَقُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِيكَ»، فَقُمْتُ، وَثَارَ رِجَالٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ، فَاتَّبَعُونِي، فَقَالُوا لِي: وَاللَّهِ مَا عَلِمْنَاكَ أَذْنَبْتَ ذَنْبًا قَبْلَ هَذَا، لَقَدْ عَجَزْتَ فِي أَنْ لاَ تَكُونَ اعْتَذَرْتَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَا اعْتَذَرَ بِهِ إِلَيْهِ الْمُخَلَّفُونَ، فَقَدْ كَانَ كَافِيَكَ ذَنْبَكَ اسْتِغْفَارُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا زَالُوا يُؤَنِّبُونَنِي حَتَّى أَرَدْتُ أَنْ أَرْجِعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأُكَذِّبَ نَفْسِي، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ لَهُمْ: هَلْ لَقِيَ هَذَا مَعِي مِنْ أَحَدٍ؟ قَالُوا: نَعَمْ لَقِيَهُ مَعَكَ رَجُلاَنِ. قَالاَ مِثْلَ مَا قُلْتَ فَقِيلَ لَهُمَا مِثْلُ مَا قِيلَ لَكَ، قَالَ: قُلْتُ مَنْ هُمَا؟ قَالُوا: مُرَارَةُ بْنُ رَبِيعَةَ الْعَامِرِيُّ، وَهِلاَلُ بْنُ أُمَيَّةَ الْوَاقِفِيُّ. قَالَ: فَذَكَرُوا لِي رَجُلَيْنِ صَالِحَيْنِ قَدْ شَهِدَا بَدْرًا فِيهِمَا أُسْوَةٌ. قَالَ: فَمَضَيْتُ حِينَ ذَكَرُوهُمَا لِي. قَالَ: وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلاَمِنَا أَيُّهَا الثَّلاَثَةُ مِنْ بَيْنِ مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ، قَالَ: فَاجْتَنَبَنَا النَّاسُ، وَقَالَ: تَغَيَّرُوا لَنَا حَتَّى تَنَكَّرَتْ لِي فِي نَفْسِيَ الأَرْضُ، فَمَا هِيَ بِالأَرْضِ الَّتِي أَعْرِفُ، فَلَبِثْنَا عَلَى ذَلِكَ خَمْسِينَ لَيْلَةً، فَأَمَّا صَاحِبَايَ فَاسْتَكَانَا، وَقَعَدَا فِي بُيُوتِهِمَا يَبْكِيَانِ، وَأَمَّا أَنَا فَكُنْتُ أَشَبَّ الْقَوْمِ وَأَجْلَدَهُمْ، فَكُنْتُ أَخْرُجُ فَأَشْهَدُ الصَّلاَةَ، وَأَطُوفُ فِي الأَسْوَاقِ، وَلاَ يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ، وَآتِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأُسَلِّمُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي مَجْلِسِهِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَأَقُولُ فِي نَفْسِي: هَلْ حَرَّكَ شَفَتَيْهِ بِرَدِّ السَّلاَمِ أَمْ لاَ؟ ثُمَّ أُصَلِّي قَرِيبًا مِنْهُ، وَأُسَارِقُهُ النَّظَرَ، فَإِذَا أَقْبَلْتُ عَلَى صَلاَتِي نَظَرَ إِلَيَّ، وَإِذَا الْتَفَتُّ نَحْوَهُ أَعْرَضَ عَنِّي، حَتَّى إِذَا طَالَ ذَلِكَ عَلَيَّ مِنْ جَفْوَةِ الْمُسْلِمِينَ، مَشَيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِطِ أَبِي قَتَادَةَ، وَهُوَ ابْنُ عَمِّي، وَأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَوَاللَّهِ مَا رَدَّ عَلَيَّ السَّلاَمَ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا قَتَادَةَ! أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَنَّ أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ؟ قَالَ: فَسَكَتَ، فَعُدْتُ فَنَاشَدْتُهُ، فَسَكَتَ. فَعُدْتُ فَنَاشَدْتُهُ، فَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَفَاضَتْ عَيْنَايَ، وَتَوَلَّيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ الْجِدَارَ، فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي فِي سُوقِ الْمَدِينَةِ، إِذَا نَبَطِيٌّ مِنْ نَبَطِ أَهْلِ الشَّامِ مِمَّنْ قَدِمَ بِالطَّعَامِ يَبِيعُهُ بِالْمَدِينَةِ يَقُولُ: مَنْ يَدُلُّ عَلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ؟

قَالَ: فَطَفِقَ النَّاسُ يُشِيرُونَ لَهُ إِلَيَّ حَتَّى جَاءَنِي، فَدَفَعَ إِلَيَّ كِتَابًا مِنْ مَلِكِ غَسَّانَ، وَكُنْتُ كَاتِبًا، فَقَرَأْتُهُ. فَإِذَا فِيهِ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنَا أَنَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاكَ، وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللَّهُ بِدَارِ هَوَانٍ وَلاَ مَضْيَعَةٍ، فَالْحَقْ بِنَا نُوَاسِكَ، قَالَ: فَقُلْتُ حِينَ قَرَأْتُهَا: وَهَذِهِ أَيْضًا مِنَ الْبَلاَءِ، فَتَيَامَمْتُ بِهَا التَّنُّورَ فَسَجَرْتُهَا بِهَا، حَتَّى إِذَا مَضَتْ أَرْبَعُونَ مِنَ الْخَمْسِينَ، وَاسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ، إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْتِينِي فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَأْمُرُكَ أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ، قَالَ: فَقُلْتُ: أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ؟ قَالَ: لاَ، بَلِ اعْتَزِلْهَا فَلاَ تَقْرَبَنَّهَا، قَالَ: فَأَرْسَلَ إِلَى صَاحِبَيَّ بِمِثْلِ ذَلِكَ، قَالَ: فَقُلْتُ لاِمْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكِ فَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِي هَذَا الأَمْرِ، قَالَ: فَجَاءَتِ امْرَأَةُ هِلاَلِ بْنِ أُمَيَّةَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ شَيْخٌ ضَائِعٌ لَيْسَ لَهُ خَادِمٌ فَهَلْ تَكْرَهُ أَنْ أَخْدُمَهُ؟ قَالَ: لاَ، «وَلَكِنْ لاَ يَقْرَبَنَّكِ»، فَقَالَتْ: إِنَّهُ وَاللَّهِ مَا بِهِ حَرَكَةٌ إِلَى شَيْءٍ، وَوَاللَّهِ مَا زَالَ يَبْكِي مُنْذُ كَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ إِلَى يَوْمِهِ هَذَا. قَالَ: فَقَالَ لِي بَعْضُ أَهْلِي: لَو اسْتَأْذَنْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي امْرَأَتِكَ، فَقَدْ أَذِنَ لاِمْرَأَةِ هِلاَلِ بْنِ أُمَيَّةَ أَنْ تَخْدُمَهُ، قَالَ: فَقُلْتُ: لاَ أَسْتَأْذِنُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَمَا يُدْرِينِي مَاذَا يَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا اسْتَأْذَنْتُهُ فِيهَا وَأَنَا رَجُلٌ شَابٌّ، قَالَ: فَلَبِثْتُ بِذَلِكَ عَشْرَ لَيَالٍ فَكَمُلَ لَنَا خَمْسُونَ لَيْلَةً مِنْ حِينَ نُهِيَ عَنْ كَلاَمِنَا، قَالَ: ثُمَّ صَلَّيْتُ صَلاَةَ الْفَجْرِ صَبَاحَ خَمْسِينَ لَيْلَةً عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِنَا، فَبَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عَلَى الْحَالِ الَّتِي ذَكَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنَّا، قَدْ ضَاقَتْ عَلَيَّ نَفْسِي، وَضَاقَتْ عَلَيَّ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ، سَمِعْتُ صَوْتَ صَارِخٍ أَوْفَى عَلَى سَلْعٍ يَقُولُ بِأَعْلَى صَوْتِهِ، يَا كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ أَبْشِرْ، قَالَ: فَخَرَرْتُ سَاجِدًا وَعَرَفْتُ أَنْ قَدْ جَاءَ فَرَجٌ، قَالَ: فَآذَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) النَّاسَ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلَّى صَلاَةَ الْفَجْرِ، فَذَهَبَ النَّاسُ يُبَشِّرُونَنَا، فَذَهَبَ قِبَلَ صَاحِبَيَّ مُبَشِّرُونَ وَرَكَضَ رَجُلٌ إِلَيَّ فَرَسًا، وَسَعَى سَاعٍ مِنْ أَسْلَمَ قِبَلِي، وَأَوْفَى عَلَى الْجَبَلِ، فَكَانَ الصَّوْتُ أَسْرَعَ مِنَ الْفَرَسِ، فَلَمَّا جَاءَنِي الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ يُبَشِّرُنِي فَنَزَعْتُ لَهُ ثَوْبَيَّ، فَكَسَوْتُهُمَا إِيَّاهُ بِبِشَارَتِهِ، وَاللَّهِ مَا أَمْلِكُ غَيْرَهُمَا يَوْمَئِذٍ، وَاسْتَعَرْتُ ثَوْبَيْنِ فَلَبِسْتُهُمَا، فَانْطَلَقْتُ أَتَأَمَّمُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَتَلَقَّانِي النَّاسُ فَوْجًا

فَوْجًا يُهَنِّئُونى بِالتَّوْبَةِ، وَيَقُولُونَ لِتَهْنِئْكَ تَوْبَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ، حَتَّى دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسٌ فِى الْمَسْجِدِ وَحَوْلَهُ النَّاسُ، فَقَامَ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِى وَهَنَّأَنِى، وَاللَّهِ مَا قَامَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ غَيْرُهُ. قَالَ: فَكَانَ كَعْبٌ لاَ يَنْسَاهَا لِطَلْحَةَ، قَالَ كَعْبٌ: فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَهُوَ يَبْرُقُ وَجْهُهُ مِنَ السُّرُورِ وَيَقُولُ: «أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ». قَالَ: فَقُلْتُ: أَمِنْ عِنْدِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «لاَ بَلْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ». وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا سُرَّ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ كَأَنَّ وَجْهَهُ قِطْعَةُ قَمَرٍ، قَالَ: وَكُنَّا نَعْرِفُ ذَلِكَ. قَالَ: فَلَمَّا جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ مِنْ تَوْبَتِى أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِى صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَمْسِكْ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ». قَالَ: فَقُلْتُ: فَإِنِّى أُمْسِكُ سَهْمِىَ الَّذِى بِخَيْبَرَ، قَالَ: وَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ إِنَّمَا أَنْجَانِى بِالصِّدْقِ، وَإِنَّ مِنْ تَوْبَتِى أَنْ لاَ أُحَدِّثَ إِلاَّ صِدْقًا مَا بَقِيتُ، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ أَنَّ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ أَبْلاَهُ اللَّهُ فِى صِدْقِ الْحَدِيثِ مُنْذُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى يَوْمِى هَذَا أَحْسَنَ مِمَّا أَبْلاَنِى اللَّهُ بِهِ، وَوَاللَّهِ مَا تَعَمَّدْتُ كَذْبَةً مُنْذُ قُلْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى يَوْمِى هَذَا، وَإِنِّى لأَرْجُو أَنْ يَحْفَظَنِى اللَّهُ فِيمَا بَقِىَ، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِىِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ الْعُسْرَةِ) حَتَّى بَلَغَ (إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ. وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ. وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ) حَتَّى بَلَغَ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ). قَالَ كَعْبٌ: وَاللَّهِ مَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَىَّ مِنْ نِعْمَةٍ قَطُّ بَعْدَ إِذْ هَدَانِى اللَّهُ لِلإِسْلاَمِ أَعْظَمَ فِى نَفْسِى مِنْ صِدْقِى رَسُولَ اللَّهُ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ لاَ أَكُونَ كَذَبْتُهُ فَأَهْلِكَ كَمَا هَلَكَ الَّذِينَ كَذَبُوا، إِنَّ اللَّهَ قَالَ لِلَّذِينَ كَذَبُوا حِينَ أَنْزَلَ الْوَحْىَ شَرَّ مَا قَالَ لأَحَدٍ، وَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انْقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنْ تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ). قَالَ كَعْبٌ: كُنَّا خُلِّفْنَا أَيُّهَا الثَّلاَثَةُ عَنْ أَمْرِ

أُولَئِكَ الَّذِينَ قَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ حَلَفُوا لَهُ فَبَايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ، وَأَرْجَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمْرَنَا حَتَّى قَضَى اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِ، فَبِذَلِكَ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَعَلَى الثَّلاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ) وَلَيْسَ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ مِمَّا خُلِّفْنَا تَخَلُّفَنَا عَنِ الْغَزْوِ، وَإِنَّمَا هُوَ تَخْلِيفُهُ إِيَّانَا، وَإِرْجَاؤُهُ أَمْرَنَا عَمَّنْ حَلَفَ لَهُ وَاعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَبِلَ مِنْهُ». {الحديث: ٦٩٤٧ = ٦٩٧١ فم = ف.م = فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية/٣، رقم: ١٢٥٧ = ٣٠٨٨، ٢٧٥٧، ٢٩٤٧، ٢٩٤٨، ٢٩٤٩، ٣٩٥٠، ٣٥٥٦،٣٨٨٩، ٣٩٥١، ٤٤١٨، ٤٦٧٣، ٤٦٧٦، ٤٦٧٧، ٤٦٧٨، ٦٢٥٥، ٦٦٩٠، ٧٢٢٥ فتح الباري + رقم: ١٦١٩ تجريد = ٤٤١٨ مجلد/٤}:

ئیمامی زوهری، كه لەناو فەرمووده شوناسەكاندا ناسراوه به (ئیبنو شهاب) كه زانایەكی گەورەو ناوداره، فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) غەزای تەبووكی ئەنجامدا، دەیویست بچێ بۆ سەر رووم و بۆسەر نەصرانییەكانی عەرەب كه لەشام بوون.

ئیبنو شەهاب فەرمووی: عەبدورەحمانی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی كەعبی كوڕی مالیك (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ) هەواڵی بەمنداو فەرمووی: باوكم عەبدوڵلای كوڕی كەعبی كوڕی مالیك – كه چاوساغی باوكی بوو، ئەو كاتەی كه كەعبی باوكی له ئاخری تەمەنیا، كوێر بوو بوو، كه ئەو لەناو كوڕەكانیدا چاو ساخی بوو، فەرمووی: لەكەعبی كوڕی مالیكم بیست (رەزای خودای لێ بێ) كەداستانی دواكەوتنی خۆیی له غەزای تەبووكدا، له پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگێڕایەوە، كەعب فەرمووی: لەهیچ غەزایەكی تردا، جگه لەغەزای تەبووك، له پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوانەكەوتووم و، لەهەموو غەزاكانیدا لەخزمەتیدا بووم، بەلام له غەزای بەدریشدا لەخزمەتیدا نەبووم، بەلام لەم غەزایەدا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گلەیی لەوانه نەكرد كه لەم غەزایه دواكەوتبوون، چونكه پێغەمبەرو موسوڵمانان لەم غەزایەدا كه دەرچوون لەماڵ، مەبەستیان كردنی ئەم غەزایه

نەبوو، بەڵكوو مەبەستیان گرتنی کاروانەکەی قورەیش بوو، کە بەماڵێکی بازرگانی زۆرەوە لەشام گەڕابوونەوە، بەڵام ئەوەبوو چارەنووسی خودایی وابوو: کەخودا بەبێ وادە لەگەڵ دوشمنی خۆیاندا بەرەنگاری یەکتری کردنو ئەو شەڕە قورسو گرانە، بەناوی غەزای بەدر ڕوویداو سەرکەوتنێکی گەورە بە نسیبی موسوڵمانان بوو، وە کەعب فەرمووی: وەمن لەشەوەکەی عەقەبەدا، کە ناودارە بە بەیعەتولعەقەبە، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، لەوکاتەدا کە پەیمانمان بەست لەگەڵیدا، لەسەر ئیسلامەتیو کۆمەکی ئیسلام، وەمن بەش بەحاڵی خۆم ئەم شەوە ناگۆڕمەوە بە ئامادەبوونی جەنگی بەدر، هەرچەند لەناو خەڵکا غەزای بەدر بەناوبانگترە لەم شەوی عەقەبەیە، لەڕاستیدا ئەوکاتە کە لەغەزای تەبووك دواکەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەرگیز وەك ئەو کاتە ئاوا بەهێزو تەواناو، دەست ڕۆیشتوو نەبووم، بەخودا لەوەپێش هەرگیز دوو وڵاخی سواریم پێکەوە نەبووە، بەڵام لەکاتی ئەو غەزایەدا دوو وڵاخی سواریم هەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەچوو بۆ ئەم غەزایە کات جەنگەی گەرمابوو، ڕێگەیەکی دوورو درێژی گرتەبەرو رووی کردە بیابانێکی وشكو برینگو، بەرەو دوژمنێکی زۆری بێ شومارو شارەزا لەجەنگا کەوتە ڕێ، جا لەبەرئەوە، لەپێشدا جاڕیداو هەموو شتێکی بەباشی روون کردەوە، بۆ موسوڵمانانو پێی گوتن کە دەیەوێ بچێ بۆ کوێ، هەتا تفاقی جەنگ بخەنو کەرەستەی پێویست ئامادە بکەن بۆ غەزاکەیان، سوپای موسوڵمانانیش – کەلەم غەزایەدا لە خزمەتی حەزرەتدا بوون – لەبەر زۆری لەژمارە نەدەهاتنو دەفتەرو تۆمار نەیدەگرتن، لەبەرئەوە ئەگەر کەسێ بیویستایە کەخۆی بشارێتەوەو نەچێ بۆ ئەو غەزایە وای دەزانی کەکەس پێی نازانێ، مەگەر تاكو تەرا، یاخود خودا سرووش (نیگا - وەحی) دەربارەی ئەو بنێرێ!

کە ئەم غەزایە روویدا جەنگەی مێوە بوو، بەر سێبەر تەواو خۆش بوو بوو، منیش حەزم لەوەیە کە بەدەستی خۆم باخ بڕنم، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و موسوڵمانان تفاقیان خست، منیش دەمویست کەبچم لەگەڵیاندا تفاق بخەم، بەڵام

دەگەڕامەوەو هیچم نەدەکرد، وە لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ئاسانە هەرکاتێ بمەوێ دەتوانم تفاق بخەم، ئیتر ئەم دڵە راوکێیەم درێژەی کێشا، تا خەڵکەکە بەگەرمی پەلاماری تفاق خستنیاندا وەڵێ من هیچم دیارنەبوو، تا رۆژێ پێغەمبەرو موسوڵمانان سەر لەبەیانی کەوتنەڕێ، منیش لەگەڵیانا دەرچووم بەڵام بەبێ ئازوقەو تفاق، وە لەدواییدا گەڕامەوەو نەچووم، ئیتر ئەم راڕاییەم هەر درێژەی کیشا. هەتا ئەوان خێرا ناویان کردو دوورکەوتنەوەو غەزاکەم لەکیس چوو، هەرچەند نیازم هەبوو کەبڕۆم پێیان بگەم، بەڵام ئەوەشم لەچارە نەنووسرابوو، خۆزگەم ئەوەم بکردایە، جا لەپاش ئەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆیشت، هەرچەند دەچوومە دەرەوەو دەچوومە ناو خەڵك، تەواو پەشیمان دەبوومەوەو خەم دایدەگرتم چونکە تەماشای دەوروبەری خۆمم دەکرد، کەسێکی وەهام نەدەدی کەبۆنی پیاوەتی لێ بێو دەست بدا بۆئەوەی کە بیکەم بەسەر مەشق بۆ خۆم، جگە لەوانەی کەتانەی نیفاقیان لێ دەدانو گومانی ناپاکیو دوو رۆییان لێ دەکرا، مەگەر ئەو بێ هێزو لاوازو لازەبوونانەی کە خودای گەورە بەهانەو پۆزشو عوزری ئەوانی پەسەند کردووە! ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی من ناکا هەتا دەگاتە تەبووك، لەکاتێکا لەناو کۆڕی موسوڵماناندا دادەنیشێ دەفەرموێ: (دەبێ کەعبی کوڕی مالیك خەریکی چی بێ، بۆ نەهات بۆ ئەم غەزایە؟!).

پیاوێکی بەنی سەلەمەییش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە لەخۆی بایی بووەو دەعیەی نایەت کەبێ بۆ غەزاو بەکەشو فشەوە لەکاڵاو واڵاکەی بەری خۆی مۆڕ دەبێتەوە!!

موعازی کوڕی جەبەلیش پێی دەڵێ: قسەیەکی نابەجێت کرد، وانییە، بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوەی کە باش نەبێ لەو پیاوەمان نەدیوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێ دەنگ دەبێ، جا لەوکاتەدا لەدوورەوە تارماییی زەلامێ دەبینێ، لەناو سەراب (بەردە خوێ: بەردە تراویلکە: تراویلکە: سەراب)دا کەروێشکە دەکا، دەفەرموێ: (دەی ئەم زەلامە کەوا لەدوورەوە هات ئەبو خەیثەمە بێت!). جا کە

زەلامەکە دێتە بەرەوە ئەبو خەیثەمە خۆی دەبێ، ئەم ئەبو خەیثەمە ئەو پیاوە ئەنصارییە بوو، کەمەنێ خورمای کردبوو بەخێر، وە مونافیقو ناپاکان تەوسیان پێ کردبوو لەسەرئەوە.

جا کاتێ کە هەواڵم زانی کەوا پێغەمبەر خەریکە دەگەڕێتەوەو لە تەبووك دێتەوە، خەمو پەژارەی خۆ پەڕاندنەوە لەم کێشەی دواکەوتنە دایگرتم، وە دەستم کرد بە درۆ ڕێکخستن، وە لەدڵی خۆمدا دەمگوت: سبەینێ بەچی خۆم رزگار بکەم لە زویربوونو لەعاجز بوونی پێغەمبەرو لە دڵ ڕەنجاندنی، وە بۆ ئەمە پرسو رام بەهەموو کەسێکی خاوەن راو تەگبیر لە کەسوکاری خۆم کرد، بەڵام هەر لەگەڵ گوتیان ئەوا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشتە بەرەوە، ئەم خەیاڵاتە پڕو پووچانە لە دڵم رەوینەوەو، بەرچاوم رۆشن بۆوەو زانیم کە بەدرۆ سازکردن لەدەستی پێغەمبەر رزگارم نابێ، جا لەبەرئەوە بڕیارمدا چی راستو رەوانە ئەوەی عەرزبکەم، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەبەیانییەك تەشریفی هاتەوە، دەستووری وابوو کە لەسەفەر دەگەڕایەوە لەپێشدا دەچوو بۆ مزگەوت، لەوێ دوو رکات نوێژی سوننەتی دەکرد، ئەوجا لەوێ دادەنیشت بۆ پێشوازی لە خەڵك، جا کەئەمەی کرد، ئیتر دواکەوتووەکان لە غەزای تەبووك، بەرودوا چوون بۆ خزمەتیو دەستیان کرد بە پاکانەکردن بۆ خۆیان لەلای پێغەمبەرو، کەمو زۆر بیانوو و بەهانەینان دەدۆزییەوە بۆ خۆیان لەلای، ژمارەی ئەمانە لە هەشتا زەلام زیاتر بوون. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرواڵەت ئەم بەهانانەی لێ وەردەگرتنو پەیمانی لەگەڵیانا دەبەستو بۆیان دەپاڕایەوەو، رازو نهێنی دڵیشیانی رووبەرووی خودای گەورە دەکردەوە.

منیش رۆیشتم بۆ خزمەتیو سڵاوم لێ کرد، وەکوو مرۆڤێکی زویرو عاجزو زیز، زەردەخەنەیەکی بەتووڕەییەوە کردو فەرمووی: (وەرە). منیش چوومە پێشەوە تا لەبەردەمیا دانیشتم، فەرمووی پێم: بۆچی پاشکەوتی لەم سەفەرە، خۆ تۆ لەلای خۆت وڵاخت کڕیبوو بۆ خەباتگێڕانو غەزاکردن!).

منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خودا گوساخیو دەمو پلێكو زمانێکی وا ڕەوانو پاراوی پێمداوە، ئەگەر لەخزمەتی تۆدا نەبوومایەو، لەلای هەرکەسێکی تر بوومایە لە خەڵکی سەر ئەم زەمینە، دەمتوانی بەعوزرو بەهانەو درۆی رازاوە خۆم قوتار بکەم لەدەستی، بەلاّم بەخودا من باش دەزانم ئەگەر ئەمرۆش لەخزمەتتا قسەیەکی درۆت بۆ بکەمو بەوە تۆ لەخۆم رازی بکەم، دوورنییە کە لەئاییندەدا خودا تووڕەو عاجزت بکالێم، وە ئەگەر قسەی راستیشت بۆ بکەم – هەرچەند لەوانەیە کەتۆ ئێستا بەو قسەیە لێم دلگران ببیت – بەلاّم لەڕاستی ڕەحمەت دەبارێ، سەرەنجام ئومێد دەکەم کە لەلای خودا بەگوتنی راستی رزگارم ببێ، دەی ئەوی کەڕاست بێ، بەخودا قوربان! هیچ بەهانەیەکی رەوام نەبوو، بەخودا هەرگیز وەك ئەم جارە ئاوا تەواناو دەوڵەمەند نەبووم، بەلاّم چارەنووس وابوو کە لەم سەفەرەدا لەتۆ داوابکەم!

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (تۆ راست دەکەیت! دەی هەستە بڕۆ هەتا بزانین کە خودای گەورە چی دەفەرموێ). منیش هەڵسامو رۆیشتم، کۆمەڵێ لەپیاوانی بەنی سەلەمە، شوێنم کەوتنو سەرکۆنەو سەرزەنشتیان کردمو گوتیان: بۆچی تۆیش وەك ئەو دواکەوتووانەی تر، بەهانەو عوزرت نەهاوردەوە بۆیو خۆت بپەڕێنیتەوە؟ دەستەلاّتی ئەوەندەیشت نەبوو، چونکە ئەم گوناهەی تۆ ئەوەندەی بەس بوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای لێخۆشبوونت بۆبکا لەخودا، وە گوتیان: بەو خودایە لەپێش ئەمەدا ئاگامان لێت نیە کە گوناهی ترت کردبێ. کەعب فەرمووی: بەخودا ئەوەندەیان سەرزەنیشت کردم لەم بارەیوە، تەنانەت خەریك بووم کە بگەڕێمەوە بۆلای پێغەمبەرو خۆم بەدرۆ بخەمەوە!

بەلاّم لەپاشا پێیانم گوت: ئایا کەسی تر، لەگەڵ مندا ئاوای بەسەرهاتووە؟ گوتیان: بەڵێ، دوو پیاوی تریش وەك تۆ هەمان شتیان بەسەرهاتووە، تۆ چیت گوتووە ئەوانیش هەر ئەوەیان گوتووە، وە بەتۆ چی گوتراوە بەوانیش هەرئەوە گوتراوە. گوتم: کێو کێن؟ گوتیان: مەرارەی کوڕی رەبیعەی ئەل-عامیریو هیلالی

کوڕی ئومەییەی ئەل-واقیفی، کە ناوی ئەم دوو پیاوە باشانەیان هێنا بۆم، روانیم کەوا دەست دەدەن بۆ ئەوە کە بیانکەم بەسەر مەشق‌و بە پێشەوای خۆم‌و چاو لەوان بکەم، ئیتر رۆیشتم‌و نەگەڕامەوە بۆ خزمەتی حەزرەت، چونکە ئەم دووانە موسوڵمانی ساغ بوون‌و ئامادەی غەزای بەدر بوو بوون!

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) موسوڵمانەکانی قەدەغەکرد لەوە کە قسەبکەن لەگەڵ ئێمەدا، کە ئەم سێ کەسە بووین‌و بەس، بەڵام قسەو گوفتوگۆی لەگەڵ دواکەوتووەکانی تردا قەدەغە نەکرد، ئیتر خەڵکی هەموو دوورە پەرێزیان لێ گرتین‌و لەگەڵمانا گۆڕان، بەجۆرێ وا دنیام لەلا تاریك‌و نوتەك‌و تەنگ‌و تەنگەبەر بوو، لەدنیاکەی لەوەوپێشی نەدەکرد، جا لەسەر ئەم بارودۆخە پەنجا شەوی دەقماینەوە، هەردوو هاوڕێکەم دۆش دامان‌و لەماڵەوە دادەنیشتن‌و دەگریان، بەڵام من کەلەوان لاوتر بووم چالاکتر بووم، دەڕۆیشتم لەگەڵ موسوڵمانانا نوێژم دەکردو بە بازاڕدا دەگەڕام، بەڵام کەس قسەی لەگەڵدا نەدەکردم، لەپاش نوێژ دەڕۆیشتم بۆ کۆڕی دانیشتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سڵاوم لێ دەکرد، لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ئەرێ لێوی جووڵاند بۆ وەڵامی سڵاوەکەم یان نا.

جار بەجارێکیش لەنزیکی حەزرەتەوە نوێژم دەکردو بەدزییەوە بە گۆشەی چاو سەرنجم دەدا، کەرووم دەکردە کوڕنووشگاکەم‌و تەماشای جێگە کوڕنووشەکەمم دەکرد، ئەو بەلاچاو بۆ منی دەڕوانی‌و کاتێ من بەقنگە چاو بۆ ئەوم دەڕوانی ئیتر ئەو لای تێ دەکردم، لەسەر ئەم حاڵە ماوەیەکی زۆر مامەوەو جەخارێکی زۆرم دەخوارد لە دەست لووتەلایی موسوڵمانان! هەتا رۆژێ رۆیشتم بەشوورای باخەکەی ئەبو قەتادەی ئامۆزاما، کە خۆشەویسترین کەسم بوو هەڵزنیم، بەو خودایە کە سڵاوم لێی کرد، وەڵامی سڵاوەکەمی نەسەندەوە. گوتم: ئەی ئەبو قەتادە! تو خودا ئایا تۆ دەزانیت کەوا من خوداو پێغەمبەری خوام خۆش دەوێ! کەچی نقەی نەکرد، دووبارە سوێندم دایەوە هەر نقەی نەکرد، سێبارە کە سوێندم دایەوە، بەس ئەوەندەی گوت: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن!

ئـيتر ئـاو بەچـاوەكانمدا هاتــە خـوارەوەو بــەرەودوا گەڕامــەوەو، بــەديوارى باخەكـەدا هەڵزنيمـەوە. ڕۆژێ لـەڕۆژان لـە بـازاڕدا دەسـووڕامەوە، تەماشـام كـرد وا جوتيارێ — لە نەبەطەكانى شام كە خۆراك دەهێنن بۆ مەدينـەو لـەوێ دەيفرۆشـن — پرسيارى من دەكا، دەڵێ: كێ كەعبى كوڕى ماليكم پێ نيشان دەدا؟

خەڵكەكەيش بە ئاماژە منيان پێ نيشان دەدا، جاهات بۆ لامو كاغەزێكى پێمدا، شاى غەسسان نووسيبووى بۆ مـن، منـيش خـۆم خوێنـدەوار بـووم، كـە خوێندمـەوە ئەمـەى تيـادا نووسـرابوو: (لـەپاش ئەمـە بيسـتوومانەتەوە كـە هاوڕێكـەت (واتـە: پێغەمبەر) لێت لووتەلايە، تۆيش خودا بێ لانەو بـێ داڵدەى نـەكردووى، بفـەرموو وەرە بـۆلاى ئێمـە، تـا دڵنـەواييت بكـەين). كـە خوێندمـەوە گوتم: ئەمـەيش بـەڵاو مەينەتييـەكى تـرە! جـا چوومەوە لەماڵـەوە نامەكـەم خسـتە نـاو گـڕى تەنـدوورو سووتاندم، جا كەلەپەنجا شەوەكە چل شـەوى ڕۆيشـت، فروسـتادەى حـەزرەت (دروودى خوداى لەسـەر بێ) هاتــە لام، گـوتى: حـەزرەت (دروودى خـوداى لەسـەر بێ) فـەرمانت پـێ دەكـا، كـە لەژنەكـەت دووركەويتـەوە. گـوتم: تـەڵاقى بـدەم ياچـى بكـەم؟ گـوتى: نـەء، تـەڵاقى مەدە، بەس توخنـى مەكەوەو نزيكى مەبـەرەوە، لەهـەمان كاتـا هـەمان فەرمانيشـى بەهەردوو هاوڕێكانم كرد، منيش ژنەكەمم ناردەوە بۆ ماڵى باوكىو گوتم: بچۆ بـۆ ماڵى باوانتو لەوێ بە، تا بزانين خودا چى دەفەرموێ.

كـەعب فـەرمووى: بـەڵام ژنەكـەى هـيلالى كـوڕى ئومەييـە چـوو بـۆ خزمـەتى حەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بێ) گوتى پێـى: ئـەى پێغەمبـەرى خـودا! هـيلال ئيختيـارێكى كەفتـەكارەو نۆكەريشـى نييـە، كـە خزمـەتى بكـا، خۆپێـت نـاخۆش نييـە كـەمن خزمەتى بكەم؟ فەرمووى: (نەء، بەڵام توخنت نەكەوێ). ژنەكە گوتى: خۆ بەخودا تاقەتى سەرجێىو شتى واى نەماوە، بەخودا لەو ڕۆژەوە كەئـەم كـارەى لێ قـەوماوە، هـەتا ئـەمڕۆ سـەرومڕ هـەردەگرى! جـا خێزانەكـەى منـيش بـەمنيان گـوت: بۆچـى عەرزى حەزرەت ناكەيت، كە ژنەكەت پـێ بداتـەوەو خزمـەتت بكـا، ئـەوەتا ڕێگـەى ژنەكـەى هـيلالى داوە كـە خزمـەتى بكـات، گـوتم: داواى شـتى وا لەحـەزرەت ناكـەم،

یەکەم لەبەرئەوە کێ دەڵێ ئەگەر رووی ئەوەی لێ بنێم ژنەکەم پێ دەداتەوە، دووەمیش من پیاوێکی گەنجم دەتوانم خزمەتی خۆم بکەمو دەشترسم کە دەروونی خۆم پێ زەوت نەکرێو توخنی بکەوم. کەعب گوتی: لەسەر ئەم حاڵەیش دەشەوی تریش ماینەوە، بەم پێیە لەوکاتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەدەغەی کرد، کە مەردووم قسەمان لەگەڵدا بکەن، پەنچا شەوی دەقمان تەواوکرد، جا بۆبەیانی شەوی پەنجاهەم، لەسەر سەربانی خانوویەکی خۆمان نوێژی بەیانیمکرد، وە لەسەر ئەو حاڵی پەرێشانییە دانیشتبووم کە خودای گەورە باسی کردووە، لەگیانی خۆم وەڕس بوومو گیانی خۆمم لێ بوو بەبارو، گۆی زەوی، بەو هەموو گوشادییەوە، لەبەر چاوم تەنگ بوو بوو، لەم کاتەداو لەم بارودۆخی دڵتەنگیەدا، دەنگی چرِندەیەکم بیست، کە سەرکەوتبووە سەر کێوی سەلع، وە بەهەموو هێزی خۆی بانگی دەکرد: ئەی کەعبی کوڕی مالیك! موژدەت لێ بێ). یەکسەر کوڕنووشی سوپاسی خودام بردو زانیم کەخودا دەرووی میهرەبانی خۆی کردۆتەوە بۆمان، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش نوێژی بەیانی ئەو رۆژە، رادەگەیەنێ کە خودا تەوبەی ئێمەی قەبووڵ کردووە، جا خەڵکی دەهاتن موژدەیان پێ دەدایـن، وەچەند کەسێ موژدە دەبەن بۆ هەردوو هاوڕێکەم، دوو پیاویش مژدەیان بەمندا:

پیاوێکیان ماینەکەی غاردەدا بەرەو من، ئەوی تریشیان لە ئەسلەمەوە رادەکاو، سەردەکەوێتە سەر چیای سەلعو لەوێوە پڕ بەدەم بانگ دەکا: ئەی کەعب! موژدەت لێ بێ، لەبەرئەوەی کە دەنگەکە لە ماینەکە خێراتر بوو، دەنگەکە زووتر گەیشت، کاتێ کابرای خاوەن دەنگ گەیشتە لام جلەکانی خۆمم بۆ داکەندو، لەباتی مزگێنیو موژدانە دامن پێی، بەو خودایە ئەو رۆژە تەنها ئەو دوو جلکەم هەبوو، کەدامن بەو، جا دوو جلکم لە برادەرێ خواستو لەبەرم کردنو رۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). برادەران پۆل پۆل پێم دەگەیشتنو دەهاتن بە پیرمەوەو پیرۆزبایی قەبووڵی تەوبەیان لێ دەکردم: دەیانگوت: پیرۆزت بێ قەبوڵی تەوبە لەلایەنی خوداوە، کە بەدەقی ئایەت لە قورئاندا راگەیەندراوە، کە

چـوومە مزگـەوت حــەزرەت (درووودی خـوداى لەســەر بـێ) دانیشــتبوو، مەردومەکــە لــەدەوری دانیشتبوون، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا، بە هـەڕاکردن هەڵسا هـات بـە پیرمـەوەو، تەوقەو پیرۆزبایی لەگەڵما کرد، بەخوا لەوزیاتر، لە کۆچکاران (موهاجیرین) کەسی تـر هـەڵ نەسـاو نـەهات بـە پیرمـەوە، ئـەم پیاوەتییـەی طـەلحەیـە قـەت فـەرامۆش ناکەم، جا کاتێ سلاوم کرد لە حەزرەت (درووودی خوداى لەسەر بێ) رووی مووفـەڕك‌و پـیرۆزی، لەخۆشــییانا شــەوقی دەدایــەوەو نــوری لێ دەبــاری‌و دەدرەوشــایەوەو فــەرمووی: (موژدەبــێ لــەتۆ ئەوەتــەی لــەدایك بوویــت، رۆژی وەك ئــەمرۆ بــاش‌و پــیرۆزت بەخۆتەوە نەدیوە!).

عـەرزیمکرد: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لەلایـەنی تۆوەیـە، یـا لەلایـەنی خـودای گەورەوەیــە؟ فــەرمووی: (نــەء، لەلایــەنی منــەوە نییــە، بــەڵکوو لەلایــەنی خوداوەیەو قەبووڵی تەوبەکەتان بەدەقی ئایەتی قورئان تۆمارکراوە).

عادەتی پێغەمبەر (درووودی خوداى لەسەر بێ) وابوو، کـە کـەیفی خـۆش بوایـە، رووی وەك مانگی چواردە دەدرەوشایەوە، ئێمە خۆمان بە ئـەزموون ئـەوەمان بەباشـی دەزانـی، کە حەزرەت لەکاتی خۆشیدا نوور لەروخساری دەبـارێ، وەك تریفـەی مانگـە شـەو، کـە لەبـەردەمیا دانیشـتم گـوتم: قوربـان! لەتـەواوکردنی تەوبەکەمـە کـە لەهـەموو سامان‌و دارایی خۆم دەست بەرداربیم بۆ موسوڵمانان‌و هەمووی ببەخشم بـەخوداو بە پێغەمبـەر خـودا، خۆیـان چۆنی دابـەش دەکـەن بیکـەن. فـەرمووی: (نـەء ئـەوە نابێ، هەنێ لەماڵەکەت بهێڵەرەوە بۆ خۆت باشترە).

گوتم: دەباشە ئەو پشکەم کە لەخەیبەردا هەیە، ئەوە گل دەدەمـەوە بـۆ خـۆم. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! راستیی منی رزگارکرد، لەو سەرەنجامە بەدەی کەبوو بەنسـیبی دواکـەوتووەکانی تـر کەبـەدرۆ خۆیـان لـەلای تـۆ لەسـەرەتاوە پەڕانـدەوە، کەواتە: بەشێ بێ لەتەواوی پەشیمانی‌و تەوبەکەم کەهەتا ماوم قسەی راست نـەبێ نەیکەم. کەعب فەرمووی: بەخودا کەس گومان نابەم کـە لـە موسـوڵمانان، کـە وەك مـن خـودا وابـەجوانی، گوتـاری راسـتی جـوانی پـێ بەخشـیبێ لـەو رۆژەوە. دیسـان

بەخودا لەو رۆژەوە کە ئەوەم عەرزی حەزرەت کردووەو ئەو بەڵێنەم داوە پێی، هەتا ئەمرۆ هێشتا بە قەستی درۆم نەکردووە. وە ئومێدم هەیە کە هەتا ماوم خودا بمپارێزێ. جا خودای گەورەو سەروەر ئەم ئایەتەی نارد:

{لَقَد تَّابَ الله عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ – التوبة/ ١١٧ - ١١٩}:

کە ئەمە پوختەی واتاکەیەتی: خودا بارانی رەحمەتو تەوبەی داباراند بەسەر پێغەمبەرو کۆچکارانو یاریدەدەراندا (کە قورئان ناوی ناون: موهاجیرینو ئەنصار) ئەوانەی کە لەوکاتە ناسكو نەهاتەدا، شوێن حەزرەت کەوتن، پاش ئەوەی کە خەریك بوو دڵی تاقمێکیان لابدا لەڕێگەی پەیڕەویی پێغەمبەر، جا خودا سەرەنجام لەبارەی ئەو وردە خەیاڵاتەوە بەخشینیو بارانی میهرو سۆزو رەحمەتو تەوبەی رژاند بەسەریاندا، هەروا تەوبەی قەبووڵ کرد لەسەر ئەو سێ کەسە موسوڵمانە کەپاش خران لەلایەنی پێغەمبەرەوە کە لەماوەی ئەم پەنجا شەوەدا، ئەم سێ کەسە تەواو پەرێشان بوون، وایان لێ هاتبوو، زەوی بەم پانو پۆڕیو گوشادییەی خۆیەوە، وەکوو زیندانی لێ هاتبوو، لەگیانی خۆیان جاڕس بوون، باوەڕی راستیان هاتە سەرئەوە کە پشتو پەنا هەر خودایەو، پەناو پاسار لەقاری خودا نییە، مەگەر هەر لەلای خۆی!

خودایش بە بەخششو نەوازشی خۆی دەرگای تەوبەو بەخشینی خۆی پێ نیشان دان، وە ئەوانیش روویان کردە قاپی کەرەمی خوداو تەوبەی بەڕاستییان کرد. ئەی موسوڵمانینە! لەخودا بترسنو بەدڵو بەگیانو بەگوتارو بەکردار هەمیشە لەگەڵ پیاو راستانو راستگۆیان بن. کەعب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا بەلامەوە، لەژیانمدا گەورەترین بەهرەو نازو بەخشش کە خودای گەورە خەڵاتی کردبێ بەمن یەکەم: ئەوەیە کە هیدایەتو رێنمایی کردووم بۆ ئایینی پاکی ئیسلام.

دووەم: ئەوەیە کە ئەو رۆژە قسەی راستم عەرزی حەزرەت کرد، لە رەحمەتی خوداوە بوو، کە درۆم لەخزمەتیا نەکرد، ئەگینا منیش وەك درۆکەرەکان بە فەتارەت دەچووم، ئەوەتانێ خودای گەورە لە قورئانا خراپترین هەرەشەو گورەشەی لێیان کردووە، لەشانیانا دەفەرموێ:

{سَيَحْلِفُونَ بِاللّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاء بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ، يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِن تَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ} :

کە ئەمە پوختەی راڤەکەیەتی: کاتێ ئێوە.. گەرانەوە بۆلای ئەو ناپاكو مونافقانە، کە لەم غەزایە دواکەوتوون، کە هەندێ لە ئەنصارەکانو کۆمەڵەی عەبدوڵڵای کوری ئوبەی‌و هەندێ ئەعراب بوون، بەگەرمی سوێندی گەورە گەورەتان بۆ دەخۆن‌و دەڵێن: ئێمە بۆیە نەهاتین بۆ ئەم تەبوکە، چونکە عوزرمان هەبوو، ئەو سوێنانەیش بۆیە دەخۆن کەئێوە باوەریان پێ بکەن‌و گلەییان لێ نەکەن‌و وازیان لێ بهێنن‌و سەرزەنشتیان نەکەن، جا ئێوە پشت گوێیان بخەن، چونکە بەراستی ئەوانە ناو دڵیان رەش‌و پیسە، ئەوانە نە سوێندیان راستەو نە بەگلەیی‌و سەرکۆنەو سەر زەنشت هۆش‌و بیردەکەنەوە، لەبەرئەوە جێگەی پاشەرۆژیان ناوجەرگەی دۆزەخە، لە تۆڵەو سزای کردەوە نابارو ناشیرینەکانیانا، ئەوانە سوێندی درۆتان بۆ دەخۆن بۆئەوەی کە ئێوە لێیان رازی بن، جا ئەگەر گریمان ئێوەیش لێیان رازی بن، بەراستی خودا لێیان رازیی نابێ، چونکە ئەوانە لەرێدەرچوون‌و لە یاسای هەق بەدەرن‌و خودایش رازی نابێ، لە کۆمەڵی لەرێ دەرچووان!

کەعب فەرمووی: مەبەست لە: {وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا} ئەوە نییە کە ئێمە کە ئەوسێ کەسە بووین، لەو غەزایە دواکەوتووین، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کەئێمە، ئەم سێ کەسە، کاتێ چووینە خزمەتی حەزرەت‌و راستیمان لەخۆمان داو درۆمان لەگەڵ پێغەمبەر نەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاری ئێمەی

دواخستو عوزری ئێمەی قەبووڵ نەكردو پەیمانی لەئێمە وەرنەگرتو بۆمان نەپاڕایەوە، وەك عوزری ئەو دواكەوتووانەی تری قەبووڵكردو پەیمانی لێ وەرگرتنو بۆیان پاڕایەوەو، كە بەسوێندی درۆ پاكانەیان بۆ خۆیان كرد. چونكە ئەوەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری سەبارەت بەئێمەی دواخست، هەتا خودا خۆی لەم بارەیەوە بڕیاری داو فەرمووی: {وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا}.

{ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٢١ – تەوبەو پەشیمانی + تاج/٤، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩١٥ – سوورەتی تەوبە، لاپەڕە: ٢٧٠ ج/٤}.

**ڕوونكردنەوە:**

لەسەر قسەی ڕاڤەنامە (شەرح)ەكان، بەهرەی زۆرو بڕیاری یاسایی (شەرعی) زۆر لەم فەرمووده درێژەدا هەنو وەردەگیرێن، وەك:

١. گەورەییو بەرێزیی هاوبەشكەرانی پەیمانی عەقەبەو جەنگی بەدر.

٢. زەندیق ئەگەر تەوبە بكا ناكوژرێ، وەك هەشتا كەسەكە كەدوا كەوتبوون لە غەزاكەو تەوبەی خۆیان ڕاگەیاندو پێغەمبەر نەیكوشتن.

٣. مونافیق (ناپاك) ناكوژرێ، چونكە خۆیو خوا نەبێ، كەسێ نازانێ كە موسوڵمانە یا ناپاكە.

٤. سەركۆنەو لێپرسینەوە لەسەر ئایین، بەپێی تەواناییو ناتەوانایی دەگۆڕێ.

٥. وەسپو مەتحی باشەی لەروو دروستە، بە مەرجی دڵنیابوون لەبایی نەبوون.

٦. كەسێكی تر بكرێ بەسەر مەشقو چاوی لێ بكرێ، بەتایبەتی لەكاتی لێقەومانا، وەك كەعب چاوی لەدوو هاورێكەی كرد كە ئەوانیش پێیان لەڕاستی نابوو، بەدرۆ مەهانەیان بۆ پێغەمبەر نەهێنابۆوە.

٧. شوێنە ونكێ لەكاتی لەباردا سوننەتە، بەشێكە لە شوێنە ونكێی شەرعی، بەكارهێنانی وشەی نهێنی (**كلمة السّر**)و جفرەی برووسكەو هێمادانان بۆ دۆزینەوەو حەڵكردنی قسەیێ كە بەجفرەو داخراوی كرابێ، وەك برووسكەو نامەی نهێنی كە بەبێ كلیل حەل ناكرێو نازانرێ بخوێنرێتەوە.

٨. خۆزگە خواستن بۆ خێری لەدەست چوو (خێری فەوتاو).

٩. کەسێ لەسەفەر دەگەڕێتەوە دەستنوێژی هەبێو لەپێشا بچێ لە مزگەوت دوو رکات نوێژی سوننەت بکاتو ئەوجا لەوێ دابنیشێ بۆ پێشوازی لە بەپیرەوە چووانی.

١٠. بڕیاری شەرع بەپێی رواڵەتی کارەو تەماشای دیوی دەرەوەی شتەکان دەکرێو بڕیار دەدرێ، ناودڵو نهێنیەکانی ناو دەروون چۆنەو چییە، ئەوە لێپرسینەوەی ئەوە لەسەر خودا خۆیەتی، لەسەر ئێمە نییە. لەم خاڵەوە هەرکاتێ لەکارێکا موسوڵمانان زیانمەند نەدەبوون، واباشە قازی بۆ بەرژەوەندی گومانبار بڕیاربدا، بە ئومێدی ئەوە کە پەندو ئامۆژ لەهەڵەی خۆی وەربگرێو عوزرەکەی وەربگرێ.

١١. چاو پۆشیو قەبوولکردنی مەهانەو شتی وا ئەگەر خراپەی لێ نەدەکەوتەوە دروستە.

١٢. سڵاو نەکردن لە گوناهکارو تاوانبارو قسە لێ دابڕینی ئەم جۆرە کەسانە دروستەو رەوایە.

١٣. قورئانو پەڕاوی فەرموودەو شتێ کەناوی خودای لێ نوسرابێ، یا چاپکرابێ، یا پێوەبێ، دروستە کە بەپێی بەرژەوەند بسووتێنرێ، بەڵام واباشە خۆڵەمێشەکەی لەشوێنێکی پاکا بشارێتەوە، یا بنێژرێ، هەروا سڕینەوەیان بەتەختە سروشتی وا، وەك سڕینەوەی تەختە رەش.

١٤. لەکاتی مژدەو روودانی خۆشیداو گەیشتنی هەواڵی خۆشو رووداني نازو بەهرەو بەخشش، کوڕنووشی سوپاس لەم کاتانەدا خێرەو سوننەتەو زۆر پەسەندە.

١٥. دانی سەرقەڵەمانەو مژدانەو موژدانە پێدان بەموژدە دەر سوننەتە، هەروا وەڵیفەتو وەڵیفەت نامەو شاگردانە.

١٦. هەڵسان لەبەر هاتوو، وە تەوقەکردن لەگەڵیداو بەخێرهاتنیو بەپیرەوە چوونیو خۆشی دەربڕین سوننەتە.

١٧. لەپاش تەوبەکردن خێرکردن سوننەتە.

١٨. بەزەویهاتنەوە بەخۆداو گریان بۆ حاڵی شڕی خۆی، لەلایەن کەسێکەوە ڕەوایە.

١٩. بەرپەرچی غەیبەت، وەك موعاز غەیبەتی کابرای ڕەتکردەوە، کە لەخزمەت پێغەمبەردا، قسەی بەکەعب گوت.

٢٠. بەهرەی ڕاستگۆییو بەردەوامبوون لەسەری.

٢١. پیرۆزبایی لەکاتی ڕوودانی نازو بەهرەو بەخشش داو، بەبۆنەی بۆنە خۆشەکانەوە سوننەتە، وەك: کاتی گەڕانەوە لەسەفەری خێرو منداڵبوونو کردنی جلو بەرگی تازەو ژنهێنانو شووکردنو ڕۆژانی جەژنو شادی.

٢٢. وەرعو پارێز لەهەرشتێ کە مەترسیت هەبێ کەسەر بکیشێ بۆ ناڕەوایی، با لەخودی خۆشیدا ڕەوابێ، وەك کەعب نەیویست کە ژنەکەی بگەڕێنێتەوە بۆلای خۆی هەتا خزمەتی بکا، نەبادا تووشی بێ شەرعییەك ببێ لەم لایەنەوە.

٢٣. خۆشی دەربڕینی گەورە، بەبۆنەی خۆشی دەستو پابەندانی خۆیەوە، وەك پێغەمبەر خۆشی دەربڕی بەبۆنەی قەبووڵی تەوبە لەو سێ کەسە لە موسوڵمانان.

٢٤. شتی گرنگ لەپێشدا ڕوون بکرێتەوە بۆ خەڵكو بۆ جەماوەر، هەتا هاوبەشی باش بکەن لە ئاراستە کردنیدا.

٢٥. ڕاوێژکردن بەکەسوکارو بەکەسێ کە لەکارێ ئاگاداربێ.

٢٦. دووربینی کردن لەکارداو هەڵبژاردنی سەرەنجامی باشو ڕاستو دروست، با کێشەو بەرەیشی لەبەردەمدا بێو هەڵ نەخەڵەتان بەخۆشی کاتی، کە پەشیمانی گەورەی لەدوابێ.

٢٧. هەندێ سزاو تۆڵە بەوە دەبێ، کە تاوانبار لەخۆشی قەدەغە بکرێ، وەك کەعبو هاوڕێکانی دوور خرانەوە لەژنەکانیان.

٢٨. هەڵبژاردنی کاتی لەبار بۆ ڕاگەیاندنو جاڕدانی کاری گرنگ، ئایا خۆش، ئایا ناخۆش. چونکە لە گێڕانەوەیەکی تاجول ئوصولدا ئەمەی واتیادا: ئیتر لەوە بەدواوە موسوڵمانان دەنگیان لەگەڵماندا دابڕیو قسەیان لەگەڵمانا نەدەکرد، وەمن ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەم حاڵەیە مامەوە، هەتا تەواو سەخڵەتی کردم، وە لەگشت شتێ بەلامەوە گرنگتر ئەوەبوو، کە خوانەخواستە لەو ماوەیەدا من بمرمو حەزرەت نوێژ لەسەر تەرمەکەم نەکات، یاخود حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بمرێو من لەسەر ئەو حاڵە بمێنمەوە لەناو خەڵکاو کەس قسەم لەگەڵدا نەکا، تا خودای گەورە لەکاتی سێیەکی دوایی شەودا، گیرابوونی تەوبەی ئێمە بە سرووش دەنێرێ بۆ پێغەمبەری خۆی، لەو دەمەدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای ئوممو سەلەمە دەبێ، ئوممو سەلەمە ئافرەتێکی زۆر باش بوو، لەم کارەی مندا قسەی خێری زۆر دەکردو گەلێ مەبەستی بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەی ئوم سەلەمە! خودا تەوبەی کەعبی گیراکرد). ئەویش (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ هەواڵی بۆنەنێرمو ئەم مۆژدە خۆشەی پێ بدەم؟

دەفەرموێ: (ئاخر بەم شەوە دەبن بەژێر پێی خەڵکەوەو خەڵكو خواکە تابەیانی خەوتان لێ دەزڕێنن، ئیتر کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی بەیانی دەکا، هەواڵی قەبووڵکردنی تەوبە، لەلایەنی خودای گەورەوە، لەسەر ئێمە، بە موسوڵمانان ڕادەگەیەنێ، دەستووری حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو لەکاتی خۆشیو شادیدا، ڕووی وەك مانگی چواردە دەدرەوشایەوەو خەرمانەی دەدا).

(تاج/٤ ز:١٠ ژ:٣٩١٥ — سوورەتی تەوبە).

## ١٤٦٣) تەوبەی پیاوێ وەرگیراوە کە سەد کەسی کوشتووە. (٦٩٣٩ - ٦٩٤١)

## بَابٌ: قُبُولُ التَّوْبَةِ مِمَّنْ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ

١٩١٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ

الأرْضِ؟ فَدُلَّ عَلَى رَاهِبٍ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: لاَ. فَقَتَلَهُ، فَكَمَّلَ بِهِ مِائَةً، ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ؟ فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ، فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَمَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ التَّوْبَةِ؟ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنَّ بِهَا أُنَاسًا يَعْبُدُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، فَاعْبُدِ اللَّهَ تعالى مَعَهُمْ وَلاَ تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوْءٍ، فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيقَ أَتَاهُ الْمَوْتُ، فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ، فَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ: جَاءَ تَائِبًا مُقْبِلاً بِقَلْبِهِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. وَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ: إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ. فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُورَةِ آدَمِيٍّ، فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُمْ، فَقَالَ: قِيسُوا مَا بَيْنَ الأَرْضَيْنِ فَإِلَى أَيَّتِهِمَا كَانَ أَدْنَى فَهُوَ لَهُ، فَقَاسُوهُ فَوَجَدُوهُ أَدْنَى إِلَى الأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ، فَقَبَضَتْهُ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ». قَالَ قَتَادَةُ: فَقَالَ الْحَسَنُ: ذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ لَمَّا أَتَاهُ الْمَوْتُ نَأَى بِصَدْرِهِ. {الحديث: ٦٩٣٩ = ٦٩٦٣ فم = ف.م = فتح الملهم. تجريد البخارى = الترجمة الكردية/٤، رقم: ١٣٨٣ = ٣٤٧٠. تحفة الأشراف: ٣٩٧٣}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ لە نەتەوە پێشینەکان، کە جوولەکە بوو، لەنەوەی ئیسرائیل بـوو، نەوەدو نۆکەس دەکوژرێ، ئینجا دەپرسێ: کێ زاناترین کەسە لە ولاتدا، دەڵێن: قیسارە سۆفیلکە، جا کابراکە دەچێ بۆلای و پێی دەڵێ: من نەوەدو نۆکەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ خودا ناسەکە دەڵێ: نەء، جا کابرا ئەویش دەکوژێ و دەیکا بە سەدی تەواو، جا دیسان کابرای بکوژ دەست دەکاتەوە بە پرسیارو دەڵێ: کێ زاناترین کەسە لە ولاتدا؟ ئەمجارەیان پیاوێکی زانای پێ نیشان دەدەن، جا دەچێ بۆلای و پێی دەڵێ: من سەد کەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ زاناکە دەڵێ: بەڵێ، وەکەس ناتوانێ رێگەی تەوبەت لێ بگرێ، تەوبە هەموو کاتێ لەهەموو کەسێ قەبووڵ دەکرێ، بەلام لێرە مەمێنەو برۆ بۆ قیسارە ولات لەوێ تاقمەیێ خواناسی باشی لێ هەیە، خەریکی خواپەرستیو پەرستش و عیبادەت کردنن، برۆ لەوێ تۆیش لەگەڵ ئەواندا خواناسی بکەو، مەچۆرەوە بۆ ولاتی خۆت،

چونكه خاكێكى شوومو بەدە، پياوەكەيش دەكەوێتە رێ بۆ ئەو ولاتە، دەڕوا تادەگاتە نيوەى رێ، لەوێ دەمرێ!

جا فريشتەى رەحمەتو فريشتەى سزاو عەزاب، لەسەر تەرمەكەى ئامادە دەبنو لەسەرى دەبێ بەكێشمە كێشمييان: فريشتەى ڕەحمەت دەڵێن: ئەمە بۆ تەوبە هاتووەو بەكوڵى دڵ رووى لە خوداى گەورە بووەو لە كردەوەى خراپى پێشينى پەشيمان بووە، كەواتە: ئەمە ديارى دەستى ئێمەيەو دەيبەين بۆ بەهەشت!

فريشتەى سزايش دەڵێن: ئەمە هەرگيز كردەوەى چاكەى نەكردووە، كەواتە: نێچيرى خۆمانەو دەيبەين بۆ دۆزەخ!

جا بەفەرمانى خودا، فريشتەيێ لە شێوەى ئادەميزاددا دەچێ بۆلايان، هەردوولا ئەو فريشتەيە دەكەن بەحەكەمو فەرمانڕەوا، حەكەمەكە دەفەرموێ: نێوانى هەردوو شوێنەكە بپێون، ولاتەكەى خۆىو ئەو ولاتەى تر كەبۆى دەچێ، جا لەكام لايانەوە نزيكتر بوو، ئەوە هى ئەوەيانە، كە نێوانيان دەپێون دەڕوانن لەو جێگەيەوە نزيكتر دەبێ كەبۆى دەچێ، ئيتر فريشتەى ڕەحمەت وەرى دەگرن).

رشتەى ئەم فەرموودەيە ئاوايە: موسليم ← موحەممەدى كوڕى موثەننى ← موعاذى كوڕى هيشام ← هيشامى باوكى موعاذ ← قەتادە ← ئەبو صەديق ← ئەبو سەعيدى خودرى.

لێرەدا قەتادە رشتەكەى دواى خۆى دەگۆڕێو ئاوا دەڵێ: حەسەنى بەصرى دەفەرموێ: باس كراوە بۆ ئێمە كەكاتێ مردن دەگاتە سەرى، ئەزنەك دەدا كەسينگى بەپێى توانا لەدێ باشەكەوە نزيك بكاتەوە!). {تاج/٥، زنجيرە: ٩٢، ژمارە: ٥٩٤٦. م} + {رياض/١، زنجيرە: ٢، ژمارە: ٢٠}.

**روونكردنەوە:**

١. مەبەست لە (الحسن) حەسەنى بەصرييە، كە تابيعييە.

٢. ئـەم زیادەیـەی حەسـەنی بەصـری لـە گێڕانـەوەی ژمـارە: (٦٩٤٠)ی صـەحیحی موسلیمدا بە مەرفووعی هاتووە.

٣. مەبەستی سەرەکی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە (دەرگای تەوبە بەمەرجی خۆی بۆ هەموو کەسێ لەسەر پشتە، تەوبـەکار لـە گونـاهی بچکۆلە تەوبـە بکـا، هـەر تەوبەی گیرایە، لەتاوانی هەرە گەورە تەوبە بکا هەر تەوبەی گیرایە).

٤. باشترین وەڵام، بۆ ئەو پرسەی کە دەڵێ: چۆن چۆنی خودا لە بکوژ خۆش دەبێ، بـەبێ ڕەزا لەسـەربوونی کـوژراو، چـونکە کـوژراو مـردووە، بەدەسـتهێنانی ڕەزابـوونی لەسـەر لێخۆشـبوون لـە بکوژەکـەی ئەسـتەمە؟ لـە وەڵامـی ئـەم پرسیارەدا دەڵێین: (لەم بارو دۆخانەدا، کە خودا لە تاوانبار خۆش دەبـێ، بـەبێ ڕەزابـوونی ئـەو کەسـەی کـە تاوانەکـەی دەربـارە کـردووە، خـودای گـەورە دەبـێ بەدەسـتە بـەری ئـەوەیش کـە لەقیامەتـدا خـاوەن مافەکـە قاییـل بکـاو هـەقی بەزیادەوە بۆ بکاتەوە).

### ١٤٦٤) کەسێ لەپێش ئەوەدا تەوبەکا، کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵ دێ، تەوبەی گیرایە. (٦٧٩٩ - ٦٨٠١)

### بَابٌ: من تاب قبل طلوع الشمس من مغربها تاب الله عليه

١٩٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ تَابَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ». {الحديث: ٦٨٠١ = ٦٨١٧ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسـێ لـەپێش ئـەو کاتـەدا کـەخۆر لـە خۆرئـاواوە هەڵدێ، تەوبـە بکـا، خـودا تەوبەی گیرا دەکا). {ریاض/١، زنجیرە: ٢، ژمـارە: ١٧ — تەوبـە + تـاج/٥، زنجیرە: ٩١، ژمـارە: ٥١٤١. م — باسـی کـاتی تەوبـەکردن}. {بڕوانـە: تـاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمـارە: ٥٥٦٨، ٥٥٧٦، ٥٥٧٧}.

**١٤٦٥) تەوبە قەبووڵ دەكرێ لەكەسێ چی بەشەو خراپە بكاو چی بەڕۆژ خراپە بكا.**
**(٦٩١٩ - ٦٩٢٢)**

**بَابٌ: قبولُ التَّوْبَةِ مِنْ مُسِيئِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ**

١٩٢١- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا». {الحديث: ٦٩٢١ = ٦٩٤٤ فم}:

**ئـەبو مووسـا** (رەزای خودای لێ بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی:** (خـودای بـاڵا دەسـتو شـكۆمەند، لەشـەودا دەسـتی خـۆی رادەهێڵـێ بـۆ ئـەو خراپـە كارانەی كە لەڕۆژدا خراپەیان كردووە، هەتا تەوبەبكەنو لەسەر دەستی خودادا لـە تاوانەكانیان پەشیمان ببنـەوە، هـەرەها لـەڕۆژدا دەسـتی خـۆی درێـژ دەكا، بـۆ ئـەو خراپە كارانەی كە لەشەودا خراپـەیان كـردووە، هـەتا لەسـەر دەسـتی ئـەودا تەوبـە بكەنو لەتاوانەكانیان پەشیمان ببنەوە، ئەم رەحمەتو قەبووڵو گیرابوونی تەوبەو پەشیمانییە، هەروا بـەردەوام دەبـێ، هـەتا ئەوكاتـەی كـە رۆژ دەگەڕێتـەوەو لـەباتی ئـەوەی وەك هـەموو جـارێ، خـۆر لـە خۆرهەڵاتـەوە هـەڵبێ، كەچـی لـە رۆژئـاواوە هەڵدێ، ئیتر لەوڕۆژە بەدواوە دەرگای تەوبە دادەخرێو تەوبەی كـەس گـیرا نابـێ). {تـاج/٥، زنجیرە: ٩١، ژمـارە: ٥١٤٠. م – كـاتی تەوبـەكردن} . بڕوانـە: ژمـارە: (١٩٢٠) لەپێشەوە تاكۆتایی.

**١٤٦٦) سەبارەت بە لێخۆشبوونی گوناهەكان.** (٦٨٩٧ - ٦٨٩٩)

**بَابٌ: فِي غفرانِ الذنوب**

١٩٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللَّهُ بِكُمْ، وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ». {الحديث: ٦٨٩٩ = ٦٩٢٠ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (بەوكەسە كە گیانی منـی بەدەسـە، كـە خـودای گـەورەو فریارەسـە، ئەگـەر گریمـان

ئێوە گوناهتان نەکردایە، خودای گەورە، ئێوەی لادەبردو، جۆرە هۆزێکی تری دەهێنا کە گوناه بکەنو لەخودا بپاڕێنەوە تاخودا بەو بەهانەیەوە لێیان خۆش بێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ٥١٣٠. م — پاڕانەوەو پەشیمانی}.

### ١٤٦٧) باسی گوشادیو بێ سنووری ڕەحمەتو میهرەبانی خودای گەورە، ڕەحمەتی ڕقو خەشمی دەبەزێنێ. (٦٩٠٣ - ٦٩١٨)

### بَابٌ: فِي سِعَةِ رَحْمَةِ اللّٰهِ تَعَالَى وَأَنَّهَا تَغْلِبُ غَضَبَهُ

١٩٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللّٰهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «لَمَّا قَضَى اللَّهُ الْخَلْقَ، كَتَبَ فِي كِتَابِهِ عَلَى نَفْسِهِ فَهُوَ مَوْضُوعٌ عِنْدَهُ: إِنَّ رَحْمَتِـي تَغْلِبُ غَضَبِي». {الحديث: ٦٩٠٥ = ٦٩٢٦ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ خودای گەورە بڕیاری دا کە ئەم خەڵكو جیهانو بوونەوەرە دروست بکا، لەنامەیەکی خۆیدا، کە لەلای خۆی دایناوە، ئەمەی نووسی: ڕەحمەتو میهرەبانی من، ڕقو خەشمم دەبەزێنێ). {تاج/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٧} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٤١٩ — هیواو ئومێد بە میهری خودا..}.

١٩٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: «إِنَّ لِلَّهِ مِائَةَ رَحْمَةٍ، أَنْزَلَ مِنْهَا رَحْمَـةً وَاحِـدَةً بَـيْنَ الْجِـنِّ وَالإِنْـسِ وَالْبَهَـائِمِ وَالْهَـوَامِّ. فَبِهَـا يَتَعَاطَفُونَ، وَبِهَا يَتَرَاحَمُونَ، وَبِهَا تَعْطِفُ الْـوَحْشُ عَلَـى وَلَـدِهَا، وَأَخَّـرَ اللَّـهُ تِسْـعًا وَتِسْـعِينَ رَحْمَةً، يَرْحَمُ بِهَـا عِبَـادَهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ». {الحديث: ٦٩٠٨ = ٦٩٢٩ فـم. تجريـد البخـاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٢٢ = ٦٠٠٠، ٦٤٦٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودا سەد ڕەحمەتی هەیە، یەك ڕەحمەتی لەو سەد ڕەحمەتە ناردۆتە خوارەوە بۆ ناو پەریو ئادەمیزادو گیانلەبەرانو جانەوەرو مارو مێروو، جا بەهۆی ئەم تاقە ڕەحمەتەوەیە کە ئەمانە لەناو خۆیاندا ڕەحم بەیەکتری دەکەنو بەزەییان بەیەکتریدا دێتەوە، تەنانەت ئەوەیش دڕندە بەزەیی بەبەچکەی خۆی دا دێتەوە

هـەر بـەهۆی ئـەم تاقـە رەحمەتەوەیـە، ئـەو نـەوەدو نـۆ رەحمەتەکـەی تریشـی هەلگرتووە، لە رۆژی ژینـەوەدا رەحمیـان پێـدەکا، بـە بەنـدەکانی خـۆی!). {تـاج/٥، زنجیرە: ٩٣، ژمـارە: ٥١٥١. م + ریـاض/٢، زنجیرە: ٥١، ژمـارە: ٤٢٠ — هیـواو ئومێـد بـە میهری خودای گەورە}.

### ١٤٦٨) هەم رەحمەتی خودا زۆرەو هەم تۆڵەی. (٦٩٠٣ - ٦٩١٨)

### باب: فيما عِنْدَ اللّٰه تَعالَى مِنَ الرَّحْمَةِ والعُقُوبَةِ

١٩٢٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَـالَ: «لَوْ يَعْلَمُ الْمُؤْمِنُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الْعُقُوبَةِ مَا طَمِعَ بِجَنَّتِهِ أَحَدٌ، وَلَوْ يَعْلَمُ الْكَافِرُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الرَّحْمَةِ مَا قَنِطَ مِنْ جَنَّتِهِ أَحَدٌ». {الحديث: ٦٩١٣ = ٦٩٣٤فم}:

ئەبو هـورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئەگەر موسوڵمان دەیزانی کە خودا چـەندێ سـزاو تۆڵـەی زۆری لـەلا هەیـە، کـەس بەتەمای بەهەشت نەدەبوو، هەروەها ئەگـەر کـافرو بێبـاوەڕیش دەیزانـی کـە خـودا چەندێ رەحمەتی زۆرە کەس لەبەهەشت نائومێد نـەدەبوو). {تـاج/٥، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥١٤٩. م — گوشادیو بێسنووری رەحمەتو میهرەبانی خودای گەورە}.

### ١٤٦٩) خودا لەدایك بە رەحمترە بە بەندەکانی خۆی

### باب: اللّٰه أرحم بعباده من الوالدة بولدها

١٩٢٦- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِسَبْيٍ، فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ السَّبْيِ تَبْتَغِى، إِذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِى السَّبْيِ أَخَذَتْـهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا، وَأَرْضَعَتْهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ): «أَتـرَوْنَ هَـذِهِ الْمَرْأَةَ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِى النَّارِ؟». قُلْنَا: لاَ وَاللَّهِ وَهِىَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ لاَ تَطْرَحَهُ، فَقَالَ رَسُـولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لَلَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَـادِهِ مِـنْ هَـذِهِ بِوَلَـدِهَا». {الحـديث: ٦٩١٢ = ٦٩٣٣ فم}:

**عومەری کوڕی خەطاب** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ بڕکەیێ ژنی دیلیان هێنا بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ژنێکی منالّ بەبەریان تیادابوو، منالّەکەی خۆیی لێ بەجێمابوو لە عەزرەت بەچکەکەی هەرگڕی دەخواردو چەرخەی دەکرد، بەناو ژنە دیلەکاندا، لەکوێ کۆرپەیەکی مەمکە خۆرەی دەست دەکەوت هەلّی دەگرتو دەینووساند بەسینگو بەرۆکی خۆیەوەو مەمکی پێی دەدا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بەئێمەی فەرموو: (ئایا بەڕای ئێوە ئەم ژنە پەرۆشە، ئەگەر ساواکەی خۆی دەست بکەوێتەوە، لەم بارو دۆخی پەرۆشییەیدا بۆی، فڕەی دەداتە ناو ئاگرەوە؟). گوتمان: نەخێر نەبەخوا هەتا بتوانێ شتی واناکا، هەرگیز ئەو جگەر گۆشەیەی خۆی کەئێستا ئاوا پەرۆشە بۆی توورِ نادات، چ جای ئەوەی کە فڕێی بداتە ناو ئاگرەوە! فەرمووی: (دەسا زۆرباش بزانن کەخوا گەلێ بەرەحمترە لەگەلّ بەندەکانی خۆیدا هەتا ئەم ژنە لەگەلّ ساواکەی خۆیدا!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥١٥٥.م}.**

## ١٤٧٠) کەس کردەوەی خۆی ڕزگاری ناکا. (٧٠٣٤ - ٧٠٤١)

## بَابٌ: لَنْ يُنْجِيَ أَحَداً عَمَلُهُ

**١٩٢٧- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، فَإِنَّهُ لَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ أَحَدًا عَمَلُهُ». قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَلاَ أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللَّهُ مِنْهُ بِرَحْمَةٍ، وَاعْلَمُوا أَنَّ أَحَبَّ الْعَمَلِ إِلَى اللَّهِ أَدْوَمُهُ وَإِنْ قَلَّ». {الحديث: ٧٠٥٣ = ٧٠٧٨ فم. تجريد البخاری بالکوردی/١، رقم: ٤٠ = ٤٣، ١١٥٣ فتح الباری}:**

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (هەولّو تەقەللایەکی مامناوەندیو ڕێکو پێک بدەنو، لەکاری خێردا درێغی مەکەنو مژدەی قەبوولّتان لێ بێ، بشزانن کەکەس بەهۆی کردەوەی خۆیەوە ناچێتە بەهەشتو لەسزا ڕزگاری نابێ!). یاران عەرزیان کرد: قوربان! هەتا تۆیش؟ فەرمووی: (بەلّێ منیش هەروا، مەگەر خودای گەورە بەرەحمەتو میهرەبانی خۆی دام بگرێو نوقمی دەریای ڕەحمەتی خۆیم بکا، بزانن کە خۆشەویسترین کردەوەی**

بەندە لەلای خودای گەورە ئەو کردەوەیەتی کە بەردەوامتربێ لەسەری با کەمیش بێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٥٢١٥ — چوونە بەهەشت لەسایەی خودای گەورەوەیە} .

**١٤٧١) کەس وەك خودای گەورەو سەروەر ئارام ناگرێ لەسەر ئازار.** (٧٠١١ - ٧٠١٣)

**باب: ما أحَدٌ أصْبَرَ علَى أذىً مِنَ اللّهِ عَزَّ وَجَلَّ**

١٩٢٨- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ قَيْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَا أَحَدٌ أَصْبَرَ عَلَى أَذًى يَسْمَعُهُ، مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، إِنَّهُمْ يَجْعَلُـونَ لَـهُ نِـدًّا، وَيَجْعَلُونَ لَـهُ وَلَـدًا، وَهُـوَ مَـعَ ذَلِـكَ يَـرْزُقُهُمْ، وَيُعَـافِيهِمْ، وَيُعْطِـيهِمْ». {الحديث: ٧٠١٣ = ٧٠٣٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٩٤٧ = ٦٠٩٩، ٧٣٧٨ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٩٠١٥} :

ئـەبو مووسـای ئەشـعەری، کـەناوی عەبـدوڵلای کـوری قەیسـە (رەزای خـودای لێ بـێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەس نییە کەئاوا وەك خودای گەورە بە ئارامو بە حەوسەڵە بێ، لەسەر ئەو گشتە ئازارو قسە ناڕەوایانەی کەبەو دەکرێو بەگوێی خۆی دەیانبیستێ، ئەوەتانێ بتپەرستان بڕیاری هاوتاو منداڵی بۆ دەدەنو دەڵێن: منداڵی هەیە، خودا شەریكو هاوبەشی هەیە، کەچی لەگەڵ ئەم تانەو توانجەشدا ئەوەتانێ خودای گەورە رزقو رۆژییان دەدا، ساخڵەمیان دەکا، خۆشیو نازو بەهرەو بەخششی خۆی دەڕژێنێ بەسەریانا). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٤٨٤٠ — باسی سەبرو ئارامو لێبووردن...} .

**روونکردنەوە:**

واتە: ئارامو هێمنیو حەوسەڵەو شێنەیی رەفتاری خودای گەورەو پێغەمبەرانو زانایانو پیاو چاکانە.

**١٤٧٢) کەس وەك خودای گەورە بەتەنگەوە نایێ. (٦٩٢٣ - ٦٩٣١)**

**بابٌ: مَا أَحَدٌ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ**

**١٩٢٩**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ مَدَحَ نَفْسَهُ، وَلَيْسَ أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ، وَلَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنَ اللَّهِ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ أَنْزَلَ الْكِتَابَ وَأَرْسَلَ الرُّسُلَ». {الحديث: ٦٩٢٦ = ٦٩٤٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٧٧٩ = ٥٢٢٣ م فتح الباري}:

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (کەس وەك خودای باڵا دەستو خاوەن شکۆ، وەسپی جوانو پیاهەلگوتنی پێ خۆش نییە، هەر لەبەرئەوەیە کە مەدحو وەسپی جوانی خۆی دەکا، لە ئایەتەکانی قورئاندا، وەك سوورەتی فاتیحاو قولهووەڵلا و زۆر ئایەتو سوورەتی تر، وە کەسیش وەك خودای باڵا دەستو خاوەن شکۆ بەتەنگی رێزی ئایینی خۆیەوە نییە، هەر لەبەر ئەوەیشە کە هەموو خراپەو بێ شەرعییەکی ناڕەوا کردووە، وە کەسیش وەك خودای گەورە مەهانەی رەوای پێ خۆش نییە، هەر لەبەرئەوەیە کە نامە ئاسمانییەکانو پێغەمبەرو رەوانەکراوو فروستادەکانی ناردووە، هەتا خودای گەورە چی پێ خۆشەو چی پێ ناخۆشە رونی بکەنەوە بۆ پەیوەندیداران!).** {تاج/٢، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٢٢٠٤}.

**١٩٣٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ، وَإِنَّ الْمُؤْمِنَ يَغَارُ، وَغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ عَلَيْهِ». {الحديث: ٦٩٢٧ = ٦٩٥٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ١٧٧٩ = ٥٢٢٣ م. ترمذي. رضاع: ١١٦٨ تحفة الأشراف: ١٥٣٦٣}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (خودای گەورە بەتەنگەوە دێو غیرەت دەیگرێ، هەروەها موسوڵمانیش بەتەنگەوە دێو غیرەت دەیگرێ، لەکاتی روودانی کاری ناشایستەدا بە تەنگی شەرەفو ئابڕوو نامووسەوە دێن، خودای گەورە لەسەر ئەوە غیرەت دەیگرێو هەڵدەداتێ کە**

موسوڵمان شتی ناڕەوا بكاو ئەوەی كە خودا نادروستو ناڕەوایكردووە ئەو بیكات).
{تاج/٢، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٢٢٠٢ — مەردایەتیو بەتەنگەوە بوونی نامووس...} .

**١٤٧٣) رازی نهێنیو دیاننانی بەندە بە گوناهەكانیدا.** (٦٩٤٢ – ٦٩٤٦)
**باب: النجْوى وتَقْرِيرِ العَبْدِ بِذُنُوبِه**

١٩٣١- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لابْـنِ عُمَـرَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا): كَيْـفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ فِى النَّجْوَى؟ قَالَ: سَـمِعْتُهُ يَقُـولُ: «يُـدْنَى الْمُؤْمِنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى يَضَعَ عَلَيْهِ كَنَفَهُ، فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِـهِ، فَيَقُـولُ: هَـلْ تَعْرِفُ؟ فَيَقُولُ: أَىْ رَبِّ أَعْرِفُ. قَالَ: فَإِنِّى قَدْ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِى الدُّنْيَا، وَإِنِّـى أَغْفِرُهَـا لَـكَ الْيَـوْمَ، فَيُعْطَـى صَـحِيفَةَ حَسَـنَاتِهِ، وَأَمَّـا الْكُفَّـارُ وَالْمُنَـافِقُونَ، فَيُنَـادَى بِهِـمْ عَلَـى رُءُوسِ الْخَلاَئِقِ: هَؤُلاَءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَـى اللَّـهِ». {الحـديث: ٦٩٤٦ = ٦٩٧٠ فـم = ف.م = فـتح الملـهم. تجريـد البخـارى = الترجمـة الكرديـة/٣، رقـم: ١٠٥٨ = ٢٤٤١، ٤٦٨٥، ٦٠٧٠، ٧٥١٤ فتح البارى. ابن ماجة. مقدمة: ١٨٣. تحفة الأشراف: ٧٠٩٦}:

سەفوانی كوڕی موحریز (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ بە ئیبنو عومەری گوت: چیت بیستووە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەرازی نهێنی نێوانی خوداو بەندەی خۆی؟ فەرمووی: ژنەوتم لێی دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەڕۆژی دوا ڕۆژدا، لە رازێكی نهێنی دوو بەدوودا، خودای گەورە، موسوڵمان لەخۆی نزیك دەكاتەوە، بە ڕەنگێكی وا لەپەنای خۆیدا پەنای دەداو بە پەردەی ڕەحمەتی خۆی دەیپۆشێ، هەتا خەڵكی مەحشەر چاویان لێ نەبێ، ئەوجا خودا یەكە یەكە، پێی پێ دەنێ لە گوناهەكانی، پێی دەفەرموێ: ئایا پێ دەنێیت لەم گوناهەو لەو گوناهە كە كردووتن، بەندەكەیش گشت جارێ لەباتی جارێ دووجار دەڵێ: بەڵێ، ئەی پەروەردگارم پێی لێ دەنێمو لەدنیادا ئەو تاوانانەم گشت كردوون، هەتا بەندەكە دادان دەنێ بەهەموو گوناهەكانیدا.

ئیتر بەندەكە دەترسێو دەحەپەسێو لەدڵی خۆیدا دەڵێ: سەرم تیادەچێ، خودا پێی دەفەرموێ: مەترسە، من لەجیهاندا ئەم گوناهانەم بۆ پۆشیویت، ئەوا

ئەمڕۆکەیش لێت خۆشبووم لەو گوناهانە، لەپاش ئەمە نامەی کردەوە باشەکانی دەدەنە دەستی راستی، ئەمە حاڵی موسوڵمانە، بەڵام نا موسوڵمان، چی بێ بڕوابێ، چی موناففق و ناپاك، جارکێش و جارچی، لەبەرچاوی شایەتەکانی سەریان و لەبەرچاوی خەڵکی مەحشەر، بانگەواز هەڵدەداو دەڵێ:

{هَؤُلاء الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى رَبِّهِمْ أَلاَ لَعْنَةُ اللّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ – هـود – ١١/١٨}.

واتـه: ئائەمانـه بـوون کـه درۆیـان بـەدەم خـوداوە دەکـرد، ئاگاداربن کـه نـەفرین و نەفرەت و سزای سەختی خودا بۆ ستەمکارانە). {تاج/٤، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٣٩٢١ – سوورەتی هود}.

## ١٤٧٤) دەورکردنەوەی بەخششەکانی خودا، لە رۆژی قیامەتدا بۆ بەندەی بێباوەڕ، یا بەندەی ناپاك. (٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

## باب: تقرير النِّعَم يوْمَ القيامَة على الكَافر والمُنافق

١٩٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: «هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ فِي الظَّهِيرَةِ لَيْسَتْ فِي سَحَابَةٍ؟». قَالُوا: لاَ. قَالَ: «فَهَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْسَ فِي سَحَابَةٍ؟». قَالُوا: لاَ، قَالَ: «فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ كَمَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ أَحَدِهِمَا، قَالَ: فَيَلْقَى الْعَبْدَ فَيَقُولُ: أَيْ فُلْ! أَلَمْ أُكْرِمْكَ وَأُسَوِّدْكَ وَأُزَوِّجْكَ وَأُسَخِّرْ لَكَ الْخَيْلَ وَالإِبِلَ وَأَذَرْكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ؟ فَيَقُولُ: بَلَى أَيْ رَبِّ، قَالَ: فَيَقُولُ: أَفَظَنَنْتَ أَنَّكَ مُلاَقِيَّ؟ فَيَقُولُ: لاَ. فَيَقُولُ: فَإِنِّي أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي، ثُمَّ يَلْقَى الثَّانِيَ فَيَقُولُ: أَيْ فُلْ! أَلَمْ أُكْرِمْكَ وَأُسَوِّدْكَ وَأُزَوِّجْكَ وَأُسَخِّرْ لَكَ الْخَيْلَ وَالإِبِلَ، وَأَذَرْكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ؟ فَيَقُولُ: بَلَى يَارَبِّ. فَيَقُولُ: أَفَظَنَنْتَ أَنَّكَ مُلاَقِيَّ؟ فَيَقُولُ: لاَ، فَيَقُولُ: فَإِنِّي أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي، ثُمَّ يَلْقَى الثَّالِثَ فَيَقُولُ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ آمَنْتُ بِكَ وَبِكِتَابِكَ وَبِرُسُلِكَ، وَصَلَّيْتُ وَصُمْتُ وَتَصَدَّقْتُ، وَيُثْنِي بِخَيْرٍ مَا اسْتَطَاعَ، قَالَ: فَيَقُولُ: هَا هُنَا إِذًا. قَالَ: ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: الآنَ نَبْعَثُ شَاهِدَنَا عَلَيْكَ، وَيَتَفَكَّرُ فِي نَفْسِهِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْهَدُ عَلَيَّ؟ فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ وَيُقَالُ لِفَخِذِهِ

وَلَحْمِهِ وَعِظَامِهِ: انْطِقِي، فَتَنْطِقُ فَخِذُهُ وَلَحْمُهُ وَعِظَامُهُ بِعَمَلِهِ، وَذَلِكَ لِيُعْذِرَ مِنْ نَفْسِهِ، وَذَلِكَ الْمُنَافِقُ، وَذَلِكَ الَّذِي يَسْخَطُ اللَّهُ عَلَيْهِ». (الحديث=٧٣٦٤ = ).

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: یاران** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرموویان: قوربان!** ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لەڕۆژی دوا رۆژدا، خودای خۆمان بەچاوی سەر دەبینین؟ فەرمووی: (ئەگەر كات نیوەڕۆ بێو ئاسمانیش ساماڵ بێ بۆ بینینی خۆر لەوكاتەدا هیچ ئەركێ، زەحمەتێ، دەكێشن؟).

گوتیان: نەخەیر. فەرمووی: (ئەی ئەگەر ئاسمان سایەقە بێ بۆ دیتنی مانگی شەوی چواردە هیچ ئەركێ، زەحمەتێ دەبینن؟). فەرموویان: (نەخەیر) فەرمووی: (دەسا بەوكەسە كە گیانی منی بەدەسە كە خودای فریا رەسە، وەك چۆن بە ئاسانیو بە ئاسایی لەم دوو كاتەدا ئەم دوو شتە بەچاوی سەرتان دەبینن، لە قیامەتیشا ئاوا بەبێ ئەركو سەراسێ، خودای خۆتان دەبینن).

فەرمووی: (كاتێ بەندە دەگاتەوە بەخودا، پێی دەفەرموێ: ئەی فیسار! من رێزی تۆم نەگرتبوو؟ نەمكردبووی بە سەرگەورەو سەردار؟ ژنم نەدابوو پێت؟ رەوگو رانە وشترم نەدابوو پێت؟ نەمكردی بە گەورەو سەرۆكو بە سەرداری تۆم نەهێشتیتەوە؟ ملكانەو چواریەكت وەرنەدەگرت لە مسكێنەكانت؟ ئەویش دەڵێ: با، چۆن دەفەرمووی وایە، فەرمووی: خودایش دەفەرموێ: ئەی باوەڕت بەوە هەبوو كەئاوا بەداماوی دێیتەوە بەردەستی من؟ دەڵێ: نەخەیر، خودایش دەفەرموێ: دەوامنیش تۆ لەبیر خۆم دەبەمەوە، وەك چۆن تۆ منت لەبیری خۆت بردبۆوە، ئیتر ئاوا لەبەینی خوداو ئەم جۆرە بەندانەدا، كە ئەمانە كافرو بێ بڕوان، ئەم جۆرە پرسیارو وەڵامانە روو دەدا، سێیەم كەس كە خودا هەمان پرسیاری لێ دەكا دەڵێ: ئەی پەروەردگاری خۆم! باوەڕم بەتۆو بەنامەی پیرۆزی تۆو بە پێغەمبەرانی تۆ هەبوو، وەكی تریش نوێژم دەكردو رۆژووم دەگرتو خێرم دەكرد، ئیتر تا دەتوانێ لەم وەسپە شیرینە دەڵێ خودایش دەفەرموێ: كەوابێ تۆ لێرەبە، هەر ئێستا شایەتی خۆمت لێ راست دەكەمەوە. ئەویش لەدڵی خۆیدا بیردەكاتەوەو دەڵێ: دەبێ

کێ بێ کە شایەتیم لێ بدا، ئەوجا دەمی مۆردەکرێ، بەڕانیو گۆشتیو ئێسکی دەگوترێ: ئادەی ئێوە قسەبکەن، جا ئەوان دێنە قسەو، کابرای دوو روو ناپاك، هەرچی کردووە دەیگێڕنەوەو شایەتی لێ دەدەن، بۆیە خودا ئەندامی خۆیی لێ دەکا بەشایەت تا هیچ قسەی نەمێنێو بیانووی ببڕێ، ئەم جۆرە کەسانەیش ئەو دوو روو ناپاكو منافقانەن، کەخودا لێیان رەنجاوەو رقی لێیان گرتوون). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٥٦٥٨ — لێپرسینەوەی بەندەکان}.

**١٤٧٥) ئەندامەکانی مرۆڤ خۆی دەبن بەشایەت لەسەری، لەڕۆژی قیامەتا.**

**(٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)**

## بَابٌ: شَهَادَةُ أَرْكَانِ الْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِعَمَلِه

١٩٣٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَضَحِكَ، فَقَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ أَضْحَكُ؟». قَالَ: قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «مِنْ مُخَاطَبَةِ الْعَبْدِ رَبَّهُ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ أَلَمْ تُجِرْنِي مِنَ الظُّلْمِ؟ قَالَ: يَقُولُ: بَلَى. قَالَ: فَيَقُولُ: فَإِنِّي لاَ أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلاَّ شَاهِدًا مِنِّي، قَالَ: فَيَقُولُ: كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيدًا، وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ شُهُودًا. قَالَ: فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ، فَيُقَالُ لأَرْكَانِهِ: انْطِقِي. قَالَ: فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ، قَالَ: ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلاَمِ، قَالَ: فَيَقُولُ: بُعْدًا لَكُنَّ وَسُحْقًا! فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ». {الحديث: ٧٣٦٥ = ٧٣٩٩ فم}:

ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەتی حەزرەتدا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) پێکەنیو فەرمووی: (دەزانن لەبەرچی پێکەنیم؟) عەرزمان کرد: خوداو پێغەمبەری خودا زۆر باش دەزانن.

فەرمووی: (لەو گفتوگۆیەی کە لەنێوانی بەندەو پەروەردگاریدا روودەدا، کە بەندەکە دەڵێ: ئەی خودایە! دیارە کەتۆ پەنای منت داوە لەوە کە زۆرو ستەمم لێ بکرێ؟

دەفەرموێ: بەڵێ: پەنام داوی، ئەمڕۆ رۆژێکە نەمن نە کەسێکی تر زۆرو ستەمو ناهەقیت لێ ناکا. بەندەکە دەڵێ: کەوابێ هەر شایەتێ کە پارچەیێ لەخۆم

نەبێ، شایەتی ئەو قەبوول ناکەم (واتە: ئەوەی کە فریشتەکان لە نامەی کردارما لەسەر منیان نووسیوە، ئەوەم قەبوولْ نییە). خودایش دەفەرموێ: ئەمڕۆ خۆت بەسیت کە ببی بەشایەت لەسەر خۆت، لەگەلْ شایەتیی فریشتە نووسەرە بەڕێزەکان (یانی: شایەتی تری پێناویٚ!).

فەرمووی: (ئەوساکە مۆر دەنرێ بەسەر دەمیاو بە ئەندامەکانی تری دەگوترێ: ئادەی ئێوە قسە بکەن). فەرمووی: (جا ئەوانیش هەرچی کردووە بەقسە دەیگێڕنەوە). فەرمووی: (ئەنجا خودا ڕێگەی قسەکردنی دەدا، زمانی دەکرێتەوەو دەلْێ: قڕتان تێکەوێ، ئەی ئەندامەکانم من بۆ کێمە، خۆمن بۆ ئێوەم بووا). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٥٦٥٩ — لێپرسینەوەی بەندەکان لەلایەنی خوداوە} .

## ١٤٧٦) ئەوپەڕی ترسان لەخودای بالاّ دەستو شکۆمەندو ترسانی زۆر لە تۆلْەی سەختی. (٦٩٠٣ - ٦٩١٨)

## بَابٌ: فِي خشية اللّه عَزَّ وَجَلَّ وَشِدَّةِ الخَوْفِ مِنْ عِقَابِهِ

١٩٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّه (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ حَسَنَةً قَطُّ لأَهْلِهِ: إِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ، ثُمَّ اذْرُوا نِصْفَهُ فِى الْبَرِّ، وَنِصْفَهُ فِى الْبَحْرِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لاَ يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ، فَلَمَّا مَاتَ الرَّجُلُ فَعَلُوا مَا أَمَرَهُمْ، فَأَمَرَ اللَّهُ الْبَرَّ، فَجَمَعَ مَا فِيهِ، وَأَمَرَ الْبَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ خَشْيَتِكَ يَا رَبِّ وَأَنْتَ أَعْلَمُ، فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ». {الحديث: ٦٥١٤ = ٦٩٣٥ فم = ف.م = فتح الملهم. تجريد البخارى = الترجمة الكردية/٤، رقم: ١٣٧٦ = ٣٤٥٢، ٣٤٧٩، ٧٥٠٦ فتح البارى. نسائى. جنائز: ٢٠٧٩. تحفة الأشراف: ١٣٨١٠} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوێ دەبێ، کفن دز دەبێ، هەرگیز کردەوەی چاکەی نەکردبوو، لەسەرە مەرگدا، کاتێ لەخۆی نائومێد دەبێو دەزانێ کەئیتر ناژی، کەسوکارەکەی رادەسپێرێو پێیان دەلْێ: کەمن مردم،، دارێکی زۆر کۆبکەنەوەو ئاگری تێ بەردەنو لەناو ئەو

ئـاگره مەشـقەلانەدا، لەشـەکەم تـەواو بسـووتێنن، کاتـێ گۆشـتو ئێسـکەکەم داپلۆخانو بـووم بـە خـەڵووز، لـەناو دنگدا ورد ورد بمهاڕنو بمکـەن بـە ئـاردو، لـە ڕۆژێکـی ڕەشـەبادا، نیـوەم بچـێنن بەدەشـتو دەرداو ئـەو نیوەکـەی تریشـم بچـێنن بەناو دەریادا، چونکە بەو خودایە، ئەگەر خودا دەستی لێم گیربێ سزایەکی وەهام دەدا، کە سزای کەسـی تـر وابەسـەختی نـادا، جـا کەپیاوەکـە دەمـرێ کەسـوکارەکەی ڕاسـپێریو وەسـێتەکەی بـەجێ دەهێـنن، دەیسـووتێننو تـۆزو خۆڵـە سـووتاوەکەی بەرووی زەویو بەسەر رووی دەریادا دەدەن بـەدەم بـاوەو دەیچـێنن. ئەوسـا خـودای گەورە ئاردو گەردو تەپو تۆزەکەی کۆدەکاتەوەو، سەر لەنوێ زینـدووی دەکاتـەوەو دەیکاتەوە بە پیاوەکەی جارانو پێی دەفەرموێ: لەبەرچی وات لەخۆت کرد؟ دەڵـێ: لەترسی سزای تۆ ئەی خوایە! وە خۆشت باشتر ئاگات لـە نیـازی دڵـم هەیـە، ئەگـەر درۆ دەکەم ئەم وەڵامەم لێ قەبووڵ مەکە. ئیتر خودا بـاوەڕی پـێ دەکـاو دەزانـێ کـە لەترسی ئەو ئەو ڕاسپێرییەی کردووەو وای لەخۆی کردووە، لەبەرئەوە لێـی خـۆش دەبـێ!). {تـاج/٥، زنجـیرە: ٩٢، ژمـارە: ٥١٤٥. م — هەرچـەندە بەنـدە لـەڕادە بـەدەر تاوانی هەبێ...}.

**١٤٧٧) کەسێ لەپاش گوناه کردن لەخوا داوای لێخۆشبوون بکا.** (٦٩١٩ - ٦٩٢٢)

**فِيمَنْ أَذْنَبَ ثُمَّ اسْتَغْفَرَ رَبَّهُ عَزَّ وَجَلَّ**

١٩٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: «أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ، اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، وَاعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ». قَالَ عَبْدُ الأَعْلَى: لاَ أَدْرِي أَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ: «اعْمَلْ مَا

شـئْتَ». {الحديث: ٦٩١٩ = ٦٩٤١ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٥، رقم: ٢١٣١ = ٧٥٠٧. تحفة/١٣٦٠٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووددو سلاّوو صەلاّواتو رەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێو سەرو ماڵو مناڵو حاڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی تۆزی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزو نازداری بێ) لە فەرموودەیەکی قودسیدا، لە پەروەردگاری گەورەو سەروەری خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کە خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: (بەندەیێ گوناهێ دەکا، لەپاشا پەشیمان دەبێتەوەو دەڵێ: خودایە! پەشیمانم لێم خۆشبە، خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من، وەك ئەم گوناهەی کردووە، هەق دەیشزانێ، کە خودایەکی وای هەیە دەتوانێ کە هەم لە گوناه خۆش بێو هەم لەسەر گوناه تۆڵە بستێنێ. دیسان ئەو بەندەیە تێهەڵ دەچێتەوەو گوناهێکی تر دەکاتەوەو دەڵێتەوە: خودایە! پەشیمانم لە گوناهم خۆشبە، دیسان خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێتەوە: ئەم بەندەیەی من، وەك ئەم گوناهەی کردووە، دەیشزانێ کە خودایەکی وای هەیە، میهرەبانو لێبوردەیە، دەتوانێ هەم لە گوناه خۆشبێو هەم لەسەر گوناه تۆڵە لە گوناهکار بستێنێ، دەی ئیتر هەرچی ئارەزوو دەکا، بابیکا مادام ئەمە حاڵیەتی، گوناه دەکاتو تەوبەی بەڕاستی لێ دەکا، والێی خۆشبووم). {ریاض/٢، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٤٢١ — باسی هیواو ئومێد بە میهرو رەحمەتی خودای گەورە}.

لێرەدا ئەمەی پترە: مامۆستاکەی موسلیم کەناوی عەبدول ئەعلای کوڕی حەممادە، دەڵێ: نازانم کە لەسەری جاری سێیەمدا یا لەسەری جاری چوارەمدا، دەفەرموێ: (چی دەکەیت بیکە، من لێت خۆش بووم!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٥١٤٤. م}.

## ١٤٧٨) كەسێ تووشی گوناهێ ببێو لەپاشا دەستنوێژ بگرێو لەپاشان نوێژێکی فەرزبکا. (٦٩٣٢ - ٦٩٣٨)

## بَابٌ: فِيمَنْ أَصَابَ ذَنْباً ثُمَّ تَوَضَّأَ وَصَلَّى الْمَكْتُوبَةَ

١٩٣٦- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْمَسْجِدِ وَنَحْنُ قُعُودٌ مَعَهُ، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، فَسَكَتَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ أَعَادَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، فَسَكَتَ عَنْهُ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ أَبُو أُمَامَةَ: فَاتَّبَعَ الرَّجُلُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ انْصَرَفَ، وَاتَّبَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْظُرُ مَا يَرُدُّ عَلَى الرَّجُلِ، فَلَحِقَ الرَّجُلُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، فَقَالَ أَبُو أُمَامَةَ: فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَرَأَيْتَ حِينَ خَرَجْتَ مِنْ بَيْتِكَ أَلَيْسَ قَدْ تَوَضَّأْتَ فَأَحْسَنْتَ الْوُضُوءَ؟». قَالَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «ثُمَّ شَهِدْتَ الصَّلَاةَ مَعَنَا؟». فَقَالَ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ حَدَّكَ، أَوْ قَالَ: ذَنْبَكَ». {الحديث: ٦٩٣٨ = ٦٩٦٢. فم. أبو داود. حدود: ٤٣٨١. تحفة الأشراف: ٤٨٧٨}:

ئەبو ئومامە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مزگەوت دانیشتبوو، ئێمەیش لە خزمەتیدا دانیشتبووین، لەوکاتەدا پیاوێ هات، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! شایانی حەددی شەرعیم، فەرمان بفەرموو کە حەددم بەسەردا جێبەجێ بکرێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێدەنگ بوو، وەڵامی نەدایەوە، دووبارە پیاوەکە قسەکەیی دووبارە کردەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! شایانی حەددی شەرعیم، بفەرموو کە حەددم بەسەردا جێبەجێ بکرێ. دیسان پێغەمبەر خامۆش بوو، قسەی نەکرد. جا قامەتکرا بۆ جەماعەتی نوێژێ لە پێنج فەرزەکانو نوێژەکە کرا، کە پێغەمبەر نوێژەکەی تەواوکرد رۆیشت، پیاوەکە شوێن پێغەمبەر کەوت، منیش شوێنی کەوتم، هەتا بزانم بەچی وەڵامی پرسیاری پیاوەکە دەداتەوە. پیاوەکە پێغەمبەری گرتەوەو عەرزیکرد: قوربان! وەڵامت

نەدامـەوە، مـن شايسـتەی حـەددی شـەرعيم، بفـەرموو كـە حەددەكـەم لەسـەر جێبەجێ بكرێ.

ئـەبو ئومامــە فــەرمووی: پێغەمبــەر پێــی فــەرموو: (ئــەرێ تــۆ كەلــەماڵ دەرچوويت، دەستنوێژێكی جوانت نەگرت؟). گوتی: بەڵێ، ئـەی پێغەمبـەری خـودا! كە لەماڵ دەرچووم دەستنوێژم گرتو دەستنوێژێكی جوانيش. فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەپاشا لەگەل ئێمەدا ئەم نوێژمت بە جەماعەت كرد؟). گوتی: بـەڵێ: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لەگـەڵ ئێـوەدا ئامـادەی ئـەم نوێـژە بـووم‌و بەجەماعـەت كـردم لەگەڵ ئێوەدا. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـی فـەرموو: (دەی خـودای گـەورە لێـت خۆشبوو لەو حەددە) يا فـەرمووی: (دەی خـودای گـەورە لـەو گوناهـەت خۆشـبوو). {تاج/١، زنجيرە: ٤٣، ژمارە: ٣٣٠ – فەضل‌و گەورەيی نوێژو باسی فەرزبوون...} .

**روونكردنەوە:**

ئـەبو ئومامـەی بـاهيلی، نـاوی صـودەيی كـوڕی عەجلانـە، هـاوەڵی پێغەمبـەرە، لەهۆزی ئـەل‌باهيلييـە، خـۆی دەفـەرموێ: كاتـێ {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ} لە قورئانی پيرۆزدا، لە پەسن‌و مەتحی بەشدارانی بەيعەتی ريضواندا هاتە خوارەوە، عەرزی خۆشەويستم كـرد: قوربـان! منـيش يـەكێك بـووم لـەو كۆمەڵـەی كـە لـەژێر ئـەم شـێخەڵەدا پـەيمانم بـەتۆدا، فـەرمووی: (تـۆ لـەمنـی‌و منيش لەتۆم).

هەروا ئـەبو ئومامە خۆی دەفەرموێ: لە غەزايـەكا چـوومە خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزيم كـرد: قوربـان! نـزام بـۆ بكـە كـە خـودا لـەم غەزايـەدا شـەهيدبوونم پـێ خـەڵات بفـەرموێ. بـەڵام خۆشەويست فـەرمووی: «اللَّهُـمَّ سَلِّمْهُمْ وَغَـنِّمْهُمْ». واتـە: (خودايـە! لـەم غزايـەدا هـەم بێـوەی‌و سـەلامەتيان بكـەو، هـەم تالانييان پێ خەڵات بفەرموو!).

ئـەبو ئومامــە لــە حـومس، لەشـام دەژيـا، دەڵـێن: دواهـەمين كـەس بـووە، لـە هاوەڵانی پێغەمبەری ئازيز كە لەشام مردووە. گێڕانەوەی زۆری لـە خۆشەويستەوە

ئەنجامـداوە، زۆرینـەی گێڕانـەوەکانی شـامیەکان دەیگێڕنـەوە. لـە فـەتحول بـاری عەسقەلانیو عومـدەتولقاری عەینیـدا دەفـەرموێ: (سـێ فـەرموودەی لـە بوخاریـدا هەیە).

لە تەجریدی بوخاریدا، ژمارە: (١٠٢٠) دەفەرموێ: جارێ ئـەبو ئومامـە صودەی کوڕی عەجلانی ئەل-باهیلی (ڕەزای خودای لێ بێ) هـەوجاڕو یـەرەقو گاسنو شـتی تـری لـە کەرەسـەی جـووتو فـەلایی بینـی، فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم لـەزاری پـیرۆزی خۆشەویسـتم ژنـەوت، دەیفـەرموو: (ئەمـە سـەربکا بەهـەر ماڵێکـا، خـودا دەیکـا بەمایەی ژێر دەستیو کەساسی بۆیان).

ئەبو ئومامە لەتەمەنی نـەوەدو یـەك ساڵیدا، لەساڵی هەشـتاو یـەکی کۆچیدا، لەشـام بـەمردنی خـودا دەمـرێ (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ). {بڕوانـە: تەجرید/٣، ژمارە: ١٠٢٠ فتح الباری}.

## ١٤٧٩) لەڕۆژی قیامەتدا لەتۆڵەی هەموو موسوڵمانێکدا بێبڕوایەك دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە. (٦٩٤٢ - ٦٩٤٦)

## بَابٌ: يُجْعَلُ لِكُلِّ مُسْلِمٍ فِدَاءٌ مِنَ النَّارِ مِنَ الْكُفَّارِ

١٩٣٧- عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا كَـانَ يَـوْمُ الْقِيَامَةِ دَفَعَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى كُلِّ مُسْلِمٍ يَهُودِيًّـا أَوْ نَصْـرَانِيًّا، فَيَقُـولُ: هَـذَا فَكَاكُـكَ مِـنَ النَّارِ». {الحديث: ٦٩٤٢ = ٦٩٦٦ فم}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لێ بێ) خۆشەویسـت (دروودی خـودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کاتێ ڕۆژی ژیانەوە هـات خـودای بـالا دەسـتو خـاوەن شکۆ، گشـت موسـوڵمانێ، یـا جوولەکـەیێ، یـا گـاورێ، دەداتـە دەسـتیو پێـی دەفـەرموێ: ئـەوا تـۆم بەخشـیو لەجیاتی تۆ، بەم کابرا جوولەکەیـە، یابـەم کـابرا گـاورە، جێگـەی نـاو دۆزەخـی تـۆ، بەمە پڕ دەکەمەوە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٥١٥٢. م}.

## (پوختەی ئەم نامەی تەوبەیە)

١- تەوبە صابوونی گوناهە، تەوبەی بەڕاستی هەموو گوناهێ پاك دەكاتەوە، پیاوەكە سەد كەسی بەناهەق كوشتبوو، بەڵام كاتێ بەڕاستی تەوبەی كرد، خودا تەوبەكەی قەبووڵ كردو لە بەهەشتی بەرینی خۆیدا نیشتەجێی كرد گەرچی فریای جێبەجێ كردنو دانەوەی مافی خوداو مافی بەندەكان نەكەوت!!

٢- تەوبە قەبووڵ دەبێ، بەمەرجێ گیان نەگاتە گیانەڵای سەرە مەرگ، خوا بەنسیبمان بفەرموێ.

٣- بەڕەحمەتی خودا زیاتر پشت دەبەستین، هەتا بەكردەوەی باشی خۆمان.

٤- نابێ مرۆڤ، لەمەكری خودا دڵنیابێ، باش وایە هەمیشە دڵی لەلای خودابێ، زمانی لە زیكرو یادی خودا پاراوبێ.

٥- **كورتو پوخت:** (مرۆڤ نابێ بەكردنی گوناه ورە بەربداو نائومێد ببێ لە رەحمەتو میهرەبانی خودا، بەڵكوو بە پێچەوانەوە لەپاش هەموو گوناهێ تەوبەی لێ بكا، پەشیمان ببێتەوە، لەخودا بپاڕێتەوە كە لێی خۆش بێ، ئەركە ئایینییەكان بەجێ بهێنێ، وەك نوێژو جەماعەتو حەجو زەكاتو خێرو خێراتو رۆژوو، وەك خودا لە قورئاندا بەدەق دەفەرموێ:

{وَآخَرُونَ اعْتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُواْ عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ — التوبة — ٩/١٠٢}. واتە:

كەسانێ تریش هەن، موسوڵمانن و خۆیان بە موسوڵمان دەزانن، لەچاكو خراپیان تێ گوشیوە، پێ لەتاوانەكانی خۆیان دەنێن، لە غەزای زۆردا ئامادەبوون، لەغەزای تەبووك دواكەوتوون، ئومێدە كەخودا تەوبەیان قەبووڵ بكا، بەهۆی پیرۆزی كارە باشەكانیانەوە، چاوپۆشی لە هەڵەو تاوانیان بكات!).

٦- جێگەی داخە، هەروەك هۆی زیانێكی زۆری ئایینیو جیهانییە، كەزۆر لەلایەنو لەمەلاو ئامۆژگارو مامۆستاو زانا ئایینیەكانمان، بەتایبەتی لە كوردستانی ئازیزی خۆماندا، زۆر توندڕەونو بەهەڵە لەكارەكە حاڵی دەبنو بە هەڕەشەو

گورەشەی زۆرو بەسەر زەنشتو سەرکۆنەو شەڕەجمێن، پۆل پۆل خەڵك لەخۆیانو لەنووری ئیسلام دەتەکێننەوە، حسێبی ئەمنو ئیستیخباراتو دیکتاتۆرو مۆدێل، بۆ فریشتەو ئایینی پیرۆزی ئیسلامو شەریعەتو خودای گەورە دەکەن!!

گرنگ ئەوەیە کە ئێمە بەو خەڵکەی بسەلمێنن، ئیسلام دەریایە، ئۆقیانووسێکی زۆر گەورەیە، جێگەی هەموو جۆرە کەسو بیرو باوەڕو خەڵکێکی تیادەبێتەوە، گرنگتر ئەوەیە کەتۆ خۆت بە موسوڵمان بزانیو ئیسلام بە پێناسەی خۆت بزانیو خوداو پێغەمبەرو قورئانو کەعبەت خۆش بوێ، ئیتر بەپێی خۆت دێیت بۆ مزگەوت، یا خەڵك لەدارە تەرما بەسەرشان دەتهێنن بەخێربێیت!

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٦٠- نامەی ناپاکەکان

## كتاب المنافقين

**١٤٨٠) فەرمایشتی خودای گەورە: {إذا جاءك المنافقون} هەتا {حتى ينفضوا}.**
**(٦٩٥٥ - ٦٩٧٥)**

**بابٌ: في قوله تعالى: {إذا جاءكَ المُنافقُون} إلى قوله {حتَّى ينفضُّوا}**

١٩٣٨- عَنْ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى سَفَرٍ أَصَابَ النَّاسَ فِيهِ شِدَّةٌ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَىّ لأَصْحَابِه: لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِه، قَالَ زُهَيْرٌ: وَهِىَ فِي قِرَاءَةِ عبدالله، وَقَالَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَخْبَرْتُهُ بِذَلِكَ، فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَىّ فَسَأَلَهُ، فَاجْتَهَدَ يَمِينَهُ مَا فَعَلَ! فَقَالَ: كَذَبَ زَيْدٌ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، قَالَ: فَوَقَعَ فِى نَفْسِى مِمَّا قَالُوهُ شِدَّةٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَصْدِيقِى (إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ). قَالَ: ثُمَّ دَعَاهُمُ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ، قَالَ: فَلَوَّوْا رُءُوسَهُمْ، وَقَوْلُهُ: (كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ). وَقَالَ: كَانُوا رِجَالاً أَجْمَلَ شَىْءٍ. {الحديث: ٦٩٥٥ = ٦٩٧٩ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٧٠٧ = ٤٩٠٠، ٤٩٠١، ٤٩٠٢، ٤٩٠٣، ٤٩٠٤ فتح البارى. ترمذى. تفسير القرآن: ٣٣١٢. تحفة: ٣٦٧٨}:

زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەری غەزایەکا، لەخزمەتی مامەمدا، لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ ئەو غەزایە، مەردومەکە تووشی سەختیو زەحمەت بوون، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیەی کوڕی سەلوول، بەلایەنگیرانی خۆی گوت: ماڵی خۆتان بۆئەوانە خەرج مەکەن کەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، هەتا بلاوەی لێ بکەنو لەدەوری بتەکێنەوە).

زوهەیری کوڕی موعاوییە، کە کەسی سێیەمە، لەڕشتەی ئەم فەرموودەیەدا، فەرمووی: قسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، کە بەعەرەبی ئاوایە: {لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ}. ئەمە ئایەتی قورئان نییە، ئایەتەکە لە قورئاندا ئاوایە: {لَا تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا} بەبێ زیادەی (مِنْ حَوْلِهِ). بەڵام لە قیرائەتێکی تەفسیریی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعووددا ئایەتەکە لە قورئاندا ئاوایە: {لَا تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا – مِنْ حَوْلِهِ} بەزیادەی (مِنْ حَوْلِهِ).

هەروا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی سەرۆکی ناپاکەکان، هەڕەشەی کردو گوتی: (ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، لەوێ لە ئێمەو لەدەستەی موحەممەد، کێمان بەدەستو بە دەسەڵاتو ئازاتربێ، شاری مەدینە بەدەستە کوونیو بێ دەستەڵاتەکەی ترمان چۆڵ دەکەین!). زەید فەرمووی: منیش چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) و ئەم قسەو هەڕەشەیەی ئیبنو سەلوولم گێڕایەوە بۆی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن عەبدوڵڵای کوڕی سەلوولو هاوڕێکانیداو، باسەکەیان بۆ باسدەکا، کە ئێوە شتێکی واواتان گوتووە، ئەوانیش حاشایان لێ کردو، بەدرۆ سوێندیان خوارد، کەئێمە قسەی وامان نەکردووەو، مامەم فەرمووی: زەید درۆی لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە. زەید فەرمووی: منیش تووشی خەمێ وابووم، هەرگیز تووشی خەمی وانەبووم، لەماڵەوە دەستە ئەژنۆ بەخەمو خەفەتەوە لێی دانیشتم، تا خواو راسان خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە:

{إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ، يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ}.

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن منداو، ئایەتەکانی بۆم خوێندەوەو فەرمووی: ئەی زەید! قسەکەت راست دەرچوو، چۆنت گوت وابوو،

ئـەوەتانێ خـودا بـەم ئایەتانـە راسـتیی قسـەکەی تـۆی دەرخسـتو ئـەوانی بـەدرۆ خستەوە.

فەرمووی: هەروەك لەم ئایەتانەدا روونکراوەتەوە، کە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نـاردی بەشـوێنیاندا، کـەبێن ئیعتیـزار بکـەنو لـەم هەڵوێسـتە نامەردانـەیان پەشیمان ببنەوە، هـەتا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای لێبووردنیـان لـەخودا بـۆ بکـا، کەچـی لووتیـان کـرد بـەولاداو، وەڵامـی پێغەمبـەریان نەدایـەوەو روویـان وەرچەرخانو ئەوەی کە پێغەمبـەر بۆیـان بپاڕێتـەوە، ئـەوەیان رەتکـردەوە. گـوتی: ئەوەیش کە لەم ئایەتانەدا دەفەرموێ:

{وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ — المنافقون — ٦٣/٤}. واتە:

کاتێ دەیانبینیو لەگەڵیان دائەنیشیو گوفتوگۆیان لەگەڵ دەکەیت، لـەشو لارو دیمـەنێکی دلگیریـی وایـان هەیـە هەرحەزدەکـەی کـە گـوێ لەقسـەیان بگـری، بـەڵام لەڕاستیدا هەر گەدو گیپاڵنو دوورن لە تێگەیشتنو لەبـەر قەبـەییو زەبـەلاحییان، دەڵێی تەختەی بەدیوارا هەڵسپێراوی بێ هەستو گیانن).

فەرمووی: ئەوەیش کە لەم ئایەتانەدا ئاوا دەفەرموێو باسی روو بازاڕیی ئەوان دەکا، مەبەست دیمەنی دەرەوەیانە کە بەڕواڵەت وابـوون، لەراستیشـدا، خۆیـان پیـاو گـەلێکی بەڕواڵـەت زۆر جـوانو شـێوە شـیرین بـوون، بـەڵام لەدڵـەوە تـەواو بـە پێچـەوانەوە بـوونو نـاو دڵو دەروونیـان پڕبـوو لـە کـێمو زووخـاوو جـەرەتاو!!. {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤١٦٩ — سوورەتی مُنافِقُون}.

**روونکردنەوە:**

١- بۆ ژیاننامەی زەیدو ئەرقەمی باوکی بڕوانە: ژمارە: (٣٣٤) کە لەپێشەوە لـەم پەڕاوە پیرۆزەدا رابورد، هەروا بڕوانە: تەجریدی بوخـاری بـەکوردی بـەرگی دووەم، ژمارە: (٥٩٠) هەتا کۆتایی لە زنجیرە: (٢٧).

## ١٤٨١) دوو ڕووەكان بێزیان نایە داوای لێبووردن لە پێغەمبەر بكەن.
(٦٩٥٥ - ٦٩٧٥)

## بَابٌ: فِي إِعْرَاضِ الْمُنَافِقِينَ عَنْ إِسْتِغْفَارِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

١٩٣٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ يَصْعَدُ الثَّنِيَّةَ ثَنِيَّةَ الْمُرَارِ؟ فَإِنَّهُ يُحَطُّ عَنْهُ مَا حُطَّ عَنْ بَنِى إِسْرَائِيلَ»، قَالَ: فَكَانَ أَوَّلَ مَنْ صَعِدَهَا خَيْلُنَا خَيْلُ بَنِى الْخَزْرَجِ ثُمَّ تَتَامَّ النَّاسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَكُلُّكُمْ مَغْفُورٌ لَهُ إِلاَّ صَاحِبَ الْجَمَلِ الأَحْمَرِ»، فَأَتَيْنَاهُ، فَقُلْنَا لَهُ: تَعَالَ يَسْتَغْفِرْ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: وَاللَّهِ لأَنْ أَجِدَ ضَالَّتِى أَحَبُّ إِلَىَّ مِنْ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لِى صَاحِبُكُمْ! قَالَ: وَكَانَ رَجُلٌ يَنْشُدُ ضَالَّةً لَهُ. {الحديث: ٦٩٦٩ = ٦٩٩٣ فم}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەری حودەیبییەدا فەرمووی: (كێ سەردەكەوێتە سەر ملەی مورار؟ هەتا بزانێ لەشكرەكەی قوڕەیش چی دەكەنو گەیشتوونەتە كوێ، ئەوەی بەم ئەركە هەڵبستێ خودا لێی خۆش دەبێ، وەك چۆن خودا لەوبەنی ئیسرائیلییانە خۆش بوو كەچوونە ناو شاری بەیتولەقدیسەوەو فەرمانەكەی خودایان بەجێ هێنا كەپێی فەرموون:

{وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُواْ هَذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَداً وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ – البقرة – ٢/٥٨}. {بڕوانە: النهاية في غريب الأثر}.

جابیر فەرمووی: جا یەكەم تاقم كە سەركەوتنە سەر ملەی مورار، كە بەسەر حودەیبییەدا دەڕوانێ، سوارەی هۆزی بەنی خەزرەج بوو، كە هۆزەكەی ئێمەن، چونكە جابیر خۆی ئەنصارییەو خەزرەجییە، فەرمووی: جا خەڵكەكەی تریش هەموویان بەرودوا بەدوا ئێمەدا سەركەوتنە سەری، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوە هەمووتان خودا لێتان خۆش بووە، تەنها خاوەنی ئەو وشترە سوورە نەبێ!). فەرمووی: جا ئێمەیش چووین بۆلای و پێمان گوت: وەرە بچین بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا داوای لێخۆشبوونی تاوانت لەخودا بۆ بكا،

کەچی گوتی: بەخودا ئەوەم لەلا باشترە کە بگەڕێم بەشوێن وڵاخە ونبووەکەما، سا بەڵکوو بیدۆزمەوە، هەتا ئەوە کەبچم بۆلای یارۆی ئێوە کەبۆم بپاڕێتەوە!).

جابیر فەرمووی: ئەم کابرایە پیاوێ بوو، وڵاخەکەی ون کردبوو، بەشوێنیدا دەگەڕا بەپرسیار.

## ١٤٨٢) نیشانەی دوو رووەکان. (٦٩٥٥ - ٦٩٧٥)

## بابٌ: فِي ذِكْرِ الْمُنَافِقِينَ وَعَلاَمَتِهِمْ

١٩٤٠- عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: قُلْنَا لِعَمَّارٍ: أَرَأَيْتَ قِتَالَكُمْ، أَرَأْيًا رَأَيْتُمُوهُ، فَإِنَّ الرَّأْيَ يُخْطِئُ وَيُصِيبُ، أَوْ عَهْدًا عَهِدَهُ إِلَيْكُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَقَالَ: مَا عَهِدَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَيْئًا لَمْ يَعْهَدْهُ إِلَى النَّاسِ كَافَّةً، وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ فِى أُمَّتِى». (قَالَ شُعْبَةُ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: حَدَّثَنِى حُذَيْفَةُ. وَقَالَ غُنْدَرٌ أُرَاهُ قَالَ: فِى أُمَّتِى) اثْنَا عَشَرَ مُنَافِقًا لاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدُونَ رِيحَهَا، حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِى سَمِّ الْخِيَاطِ، ثَمَانِيَةٌ مِنْهُمْ تَكْفِيكَهُمُ الدُّبَيْلَةُ: سِرَاجٌ مِنَ النَّارِ يَظْهَرُ فِى أَكْتَافِهِمْ، حَتَّى يَنْجُمَ مِنْ صُدُورِهِمْ». {الحديث: ٦٩٦٧ = ٦٩٩١ فم = ف.م = فتح الملهم}:

قەیسی کوڕی عوبادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بە عەمماری کوڕی یاسیرمان گوت: هەواڵمان پێ بدە: ئایا ئەم جەنگی ئێوەو عەلییە کە لەگەڵ موعاوییەو خەڵکی شامدا دەیکەن، لەسەر بیرو باوەڕی خۆتان بوو، دیارە کە بیرو راش گەڵێ جار دەیپێکیو هەندێ جاریش بەهەڵەدا دەچێ، یاخود ئەم شەڕو شۆڕە کە دەیکەن لەگەڵ ئەواندا، بەپێی پەیمانێ بووە، لەلایەنی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئەو وەسێتی بۆتان کردووەو بۆ ئەمە ئێوەی راسپاردووە؟

ئەویش فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانو عەهدی وای لەگەڵ ئێمەدا نەکردووە، کە لەگەڵ سەراپای یارانی تریدا نەیکردبێ. وە عەمار فەرمووشی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (لەناو ئۆمەتی مندا، دوازدە ناپاك، واتە: (منافق = دوو روو) هەن، نەدەچنە بەهەشتەوەو نە لەدووریشەوە

بۆنی بەهەشت دەکەن، مەگەر لەفەرزی مەحالاً وشتر بچێ بەکونی دەرزییەوە ئەوسا ئەوانیش بچنە بەهەشت، هەشت کەس لەم دوازدە کەسە، خەیارە (کە دوومەلێکی گەورەی بەسوێیە، لە ئەندام پەیدا دەبێ، وە بەقەد خەیارێ دەبێ) لە کۆڵی ئێوەیان دەکاتەوە، دوومەڵێ وەکوو چراووك لەسەر شانیان دەردێ، لەسەر سینگیانەوە سەر هەڵدەدات و لەوێوە دەرگا دەبێ و دەیانکوژێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤١٧١ — سوورەتی منافقون}.

## ١٤٨٣) باسی دوو رووەکانی شەوی ملەکەی کەوا لەسەر رێگەی تەبووك - مەککەداو باسی ژمارەیان. (٦٩٥٥ - ٦٩٧٥)

## بَابٌ: فِي الْمُنَافِقِينَ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ وَعَدَدُهُمْ

١٩٤١- عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: كَانَ بَيْنَ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْعَقَبَةِ، وَبَيْنَ حُذَيْفَةَ بَعْضُ مَا يَكُونُ بَيْنَ النَّاسِ، فَقَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، كَمْ كَانَ أَصْحَابُ الْعَقَبَةِ؟ قَالَ: فَقَالَ لَهُ الْقَوْمُ: أَخْبِرْهُ إِذْ سَأَلَكَ، قَالَ: كُنَّا نُخْبَرُ أَنَّهُمْ أَرْبَعَةَ عَشَرَ، فَإِنْ كُنْتَ مِنْهُمْ فَقَدْ كَانَ الْقَوْمُ خَمْسَةَ عَشَرَ، وَأَشْهَدُ بِاللَّهِ أَنَّ اثْنَيْ عَشَرَ مِنْهُمْ حَرْبٌ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الأَشْهَادُ، وَعَذَرَ ثَلاَثَةً، قَالُوا: مَا سَمِعْنَا مُنَادِيَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلاَ عَلِمْنَا بِمَا أَرَادَ الْقَوْمُ، وَقَدْ كَانَ فِي حَرَّةٍ فَمَشَى فَقَالَ: «إِنَّ الْمَاءَ قَلِيلٌ فَلاَ يَسْبِقُنِي إِلَيْهِ أَحَدٌ»، فَوَجَدَ قَوْمًا قَدْ سَبَقُوهُ فَلَعَنَهُمْ يَوْمَئِذٍ. {الحديث: ٦٩٦٨ = ٦٩٩٢ فم}:

ئەبو طوفەیل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەنێوانی پیاوێکا، کە ئامادەی پیلانەکەی ملەکە بوو بوو، ئەوکاتەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەغەزای تەبووك دەگەڕایەوە، کە ناودارە بە پیلانی عەقەبە (ملە)ی رێگەی تەبووك کە لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کراوە، فەرمووی: لەنێوانی ئەم پیاوەو لەنێوانی حوذەیفەی کوڕی یەماندا، دەمە قاڵەیێ روویدا، وەك ئەو دەمە قاڵەیانەی کە لەناو خەڵکا روودەدەن، کەوا مەشهوورە حوذەیفە ناوی دوو رووەکانی لەلابووە. {بڕوانە: مختصر صحیح مسلم، ژمارە: ٧١، تەجریدی بوخاری بە کوردی/١، ژمارە: ١٦٣}.

حوذەیفە بەکابرای فەرموو: سوێندت دەدەم بەخودا، کەپێم بڵێیت ئەوانەی کە لەڕێگەی گەڕانەوە، لە غەزای تەبووك لەملەکە، شەوێ پیلانیان کرد لە پێغەمبەرو ویستیان بیکوژن چەند کەس بوون. کابرایش لە سەرەتاوە نکوولی لە گوتنی ئەوەکرد. فەرمووی: جا خەڵکەکە پێیان گوت: بۆ وەڵامی پرسیارەکەی نادەیتەوە. کابرا گوتی: بیستوومانە کە چواردە کەس بوون. حوذەیفە فەرمووی: دەی ئەگەر تۆیش یەکێك بیت لەو پیلانگێڕانە، ئەوا ژمارەیان پازدە کەس بووە، نەوەك چواردە، ئەوجا حوذەیفە فەرمووی: وەمن خودا دەگرم بەشایەت لەسەر راستیی ئەم قسیەم کە: لەو پازدە کەسە دوازدە کەسیان دوو روو مونافق بوونو دوژمنی خوداو پێغەمبەر بوون، هەم لە جیهانداو، هەم لەڕۆژی دواییدا، کە پێغەمبەرانو فریشتە نووسەرەکانی کردەوەکانو ئەندامی لەش، راست دەبنەوەو ئەو شایەتییەی کە لەلایانە پێی هەڵ دەستن! (وەك لە قورئانی پیرۆزدا، لەسوورەتی هوددا دەفەرموێ: {وَيَقُولُ الأَشْهَادُ هَؤُلاء الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى رَبِّهِمْ أَلاَ لَعْنَةُ اللّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ— هود—١١/١٨}.

ئەوجا حوذەیفە فەرمووی: بەڵێ ئەم دوازدەیان ئەمە حاڵیانە، ناپاك بوونو نەفرەتو لەعنەت لێکراو بوون، بەڵام سێ کەس لەو پازدە کەسە، پاكو بێتاوان بوون، وە لەوهەڵەدا کە کردبوویان مەهانەی رەوایان هەبوو، وەك خۆیان پاکانەیان بۆ خۆیان کردو گوتیان: ئێمە بێ ئاگابووین لەم کەینو بەینەی کە ئەمانە کردیانو گوێمان لەجاڕچی پێغەمبەر نەبووە کە جاڕی داوە: کەس لە لەشکرەکە، لە هەورازەکەوە (واتە: لە عەقەبەکەوە) نەڕوات، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیەوێ لەوێوە بڕوات، تا رێیەکە جەنجاڵ نەبێو، نەبن بە ئەركو زەحمەت بۆی).
گوتیان: ئێمە نە ئاگامان لەم پیلانەی ئەم چەندَ کەسە بووە، نە ئاگاشمان لەو قەدەغەکردنەی پێغەمبەر بووە، کە فەرمانی کردووە کەس لەڕێگەی هەورازەکەوە نەڕوات، چونکە من دەمەوێ لەوێوە بڕۆم، ئێمە بەنیازێکی پاك شوێن ئەمانە کەوتینو ئاگامان لەنیازی پیسیان نەبووە!

ئەنجا ئەبو طوفەیل فەرمووی: بەم بۆنەیەوە، ئەمەیشتان بۆ دەگێڕمەوە کە دیسان باسی چیرۆکی ناپاکانو دوو ڕووانە: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەری گەڕانەوەدا، لە غەزای تەبووك گەیشتە شوێنێکی بەرداوی، کەخڕە بەرداوی بوو، وە بەردی ڕەشی زۆر بوو، بەدەم ڕێگەوە فەرمووی: (لەپێشمانەوە کوێرە کانییەك هەیە، ئاوەکەی زۆر کەمە، لەپێش مندا کەس دەستی بۆ نەباو ئاوی لێ بەکارنەهێنێ، باپیتو فەڕەکەی نەڕوات!).

کەچی کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گەیشتە سەر کوێرە کانیەکە، ڕوانی چوار لە منافقەکان لەوێنو لەپێش پێغەمبەردا، گەیشتوونەتە ئەوێو فەرمانەکەی پێغەمبەریان شکاندووە، جا لەبەرئەوە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) نەفرینو نەفرەتو لەعنەتی لێیان کرد).

**ڕوونکردنەوە:**

١- بڕوانە: ژمارە (١٥٣٠) کە لەم پەڕاوەدا لەپێشەوە لەکیتابی فەضائیلدا ڕابورد.

٢- بەندە هەوڵ دەدەم کە بەپێی سەرچاوەکان، بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا، فەرموودەکان بکەم بە کوردی، لەم خاڵەوە زۆرجار ناچاردەبم، کە تەرجەمەکە دووربێ لە تەرجەمەی پیت بەپیت، بەڵکوو وەرگەڕاوەکە ڕووحی بابەتەکە بەخوێنەری کورد، بەو پەڕی ئەمانەتەوە، ڕابگەیەنێتو بۆیڕاگوێز بکاتو مەبەستی بەندە لە پلەی یەکەمدا تێگەیشتنو سوود وەرگرتنە لەڕووداو فەرموودەکان، نەوەك کردنیان بەکوردیو بەس.

## ١٤٨٤) نموونەی دوو ڕوو وەك مەڕی ئاوەکی وایە، کە لەنێوانی دوو ڕانا سەرگەردان بێ. (٦٩٥٥ - ٦٩٧٥)

## باب: مَثَلُ الْمُنافِقِ كَالشَّاةِ العَائِرَةِ بَيْنَ الغَنَمَيْنِ

١٩٤٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ «مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ تَعِيرُ إِلَى هَذِهِ مَرَّةً وَإِلَى هَذِهِ مَرَّةً».

{الحديث: ٦٩٧٥ = ٦٩٩٨ فم}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ناپاك (موونافق) وەك مەڕی ئاوەکی وایە، وێڵو سەرگەردانو رارایە، جارێ بەم لایەدا بادەداتەوەو جارێ بەولایەداو حول حولی دەبێو سەری لێدەشێوێو رانەکەی خۆی ناناسێتەوە!). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤١٧٣ — سوورەتی موونافقوون}.

### ١٤٨٥) هەڵکردنی بایەکی سەخت بەبۆنەی مردنی دوو ڕوویەکەوە.

(٦٩٥٥ - ٦٩٧٥)

### باب: بَعْثُ الرِّيحِ الشَّدِيدَةِ لِمَوْتِ الْمُنَافِقِ

١٩٤٣- عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، فَلَمَّا كَانَ قُرْبَ الْمَدِينَةِ هَاجَتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ تَكَادُ أَنْ تَدْفِنَ الرَّاكِبَ، فَزَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «بُعِثَتْ هَذِهِ الرِّيحُ لِمَوْتِ مُنَافِقٍ». فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَإِذَا مُنَافِقٌ عَظِيمٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ قَدْ مَاتَ. {الحديث: ٦٩٧٢ = ٦٩٩٦ م}:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەفەر دەگەڕایەوە، کە گەیشتە نزیکی شاری مەدینە، لەوێ بایەکی سەخت هەڵیکرد، زۆری نەمابوو کەسوار بە ماینەوە بباتو لەبەرچاو ونی بکات، دەیگوت: بەم بۆنەیەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم بایە سەختە بەبۆنەی مردنی پیاوێکی ناپاك (دوو روو — دوو دڵ - موونافیق)ەوە خودا ناردوویەتی!) فەرمووی: جا کاتێ حەزرەتو لەشکرەکەی گەیشتنەوە مەدینە، تەماشامان کرد وا پیاوێکی ناپاکی گەورە لە ناپاكو منافقەکان مردووە). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤١٧٢ — سوورەتی منافقون}.

### ١٤٨٦) سەختیی سزای دوو ڕوو لەدوا ڕۆژدا. (٦٩٥٥ - ٦٩٧٥)

### بَابٌ: شِدَّةُ عَذَابِ الْمُنَافِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

١٩٤٤- عَنْ سلمة بن الأكوع قَالَ: عُدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَجُلاً مَوْعُوكًا، قَالَ: فَوَضَعْتُ يَدِي عَلَيْهِ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ رَجُلاً أَشَدَّ حَرًّا! فَقَالَ نَبِيُّ

اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَشَدَّ حَرًّا مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ هَذَيْنِكَ الرَّجُلَيْنِ الرَّاكِبَيْنِ الْمُقَفِّيَيْنِ لِرَجُلَيْنِ حِينَئِذٍ مِنْ أَصْحَابِهِ». {الحديث: ٦٩٧٣ = ٦٩٩٧ فم}:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆ هەواڵپرسیو سەردانی پیاوێکی نەخۆش کە تایەکی سەخت دایگرتبوو، منیش دەستم لێی دا، زۆر گەرم بوو، گوتم: بەخودا قەت پیاوی وەها گەرمم نەدیوە!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی با هەواڵتان پێ بدەم کەکێ لەم پیاوە لە قیامەتدا گەرمییەکەی سەختترە؟ ئائەو دوو سوارە دەبینن کە پشتیان لەئێمە هەڵکردووەو دەڕۆن، ئەو دوو پیاوە لە قیامەتدا گەرمییەکەیان زۆر لەگەرمی ئەم پیاوە تادارە سەخترە!). پێغەمبەر (درووی خودای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆ دووپیاو کرد، کە بەناو لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوون.

### ١٤٨٧) دوو ڕوویەکی پاشگەز گۆڕ نایگرێتە خۆی. (٦٩٥٥ - ٦٩٧٥)

### باب: فِي نَبْذِ الْأَرْضِ الْمُنَافِقَ الْمُرْتَدَّ وَتَرْكِهِ مَنْبُوذاً

١٩٤٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ مِنَّا رَجُلٌ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ قَدْ قَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ، وَكَانَ يَكْتُبُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَانْطَلَقَ هَارِبًا حَتَّى لَحِقَ بِأَهْلِ الْكِتَابِ، قَالَ: فَرَفَعُوهُ، قَالُوا: هَذَا قَدْ كَانَ يَكْتُبُ لِمُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأُعْجِبُوا بِهِ، فَمَا لَبِثَ أَنْ قَصَمَ اللَّهُ عُنُقَهُ فِيهِمْ، فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ، فَأَصْبَحَتِ الأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا، ثُمَّ عَادُوا فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ فَأَصْبَحَتِ الأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا، {ثُمَّ عَادُوا فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ فَأَصْبَحَتِ الأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا} فَتَرَكُوهُ مَنْبُوذًا. {الحديث: ٦٩٧١ = ٦٩٩٥ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەبوو، لەهۆزی بەنی نەجاری ئێمەبوو، موسوڵمان بوو، دەستی کرد بە خوێندنی قورئان، سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمرانی خوێند، گەلێ جار شتی دەنووسی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژێ هەڵهاتو ڕۆیشت بۆناو خاوەن نامەکان، فەرمووی: جا

ئەوانیش کابرایان قۆستەوەو بەرزیان کردەوە. گوتیان: ئەم پیاوە لەلای موسولمانان پایەی بەرز بوو، گەیشتبووە پایەی نووسەرانی موحەممەد، نامەو قورئانو شتی بۆ دەنووسی، ئیتر تەواو تەواو موعجەب بوون پێی، بەلام ئەوەندەی پێ نەچوو کەخودا پێی نواندو لەناویانا خودا ئەستۆی وردکرد، ئەوانیش چالێکیان بۆی هەلکەندو شاردیانەوە، بەلام زەوی نەیگرتە خۆیو فڕەی دایە سەرپشتی خۆی، تا سێجار گۆڕیان بۆیهەلدەکەندو زەوی نەیدەگرتە خۆیو فڕەی دەدایە دەرەوە، ئیتر ئەوانیش وازیان لەلاشەکەی هێناو لەو دەشتە تووڕیاندا).

**روونکردنەوە:**

منافقە نوێکان:

جێگەی داخە، لەم رۆژگارەدا، لەهەموو لایەکەوە، جیهانی ئیسلام کەوتۆتە بەر هەلمەتو هەوێلی سوپای کوفرو ناپاکانو دوو رووان، وەکی تریش کۆمەلە دەغەز لەدلو بەناو موسولمانەکان، بەدرۆو بۆ چاوبەستو چەواشەکاری، خۆشەویستیو حوببی ئەهلو بەیتیان کردووە بەدەمامكو روو پۆشو، وەك دێوجامە، لەپەنا ئەم بیانووە درۆینەداو، بەناوی خۆشەویستیو لەسەر کردنەوەی کەسوکاری پێغەمبەرەوە، هێرشی بێشەرمانە دەبەنە سەر حەرەمەکانی پێغەمبەرو سەرجەمی هاوەلەکانیو حەیاو ناموسی خودی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زەدەدارو لەکەدار دەکەنو تۆمەتی داوێنپیسیو بێئابڕوویی دەدەن لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) و جمێنو لەعنەت بەئاشکرا دەدەنو دەکەن لە جێنشینە بەرێزەکانی پێغەمبەرو دەیکەن بە شریتو نەوارو سێ دێو بەهەموو ولاتدا بلاوی دەکەنەوە.

ئەمانەمان بەچاوی خۆمان دی، کە ئاخونی شێوە مالووم لەسەر کەنالە ئاسمانیەکان، بەوپەڕی بێ شەرمیو دەغەز لەدلییەوە، جمێن بەدایکی موسولمانان عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرو بە ئەبوبەکرو بە عومەرو حەفصەو بە ئوم حەبیبەو بە سەرجەمی سەحابەکانی پێغەمبەر دەدەنو هێرش دەبەنە سەر رەمزو

هێماكانی تری ئیسلام، تەنانەت قورئانی پیرۆزیش لەشەڕی ئەم ئاخونانە رزگاری نەبووە، بەڕاستی ئەمانە، بەشەیتانانە:

١- ئالوبەیتیان كردووە بە مەقاش‌و بە ماشە بۆ تانەو تەشەر لەهاوەڵان‌و بە پاچ‌و بێڵ، بۆ رووخاندنی ئایینی محمدو ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان لە رەگ‌و ریشە پێ دەردەهێنن‌و بوون بە كوتەكی دەستی دوژمن، لە جوولەكەو لە گاور، تەنانەت گاورو جوولەكەكانیش لەكاتی هێرشدا بۆسەر ئیسلام، هەمان تانەو تەشەری ئەم ئاخونانە بەكاردەهێنن‌و بەبێ زیادو كەم دووبارە دەكەنەوە.

٢- ئێمە بەڕاستی موسوڵمانین‌و تەنیا لەبەرئەوە نوورو رووناكی ئیسلاممان قەبووڵكردووە، كەببێت بەچرای رۆشنی دین‌و دونیامان‌و هیچی تر، وە خودا حەزكا هەر وایش دەبێ، لەم خاڵەوە باوەڕمان بەهەموو فەرموودەو فەرمایشتەكانی خوداو پێغەمبەری خودا هەیەو لەسەر فەرمایشت‌و فەرموودەی ئەوان، خێزان‌و كەسوكارو ئەهلوبەیتی پێغەمبەرمان خۆش دەوێ‌و، عەلی‌و فاطیمەو حەسەن‌و حوسەین‌و نەوەو وەچەی پیرۆزی ئەوانمان لەنووری چاوی خۆمان خۆشتر دەوێ‌و ئومێدی گەورەی دین‌و دنیامان، لەپاش خوداو پێغەمبەرو قورئانی پیرۆز، حوبب‌و خۆشەویستی ئەوانە! وە رۆژی چەندین جار لەناو نوێژو غەیری نوێژدا دروودو سڵاویان بۆ دەنێرین.

بەڵام لەبەر رووناكی ئەم شیعرە عەرزتان دەكەم:

پرسیاری كورت، وەڵامی ورد ورد
زاخاوی مێشكبن، بۆ خوێنەری كورد:

دەبێ بۆچی یەكێكی وەكوو ئەقرەعی كوڕی حابیس، كە خۆی‌و دەكوڕی، لەشەڕی یەرمووكدا، لەسەردەمی عومەری كوڕی خەطابدا، لە وڵاتی شام، لەپێناوی بەرگری لە نووری ئیسلام جەنگیون‌و هەوڵیان داوە بۆ فەتحی شام‌و لە نەبەردێكی خوێناویدا لەگەڵ سوپای رووما، شەهید بووبن، دەبێ بۆچی ئەمانە مورتەددو مەلعوون بن، چونكە عومەریان بە خەلیفەی خۆیان زانیوە، بەڵام ئیمامی حوسەین، كە لەشەڕی برا كوژیدا كوژراوە وەبەهۆی ئەوەوە خەڵكێكی زۆر لە

موسوڵمانان، به بەلاش‌و لە پێناوی هیچدا کوژراون دەبێ بۆ حوسەین شەهیدبێ‌و خوێنەکەی ببێ بەخوێنی سیاوەیش‌و تا ڕۆژی قیامەت نەکوژێتەوەو ڕۆژانە، لێرەو لەوێ، لەسەر ئەو موسوڵمانان یەکتری بکوژن‌و کەسانێ بازرگانی بەخوێنەکەیەوە بکەن‌و وەك بایەقوژ هەر بڵێن: ئادەی تۆڵەی حوسەین بسێنن! دەبێ بۆچی ئەم هەموو سەحابەو تابیعین‌و موسوڵمانانەی کە لەسەردەمی ئەبوبەکری صەدیقەوە، هەتا کۆتایی خەلافەی ئیسلامی، کە ئەم هەمکە فتوحاتانەیان کردووەو نووری ئیسلامیان بەجیهانا پەخشەوە کردووە، هەموو مورتەددو پاشگەزو منافق‌و دوو ڕووبن، چونکە لەعنەت‌و نەفرەتیان لە ئەبوبەکرو عومەرو عائیشەو حەفصەو ئوم حەبیبەو موعاوییە نەکردووە!

ئەمانە کە دوورگەی عەرەب‌و شام‌و میصرو سێ بەشی ئەفریقاو عێراق‌و ئێران‌و هیندو سیندو نیوەی ئاسیاو بەشێ لە ئەورووپایان بەنووری قورئان‌و بە نووری ئیسلام درەخشانکردو کردیانن بە ئیسلام‌و هەتا ئێستایش بەهۆی کۆششی ئەوانەوە لە سەراسەری جیهاندا، زیاتر لە ملیارو نیوێ موسوڵمان‌و زیاتر لە پەنجاو چوار دەوڵەتی ئیسلام هەیە، ئەمانە هەموو مورتەددو پاشگەزو جەهەننەمی بن، بەڵام عەلی‌و منالی عەلی‌و ئەوانەی کە عەلی‌و منالی عەلییان کردووە بە بیانوو، کە یەك سانتیمیان نەخستۆتە سەر خاکی ئیسلام‌و یەك شەهیدی بەرەی شەڕی کوفریان نییەو هەر خەریکی شەڕی برا کوژی بن، ئەمانە هەموو شەهیدبن‌و بەهەشتی بن؟!

بۆچی ئەمە هەرقەلییەتە، یا عەدالەت‌و نوبووەتە؟ بەڕاستی ئەمە مەنطیقێکی لارو خوارەو پیلانێکی شەیتانانەی ئاشکراو دیارە، نەخوا، نە پێغەمبەر، نە عەلی پێی ڕازییە!

بۆ بەراورد لەگەڵ ئەم بەچکە شەیتانانەی کە تانەو تەشەر لە حەرەمەکان‌و لە مامەکان‌و لە خەزوورەکان‌و لە سەحابەکان‌و لە جێنشینەکانی پێغەمبەر دەدەن‌و

قورئانەکەی بەدەسکاریکراو دەزانن‌و سوننەتە راست‌و دروستەکەی بەدرۆی ئەبو هورەیرەو عائیشە دادەنێن، ئەم نموونەیە تۆمار دەکەین:

سەیگوڵێ هەبوو زۆر بەدین بوو، لەسەیدەکانی خاوی‌و قانزانقایە بوو، لە گەڕەکی چوارباخ دادەنیشت لە سلێمانی، بەزۆری لە مزگەوتی قەرە چێوار لە گەڕەکی چوارباخ نوێژی دەکرد، هەرچی لەگەنم پەیدا دەبێ نەیدەخوارد، گوایە باوە حەواو دایە حەوا لەسەر خواردنی گەنم لە بەهەشت دەرکراون، ئەم سەیگوڵە (رەحمەتی خودای لێ بێ) رەفتارێکی زۆر سەیری هەبوو، هەر مەلایەك لەبەر نوێژیدا، سوورەتی (تَبَّتْ يَدَا)ی بخوێندایە، یەکسەر نوێژەکەی دەبڕی‌و دەچوو لەولاوە نوێژەکەی خۆی دەکرد، ئیتر قەت جەماعەتی لەپشتی ئەو مەلایەوە نەدەکرد، دەدەیگوت: مەلا! چۆن شەرم لەخواو لە پێغەمبەری خوا ناکەی، دەچی لەناو خەڵکی عەوامدا، خراپیی ئەبو لەهەب باس دەکەیت، کە مامەی پێغەمبەرە، نازانی هەر قسەیێ شوێنی خۆی هەیە؟

جا برا سوێندم بە خودای گەورە، ئەم سەیگوڵە، گەلێ گەلێ لەم هەمکە ئاخونەی کە لەسەر جوێندان بە ناموسی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سوورن‌و بەردەوام ئاگری شەڕی براکوژی لەناو موسوڵمانانا، بەناوی لەسەرکردنەوەی عەلی‌و فاطیمەو حەسەن‌و حوسەین‌و ئەهلوبەیتەوە، بەردەوام بەم بیانووە درۆیەوە، ئاگری شەڕی براکوژی هەڵ دەگیرسێنن‌و خۆش دەکەن!

من ئەم پرسیارە لە هەموو خاوەن ویژدانێ، خاوەن هۆش‌و گۆشێ، بەبێ لایەنانە دەکەم: دەبێ بۆچی، ئەم مەراجیعانە کە خۆیان بە نوێنەری راستەقینەی ئەهلو بەیت دەزانن‌و بەس، داخ لەدڵانەو کوێرانە، بەهەموو هۆکارێکی راگەیاندن، شەوو رۆژ خەڵك هاندەدەن لەسەر دژایەتی‌و کافرکردنی لەسەددا نەوەدو پێنجی گەلی موحەممەد، بەتایبەتی هی خزمە نزیکەکانی‌و هاوسەرەکانی‌و هۆزەکەی کە هۆزی قورەیشە، گوایە ئەمانە پشتی عەلییان بەرداوەو پشتی دوژمنانی ئەویان گرتووە!

ئەو هەموو فیداکاریو قوربانیو تێکۆشانو خەباتگێڕانو شەهیدانەی، کە کۆی سەرجەمیان بە درێژایی مێژوو لە نزیکەی یەك ملیار تێ دەپەڕێ، ئەم هەموو خۆبەختکردنو خەباتگێڕانو شەهید بوونە، گشتی هیچو پووچەو جێگەیان ناو ئاگری سووری دۆزەخە، گوایە ئەمانە تەبەڕڕایان لە ئەبوبەکرو عومەر نەکردووە، بەڵکوو لایەنگیرانی ئەوانن، کە منداڵێکیان بەناوی موحسینەوە لەباری فاطیمە بردووە!! پەککو لەم حەلامەتەی؟

جا باشە توخوا، گریمان ئەم بوختانە راستیش بێو درۆی پەتی ناپاکانو دووڕووانو ناحەزانی ئیسلامیش نەبێ، ئەم هەموو بەچکە شێرو پاڵەوانو فیداکارانەی، کە لەماوەی نزیکەی (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد ساڵدا، جەنگیونو دەستیان بە قورگی شێردا کردووەو ئاڵای ئیسلامیان شەکاندۆتەوەو زیاتر لە ملیارێ شەهیدیان، لەم ماوەدا، لەم پێناوەدا داوە، ئەم دەریایە لە خوێنو فرمێسك، ئەم هەموو زامارو شەهیدو کەم ئەندامو قوڕ بەسەرو جەرگ سووتاوانە، بەهەموویان ئەم سکە لەبارچووە درۆینەی فاطیمەیان تیادا نابێ؟! باشە ئەوا گریمان ئەبوبەکرو عومەریش تاوانبار بوون، ئەم خەڵکەی تر بۆ؟ بۆچی ئەو خەڵکە شەهیدو خەباتگێڕانە، هەموو ئاو لەزامیان دێ، بەس منداڵی عەلی خوێن لەزامیان دێ!

خودا شایەتە عەلیو فاطیمە خۆشیان بەمە رازی نابن، بەڵام چی دەڵێی بەکەسانێ، بە فێڵو بەدرۆو بەساختە ئالوبەیتیان کردووە، بە کوتەكو بە ئامراز بۆ رووخانی ئایینی موحەممەد.

من بۆخودا ئەم شایەتییە دەدەم، زیاتر لە (٣٠) سیی ساڵ لەناو جەعفەریدا، خۆمو ماڵو منداڵم ژیاوم، دراوسێو هاوەڵو برادەرم بوون، هیچ هەستمان بەوە نەکردووە، کە ئێمە دوو لایەنی جیاین، مەبەستم ئەمەیە: ئەم تۆوی دوژمنایەتی بڵاوکردنەوەیە، بەس لەژێر سەری مێزەر بەسەرەکاندا هەیەو بەس، جەماوەرەکە لە شیعەو لە سوننە وەك برا پێکەوە دەژین، ئەگەر دەستتێوەردانی ئەوان نەبێ!

بەم بۆنەیەوە ئەم راستیە دەدرکێنمو تۆمار دەکەم: کە حیزبی بەعثی درندە، لە سوپادا، بە کوردو شیعەو شیوعییان دەتگوت: (الثُّلاَثِيُّ الخبيث) = (سێلانەی چەپەڵ!).

وەکی تریش کە بارودۆخەکە، لەهەموو گۆشەکانیەوە دەهێنمە بەرچاو، هەق دەزانم کە ئەمانە وا خۆشی دنیا قووتی داونو وەك مەسیح دەفەرموێ: وا کەیفیان بەوەدێ کە لەلای سەرووەوە دانیشنو پێیان بگوترێ ئایەتوڵلاو شتی واو وابوون بەداوی شەیتانەوە (يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِنَ الحَيَاةِ الدُّنْيَا). وا لەشەقامە رێگەی ئیسلام تەرابوونو دوور کەوتوونەتەوە، بەمنی هەژار وریا ناکرێنەوە، بەڵام وەك قورئان بەدەق دەفەرموێ:

{وَإِذَ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُواْ مَعْذِرَةً إِلَى رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ – الأعراف – ٧/١٦٤}.

لەکۆتادا بەکوڵی دڵ لەخودا داوا دەکەم کەبرا سوننییەکانو برا جەعفەرییەکان، وەك برا لەگەڵ یەکتری بژینو خودا لەشەڕی ئاژاوە گێڕانو ئەوانەی کە بازرگانی بەخوێنی هەردوولاوە دەکەن: بیانپارێزێو برایەتیو تەباییو هاوسەنگەریی، لەناو سەرجەمی موسوڵمانانندا، دژی دوژمنی ئیسلام، بەردەوام بێ. ئامین.



# ٦١- نامەی نیشانەکانی قیامەت

## كِتَابُ صِفَةِ الْقِيَامَةِ

{بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٥٧ + زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٨١}.

### ١٤٨٨) لەڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە گۆی زەوی دەکات بەیەك چنگ.

(٦٩٧٦ - ٦٩٨٤)

### بَابٌ: يقبض الله الأرض يوم القيامة {وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ - الزمر - ٦٧/٣٩}

١٩٤٦- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَطْوِي اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ السَّمَوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟ ثُمَّ يَطْوِي الأَرَضِينَ بِشِمَالِهِ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟». {الحديث: ٦٩٨٢ = ٧٠٠٦ فم. بخاری. توحيد: ٧٤١٣}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتدا خودای باڵا دەستو خاوەن شکۆ، ئاسمانەکان وەك تۆمار دەپێچێتەوە، ئەنجا بەدەستی ڕاستی هەڵیان دەگرێو دەفەرموێ: پادشای تاكو تەنیای بێ هاوشان هەر خۆمم، پادشا زەبردارەکانی سەرزەوی لەکوێن؟ پادشا ملهوڕو خۆبەزلزانەکان کوان لەکوێن؟ ئەوجا گۆی زەوی دەپێچێتەوەو بەدەستی چەپی دەیکا بەیەك چنگو ئەوجا دەفەرموێ: پادشای تاكو بێ هاوشان هەر خۆمم، پادشا زەبردارەکانی سەر زەوی لەکوێن؟ پادشا ملهوڕو خۆبەزلزانەکان کوان لەکوێن؟). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٤٠٧٤ — سوورەتی زومەر + ژمارە: ٤٠٧٤ م + تاج/٥، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ٥٦٤٦ + ژمارە: ٥٦٤٧ — فەرمایشتی خودای گەورەو مەزن لەڕۆژی قیامەتدا}.

### ١٤٨٩) شێوەی زەوی لەڕۆژی دواییدا. (٦٩٨٦ - ٦٩٨٧)
### بَابٌ: صِفَةُ الأَرْضِ يَوْمَ القِيَامَةِ

١٩٤٧- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ، لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لأَحَدٍ». {الحديث: ٦٩٨٦ = ٧٠١١ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢٠٢٧ = ٦٥٢١ فتح الباري}:

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەڕۆژی دوا رۆژدا، مەردوم هەموو لەسەر زەوییەکی سپی مەیلەو سوور حەشر دەکرێن‌و لەمەوقیف کۆدەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوەو پاداش وەرگرتن، کە ئەو زەوییە وەك کولێرەی باراشی پاککراوی بێژراوەی بێ سۆس‌و کەپەك وایە).

ئاخری ئەم فەموودەیە لە تەجریددا ئاوایە:

سەهل (یا یەکێکی تر) لە گێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە فەرمووی: (ئەو زەوییە زەوییەکی تری نوێیە، جیایە لەم عەردەی ئێستای خۆمان، کە ئێستا لەسەری دەژین، لەبەرئەوە نیشانەی خاوەنێتی‌و پەیوەندی‌و دیاریکردنی جێگەو رێگەی پێوە نییە، بە هەرچوار لادا هەتا چاوبڕبکا، دەشتێکی سافی بێ بەرزی‌و نزمی‌و بێ نیشانەو شوێنەوارە). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٥٦٤٤ — حەشر لەسەر زەوییەکی نوێ دەکرێ = الحشر على أرضٍ جدِيدة} + {تاج/٤، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٤٠٧٣، ٤٠٧٤، ٤٠٧٤ م — سوورەتی زومەر}.

### ١٤٩٠) بەندە لەسەرچی حاڵێ مردووە لەسەرئەوە زیندوو دەکرێتەوە.
### (٧١٥٨ - ٧١٦٣) بَابٌ: يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ

١٩٤٨- عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ». {الحديث: ٧١٦١ = ٧١٨٨ فم. ابن ماجة. زهد: ٤٢٣٠. تحفة الأشراف: ٢٣٠٦}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەموو بەندەیێ لەسەر چی حاڵێ دەمرێ، لە قیامەتدا، لەسەر ئەو حاڵە زیندوو دەکرێتەوە!).

**١٤٩١) زیندوو کردنەوە لە قیامەتدا بەپێی کردەوەیە.** (٧١٥٤ - ٧١٥٧)

**بَابٌ: العبث عَلَى الْأَعْمَالِ**

١٩٤٩- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا، أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ».
{الحديث: ٧١٦٣ = ٧١٩٠ فم}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەری خۆشەویستو نازدارم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتێ خودای گەورەو مەزن سزایەکی ناردە سەر هۆزێو ویستی سزایان بدا، ئیتر ئەو سزایە پاكو پیسیان وەك یەك دەگرێتەوە، بەڵام لەپاشا کەخودا زیندوویان دەکاتەوە، هەرکەسەیان بەپێی کردەوەی خۆی، تۆڵەی لێ دەستێنێ، یا پاداشی باشی دەداتەوە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٨٤، ٥٤٨٦}.

**١٤٩٢) مەردووم بەرووتو قووتیو بە پێخاوسیو بە سوننەت نەکراوی حەشر دەکرێن.** (٧١٢٦ - ٧١٣١)

**باب: يُحْشَرُ النَّاسُ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً**

١٩٥٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! النِّسَاءُ وَالرِّجَالُ جَمِيعًا يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ قَالَتْ: قَالَ: « يَا عَائِشَةُ: الأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ». {الحديث: ٧١٢٧ = ٧١٥٦ فم. تجريد البخارى بالكوردى/٥، رقم: ٢٠٢٩ = ٦٥٢٧ فتح البارى}:

**عائیشه** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی:** لە پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیزم بیست، دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەتدا، بەرەی ئادەمیزاد بەنێرو مێیانەوە کە حەشر دەکرێن، بەپێی پەتیو بەرووتو قووتیو بە خەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن).

منیش عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو پیاوو ژنانە کە هەموویان بەیەکەوە حەشر دەکرێن، چۆن تەماشای شەرمگای یەکتری ناکەنو کۆئەندامی زاوزێی یەکتری نابینن؟

**فەرمووی** (دروودی خودای لەسەر بێ): {ئەی عائیشە! کێ دەیپەرژێتە سەر شتی وا، کار لەوەدا نییە کە خەڵك بیر لەشتی وابکەنەوە، یا تەماشای یەکتری بکەن!}. {تاج/٤، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٤٢٠٣ — سوورەتی عەبەسە + ریاض/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٤١١ — ترسان لەقاری خوا}.

## ١٤٩٣) مەردوم بەسێ کۆمەڵ کۆدەکرێنەوە بۆ حەشر. (٧١٢٦ - ٧١٣١)

## بابٌ: يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى طَرَائِقَ

١٩٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلاَثِ طَرَائِقَ: رَاغِبِينَ، رَاهِبِينَ، وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلاَثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا». {الحديث: ٧١٣١ = ٧١٥٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢٠٢٨ = ٦٥٢٢ فتح الباري. نسائي. جنائز: ٢٠٨٤. تحفة: ١٣٥٢١}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ:** خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تۆزێ لەپێش بەرپابوونی قیامەتا، حەشرێ لە جیهاندا دەبێ، لەو حەشرەدا مەردوم بەسێ کۆمەڵ کۆدەکرێنەوەو دەبن بەسێ دەستەی سەرەکییەوە:

دەستەی یەکەم: پێشەنگەکانن، ئارەزوومەندانی دیداری خودانو، لەرابووردووی خۆیان بێزارن، چونکە ئەوەندە تامەزرۆی دیداری خودای خۆیانن، لەهەموو شتێکی تر بێزارن.

دەستەی دووەم: ئەوانەن کە دوو کەس، یاسێ کەس، یاچوار کەس، یا پێنج کەس، یا شەش کەس، یا حەوت کەس، یا هەشت کەس، یا نۆکەس، یا دەکەس، بەسەرەو بەنۆرە، بەرودوای یەکتری، سواری یەك وشتر دەبن، یاخود دووکەس دوو کەس، یا سێ کەس سێ کەس، یا چوار کەس چوار کەس... تاد، پێکەوە لە پاشکۆی یەکترییەوە سواری یەك وشتر دەبن و ئەم دەستەیە لە پلەو پایەدا ناوەندین.

دەستەی سێیەم: وە هەرچی لەمانە مایەوە دەستەی سێیەمن و ئایەخی هەرسێ کۆمەڵەکەن، ئاگر وەك شوان دەیانداتە بەرو وەك ران بەرەو سارای مەحشەر لێیان دەخورێ، ئیتر چەند رۆژ بەرێوەبن ئاگرەکەیش لەگەڵیاندایە، لە هەرکوێ شەو بکەنەوە ئاگرەکەیش بەدیاریانەوە لەوێ شەو دەکاتەوە، لە هەرکوێ نیوەڕوان وچان بگرن، ئاگرەکەیش لەگەڵیانا لەوێدا وچان دەگرێ، لە هەرکوێ بەیان بکەنەوە، ئاگرەکەیش هەروا، لەکوێ ئێوارە بکەنەوە ئاگرەکەیش هەروا). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٥٦٤١ — زیندوو بوونەوەو کۆمەڵبوون بۆ لێپرسینەوە}.

**روونکردنەوە:**

ئەم واتایە بۆ ئەم فەرموودەیە، کە ئەم کۆبوونەوەیە لەدنیادا دەبێ، وەسێ کۆمەڵەکەیش ئەو سێ دەستەیەن کە باسکران ئەمە پەسەندی ئیمامی نەوەوییە (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا، وە لێکدانەوەی تریش بۆ ئەم فەرموودەیە کراوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئێمە لە کرۆکی حاڵەکە تێ بگەین و پەندو ئامۆژی لێ وەربگرین و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین.

### ١٤٩٤) لەرۆژی قیامەتدا بێباوەڕان لەسەر روخساریان لێ دەخورێن بۆ دەشتی مەحشەر. (٧٠١٤ - ٧٠١٩)

### بَابٌ: حشر الكافر على وجهه يوم القيامة

١٩٥٢- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ: «أَلَيْسَ الَّذِى أَمْشَاهُ عَلَى رِجْلَيْهِ فِى الدُّنْيَا قَادِرًا عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ

عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟». قَالَ قَتَادَةُ: بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا. {الحديث: ٧٠١٨ = ٧٠٤٣ فم. تجريد البخاری بالكوردی/٤، رقم: ١٦٧٧ = ٤٦٧٠، ٦٥٢٣ فتح الباری. تحفة الأشراف: ١٢٩٦}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەرۆژی قیامەتدا، بێبڕوا لەسەر روخسار چۆن حەشر دەکرێت؟ فەرمووی: (ئەو خودایەی کەلەم جیهانەدا دەتوانێ کارێکی وابکا کە ئادەمیزاد لەسەر دووپێ بڕوات، ئایا ناتوانێ کە لەوجیهاندا کارێکی وا بکا، کە لەسەر روو بڕوات؟).

قەتادە فەرمووی: با، بەگەورەیی خودا، دەتوانێو زیاتریش. {تاج/٤، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٣٩٧٠ و ٣٩٧١ — سوورەتی ئیسرا}.

## ١٤٩٥) رۆژی ژینەوەو هەستانەوە خۆر تەواو نزیك دەبێتەوە لە دروستکراوان.

(٧١٣٢ - ٧١٣٥)

## بَابٌ: دُنُوُّ الشَّمْسِ مِنَ الخَلْقِ يَوْمَ القِيَامَةِ

١٩٥٣- عَنْ سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَدَّثَنِي الْمِقْدَادُ بْنُ الأَسْوَدِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «تُدْنَى الشَّمْسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْخَلْقِ، حَتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيلٍ». (قَالَ سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ: فَوَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا يَعْنِي بِالْمِيلِ أَمَسَافَةَ الأَرْضِ أَمِ الْمِيلَ الَّذِي تُكْتَحَلُ بِهِ الْعَيْنُ). قَالَ: «فَيَكُونُ النَّاسُ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ فِي الْعَرَقِ: فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى كَعْبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى حَقْوَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ الْعَرَقُ إِلْجَامًا». قَالَ: وَأَشَارَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ إِلَى فِيهِ. {الحديث: ٧١٣٥ = ٧١٦٢ فم. ترمذی. زهد: ٢٤٢١. تحفة الأشراف: ١١٥٤٣}:

سولەیمی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: میقدادی کوڕی ئەسوەد (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (لەرۆژی ژینەوەو هەستانەوەدا، کە ناوداره بە قیامەت، خۆر وا لەدروستکراوانی خودای گەورە نزیك دەبێتەوە، بە ئەندازەی میلێکی دەمێنێ لێیانەوە).

سولەیمی کوڕی عامیر، کە لە میقدادە وە فەرموودەکە دەگێڕیتەوە، فەرمووی: بەخودا نازانم مەبەستی لەمیل ئەو میلەیە، کە وەك کیلۆمەتر لەم سەردەمەدا، زەوی پێ دەپێورێ، یا مەبەستی ئەو میلەیە کەچاوی پێ دەڕێژرێو پێشی دەگوترێ: میلچیۆك. بچینەوە سەر فەرموودەکەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیتر کە گۆی خۆر لە دروستکراوان ئاوا نزیك دەبێتەوە، ئەو خەڵکە، هەرکەسەی بەپێی کردەوەی خۆی، لەناو ئارەقی خۆیدا نوقم دەبێ! بازێکیان تا هەردوو قولەپێی، هەیانە تا هەردوو ئەژنۆی دەچەقێ لە ئارەقی خۆیدا، هەیانە هەتا کورتە کەلەکەی دێ، هەشیانە هەتا لالغاوەی ئارەق پەنگ دەخواتەوە).

میقداد فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی پیرۆزی، ئاماژەی بۆدەمی خۆی کرد، نیشانیدا کە ئارەق تا ئێرەیان دێو وەك لغاو لغاویان دەکات، خودا پەنامان بدا). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٠، ژمارە: ٥٦٥١ — سامناکی رۆژی قیامەت + ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٤٠٢ — ترسان لەقاری خودای گەورە} .

### ١٤٩٦) زۆریی ئارەقی لەش لە رۆژی هەستانەوەدا (قیامەت). (٧١٣٢ - ٧١٣٥)

### بَابٌ: فِي كَثْرَةِ الْعَرَقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

١٩٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الْعَرَقَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيَذْهَبُ فِي الأَرْضِ سَبْعِينَ بَاعًا، وَإِنَّهُ لَيَبْلُغُ إِلَى أَفْوَاهِ النَّاسِ أَوْ إِلَى آذَانِهِمْ». (يَشُكُّ ثَوْرٌ أَيَّهُمَا). {الحديث: ٧١٣٤ = ٧١٦١ فم = ف.م = فتح الملهم + تجريد البخارى بالكوردى/٥، رقم: ٢٠٣٠ = ٦٥٣٢ فتح الملهم. تحفة الأشراف: ١٢٩١٩} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕۆژی ژیانەوەدا، ئەو خەڵکە دەکەونە سەخڵەتییەکی واوە، ئارەق دەکەن، ئارەقێکی زۆر زۆر، بەهۆی نارەحەتیو مەینەتی زۆرەوە، تەنانەت ئارەقیان حەفتا گەز بەناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە!

لەلایەکی تریشەوە پەنگاوی لافاوی ئارەقی لەشیان وا ئەوق دەکاتەوە، هەتا دەگاتە لالغاویان، گەلێ جار دەگاتە بناگوێیان!).

فەرموودەکە لە بوخاریدا، بەم شێوەی پێشەوەیە، هەروا لە ریاض الصالحیندا، بەڵام لە موسلیمدا، لە کۆتاوە ئەم پتریيە هەیە: ثەور کە لە ئەبولغەیثەوە، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە، ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، گومانی بۆ پەیدابوو بوو، لەوەدا کە فەرموویەتی: (دەگاتە لالغاوەیان) یا فەرموویەتی: (دەگاتە بناگوێیان!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢٠، ژمارە: ٥٦٤٩ + ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٤٠٣ – ترسان لەقاری خودا}.

١٩٥٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا: لَوْ كَانَتْ لَكَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا أَكُنْتَ مُفْتَدِيًا بِهَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هَذَا، وَأَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ - أَنْ لاَ تُشْرِكَ، (أَحْسَبُهُ قَالَ:) وَلاَ أُدْخِلَكَ النَّارَ، فَأَبَيْتَ إِلاَّ الشِّرْكَ». {الحديث: ٧٠١٤ = ٧٠٣٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٣٣٩ = ٣٣٣٤، ٦٥٣٨، ٦٥٥٧ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٠٧١}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەرۆژی دوارۆژدا خودای گەورەو سەروەر، بەوکەسەی کە لەناو ئاگری دۆزەخدا، سزاو ئێش و ئازاری لەهەموو دۆزەخییەکانی تر سووکترە، پێی دەفەرموێ: ئەگەر ئێستا جیهان و هەرچی لەجیهاندا بوو، هی تۆ بووایە، ئایا دەیدەیت لە تۆڵەی خۆتدا، هەتا لەم ئێش و ئازارەی ئێستات، رزگارت ببێ یانا؟

دەڵێ: بەڵێ، ئەی خوایە! دەیدەم. خودا پێی دەفەرموێ: درۆدەکەیت، چونکە تۆ هێشتا لەپشتی ئادەمدا بووی من شتێکم لێ داواکردیت، کە گەلێ لەمە ئاسانتربوو، کە ئەوەبوو داوام لێ کردیت، کە تۆ هاوبەشم بۆ بڕیار نەدەیت و منیش نەتخەمە ناو ئاگری دۆزەخەوە، کەچی تۆ هەر حەزت لەوەبوو، کە هاوبەشم بۆ بڕیار بدەیت!). {تاج/٤، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٨٢٩ – سوورەتی مائیدە}.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٦٢- نامەی چۆنێتی ژیانی بەهەشت
## كِتَابُ صِفَةِ الجَنَّةِ

{بڕوانـە: تـاج/٥/٦٥٤، زنجـیرە: ١١٦ هـەتا زنجـیرە: ١٥٠، لـە ژمـارە: ٥٦٣٣وە هـەتا ژمـارە: ٥٧٥٩ + ریاضـی صـالحین/٤، زنجـیرە: ٣٧٢، لـە ژمـارە: ١٨٨٠وە هـەتا كۆتـایی + تەجرید/٥، زنجیرە: ٨٤، لە ژمارە: ١٩٩٧ وە هەتا ژمارە: ٢٠٤٣}.

### ١٤٩٧) یەكەم دەستە كەدەچنە بەهەشت. (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)
### بَابٌ: فِي أَوَّلِ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الجَنَّةَ

١٩٥٦- عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: إِمَّا تَفَاخَرُوا، وَإِمَّا تَذَاكَرُوا: الرِّجَالُ فِي الْجَنَّةِ أَكْثَرُ أَمِ النِّسَاءُ؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَوَلَمْ يَقُلْ أَبُو الْقَاسِمِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، وَالَّتِي تَلِيهَا عَلَى أَضْوَإِ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ، لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ اثْنَتَانِ يُرَى مُخُّ سُوقِهِمَا مِنْ وَرَاءِ اللَّحْمِ، وَمَا فِي الْجَنَّةِ أَعْزَبُ». {الحديث: ٧٠٧٦ = ٧١٠٣ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٣١٢ م = ٣٢٤٦، ٣٢٤٥ = ١٣١٢ تجريد. تحفة الأشراف: ١٤٤٠٨}:

ئیبنو سیرین كەناوی موحەممەدی كوڕی سیرینەو ناسراوە بە ئیبنو سیرین (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنانو پیاوان لەناو خۆیاندا، یا بۆ شانازی، یا بۆ دەمەقاڵێ، بوو بە گوفتوگۆیان، كە ئایا پیاوان لە بەهەشتا زۆرترن، یا ژنان؟ ئەبو هورەیرەیش گوێی لەم گفتوگۆیە بوو، فەرمووی: دیارە كە ژمارەی ژنان زۆرترە، ئەوەتا حەزرەتی ئەبولقاسم، كە پێغەمبەری ئێوەیە دەفەرموێ: (یەكەم دەستەیێ كەدەچنە ناو بەهەشت، لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن، ئاوا جوانو گەشو ناسكو نازدارن، لەناو ریزی بەهەشتییەكانی تردا دیارن، دەستەی دوای ئەوان وەك گەشترین ئەستێرەی ئاسمان وان، هەر پیاوەی دوو ژنی هەیە، لە بەهەشتا پیاوی بێ ژنی رەبەن نییە، هەموو ژندارن، ژنەكانیان لەبەر جوانیو ناسكیو نازداری، مۆخی

ناو نوولاقیان لەژێر چەرمو گۆشتو ئێسکەکەوە دیارە، وەك لەناو مینادا بێ ئاوایە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٤٢، ژمارە: ٥٧٣٧ – چۆنێتیو شێوەی دانیشتوانی بەهەشت + ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٢، ژمارە: ١٨٨٢} + {تاج/٥، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٥٢١٠ م + ٥٢١١ م}.

١٩٥٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ، مِنْ أُمَّتِى عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ نَجْمٍ فِى السَّمَاءِ إِضَاءَةً، ثُمَّ هُمْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنَازِلُ، لاَ يَتَغَوَّطُونَ وَلاَ يَبُولُونَ، وَلاَ يَمْتَخِطُونَ وَلاَ يَبْزُقُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَمَجَامِرُهُمُ الأَلُوَّةُ وَرَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، أَخْلاَقُهُمْ عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى طُولِ أَبِيهِمْ آدَمَ، سِتُّونَ ذِرَاعًا»، قَالَ ابْنُ أَبِى شَيْبَةَ: عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ. وَقَالَ أَبُو كُرَيْبٍ: عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ، وَقَالَ ابْنُ أَبِى شَيْبَةَ: عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ. {الحديث: ٧٠٧٩ = ٧١٠٦ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = تجريد البخاري بالكوردي/٣ رقم:١٣١٢ = ٣٢٤٥، ٣٢٤٦، ٣٢٥٤، ٣٣٢٧. ابن ماجة. زهد: ٤٣٣٣. تحفة الأشراف: ١٢٥٢٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودو سڵاوو میهرەبانیو رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێو، سەرومالّو منالّو گیانو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دینکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: (یەکەم دەستەیێ کەدەچنە بەهەشت، لەسەر شێوەی مانگی چواردەن، ئەم یەکەم کۆمەڵە لە نەتەوەی ئیسلامی منو لە موسوڵمانانن، دەستەی دوای ئەوان وەك گەشترین ئەستێرەی ئاسمان وان، لەبەهەشتا بەهەشتیەکان دەبن بە چەندین پلەو پایەوە، کە هەندێکیان لە هەندێکیان نایابترن، خەڵکی بەهەشت نەسەراو دەکەن، نە گمێز دەکەن، نە چڵم دەسڕن، نە تفو بەڵغەم رۆدەکەنو (نە قرخننو لرخنن) شانەکانیان زێڕە، بخووریان عوودەو لە بخوورانەکانیاندا عوودی هیندی دەسووتێنن، کە خۆشترین بۆنی هەیە، ئارەقیان میسکە، رەفتارو رەوشتو شێوەیان وەك یەك جوانە، ناشیرینو بەد رەوشتیان تیادا نییە، لەسەر رەفتارو شێوەو قەڵافەتی ئادەمی باوکیانن، بالآیان شەست باڵ درێژە).

ئیمامی موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی لەدوو مامۆستای خۆیەوە دەرهێناوە، کە ئەم دوو مامۆستایانەی موسلیم: ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبەو ئەبو کورەیبن، کە لەخوێندنەوەو گێڕانەوەی دوو وشەدا، کەمێ جیاوازییان هەیە، کە ئەو جیاوازییانە کاریگەرییان لەسەر واتاو مەبەست هەیە، جا لەم روانگەیەوە ئیمامی موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

١- ئەبوبەکر، کە ناسراوە بە (ئیبنو ئەبی شەیبە) وشەی (على خلق) ئاوا خوێندوٚتەوە: (عەلا خولوقی). واتە: لەسەر رەفتارو خووی یەك پیاو، بەڵام ئەبو کورەیب هەمان وشەی ئاوا خوێندوٚتەوە (عەلا خەلقی). واتە: لەسەر شێوەو قەڵافەتی یەك پیاو.

٢- ئەبو کورەیب فەرموویەتی (عَلَى طُولِ أَبِيهِمْ آدَم) بەڵام ئیبنو ئەبو شەیبە فەرموویەتی: (عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ).

**روونکردنەوە:**

١- بەکۆی دەنگ ژنان هەم زۆرینەی خەڵکی بەهەشتن‌و هەم زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن بەڵگەی رۆشنی زۆر لەسەر ئەم بابەتە لە سوننەتدا هەیە. {بڕوانە: ژمارە: ١٩٧٠ لەدواوە}.

٢- ئیبنو سیرین، کە خەونزانێکی گەورە بووە، لەناو کوردەواری خۆماندا بەناوبانگە، ناوی موحەممەدی کوڕی شیرینە، ناسراویشە بە (ئەبوبەکری کوڕی ئەبو عەمری ئەل‌بەصری) پێشەواو ئیمامی سەردەمی خۆی بووە، لە کۆمەڵێکی زۆر، لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گێڕانەوەی هەیە، وەك ئەنەسی کوڕی مالیك‌و زەیدی کوڕی ثابیت‌و حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیب‌و ئەبو هورەیرەو دایکی باوەڕداران عائیشەو ئوم عەطی‌و کەسانی تریش، کۆمەڵێ شاگردی ناوداری بووە لە تابیعین کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، وەك: شەعبی‌و خالیدی ئەل- حەذذاو عاصمی ئەل‌ئەحوەل‌و قەتادە، لەرێگەی عیکریمەوە، فەرموودەی لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە ئیمامی بوخاری دەفەرموێ: ئیبنو

سیرین لەسەردەمی فەرمانڕەوایی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیردا چوو بۆ حەج، لەو ماوەیەدا فەرموودەی لێ وەرگرتووە.

دووساڵ لە جێنشینی عوثمان دەمێنێ، کە ئیبنو سیرین لەدایك دەبێ. هیشامی کوڕی حسان دەیفەرموو: (راستترین کەس لەسەردەمی خۆمدا کەپێی گەیشتووم، کە فەرموودەم لێ وەرگرتووە: موحەممەدی کوڕی سیرینە).

ئیبنو سیرین بەصرییە تابیعییە، جێگەی متمانەو باوەڕی فەرموودە شوناسەکانە، بەڕاستی پێشەوایەکی زاناو شارەزای ئایینو یاسا نامەی خودا بوو، زۆر بە وەرعو بە تەقوا بوو.

ئیبنو عەون دەیفەرموو: باشترین کەس بوو کە ئومێدی خێری لێ بکرێ بۆ نەتەوەی ئیسلام، لەهەمان کاتدا هەتا دەیتوانی نەفسی خۆی دەچرووساندەوە. هەروا ئیبنو عەون دەیفەرموو: لەم جیهانەدا، وەك ئەم سێ کەسە پیاوی زاناو باشم نەدیوە:

١- موحەممەدی کوڕی سیرین لە عێراق.

٢- قاسمی کوڕی موحەممەد لەحیجاز.

٣- رجائی کوڕی حەیوە لەشام، شازی ئەم سیانەیش موحەممەدی کوڕی سیرینە. کەمێ کەڕ بووە، شەرعزانێکی وەك خۆی کەم بوو، لە قەزاوەتا دەستی باڵای هەبوو.

ئیبنو حیببان دەیفەرموو: موحەممەدی کوڕی سیرین ئەورەعترینی کەسی خەڵکی بەصرە بوو، شەرعزان (فەقیە)ێکی گەورە بوو، پیاوێکی رێزداری پایە بەرزبوو، فەرموودەکانی لەبەربوو، زۆر بەجوانیو رەوانی، خەونزانێکی ناسراوە. لەتەمەنی (٧٧) حەفتاو حەوت ساڵیدا عەمری خودایکرد.

ئەم چەند هەواڵە لە (البداية والنهاية)ی ئیبنو کەثیرەوە سەبارەت بە ئیبنو سیرین راگوێز دەکەین:

١ - ئەبو عەمری باوکی ئیبنو سیرین، لە کۆیلە دیلەکانی عەینول تەمرە، خالیدی کوڕی وەلید دیلی کرد، ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك کڕیو موکاتەبەی لەگەڵ کردو ئازادبوو، کۆمەڵێ منالی لێ بوو، هەموویان لە خاسانی خودان:

أ- موحەممەد.

ب- ئەنەسی کوڕی سیرین.

ج- مەعبەد.

د- یەحیا.

هـ- حەفصە.

و- کەریمە هەرشەشیان تابیعینو هەر شەشیان ثقەو متمانە پێکراوی پیاوانی فەرموودەن.

٢ - دەستووری ئیبنو سیرین وابوو، کە لەلایا باسی خراپەی کەسێ بکرایە، ئەو بە پێچەوانەوە باسی باشەی ئەوی دەکرد.

٣ - لەوجۆرە پیاو چاکانەبوو، هەرکەسێ چاوی پێی دەکەوت خودای یاد دەکەوتەوە {إِذَا رَأَوْهُ ذَكَرُوا اللَّهَ}.

٤ - کاتێ ئیمامی ئەنەس مرد، رایسپارد کە موحەممەدی کوڕی شیرین تەرمەکەی بشوات، ئەوکاتە ئیبنو سیرین لەزیندانا بوو، خاوەن مافەکە رازی بوو کە بچێت، ئەویش شۆردی.

٥ - چەند نموونەیێ لەخەو پەرژێنەکانی ئیبنو سیرین:

أ- پیاوێ پێی گوت: لەخەوما رۆن زەیتون دەکەم بەسەر زەیتووندا؟ گوتی: ژنەکەت دایکی خۆتە، کەکابرا چووە بنجو بناوانی وابوو، بەمناڵی لەدایکی دابڕابوو، بە گەورەیی مارەی کردبوو، بەوەی نەزانی بوو.

ب- پیاوێ پێی گوت: لەخەوما ریشم زۆر درێژبوو بوو، خۆم تەماشایم دەکرد؟ فەرمووی: تۆ بانگبێژی؟ گوتی: بەڵێ. پێی فەرموو: کە دەچیتە سەربان بۆ بانگدان، تەماشای دراوسێکان مەکەو لەخودا بترسە!!

ج- پیاوێ تر پێی گوت: لەخەوما ریشم درێژ بوو بوو، بڕیمو کردم بە شاڵو لەبازاڕ فرۆشتم؟

فەرمووی: لەخودا بترسە، دیارە شایەتی درۆو ناهەق دەدەیت.

### ١٤٩٨) هەموو کەسێ کاتێ دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەمە. (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)

### بَابٌ: مَنْ يَدْخُلُ الجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَم

١٩٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ، طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، فَلَمَّا خَلَقَهُ قَالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ النَّفَرِ، وَهُمْ نَفَرٌ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ جُلُوسٌ، فَاسْتَمِعْ مَا يُجِيبُونَكَ فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ، وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ، قَالَ فَذَهَبَ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، فَقَالُوا: السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، قَالَ: فَزَادُوهُ: وَرَحْمَةُ اللَّهِ. قَالَ: فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَمَ عَلَيْهِ السَلاَمْ، وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، فَلَمْ يَزَلِ الْخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدَهُ حَتَّى الآنَ». {الحديث: ٧٠٩٢ = ٧١١٩ فم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية/٤، رقم: ١٣٣٦ = ٦٢٢٧، ٣٣٢٦. تحفة الأشراف: ١٤٧٠٢} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای باڵا دەستو خاوەن شکۆ، ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست کرد، درێژیکەی شەست باڵ بوو، جاکاتێ دروستی کرد پێی فەرموو: بچۆ بۆلای ئەو کۆمەڵە فریشتەیێ، کە ئەوەتان ئالەوێدا، دانیشتوون سڵاویان لێ بکە، گوێ بگرە کەچۆن وەڵامت دەدەنەوەو ڕۆژ باشیت لەگەڵدا دەکەن، چونکە ئەوە ڕۆژباشیی خۆتو ڕۆژ باشیی نەوەو وەچەکەت دەبێ لەناو خۆتانا هەتا هەتایە. جا ئادەم (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەی لێ بێ) تەشریفی ڕۆیشت بۆ لایانو پێی فەرموون: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ: سڵاوتان لێ بێ) فریشتەکانیش سڵاوەکەیان سەندەوەو فەرموویان: (السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللّهِ: سڵاوو ڕەحمەتی خودا لەتۆیش). فەرمووی: فریشتەکان لە وەڵامەکەیاندا وشەی (ڕەحمەتی خودا)یان بۆ ئادەم پترکرد. فەرمووی: ئیتر هەموو کەسێ کاتێ دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەمە،

بالای شەست باڵ بەرزە، شێوەی وەك شێوەی ئادەم شیرینو جوانو ڕێكو پێكە، نەك وەك شێوەی شێواوی دنیایی خۆی!

بەڵام ئیتر لەوساوە، ئەم خەڵكە بەرە بەرە هەر بچووكو كورتو ناشیرین دەبن، هەتا ئەم چركە ساتەیش هەر لەكەمیو كورتین). {ریاضی صالحین/٢، زنجیرە: ١٣١، ژمارە: ٨٤٦ — نامەی سلاوو ڕۆژ باشی + تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٦٩١ — ماورد في سورة البقرة}.

**١٤٩٩) خەڵكانێ دەچنە بەهەشت لەدڵنەرمیو سامو ترسدا، وەك مەلو باڵندەوان.** (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)

**بَابٌ: يَدْخُلُ الجَنَّةَ أَقْوَامٌ أَفْئِدَتُهُمْ مِثْلَ أَفْئِدَةِ الطَّيْرِ**

١٩٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَقْوَامٌ أَفْئِدَتُهُمْ مِثْلُ أَفْئِدَةِ الطَّيْرِ». {الحديث: ٧٠٩١ = ٧١١٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خەڵكانێ كۆمەڵ كۆمەڵ دەچنە بەهەشت، لەدڵنەرمیو سامكردندا، دەڵێی مەلو باڵندەن، ئەوەندە دڵنەرمو سامكارو ترسدارن!).

**١٥٠٠) ڕژاندنی خۆشنوودیی خودا بەسەر دانیشتوانی بەهەشتدا.** (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)

**بَابٌ: إِحْلَالُ الرِّضْوَنِ عَلَى أَهْلِ الجَنَّةِ**

١٩٦٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لاَ نَرْضَى يَا رَبِّ وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَلاَ أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، فَيَقُولُونَ: يَا رَبِّ وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي، فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا». {الحديث: ٧٠٧٠ =

٧٠٩٦ فم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية = مختصر صحيح البخاري/٥، رقم: ٢٠٣٣ = ٦٥٤٩، ٧٥١٨ فتح الباري. ترمذي. صفة الجنة: ٢٥٥٥. تحفة الأشراف: ٤١٦٢}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزاو خۆشنوودیی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر بە بەهەشتییەکان دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەی دانیشتوانی بەهەشت! ئەوانیش بەیەك دەنگ دەڵێن: بفەرموو ئەی پەروەردگارمان! هەمیشە ئێمە بەندەی کەمەر بەستەین‌و ئامادەین بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانت، سەرچاوەی گشت خێرو خۆشی‌و بەهرەیێ، وا لەهەردوو دەستی توانایی تۆدا، خودای گەورە پێیان دەفەرموێ: ئایا بەبەش‌و بارەی باشی خۆتان لەبەهەشتا رازین‌و پێی خۆشنوودن؟ دەڵێن: ئەی بۆ رازی نین، دەبێ لەم بەش‌و بارە باشە کەتۆ داوتە بەئێمە باشتر هەبێ؟ کێی تر بەش‌و بارەی واباشی پێ دراوە؟

خودا دەفەرموێ: ئەدی دەڵێن چی ئەگەر لەوەیش باشترتان پێ بدەم؟ دەڵێن: جا شتی واهەیە، دەبێ چی شتێ هەبێ کە لەمە باشتربێ؟! دەفەرموێ: خۆشنوودی‌و رەزامەندیی خۆمتان دەدەمێ‌و لێزەمەی لێرازی بوونی خۆم دادەبارێنم بەسەرتانداو، لەناو بەهەشتی ریزوانی خۆمدا جێتان دەکەمەوەو ئیتر بەهۆی ئەوەوە هەتا هەتایەو هەرگیزو قەت قەت‌و بڕای بڕای لەمڕۆ بەدواوە لێتان نارەنجێم!). {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٣٧٢، ژمارە: ١٨٩٤} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ٥٧٥٩ — خودا میهرەبانی‌و نەوازشت لەگەڵ خەڵکی بەهەشتدا دەنوێنێ‌و کاڵای رەزامەندیی خۆییان بەباڵا دەبڕێ}.

**١٥٠١) بەهەشتییەکان کە تەماشای دانیشتوانی ناو باڵەخانەکان دەکەن، کەوان لە قاتەکانی سەرەوە دەڵێی چاو بۆ ئەستێرە دەگێڕن.** (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)

**بَابُ: تَرَائِی أَهْلِ الجَنَّةِ أَهْلَ الغُرَفِ**

١٩٦١- عَنْ أَبِی سَعِیدٍ الْخُدْرِیِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّی اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَیَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّیَّ الْغَابِرَ مِنَ الأُفُقِ مِنَ

الْمَشْرِقِ أَوِ الْمَغْرِبِ، لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ، لاَ يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: «بَلَى وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ، رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ».
{الحديث: ٧٠٧٣ = ٧١٠٠ فم. تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى = الترجمة الكردية/٣، رقم: ١٣١٧ = ٣٢٥٦، ٦٥٥٦ فتح البارى. تحفة الأراف: ٤١٧٣} :

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێو سەرو مالو منالو گیانو دڵو هەستو نەسنت گشتی بەقوربانی تۆزی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ لەمەدینەی نازدارو خودا چاوی دڵو دەروونو سەرمان بەو سورمەیە رۆشن بکاتەوە).

دەفەرموێ: (بەهەشتییەکان کە تەماشای دانیشتوانی ناو باڵەخانەکان دەکەن، کەوان لەقاتە هەرە بەرزەکانی سەروویانەوە، وەها پیایاندا هەڵدەڕوانن وەك چاو بۆ ئەستێرە بگێڕن ئاوا، دەق وەك چۆن ئێوە چاو دەگێڕن بۆ ئەو ئەستێرە گەشانەی کەتەواو تەواو دوورکەوتوونەتەوەو، لەکەناری ئاسمان نزیکبوونەتەوەو لەخۆرهەڵاتەوە، یان لەخۆر ئاواوە خەریکن ئاوادەبن!

دیارە کەئەم بەرزیو نزمییەیش لەبەر جیاوازیی پلەو پایەی نێوانیانە!

یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە کە ئەوجێگە بەرزانە هەوارو بارەگای پێغەمبەرانن، پێغەمبەران نەبێ کێ دەگاتە ئەوێ؟ فەرمووی: (وانییە، بەو خودایە کەهەر خۆی خودای بەهەقو راستو دروستە، کە گیانی هەموومان وا لەدەستی توانایی ئەودا، زۆر کەسانی تریش هەن، جگە لە پێغەمبەران، کە دەگەنە ئەو پلەو پایە بەرزانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر نەبوون، بەڵام لە گەلانی ئەوان بوون، باوەڕی ساخیان بەخودا هەبووەو، هەروا بەدەمو بەدڵو بە کردەوەی باش باوەڕیان بە پێغەمبەر هەبووە!) . {تاج/٥، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ٥٧٢٤ — هۆدەو مالی بەهەشتییەکان} + {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٣٧٢، ژمارە: ١٨٩٠ — ئەو خۆشیو بەهرانەی کەخودا لە بەهەشتا ئامادەی کردوون بۆ بڕواداران} .

## ١٥٠٢) خۆراكی بەهەشتییەكان لە بەهەشتا. (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)

## باب: أكْلُ أهْلِ الجنَّةِ فيهَا

١٩٦٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «يَأْكُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ، وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ، وَلاَ يَمْتَخِطُونَ، وَلاَ يَبُولُونَ، وَلَكِنْ طَعَامُهُمْ ذَاكَ جُشَاءٌ كَرَشْحِ الْمِسْكِ يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالْحَمْدَ كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَسَ». {الحديث: ٧٠٨٣ = ٧١١١٠ فم}:

**جابیری كوڕی عەبدوڵلا** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خەڵكی بەهەشت لە بەهەشتا شت دەخۆنو شت دەخۆنەوە، بەڵام نەپیسایی دەكەنو نەچڵمو كڵمیان هەیەو، نەگمێز دەكەنو نە سەراو دەكەن، ئەو خواردنەوەی كە دەیخۆنەوە، وەك ئاورنگی مسك دەبێ بە ئارەقو لەشیان نم نم دەری دەدات، ئەو خواردەمەنیەشی كە دەیخۆن بە قرقێنەی بۆنخۆشی وەك گوڵاو دەڕوات، وەك چۆن لەبەهەشتا بە ئاسایی‌و بە ئاسانی‌و بەخۆشی، بەبێ ئەركو زەحمەت هەناسە دەدەن، ئاوەهاش لەخوداوە یادو زیكری خودا دەكەن، بەتایبەتی یادی (سُبْحَانَ اللّهِ)و (الحمد للّهِ). {ریاضی صالحین/٤، زنجیرە: ٣٧٢، ژمارە: ١٨٨٠}.

## ١٥٠٣) دیاری دانیشتوانی بەهەشت. (٧١٤ - ٧١٥)

## باب: تُحْفَةُ أهْلِ الجنَّة

١٩٦٣- عَنْ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: كُنْتُ قَائِمًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَجَاءَ حَبْرٌ مِنْ أَحْبَارِ الْيَهُودِ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا مُحَمَّدُ، فَدَفَعْتُهُ دَفْعَةً كَادَ يُصْرَعُ مِنْهَا، فَقَالَ: لِمَ تَدْفَعُنِي؟ فَقُلْتُ: أَلاَ تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: إِنَّمَا نَدْعُوهُ بِاسْمِهِ الَّذِي سَمَّاهُ بِهِ أَهْلُهُ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ اسْمِي مُحَمَّدٌ الَّذِي سَمَّانِي بِهِ أَهْلِي»، فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: جِئْتُ أَسْأَلُكَ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «أَيَنْفَعُكَ شَيْءٌ إِنْ حَدَّثْتُكَ؟». قَالَ: أَسْمَعُ بِأُذُنَيَّ، فَنَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِعُودٍ مَعَهُ، فَقَالَ: «سَلْ»، فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: أَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَمَ): «هُمْ فِى الظُّلْمَةِ، دُونَ الْجِسْرِ». قَالَ: فَمَنْ أَوَّلُ النَّاسِ إِجَازَةً؟ فَقَالَ: «فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ»، قَالَ الْيَهُودِيُّ: فَمَا تُحْفَتُهُمْ حِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: «زِيَادَةُ كَبِدِ النُّونِ» قَالَ: فَمَا غِذَاؤُهُمْ عَلَى إِثْرِهَا؟ قَالَ: «يُنْحَرُ لَهُمْ ثَوْرُ الْجَنَّةِ الَّذِى كَانَ يَأْكُلُ مِنْ أَطْرَافِهَا». قَالَ: فَمَا شَرَابُهُمْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: «مِنْ عَيْنٍ فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلاً». قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: وَجِئْتُ أَسْأَلُكَ عَنْ شَىْءٍ لاَ يَعْلَمُهُ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ إِلاَّ نَبِىٌّ أَوْ رَجُلٌ أَوْ رَجُلاَنِ، قَالَ: «يَنْفَعُكَ إِنْ حَدَّثْتُكَ؟». قَالَ: أَسْمَعُ بِأُذُنَىَّ! قَالَ: جِئْتُ أَسْأَلُكَ عَنِ الْوَلَدِ، قَالَ: «مَاءُ الرَّجُلِ أَبْيَضُ وَمَاءُ الْمَرْأَةِ أَصْفَرُ، فَإِذَا اجْتَمَعَا فَعَلاَ مَنِىُّ الرَّجُلِ مَنِىَّ الْمَرْأَةِ أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللَّهِ، وَإِذَا عَلاَ مَنِىُّ الْمَرْأَةِ مَنِىَّ الرَّجُلِ آنَثَا بِإِذْنِ اللَّهِ». قَالَ الْيَهُودِيُّ: لَقَدْ صَدَقْتَ، وَإِنَّكَ لَنَبِىٌّ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَذَهَبَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لَقَدْ سَأَلَنِى هَذَا عَنِ الَّذِى سَأَلَنِى عَنْهُ وَمَا لِى عِلْمٌ بِشَىْءٍ مِنْهُ حَتَّى أَتَانِىَ اللَّهُ بِهِ». {الحديث: ٧١٤ = ٧٢٧ فم}:

**ثەوبان** (رەزای خوادای لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا،** (دروودی خودای لەسەر بێ) **راوەستابووم، مالوومێکی جوولەکە هات گوتی: سلاو لەتۆ ئەی موحەممەد!: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا محمد. منیش پالێکی توندم پێوەنا خەریك بوو پێی بکەوێ، گوتی: بۆچی پالم پێوە دەنێی؟! گوتم: ئەی بۆچی نالێیت ئەی پێغەمبەری خودا!. گوتی: بەو ناوەوە بانگی دەکەین کە کەسوکاری لێی ناوە!**

**حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (بەلێ من ناوم موحەممەدەو کەسوکارم بەو ناوە منیان ناو ناوە). مالوومەکە گوتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم.**

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەگەر قسەی هەقت بۆ بکەم موسولمان دەبیت؟). گوتی: بەگوێی خۆم دەبیستم. حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دارێکی بەدەستەوە بوو، دەیژەند لە زەوییەکەوە فەرمووی: (ئادەی پرسیارت چییە بیپرسە). گوتی: ئەو رۆژەی کە ئەم زەویو ئاسمانە دەگۆڕێن بەزەویو بە ئاسمانێکی تر، ئەم خەلکە لەکوێ دەبن؟**

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (لەسەر پردی سیرات دەبن). گوتی: ئەی کێ یەکەم کەس دەبێ کەلێی دەپەڕێتەوە؟ فەرمووی: (هەژارانی کۆچکاران ئەو**

هەژارانەی کە لەمەککەوە لەتاو کافرەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینـە). گوتی: کاتێ دەچنە بەهەشت یەکەم خواردنیان چییە؟ فەرمووی: (پارچە زیادە گۆشتەکەی جەرگی نەهەنگەکە).

گوتی: ئەی گەرماو گەرم لەدوای ئەو چی تر دەخۆن؟ فەرمووی: (جوانە گاکەی بەهەشتیان بۆ سەردەبڕن، کە لەدەوروبەری بەهەشتا بۆ خۆی دەلەوەڕێ!).

گوتی: راست دەکەی! هاتوویشم شتێکی ترت لێ دەپرسم کە کەس نایزانێ بێجگە لە پێغەمبەران، مەگەر پیاوێ، یان دوانی تریش بیزانن، فەرمووی: (ئەگەر من پێت بڵێم و بیزانم تۆ ئیسلام دەبیو، لە ئیسلام بوونت قازانج بەخۆت دەگەیەنی؟).

گوتی: جارێ باگوێم لە قسەکانت بێ. مالوومەکە گوتی: هاتووم لەبارەی کورپەلەو منداڵەوە لێت دەپرسم؟

فەرمووی: (ئاوی پیاو سپییە، ئاوی ژن زەردە، کە لەگەڵ یەکا دروستبوون و ئاوی پیاو سەر ئاوی ژن کەوت، بە فەرمانی خودا، نێرینەیان دەبێ، بەلام ئەگەر ئاوی ژن سەر ئاوی پیاو کەوت، ئیتر بە فەرمانی خودا مێینەیان دەبێ).

مالوومەکە وتی: راستت فەرموو! بەڕاستی تۆ هەق پێغەمبەریت).

ئەوجا گەڕایەوە ڕۆیشت. پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ مالوومەکە ئەم پرسیارانەی لێ دەکردم، تا ئەو چرکە ساتە، ئاگام لە وەلامی هیچ لەم پرسیارانە نەبوو، بەلام خودا بە سرووش یەك بەیەك وەلامەکانی نارد بۆم).

{بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٦٩٦، لاپەڕە: ٨٢ + تاج/١، لاپەڕە: ١٣٨، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٦٣}.

### ١٥٠٤) نازو بەهرەی بەهەشت بۆ دانیشتوانی بەهەشت هەمیشەیین.

### (٧٠٦١ - ٧٠٩٢) بَابٌ: فِي دَوَامِ نَعِيمِ أَهْلِ الْجَنَّةِ

١٩٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ لاَ يَبْأَسُ، لاَ تَبْلَى ثِيَابُهُ، وَلاَ يَفْنَى شَبَابُهُ». {الحديث: ٧٠٨٥ = ٧١١٢ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی بچێتە بەهەشت دەکەوێ بەسەر خێرو خۆشیداو، دەکەوێتە ناو نازو بەهرەوە، ئیتر هەتا هەتایە رەنجو ناخۆشیو نارەحەتی نابینێ، جلو بەرگی نە دەدرێو نە کۆن دەبێ، چونکە هەمیشە جلی نوێ لەبەر دەکەن، هەمیشەیش گەنجو جەهێڵو لاو دەبن قەت قەت پیر نابن!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ٥٧٥٤ – دانیشتوانی بەهەشت لەبەهەشتا...}.

**١٥٠٥) لە بەهەشتا درەختێ هەیە، سوار سەد ساڵ بە سێبەرەکەیدا دەڕوات ناگاتە ئەوپەڕی. (٧٠٦٩ - ٧٠٩٤)**

**بابٌ: فِي الجَنَّةِ شَجَرةٌ يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لا يَقْطَعُهَا**

١٩٦٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ فِى الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِى ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا». قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَحَدَّثْتُ بِهِ النُّعْمَانَ بْنَ أَبِى عَيَّاشٍ الزُّرَقِىَّ فَقَالَ: حَدَّثَنِى أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِىُّ عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ فِى الْجَنَّةِ شَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ الْجَوَادَ الْمُضَمَّرَ السَّرِيعَ مِائَةَ عَامٍ مَا يَقْطَعُهَا». {الحديث: ٧٠٦٩ = ٧٠٩٤ فم. تجريد البخاری بالكوردی/٣، رقم: ١٣١٥ = ٣٢٥١ = ١٣١٦ = ٣٢٥٢ فتح الباری}:

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (درەختێ هەیە لە بەهەشتدا، سواری ئەسپی خێرا، سەد ساڵ بەغار بەبن سێبەری لقەکانیدا دەڕوات ناگاتە ئەو پەڕی!).

ئەبو حازم کە تابعییەو فەقێی سەهلەو ئەم فەرموودەیەی لە سەهل وەرگرتووە فەرمووی: ئەم فەرموودەیەی سەهلم گێڕایەوە بۆ نوعمانی کوڕی ئەبو عەییاش ئەل – زورەقی فەرمووی: من لە ئەبو سەعیدی خودریم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (درەختێ لە بەهەشتا هەیە، سواری ئەسپی خێرای چابوکی زۆر چاك، کە مەشق دیدەو ئامادەکرابێ بۆ قۆچو تەراتێن، سەد ساڵ بەغار بەبن لقەکانیدا دەڕوا هێشتا ناگاتە ئەوپەڕی!). {تاج/٥،

زنجیره: ١٣٧، ژماره: ٥٧٢٢ — باسی دارو درەختو میوەی بەهەشت}. {ریاض/٤، زنجیره: ٣٧٢، ژماره: ١٨٨٦ — ئەو خۆشیو بەهرانەی کەخودا لەبەهەشتا ئامادەی...}.

## ١٥٠٦) باسی چۆنێتی خێوەتگاکانی بەهەشت. (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)

## بَابٌ: فِي صِفَةِ خِيَامِ الجَنَّةِ

١٩٦٦- عَنْ أَبِي موسى أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِنَّ فِى الْجَنَّةِ خَيْمَةٌ مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ عَرْضُهَا سِتُّونَ مِيلاً، فِى كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ، مَا يَرَوْنَ الآخَرِينَ يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُ»؟ {الحديث: ٧٠٨٨ = ٧١٩٦ فم. تجريد البخاری بالكوردی/٤، رقم: ١٧٠٣ = ٤٨٧٩، ٣٢٤٣، ٤٨٨٠، ٤٨٧٨. ترمذی. صفة الجنة: ٢٥٢٨ تعليقاً. تحفة الأراف: ٩١٣٦}:

عەبدوڵلای کوڕی قەیس (کە ناسراوە بە ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە بەهەشتا چادری واهەیە برێتییە لەیەك دەنك مرواری هلۆڵ، پانییەکەی شەست میلە، لەهەموو گۆشەیێ لە گۆشەکانی ئەو چادرەدا، خێزانێکی خاوەنی ئەو چادرەی تیادایە، کە هەمیشە چاویان بڕیوەتە هاوسەرەکەی خۆیانو دڵیان لەلای کەسی تر نییە، وە خێزانی ناو هیچ گۆشەیێ، چاویان لەو خێزانانەی تر نییە کەوان لەناو گۆشەکانی تری ئەم چادرەدا، ئیتر پیاوی موسوڵمان بە ئارەزووی دڵی خۆی، گۆشە بەگۆشە، دەسوورێتەوە بەسەر ئەو خێزانانەی خۆیدا. (وەك خودا لە قورئاندا دەفەرموێ: {حُورٌ مَّقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ — ٥٥/٧٢}.

واتە: لە بەهەشتدا پەری ناسكو نازداری، خۆشڕوو خۆش ڕەفتاری تیایە، وان لەناو دەوارو ڕەشماڵو چادرو خەیمەگادا، هۆگری مێردی خۆیانن‌و چاویان بەس لەمێردی خۆیانە). {تاج/٤، زنجیره: ٣٨، ژماره: ٤١٤٥ — سوورەتی رەحمان + تاج/٥، زنجیره: ١٣٩، ژماره: ٥٧٢٧ — خێوەتگاکانی بەهەشت}.

## ١٥٠٧) بازاڕەکەی بەهەشت. (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)
## باب: فِي سُوقِ الجَنَّة

١٩٦٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ فِى الْجَنَّةِ لَسُوقًا يَأْتُونَهَا كُلَّ جُمُعَةٍ، فَتَهُبُّ رِيحُ الشَّمَالِ فَتَحْثُو فِى وُجُوهِهِمْ وَثِيَابِهِمْ، فَيَزْدَادُونَ حُسْنًا وَجَمَالاً، فَيَرْجِعُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ وَقَدِ ازْدَادُوا حُسْنًا وَجَمَالاً، فَيَقُولُ لَهُمْ أَهْلُوهُمْ: وَاللَّهِ لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْنًا وَجَمَالاً، فَيَقُولُونَ: وَأَنْتُمْ وَاللَّهِ، لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْنًا وَجَمَالاً». {الحديث: ٧٠٧٥ = ٧١٠٢ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (دروودو سڵاوو ڕەحمەتو بەرەکەتو پیرۆزیی خودای گەورەو سەروەریی لەسەر بێو، سەرو ماڵو مناڵو باوكو دایكو کەسوکار، گشتی بە قوربانی خاکی بەر ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ – ئامین – ٢٠١٠/١٠/١٠ز) فەرمووی: (لەبەهەشتا بازاڕێ هەیە، دەبێ بەسەیرانگای خەڵکەکەی، هەموو ڕۆژی هەینییەك بەهەشتییەکان بۆ گەشتو گوزار دەچن بۆ ئەوێ، جابای شەماڵ هەڵدەکا، دەموچاوو جلو بەرگەکانیان گوڵاو پەرژێن دەکا، ئیتر ئەوەندەی تر جوانترو نازدار تر دەبن، جا لەسەر ئەم حاڵە تازەیە کە دەچنەوە بۆ ماڵەوەیان، خێزانەکانیان پێیان دەفەرموون: بەخودا لەم ماوەیەدا کەچوونەتە دەرەوە، ئەوەندەی تر شەوقو ڕەونەقتان هەڵهێناوە!

ئەوانیش وەڵامیان دەدەنەوە: بەخودا ئێوەیش هەروەها نازدارترو جوانتربوون!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٤٠، ژمارە: ٥٧٢٨ – بازاڕەکانی بەهەشت = أسواق الجنه}. {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٢، ژمارە: ١٨٨٩}.

## ١٥٠٨) ئەو ڕووبارانەی جیهان کە سەرچاوەکەیان لە بەهەشتەوەیە. (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)
## باب: مافى الدنيا من أنهار الجَنَّة

١٩٦٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سَيْحَانُ وَجَيْحَانُ وَالْفُرَاتُ وَالنِّيلُ كُلٌّ مِنْ أَنْهَارِ الْجَنَّةِ». {الحديث: ٧٠٩٠ = ٧١١٧ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (سەیحان‌و، جەیحان‌و، فورات‌و، نیل، هەموویان هەرچواریان سەرچاوەکانیان لە بەهەشتەوەن!). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٣٧، ژمارە: ٥٧١٨ — سەرچاوەو ڕووبارەکانی بەهەشت}.

**ڕوونکردنەوە:**

دەربارەی ئەم ڕوبارانە، کە لەڕووباری بەهەشت بن، چەند ڕایەکی بەهێز هەیە، بەهێزترینیان یەکەمیانە کە دەفەرموێ:

١ لە بنەڕەتدا سەرچاوەی ئەم ڕوبارانە، لەبەهەشت هەڵگیراون ئەمەیش وەك ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: {وَأَنْزَلْنَا الحَدِيدَ}.

٢ - وەك ئاوی بەهەشت شیرین‌و خۆش‌و سازگارن.

٣ - چوار ڕوبارە گەورەکانی بەهەشت، کە بنەوان‌و سەرچاوەن بۆ هەموو جۆگەو چەم‌و ڕوبارەکانی تری بەهەشت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەناوی ئەم چوار ڕووبارەی جیهانەوە ناوی بردوون، لەسەر ڕووی پێشوبهاندن‌و لێکچوون، چونکە لەلای عەرەب ئەم چوار ڕووبارە بە سازگار ناسراون‌و بەس.

٤ - هەواڵدانە لە پیرۆزیی ئەم چوار ڕووبارە، کە ئەوەندە پیرۆزن، ئەوگەلانەی لەسەرئەم ڕوبارانەن موسوڵمان دەبن‌و دەبن بە بەهەشتی. ئاوەکانیان ئەوەندە پیرۆزو مووفەڕکن، هەر جەستەیێ بەم ئاوانە پەروەردە ببێ، ئەنجامی بەهەشتە.

بە بۆچوونی بەندەی هەژار، ئەم چوار ڕایە، هەریەکی لە ڕوویەکەوە جوان‌و پەسەندن‌و فەرموودەکە ئەم چوار مەبەستە دەگرێتەوە!

### ١٥٠٩) بەهەشت بە نارەحەتی دەورە دراوە. (٧٠٦١ - ٧٠٩٢)

### بابٌ: حُفَّتِ الجَنَّةُ بالمَكَارِه

١٩٦٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ». {الحديث: ٧٠٦١ = ٧٠٨٦ فم. تجريد البخاری بالكوردی/٥، رقم: ٢٠١٧ = ٦٤٨٧ فتح الباری}:

ئــەبو هــورەیرە (ڕەزای خــودای لێ بــێ) دەفــەرموێ: خۆشەویســت (دروودی خــودای لەســەر بــێ) دەفەرموێ: (بەهەشت بەناخۆشیو ناڕەحەتی دەورەگیراوە، دۆزەخیش بە هـەوەسو ئـارەزوو بـازی دەورە دراوە!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ١١، ژمـارە: ١٠١ — باسـی تێکۆشانو لێبڕان بۆ خودا + تاج/٥، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٥١٨٦ — ترسی خودای گەورەو پیرۆز}.

**ڕوونکردنەوە:**

واتــە: بــەجێهێنانی ئارەزووەکـانی دەروون، وەك ئــەوە وایــە پــەردەو پــەرژینی دەوری دۆزەخ بەدەستی خۆت بدڕێنیتو لابدەیت، ئەوجا بەپێی خۆت بچیتە ناوی، هــەروەها بــەجێهێنانی ئەرکــە ئایینییــەکانیش، کــە بــەجێهێنانیان زۆر نــاخۆشو قورسو گرانــە، لەســەر شانی نــەفسو دەروون، وەك ئــەوە وایــە: پــەردەو پــەرژینی دەوری بەهەشت بەدەستی خۆت لادەیــتو، ئــەوجا بەهاسانی خۆت بکــەیت بــەناو بەهەشتدا).

### ١٥١٠) ژنان کەمترین دانیشتوانی بەهەشتن. (٦٨٧٢ - ٦٨٨٣)
### بَابٌ: أَقَلَّ سَاكِنِي الْجَنَّةِ النِّسَاءُ

١٩٧٠- عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ قَالَ: كَانَ لِمُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ امْرَأَتَانِ، فَجَاءَ مِنْ عِنْدِ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتِ الأُخْرَى: جِئْتَ مِنْ عِنْدِ فُلاَنَةَ؟ فَقَالَ: جِئْتُ مِنْ عِنْدِ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ فَحَدَّثَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ أَقَلَّ سَاكِنِي الْجَنَّةِ النِّسَاءُ». {الحديث: ٦٨٧٣ = ٦٨٩٧ فم}:

ئــەبو تــەیياح فــەرمووی: مــوطریفی کــوڕی عەبــدوڵلا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) دوو ژنــی هەبوو، لەلای ژنێکیانــەوە ڕۆیشــت بــۆلای ژنەکــەی تــری، ژنەکــەی تــری بەتەوســەوە پێی گوت: دیارە لەلای ژنەکەی ترتەوە هاتوویت بۆ لای من!!

موطریفیش پێی فەرموو: نەکەی گومانی بەد بەمن، یا بــە هەوێکــەت بــەریت، نەبادا تووشی غەیبەتو پاشملە گۆیی ببیتو ببێ بەهۆی چوونە دۆزەخت، چونکە

من لەلای عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هاتم، فەرمووی پێمان: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێمان: (ژنان بەژمارە کەمترین دانیشتوانی بەهەشتن).

**ڕوونکردنەوە:**

١- بڕوانە: ژمارە: (١٩٥٦) و (١٩٥٧).

٢- بەدیمەن ئەم فەرموودەی ژمارە: (١٩٧٠ یە، نارێکەو بە پێچەوانەی ژمارە: (١٩٥٦) و (١٩٥٧) کە لەپێشەوە لەم پەڕاوەدا رابوردن. نەوەوی لە ژمارە: (١٩٥٦ = ٧٠٧٦)دا، لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا، لە قازی راگوێز دەکا، دەفەرموێ: (بە پێی کۆی ئەم فەرمایشتانە، ژمارەی ژنان زۆرینەی نەوەی ئادەمن‌و زۆرینەی دانیشتوانی بەهەشتن‌و زۆرینەی دانیشتوانی دۆزەخن...).

بەزەینم ئەم فەرموودەیەی ئێرە بۆ بەرابەر کردنی ژمارەی پیاوان لەگەڵ ژناندا نییە، بەڵکوو مەبەسمت ئەوەیە: کە زۆرینەی ژنان لەناو خۆیانا دۆزەخین‌و کەمینەیان بەهەشتییە، بەوێنە: لەسەددا پەنجاو دووی ژنان دۆزەخین‌و لەسەددا چل‌و هەشتیان بەهەشتین، ئەمە ژنان لەناو خۆیانا ئاوان، بەڵام ئەگەر ژمارەیان لەگەڵ ژمارەی پیاواندا، رەچاوبکرێ‌و بەرابەر بکرێ، ئەوا ژنان هەم لەبەهەشتا، هەم لە دۆزەخدا زۆرینەن!

## ١٥١١) نیشانەی بەهەشتی، یا دۆزەخی لە جیهاندا. (٧٠٩٣ - ٧١٢٥)

## بَابٌ: فِي أَهْلِ الجَنَّةِ وَأَهْلِ النَّارِ وَعَلاَمَاتِهِمْ فِي الدُّنْيَا

١٩٧١- عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ؟». قَالُوا: بَلَى، قَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعَّفٍ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ»، ثُمَّ قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ»؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «كُلُّ عُتُلٍ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ». {الحديث: ٧١١٨ = ٧١٤٣ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٤، رقم: ١٧١٠ = ٤٩١٨، ٦٠٧١، ٦٦٥٧. ترمذى. صفة جهنم: ٢٦٠٥. ابن ماجة: زهد: ٤١١٦. تحفة الأشراف: ٣٢٨٥}:

**حاریثەی کوڕی وەهب** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەدی با هەواڵتان پێ بدەمو نیشانەی مرۆڤی خودا پێداوی بەهەشتیتان پێ نیشان بدەم؟). یاران** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرموویان: ئادەی بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا!.**

**فەرمووی** (درودی خودای لەسەر بێ): **(هەموو موسوڵمانێکی لازەبوونی بێ نموودی، بێ فیزی، خۆ بەکەم زانی بێ ناز بەهەشتییە، ئەو جۆرە کەسانە هەرچەند خەڵك بەبێ نموود سەیریان دەکەن، بەڵام لەلای خودای گەورە ئەوەندە بەقەدرو بەڕێزن، هەموو دووعاو نزایەکیان گیرایە، ئەگەر یەکێ لەوانە سوێند بخوات لەسەر شتێ بەپشتی کەرەمو بەخششی خودا، خودا دڵی ناشکێنێو سوێندەکەی بۆ دەباتە سەرو کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکات!).**

**ئەوجا خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەدی با پێشتان بڵێم کەکێ دۆزەخییەو نیشانەی خەڵکی دۆزەخ چییەو چۆنە؟). یاران** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرموویان: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا!**

**فەرمووی** (درودی خودای لەسەر بێ): **(هەموو ئادەمیزادێکی چارە قورسی، ڕەزا قورسی، مچو مۆڕی، مرقنی گۆشتنی فیزنی، بەدەعیەو دەماری زۆرخۆر دۆزەخییە!).**
**{تاج/٤، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٤١٨٣ — سوورەتی نوون}.**

**١٩٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «رُبَّ أَشْعَثَ مَدْفُوعٍ بِالأَبْوَابِ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ». {الحديث: ٧١١٩ = ٧١٤٦ فم}:**

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (زۆر کەسی شڕۆڵەی پەڕپووتی، قژو سەر ئالۆسکاوی، لەشو جلو بەرگ خۆڵاویو تۆزاوی، کەلەبەر بێ نموودیو هەژارۆکەیی لەم دەرگاو دەرگا دەستی پێوە دەنێن، زۆر کەس هەیە لەم حاڵەو لەم ڕەنگە، لەناو خەڵکا وا بێ نموودو بێ بایەخە، بەڵام لەلای خودا ئەوەندە ناسكو نازدارو بەقەدرو بەڕێزە، داوای هەرچی لێ بکا دەست**

نانێ بەروویەوەو داوای جێبەجێ دەکا). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٢٥٧}.

١٩٧٣- عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ الْمُجَاشِعِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ ذَاتَ يَوْمٍ فِى خُطْبَتِهِ: «أَلاَ إِنَّ رَبِّى أَمَرَنِى أَنْ أُعَلِّمَكُمْ مَا جَهِلْتُمْ مِمَّا عَلَّمَنِى يَوْمِى هَذَا: كُلُّ مَالٍ نَحَلْتُهُ عَبْدًا حَلاَلٌ، وَإِنِّى خَلَقْتُ عِبَادِى حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ، وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ، وَأَمَرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِى مَا لَمْ أُنْزِلْ بِهِ سُلْطَانًا، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ فَمَقَتَهُمْ، عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ، إِلاَّ بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، وَقَالَ: إِنَّمَا بَعَثْتُكَ لأَبْتَلِيَكَ وَأَبْتَلِىَ بِكَ، وَأَنْزَلْتُ عَلَيْكَ كِتَابًا لاَ يَغْسِلُهُ الْمَاءُ، تَقْرَؤُهُ نَائِمًا وَيَقْظَانَ، وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِى أَنْ أُحَرِّقَ قُرَيْشًا، فَقُلْتُ: رَبِّ إِذًا يَثْلَغُوا رَأْسِى فَيَدَعُوهُ خُبْزَةً، فَقَالَ: اسْتَخْرِجْهُمْ كَمَا اسْتَخْرَجُوكَ وَاغْزُهُمْ نُغْزِكَ، وَأَنْفِقْ فَسَنُنْفِقَ عَلَيْكَ، وَابْعَثْ جَيْشًا نَبْعَثْ خَمْسَةً مِثْلَهُ، وَقَاتِلْ بِمَنْ أَطَاعَكَ مَنْ عَصَاكَ. قَالَ: وَأَهْلُ الْجَنَّةِ ثَلاَثَةٌ: ذُو سُلْطَانٍ مُقْسِطٌ، مُتَصَدِّقٌ مُوَفَّقٌ، وَرَجُلٌ رَحِيمٌ، رَقِيقُ الْقَلْبِ لِكُلِّ ذِى قُرْبَى وَمُسْلِمٍ، وَعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ ذُو عِيَالٍ، قَالَ: وَأَهْلُ النَّارِ خَمْسَةٌ: الضَّعِيفُ الَّذِى لاَ زَبْرَ لَهُ، الَّذِينَ هُمْ فِيكُمْ تَبَعًا، لاَ يَتْبَعُونَ أَهْلاً وَلاَ مَالاً، وَالْخَائِنُ الَّذِى لاَ يَخْفَى لَهُ طَمَعٌ وَإِنْ دَقَّ إِلاَّ خَانَهُ، وَرَجُلٌ لاَ يُصْبِحُ وَلاَ يُمْسِى إِلاَّ وَهُوَ يُخَادِعُكَ عَنْ أَهْلِكَ وَمَالِكَ». وَذَكَرَ الْبُخْلَ أَوِ الْكَذِبَ، «وَالشِّنْظِيرُ الْفَحَّاشُ». {الحديث: ٧١٣٦ = ٧١٦٣ فم}:

عیياضی کوڕی حیماری موجاشیعی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وتاردا فەرمووی: (بزانن کەخودا فەرمانی پێم کردووە، کە لەم زانستەی خودا کە ئەمڕۆ فێری خۆمی کردووەو ئێوە نایزانن، لەو زانستەتان فێربکەم، خودا دەفەرموێ: هەر ماڵێ خۆم بیدەم بە بەندەیێ لە ڕێگەیەکی ڕەواوە، ئەو ماڵە پاکەو حەڵاڵە، وەمن لە بنەڕەتدا بە سروشت بەندەکانی خۆمم لەسەر پاکیو هەق وەرگرتن دروست کردووە، گشتیان بە سروشت ئامادەن بۆ وەرگرتنی هەق، بەڵام لەپاشان شەیتانەکان گرپیان دەدەنو لە ئایین وەریان دەگێڕنو ئەوەی من حەڵاڵم کردووە بۆیان ئەوان لێیان حەرام دەکەن، وەپێشیان دەڵێن کە

بەساختەو ساختەکاری هاوبەشی درۆ بۆ من دابنێن‌و ئەوانیش بە گوێیان دەکەن) وە لەو وتارەدا فەرمووی: (لەپێش رەوانەکردنی مندا، بۆ سەر بەرەی ئادەمیزادو جندۆکە، خودای گەورە سەرنجێکی دانیشتوانی سەر رووی زەوی دەدا، لە عەرەب‌و ناعەرەب (عەجەم)یان دەڕەنجێ‌و لە رەفتاری ناهەمواریان بێزار دەبێ، تەنیا لەچەند دەستەیێ نەبێ، لە خاوەن نامەکان، کە لەسەر هەق مابوون، وە خودای گەورە بەمنی فەرموو: بۆیە من تۆم کردووە بە پێغەمبەرو رەوانەم کردووی بۆسەر خەڵکان، هەتا خۆت تاقی بکەمەوەو خەڵکیش بەهۆی تۆوە تاقی بکەمەوە، نامەیەکیشم بۆت ناردووە ئاو نایشۆرێتەوە، چونکە لە سینگی موسوڵماناندایەو هەموو کاتێ لەبەر دەیخوێنن‌و دەیخوێننەوە، تۆ خۆتیش چ بە خەبەربی‌و چ خەوتووبی دەوری دەکەیتەوە، وە خودا فەرمانی پێم کردووە کە قوڕەیش بەنووری ئەم قورئانە بسووتێنم، وەك برووسکە وابێ، لە گوێیاندا، گوتم: ئەی خودایە! ئەی پەروەردگاری من! ئاخر سەرم وەك کولێرەی شکاو دەشکێنن، من کەم‌و ئەوان زۆر، مەگەر خۆت فریام بکەوی، فەرمووی: چۆن ئەوان تۆیان دەرکرد تۆیش ئاوا ئەوان دەربکە، وە بچۆرە سەریان بۆ جەنگ، ئێمە تۆ سەردەخەین بەسەریاندا، وە ماڵ‌و دارایی بەخت بکە، ماڵ‌و داراییت دەدەینێ، وە تۆیەك سوپا بنێرە، ئێمە خۆمان پێنج سوپای تر لە هێزی ئاسمانی دەنێرین، بۆ یاریدەیان. بیکە بە دەستوور بە لەشکری ئیسلام شەڕبکە بەوانەی کە بەگوێت دەکەن، لەگەڵ ئەوانەدا کە بەگوێت ناکەن‌و لەفەرمانت دەردەچن).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دانیشتوانی بەهەشت یەکێکن لەم سێ جۆرە کەسەو لەم سێ تاقمانە بەدەرنین:

١ - یا کاربەدەست‌و کارمەندی دادپەروەری خێرکەری بەخشندەی خاوەن تەوفیقەو لەخوداوە سەرکەوتووە.

٢ - یا مرۆڤی بەرەحمی بە بەزەیی دڵنەرمە، کە لەگەڵ هەموو خزم‌و خوێش‌و موسوڵمانێکا، دڵنەرم‌و بەرەحم‌و بە بەزەییە.

٣ - یا هەژاری دەس‌و دەم‌و دڵ‌و داوێن پاكی خاوەن خێزانە كە بۆخۆی ڕەنج دەداو بەڕەنجی شانی خۆی بەبێ سكاڵا، خێزانی خۆی بەخێو دەكاو، چاوی لەدەستی خلەو بلەو خەڵكەوە نییە).

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (خەڵكی دۆزەخیش لەم پێنج تاقمانە بەدەرنین:

١ - گرۆی ئەو گێل‌و گەلحۆو بێ فەڕانەی كە خۆیان بە ئێوەدا هەڵ دەواسن‌و ماڵ‌و حاڵێكیان بۆ خۆیان نییەو خەمی ماڵ‌و مناڵ ناخۆن‌و نەبۆ دین‌و نەبۆ دنیا هەوڵ نادەن‌و بەكەڵك نایەن.

٢ - گرۆی دووەم: ئەو ناپاكە گزیكارە نەوسن‌و چڵێس‌و ماڵپەرستانەن، كە لەهەرلا گوێچكەی تەماعیان بۆ دەربكەوێ خۆیانی بۆ دەكوتن‌و كلكە لەقێی بۆ دەكەن!

٣ - گرۆی سێیەم: ئەو پیاوە فێڵاوییانەن، كە شەوو ڕۆژ بە دەورتانا دێن‌و بۆ هەل دەگەڕێن، كە فێڵ‌و گزی‌و ناپاكی لە خۆت‌و ماڵ‌و مناڵ‌و نامووست بكەن!).

٤ - حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی گرۆیەكی تریشی كرد كە دۆزەخین: یا باسی گرۆی ڕەزیلی‌و ڕژدی كرد، یاباسی گرۆی درۆی كرد، كەئەوانیش دۆزەخین.

٥ - فەرمووی: (گرۆیەكی تریشیان مرۆی سەرسەری بەد گۆی بەد كرداری بەد ڕەفتارە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٤٩١٩}.

**ڕوونكردنەوە:**

عییاضی كوڕی حیماری ئەل‌موجاشعیی دۆستێكی دێرینی پێغەمبەر بووە، لە بەصرە نیشتەجێ بوو، كۆمەڵێ فەرموودە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، كە یەكێكیان ئەم فەرموودەیەی ئێرەیە، لە ئەفرادی صەحیحی موسلیمە، لەسەر فەرمایشتی إصابەی شێخی عەسقلانی، واتە: لە بوخاریدا فەرموودەی نییە، لەپێش ئیسلامبوونیدا دیارییەك دەبا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر لێی وەرناگرێ.

باوکی ناوی (حیمار) بووە، کە بەواتا گوێدرێژە، لە کوردیدا، هەندێ لەیاسا ناسانی شەرع گۆڕیویانە بە (حەممار) کە بەواتا خاوەن گوێدرێژو کەردارە، لە کوردیدا، گوایە ئەقڵ نایگرێ کە مرۆڤ ناو بنرێ بەناوی گوێدرێژەوە، شتی وا دەست تێوەردانی بێ بەڵگەو نیشانەیە، وەك مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ.

ئەم زاتانە، لە زاراوەی زانستی فەرموودەدا، دادەنرێن بە شاگردو فەقێی عییاض، چونکە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: موطریفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شەخیرو یەزیدی برای موطریفو عەلای کوڕی زیادو عوقبەی کوڕی صەهبانو کەسانی تریش!!

عییاض دەستووری وابوو کە دەهات بۆ مەککە، طەوافی بەیتی بەجلو بەرگی پێغەمبەرەوە دەکرد، لەو کۆمەڵەیە بوو، کەهەر بەجلی ئەحمەسییەوە تەوافیان دەکرد!

(قسەیەکی نەستەق) بەم بۆنەی باسی (حیمارە)وە: جارێکیان لە هۆدەکەی خۆمدا، لە نەخۆشخانەی سەربازیی کەرکووك دانیشتبووم، چوار دەورم پڕبوو لە جاشو سەرۆك جاش، شەڕێکی گەورە بوو بوو، جاشو جەیشێکی زۆر، لە کوژراوو زامار هەبوو، پێشمەرگە بەخوێنی گەشی چەپکێ لەخۆیان، سەرکەوتنێکی گەورەیان تۆمار کردبوو، لەکێوە رەشو دەوروبەری، لە ناوچەی رانیەو قەڵادزێ.

مەئموورەکانو پەیوەندیدارەکان، یەکە یەکەو بەرودوا، شەهادەتی وەفاتو پارەی تایبەتی کفنو ناشتنو شتی وایان لە لیژنەی تایبەت وەردەگرتو شەهید، یا زاماری خۆیان دەبرد بۆ جێگەی مەبەست، مەئمووری هات، پێیم گوت: کاکە لێ! روتبەی شەهیدەکەت چییەو ناوی سیانی چییە؟ کوڕە مەئموورەکە زۆر بەشاویلکەیی گوتی: روتبەی شەهیدەکەم جاشەو ناوی مام بایزە...).

گەرچی کوڕەکەمان وەکوو کوڕی ماتەم وابوو، بەڵام خەڵکەکە گشت پێکەنین، سەرۆك جاشێ ئاغابوو، کەمێ لاوو پۆشتەو پەرداخ بوو، ئەمەی زۆر پێ ناخۆش

بوو، وەك پرسیاری شەرعم لیّ بكا، بەمنی گوت: ئەریّ مامۆستا پیّم نالیّی ئەم ناوە پیسە، چۆن شویّن ئیّمە كەوتووە؟

منیش لەم كاتەدا، پیّش ئەوەی وەلامی ئەم ئاغایە بدەمەوە، بۆئەوەی زیاتر ریّ بۆ مەسەلەكە خۆش بكەم، بە مەئموورەكەم گوت: ئەی كوڕی باش! ئەی روتبەو ناوی سیانی خۆت چییە؟ گوتی: قوربان! خۆشم هەر جاشم، روتبەكەم جاشە، جاشە شەهیدەكە باوكمە! حەفتەی پیّشووش باپیرەم شەهید بوو، ئەویش هەرجاش بوو، منو باوكم مەئموور بووین تەرمەكەیمان وەرگرتەوە، بەخوا وابڕوا، هەمووی حەفتەییّ دوانی ترە منیش شەهید دەبم!

كابرای جاش ئاغا لیّی تووڕە بوو، گوتی: هەتیو! ئەم لەوچە لەوچە چییە دەیكەی؟

سەرۆك جاشیّكی تر گوتی: ئاغا! لیّی مەگرە، وازی لیّ بهیّنە، دیارە كە ئەقلّی تیّك چووە، ناهەقی مەگرە، لە حەفتەیەكا دوو كەسی ئاوای بكوژریّ، هەر باشە كە هاریش نەبووە!

ئەم چیرۆكە دریّژە بالیّرەدا ئەوەندەی بەس بیّ.

**١٥١٢) جاویدانیو هەتا هەتاییو نەمریی خەلّكو دانیشتوانی بەهەشتو دۆزەخ.**

**(٧٠٩٣ - ٧١٢٥)**

**بَابٌ: خُلُودُ أَهْلِ الجَنَّةِ وَأَهْلِ النَّارِ فِيمَاهُمْ فِيهِ**

١٩٧٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «إِذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ، وَصَارَ أَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ، أُتِىَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، ثُمَّ يُذْبَحُ، ثُمَّ يُنَادِى مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ لاَ مَوْتَ. فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ، وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ».

{الحديث: ٧١١٣ = ٧١٤٠ فم. ترج/٥، رقم: ٢٠٣٢ = ٦٥٤٨. تحفة/٧٤٢٤}:

عەبدوللای كوڕی عومەر (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بیّ) فەرمووی: (كاتیّ بەهەشتییەكان لەبەهەشتا جیّگیر دەبنو تیادا دادەمەزریّن، وە

هەروەها دۆزەخییەکانیش لە دۆزەخدا مۆڵ دەدرێن، ئەوجا جاڕچییەك جاڕ هەڵ دەداو بەدەنگی بەرز بانگ دەکا: ئەی دانیشتوانی بەهەشت! گوێ بگرن. ئەوانیش گوێ قوڵاخ دەکەن‌و دەنوارن، تا بزانن جاڕەکە چییە، دیسان بانگی دۆزەخییەکان دەکرێ‌و دەڵێ: ئەی خەڵکی دۆزەخ! گوێ رابگرن. ئەوانیش گوێ قوڵاخ دەبن‌و دەنوارن، تا بزانن ئەو جاڕە چییە!

ئەوجا مردن دەهێنن، لەشێوەی بەرانێکی تەودا، لەسەر شوورەکەی نێوانی بەهەشت‌و دۆزەخ، کەپێی دەگوترێ: ئەعراف، لەوێ بەرانەکە رادەگرن، جاڕ چییەکە بەهەردوو لا دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسن؟ هەردوولا دەڵێن: بەڵێ ئەمە مردنە، هەموویان بەباشی چاویان لێیەتی.

جا پێغەمبەر یەحیای کوڕی پێغەمبەر زەکەریا (دروودی خودا لە خۆی‌و لەباوکی) بەرانەکە پاڵ دەخاو بەچەقۆ سەری دەبڕێ. ئەنجا جاڕکێش بانگەواز هەڵ دەدا: ئەی خەڵکی بەهەشت! خۆشی لەئێوە، موژدەتان لێ بێ، ئیتر مردن نەما، ئیتر هەتا هەتایە لەبەهەشتا بەشادی‌و خۆشی دەژین!

وە ئەی خەڵکی دۆزەخ! قوڕبەبانی سەرتان، قوڕ بەبانی چاوتان، ئەوا دەرگای ئومێدتان بە ئێجگاری لێ داخرا، ئیتر مردن نەما، هەتا هەتایە ئەمە شوێنتانە!

جا بەهەشتییەکان بەم بۆنە خۆشەوە، ئەوەندەی تر کەیف خۆش‌و شادمان دەبن‌و، دۆزەخیەکانیش بەهۆی ئەم رووداوە دڵتەزێنەوە، ئەوەندەی تر خەمبارو خەفەتبار دەبن!). {تاج/٤، زنجیرە: ٢، لاپەڕە: ٣٥٣، ژمارە: ٣٩٨٤ — سوورەتی مەریەم}.

## پوختەی نامەی بەهەشت

١. بەکۆی دەنگ دوو جۆرە ژن لەبەهەشتا هەن: یەکەم: ژنانی جیهان، دووەم: پەریەکانی بەهەشت.

٢. بەشێوەی گشتی ژنان هەم زۆرینەی دانیشتوانی بەهەشتن، هەم زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن.

٣. پیاوی رەبەنی بێ ژن نییە، هەموو پیاوێ چەند ژنێکی هەیە.

٤. کەسانێ کە لەجیهانا، بەبێ ژن مردوون، یابەبێ مێرد مردوون، وەك منداڵو پیاوی رەبەنو ژنی شوو نەکردوو، لە بەهەشتا دەبن بەخاوەن هاوسەر، چونکە رەبەن لە بەهەشتا نییە {وَفِيهَا مَاتَشْتَهِيهِ الْأَنْفُسُ وَتَلُذُّ الأَعْيُنُ}.

٥. نیشانەکانی مرۆڤی بەهەشتی لەجیهاندا (ژمارە: ١٩٥٩).

٦. ژیانی بەهەشت، وەك ژیانی جیهان وایە، ژیانی جەستەییە، نەوەك وەك مەسیحییەکان دەڵێن: ژیانی گیانیو بەس. مەبەست ئەوەیە، لەبەهەشتا وەکوو جیهان ژنو مێردیو هاوسەری هەیە، خواردنو خواردنەوەو خۆشی هەستی (لەززەتی حیسسی) هەیە.

٧. لە بەهەشتا خواپەرستیو یادی خوداو قورئان خوێندنو تەسبیحات هەیە، بەڵام بەبێ ئەرك ئەنجامی دەدەن، هەروەك چۆن هەناسەدان زۆر ئاسانو سانایيەو هیچ ئەرکێکی تیادا نییە، بگرە کارێ زۆر خۆشو پێویستیشە، خواپەرستیو تەسبیحاتو قورئان خوێندنیش هەروەها. {بڕوانە: ژمارە: ١٦١٤} کە لەپێشەوە رابورد.

٨. بەهەشتی بەچاوی سەر خودا دەبینێ.

٩. لە بەهەشتا ناخۆشیو نەخۆشیو ئەرکو ئازارو ئێشو خەمو خەفەت نییە.

١٠. لە بەهەشتا بازاڕ هەیە.

١١. ژیانی بەهەشت سەرەتای هەیە، بەڵام بێ کۆتایەو کۆتایی بۆ نییەو هەتا هەتایە.

١٢. بەهەشت ئێستا هەیە، خوا خۆی دەزانێ کە لەکوێیە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٦٣- نامەی چۆنێتی دۆزەخ

## كِتَابُ صِفَةِ النَّارِ

{بڕوانە: تاجُ الأُصُولِ فِي أحاديث الرسول بەكوردی. بەرگی/٥، لاپەڕە: ٧٧٤، زنجیرە: ١٥١، چاپی/٤، لە ژمارە: ٥٧٦٠ هەتا ژمارە: ٥٧٩٥ + }

### ١٥١٣) باسی هەوسارەكانی دۆزەخ. (٧٠٩٣ - ٧١٢٥)

### بَابٌ: فِي ذِكْرِ أَزِمَّةِ النَّارِ

١٩٧٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنْ مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا». {الحديث: ٧٠٩٣ = ٧١٢٠ فم}:

عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو ڕۆژە كە دۆزەخ دەهێنن، بە حەفتا هەزار فریشتە، بە حەفتا هەزار جڵەوو ڕەشمەو هەوسار بەكێشی دەكەن). {ریاض/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٣٩٧}.

**ڕوونكردنەوە:**

چۆنێتی ئەم گوریس‌و ڕەشمەو هەوسارو لغاوانە، خودای گەورە خۆی باشتری لێ دەزانێ، گرنگ ئەوەیە كە ئێمە بڕوامان پێی هەبێ، خودا پەنامان بدا لێی.

### ١٥١٤) سەختی گەرمی ئاگری دۆزەخ. (٧٠٩٣ - ٧١٢٥)

### بَابٌ: فِي شِدَّةِ حَرِّ جَهَنَّمَ

١٩٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: «نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ، جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ». قَالُوا: وَاللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا كُلُّهَا مِثْلُ

حَرِّهَا». {الحديث: ٧٠٩٤ = ٧١٢١ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٣١٩ = ٣٢٦٥، ٣٢٦٦ + ١٣٠٢ تجريد = ٣٢٣٠ فتح الباري. ترمذي. صفة جهنم: ٢٥٨٩. تحفة/١٣٩٠٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم ئاگرەی ئێوە کە لەم جیهانەدا بەکاری دەهێنن‌و ئادەمیزاد هەڵی دەکا، یەك لە حەفتای ئاگری دۆزەخ گەرمە، ئاگری دۆزەخ حەفتا ئەوەندە گەرمە). یاران (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا خۆ ئەگەر ئاگری دۆزەخ، بەقەد ئەم ئاگرەی دنیاش گەرم بێ، بەسەو سەرو زیادە، بۆ سزاو ئازاردانی دۆزەخییەکان!

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەسا شەست‌و نۆ جار لەم ئاگرە گەرمترە، رێك حەفتا ئەوەندەی ئەم گەرمە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٥١، ژمارە: ٥٧٦٠ — باس‌و خواسی دۆزەخ‌و دەرگاکانی}.

## ١٥١٥) زۆر قووڵی بنی دۆزەخ. (٧٠٩٣ - ٧١٢٥)

## بابٌ: فِي بُعْدِ مَقَرِّ جَهَنَّمَ

١٩٧٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ سَمِعَ وَجْبَةً، فَقَالَ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَتَدْرُونَ مَا هَذَا؟». قُلْنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «هَذَا حَجَرٌ رُمِىَ بِهِ فِى النَّارِ مُنْذُ سَبْعِينَ خَرِيفًا، فَهُوَ يَهْوِى فِى النَّارِ الآنَ، حَتَّى انْتَهَى إِلَى قَعْرِهَا». {الحديث: ٧٠٩٦ = ٧١٢٣ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) رمبەیەکی بەرگوێ کەوت، فەرمووی: (ئایا دەزانن کەئەم گرمەیە چی بوو؟).

گوتمان: قوربان! خوداو پێغەمبەری خودا باشی دەزانن. فەرمووی: (ئەوە بەردێك بوو، حەفتا ساڵە لە لێواری دۆزەخەوە بەردراوەتەوە، لەوساوە وابەرێوەو هەر بەردەبێتەوە، تا ئێستا گەیشتە بنی‌و ئەوەبوو کە ئێوە گوێتان لە گرمەکەی بوو).

**روونكردنەوە:**

١- بەلگەیە لەسەر ئەوە كە دۆزەخ ئێستا هەیەو دروستكراوە.

٢- لە گێڕانەوەی ژمارە: (٧٠٩٧)دا، دەفەرموێ: (فَسَمِعْتُمْ وَجْبَتَهَا: ئەوەبوو كەئێوە گوێتان لە گرمەو رمبەكەی بوو) كە ئەمە بەلگەیەكی گەورەیە لەسەر ئەوە كە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەوان بێ) لەسەر رووی خەواریق‌و كەرامەت، خەرقی عادەتیان بۆ بووەو شتی غەیبی زۆریان لەخزمەت پێغەمبەردا دیوەو بیستووە. {بڕوانە: ژمارە: (٢) لەم پەڕاوە كە جوبرائیلیان بەچاوی خۆیان بینی، بڕوانە: ژمارە: (٤) شەرحی صەدری عومەر (ژمارە: ١٠) موعجیزەیەكی گەورەیان بینی (ژمارە: ٧٣)و (ژمارە: ٢١٠٦)و (ژمارە: ٢١٠٧)و (ژمارە: ١٥٢٩)و (ژمارە: ١٥٣٠)و (ژمارە: ١٥٣١)و (ژمارە: ١٥٣٢)و (ژمارە: ١٥٣٣) و (ژمارە: ١٥٣٤)و (ژمارە: ١٥٣٥)و (ژمارە: ١٥٣٦)و (ژمارە: ١٥٣٧)و (ژمارە: ١٥٣٨)و (ژمارە: ١٥٣٩)و (ژمارە: ١٥٤٠)و (ژمارە: ١٥٤١)و (ژمارە: ١٥٤٢)و (ژمارە: ١٥٤٣). بڕوانە: (١٦٧٦ = ٦٢٦٥).

## ١٥١٦) سووكترین سزای دۆزەخ
## بَابٌ: فِي أَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً

١٩٧٨- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا مَنْ لَهُ نَعْلاَنِ وَشِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ، يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ، كَمَا يَغْلِي الْمِرْجَلُ، مَا يَرَى أَنَّ أَحَدًا أَشَدُّ مِنْهُ عَذَابًا، وَإِنَّهُ لأَهْوَنُهُمْ عَذَابًا». {الحديث: ٥١٥ = تجريد البخاری = مختصر صحيح البخاری بالكوردی/٥، رقم: ٢٠٣٦ = ٦٥٦٢ فتح الباری. ترمذی. صفة جهنم: ٢٦٠٤}:

نوعمانی كوڕی بەشیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو دۆزەخیەی كە ئێش‌و ئازاری لەهەموو كەسێ سووكترە، كابرایەكە جووتێ پێلاوی ئاگرینی لەپێدایە، جووتێ قەیتانی ئاگرینی پێوەیە، مۆخی ناو كاسەی سەری وەك مەنجەلی سەر ئاگر، بەو پێلاوانە دەكولێ، لەخۆی وایە كەس

لەو ئازاری قورس و سەختتر نییە، بەڵام لەچاو خەڵکی تردا، لەگشت کەسێ ئازاری سووکترە!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٥٧٨٢} + {ریاض/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٣٩٨ — ترسان لەقاری خوا}.

### ١٥١٧) ئاگری دۆزەخ هەتا کوێی دۆزەخیەکان دێت

### بَابٌ: مَاتَأْخُذُ النَّارُ مِنَ المُعَذَّبِينَ

١٩٧٩- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذُهُ النَّارُ إِلَى كَعْبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذُهُ النَّارُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذُهُ النَّارُ إِلَى حُجْزَتِهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذُهُ النَّارُ إِلَى تَرْقُوَتِهِ». {الحديث: ٧٠٩٩ = ٧١٢٦ فم}:

سەموورەی کوڕی جوندوب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دۆزەخی واهەیە لەدۆزەخا، ئاگر دەدا لەقولە پێی، هی واهەیە ئاگر دەدا لەهەردوو ئەژنۆی، هەیە تا پشتێنەی نوقم دەبێ لەناو ئاردا، هی وایش هەیە هەتا بینە قاقای لە ئاگری دۆزەخدا دەچەقێ!). {ریاض/١، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٣٩٩ — باسی ترسان لەقاری خوا}.

### ١٥١٨) ملهوڕە ستەمکارەکان دەچنە دۆزەخ و بێ نەواو لازەبوونانیش دەچنە بەهەشت. (٧٠٩٣ - ٧١٢٥)

### باب: النَّارُ يَدْخُلُهَا الجبَّارُونَ، وَالجنَّةُ يَدْخُلُهَا الضُّعَفَاءُ

١٩٨٠-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «تحَاجَّتِ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ: أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ، وَقَالَتِ الْجَنَّةُ: فَمَا لِي لاَ يَدْخُلُنِي إِلاَّ ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ وَغِرَّتُهُمْ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِلْجَنَّةِ: إِنَّمَا أَنْتِ رَحْمَتِي، أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَقَالَ لِلنَّارِ: إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي، أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْكُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ فَلاَ تَمْتَلِئُ، حَتَّى يَضَعَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى رِجْلَهُ، تَقُولُ: قَطْ قَطْ قَطْ. فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلاَ يَظْلِمُ اللَّهُ

مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا، وَأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا». {الحديث: ٧١٠٤ = ٧١٣١ فم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري/٤، رقم: ١٦٩٨ = ٤٨٥٠، ٤٨٤٩ فتح الباري}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەهەشتو دۆزەخ دەبێ بە دەمەقاڵێیان، دۆزەخ دەڵێ: خۆشەویست بەزلزانو بەزەبرو زەنگەکان تەرخان کراون بۆ من. بەهەشتیش دەڵێ: ئەی من چیمە، کەوا هەر لازەبوونەکانو بێنەواکانی ئەم خەڵکەم تێ دێنو بووم بەجێگەی دوارۆژی ڕەشو رووتەکان!

ئەوجا خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەی بەهەشت! تۆ ڕەحمەتی منی، هەرکەسێ خۆم بمەوێ لە بەندەکانی خۆم ڕەحمی پێ دەکەمو تۆ دەکەم بەشوێنی ڕەحمەت بۆی، وە بەدۆزەخیش دەفەرموێ: تۆ هۆی سزای منی، هەرکەسێ خۆم بمەوێ لە بەندەکانی خۆم بەتۆ سزای دەدەمو تۆ دەکەم بە جێگەی سزادانی، وە بەڵێنە لەسەرم کە هەردوو لاتان پڕبکەم، هەرکەسەتان لەخەڵکی خۆی، بەڵام دۆزەخ هەر لرفەی دێ، هەر پڕنابێ، پەیتا پەیتا هەر خەڵکی تێ فڕێ دەدەنو هەر دەڵێ: ئەگەر ماوە بابێ! هەتا خودا پێی مەزنایی خۆی دادەنێ لەسەری. ئەوکاتە وازدەهێنێو دەڵێ: ئیتر بەسە، ئیتر بەسە، جێگە نەما، جا ئەوجا پڕدەبێو دەپەچنێ بەسەریەکاو، لەناو خۆیدا پەنگ دەخواتەوە! دیارە کە خودای گەورەو خاوەن شکۆ زۆرو ستەمو ناهەقی لەکەس ناکا، لە دروستکراوانی خۆی، وە هەروەها بەهەشتیش هەر پڕنابێو شوێنی وای هەیە کەهەر چۆڵە، تا خودا لەنوێ خەڵکی تری بۆ دروست دەکاو بەو خەڵکە نوێیە چۆڵیەکانی بەهەشت پڕدەکاتەوە!).
{تاج/٤، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٤١١٧ — سوورەتی قاف}.

## ١٥١٩) سزای ئەوكەسە كەبۆ يەكەمجار لە جیهاندا (سائبە)ی داهێنا.
(٧٠٩٣ - ٧١٢٥)

## بَابٌ: عَذَابُ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ فِي النَّار

١٩٨١- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ يَقُولُ: إِنَّ (الْبَحِيرَةَ) الَّتِى يُمْنَعُ دَرُّهَا لِلطَّوَاغِيتِ فَلاَ يَحْلُبُهَا أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ، وَأَمَّا (السَّائِبَةُ) الَّتِى كَانُوا يُسَيِّبُونَهَا لآلِهَتِهِمْ فَلاَ يُحْمَلُ عَلَيْهَا شَىْءٌ، وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «رَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ عَامِرٍ الْخُزَاعِىَّ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِى النَّارِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ». {الحديث: ٧١٢٢ = ٧١٤٩ فم. تجريد البخاري بالكوردى/٤، رقم: ١٤٠٢ مكرّر = ٣٥٢١، ٤٦٢٣ فتح الباري. تحفة الأَشْراف: ١٣١٧٧}:

زوهـری، واتـە: ابـن شـهـاب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: لەسـەعیدی كـوڕی موسەییەبم بیست دەیفەرموو: لەكاتی روونكردنەوەی ئەم ئایەتەدا:

{مَا جَعَلَ اللّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ وَلَكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ - المائدة — ٥/١٠٣}.

واتە: یەزدانی پاك‌و پیرۆز، خودای گەورەو سەروەر نە (بـەحیرە)ی دانـاوەو نـە (سائیبە)و نە (وەصیلە)و نە (حام) بەڵام كەسانی بێ باوەڕو بێ بڕواو كۆمەڵەی بێ ئایینان درۆ هەڵ دەبەستن، بەدەم خوداوەو دەڵێن: ئەمانە هەن‌و خودا بڕیاری داون، زوربەی ئەمانەیش كەئەم درۆیانە دروست دەكەن، بێ هۆش‌و بێ ئەقڵن).

زوهری فەرمووی: بیستم لە سەعیدی كوڕی موسەییەب دەیفەرموو: بـەحیرە بەو وشترە دەڵێن كە شیرەكەیان قەدەغە دەكرد بۆ بتە سەركەشەكانیان، لەبەرئـەوە كە پێنج سك لەسەر یەك زاوەو دوا سكەكەی نێرینە بـووە، ئـیتر بـەرەڵایان دەكـرد، نەسواری دەبوون‌و نەهیچیان پێ دەكرد، وەبۆ نیشانەیش گوێیان شـەق دەكـردو، ناویان دەنا بەحیرە، واتە: گوێ هەڵدڕاو، سـائیبەیش بـەو وشـترە دەڵێن كـە هەنـدێ كـەس نـەخۆش دەكـەوت دەیگـوت: ئەگـەر خـودا لـەم نەخۆشـینە چـاكی كردمـەوە فیسارە وشتر سائیبەبێ، واتە: مەرەخەس‌و بـەرەڵابێ بـۆ خوداوەنـدە درۆینـەكانیان، ئیتر نەسواری دەبوون‌و نە باریان لێ دەنا. وەصیلەیش ئـەو وشـترە مێنگەیەیـە بـوو

كە نۆبەرەكەى‌و سكى دووەمى لەسەر يەك مێچكە بوون‌و نێرەيان لە نێواندا نەبوو، بۆيەيش پێيان دەگوت وەصيلە، بەكوردى واتە: گەيێنەر، چونكە دوو مێچكەى بەيەك دەگەياند، جا ئەويشيان بەرەڵا دەكردو تەرخانيان دەكرد بۆ خودا درۆينەكانيان، حاميش وشترە نێرەيەكە دەيكەن بەكەڵ، ئەندازەيەكى دياريكراو دەپەڕێ‌و وشترە مێنگەى بەكەڵ كەڵ دەدا، ئيتر لەپاش ئەوە ئازاديان دەكرد لەبار كێشان‌و سەر بڕين‌و تەرخانيان دەكرد بۆ خودا درۆينەكانيان.

سەعيدى كوڕى موسەييەب دەيفەرموو: ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) دەيفەرموو: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەيفەرموو: (عەمرى كوڕى عاميرى كوڕى لوحەيى خوزاعيم، لەناو ئاگرى دۆزەخدا بينى، حاڵى زۆر شڕبوو، ريخۆڵەى، خۆى بەناو ئاگرەكەدا بەكێش دەكرد، چونكە ئەو يەكەم كەسێ بوو كە ئاژەڵى سائيبەى داهێناوە). {تاج/٤، زنجيرە: ٦، ژمارە: ٣٨٤٨ — سوورەتى مائيدە}.

**١٥٢٠) باسى زلێتى كاكيلەى بێباوەڕ لەناو ئاگرى دۆزەخدا.** (٧٠٩٣ - ٧١٢٥)

**باب: عِظَمُ ضِرْسِ الكَافِرِ فِى النَّارِ**

١٩٨٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «ضِرْسُ الْكَافِرِ أَوْ نَابُ الْكَافِرِ مِثْلُ أُحُدٍ، وَغِلَظُ جِلْدِهِ مَسِيرَةُ ثَلاَثٍ». {الحديث: ٧١١٤ = ٧١٤١ فم}:

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (لەڕۆژى دوا رۆژدا كاكيلەى بێباوەڕ لەناو ئاگرى دۆزەخدا بەقەد كێوى ئوحود دەبێ) يا فەرمووى: (كەڵبەى بێباوەڕ (كافر) لەناو ئاگرى دۆزدخا بەقەد چياى ئوحود دەبێ كە غەزاى ئوحود لەوێ روويداوە، ئەستوورى پێستەكەيشى سێ رۆژە رێگايە). {تاج/٥، زنجيرە: ١٥٢، ژمارە: ٥٧٥٢ — چۆنێتى دۆزەخى}.

ئەم فەرموودەيە لە تاجول ئوصولدا ئاوايە:

لەڕۆژى دوا رۆژدا كاكيلەى بێباوەڕ بەقەد چياى ئوحود دەبێ، رانيشى بەقەد كێوى بەيزاء دەبێ، شوێن قنگيشى كە لەناو ئاگرەكەدا دادەنيشێ سێ قۆناغە، وەك ئێرەو رەبەزە). {تاج/٥، زنجيرە: ١٥٢، ژمارە: ٥٧٧٣ — ترمژى سند حسن}.

١٩٨٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ يَرْفَعُهُ قَالَ: «مَا بَيْنَ مَنْكِبَيِ الْكَافِرِ فِى النَّارِ مَسِيرَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ لِلرَّاكِبِ الْمُسْرِعِ». {الحديث: ٧١١٥ = ٧١٤٢ فم. تجريد البخارى = الترجمة الكردية/٥، رقم: ٢٠٣٤ = ٦٥٥١ فتح البارى}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەشی دۆزەخیەکان لەدۆزەخا ئەوەندە زلو گەورەیە، تەنانەت نێوانی هەردوو سەرشانی ناموسوڵمان، لە دۆزەخدا سێ ڕۆژە ڕێگەیە بۆ سواری خێرا). {تاج/٥، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ٥٧٧١ — چۆنێتی دۆزەخی}.

**١٥٢١) سزای ئەو کەسانەی کەلەم جیهانەدا ئازاری خەڵکی بێ تاوان دەدەن.**

**(٧٠٩٣ - ٧١٢٥)**

**بابٌ: عَذَابُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ النَّاسَ**

١٩٨٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا، قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ، رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا». {الحديث: ٧١٢٣ = ٧١٥٠ فم}:

ئەم فەرموودەیە بەتەواوی لە (كِتَابُ اللباس والزينة)دا ڕابورد، زنجیرە: ١٠٧٢، ژمارە: ١٣٨٨,

١٩٨٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «إِنْ طَالَتْ بِكَ مُدَّةٌ أَوْشَكْتَ أَنْ تَرَى قَوْمًا يَغْدُونَ فِى سَخَطِ اللَّهِ وَيَرُوحُونَ فِى لَعْنَتِهِ، فِى أَيْدِيهِمْ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ». {الحديث: ٧١٢٥ = ٧١٥٢ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئەبو هورەیرە! ئەگەر مەرگ مەودات بداتو ماوەیێ تر لەپاش ئێمە بژیت، دوورنییە کە فریای ئەو سەردەمە بکەویت، کە دەستو پێوەندی دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان بەچاوی خۆت ببینی، کەسەر لەبەیانیان خودا لەخۆیان

تووڕە دەکەن‌و شایانی قاری خودا دەبن‌و سەر لەئێواران شایستەی نەفرەت‌و لەعنەتی خودا دەبن، نیشانەی هەرە گەورەیان ئەوەیە: کە لیسێکیان وا بەدەستەوە لە کلکی گادەکا، کە مرۆڤی بێتاوانی پێ فەلاقە دەکەن!).

**١٥٢٢) نازدارترین کەس، لە ناموسوڵمانەکان، لە جیهاندا، لە قیامەتدا هەڵ دەکێشرێ لەسزای دۆزەخ، بێنازترین کەسیش لە موسوڵمانەکان،لە قیامەتدا هەڵدەکێشرێ لەنازو بەهرەی بەهەشت.** (٧٠١١ - ٧٠١٣)

**بَابٌ: صُبْغُ أَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا فِي النَّارِ وَصُبْغِ أَشَدِّهِمْ بُؤْساً فِي الْجَنَّةِ**

١٩٨٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُصْبَغُ فِى النَّارِ صَبْغَةً ثُمَّ يُقَالُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ خَيْرًا قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَبِّ، وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْسًا فِى الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِى الْجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ بُؤْسًا قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَبِّ، مَا مَرَّ بِى بُؤْسٌ قَطُّ، وَلاَ رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ». {الحديث: ٧٠١٩ = ٧٠٤٤ فم}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕۆژی دوا ڕۆژدا، کێ لە خەڵکی جیهان، کە لەجیهاندا لەهەموو کەسێ ناز پەروەرتر بووە، کە شایانی ئاگری دۆزەخ بێ، دەیهێنن‌و وەك جلێ لە ڕەنگی هەڵکێشی ئاوا لە ئاگری دۆزەخ هەڵی دەکیشن‌و ئەوجا پێی دەڵێن: ئەی کابرا! ئەوەتی هەیت قەت خۆشیت دیوە؟ ئایا هەرگیز لە ژیانتا ڕێکەوتووە کە تووشی نازو نیعمەت بوو‌بیت؟ دەڵێ: نا بەخودا ئەی پەروەردگارم!.

هەروەها کێ لەجیهاندا، کە لەهەموو کەسێ زیاتر، سزاو ئێش‌و ئازارو ناخۆشی دیبێ، کە شایانی ئەوەبێ کە بچێتە بەهەشتەوە دەیهێنن‌و، وەك خامێ لە خومی هەڵکێشن ئاوا هەڵی دەکێشن لەخۆشیی بەهەشت‌و جاپێی ەگوترێ: ئەی ڕۆڵەی ئادەم! ئەی ئادەمیزاد! ئایا ئەوەتی هەیت هەرگیز ناخۆشی‌و نارەحەتیت بینیوە؟ ئایا قەت تووشی سەختی‌و مەینەتی بوویت لەژیانتا؟

ئەویش دەڵێ: لاَ إِله إِلاَّ الله، ئەی پەروەردگارم! نە تووشی ناخۆشی بوومو نە سەخڵەتیو سەختیم بینیوە).

**روونکردنەوە:**

یەکەم:- لە فەرمایشتی ڕاڤە نووسەکان، وەك دانەری تاجول ئوصولو ئیمامی نەوەویو شێخی عەسقەلانیو مامۆستای بەدری عەینیو خاوەنی فەتحولمولهمو لەکۆی گێڕانەوەکانی ئەم باسی دۆزەخو خەڵکەکەی، دەردەکەوێ کە: (کۆمەڵێ فەرموودەی بەهێز هەن، کەمێك لەناو خۆیانا جۆرە جیاوازییەکیان هەیە، قسە لە چۆنێتیو گەورەییو بچووکیی لەشو ئەندامی بێباوەڕان لە دۆزەخا دەکەن، وەك هەندێ فەرموودە باسی ئەوە دەکا کە هەندێ لە ناموسوڵمانەکان لە دۆزەخدا زۆر زەبەلاحو فیلەتەنن، تەنانەت خرێیەکیان بەقەد کێوی ئوحود دەبێ، یا لەنەرمەی گوێچکەیەوە هەتا سەرشانی ناموسوڵمان لە دۆزەخا، ماوەی حەوت ساڵە ڕێگەیە، یا ئەستووریو قەوێتیی پێستەکەی سێ ڕۆژە ڕێگەیە، یان ئەستووریی پێستەکەی چلو دوو باڵ قووڵە!

جێگە قنگی یەکێ لەم ناموسوڵمانو زەبەلاحانە، لەناو ئاگری دۆزەخدا، بەقەد نێوانی ڕەبەزەو مەدینە دەبێ، کە ڕەبەزە گوندێکە لە نزیك مەدینەوە، گۆڕی ئەبو زەڕری غیفاری لەوێیە، یا بەئەندازەی نێوانی مەککەو مەدینە دەبێ، یا درێژیو پانی زمانی ناموسوڵمان لە دۆزەخدا، فرسەخێ دوو فرسەخ، وەك رایەخ لەسەر زەوی رادەخرێ، خەڵکی تری دۆزەخ بەسەریدا دەڕۆنو دێنو دەچنو، بەپێ دەیشێلن، وەهەندێ فەرموودەی تر باسی ئەوە دەکەن کە لەشو جەستەی دەعیە زلو فیزنو خۆ بەزلزانەکان، کاتێ حەشر دەکرێن، لە ڕۆژی قیامەتدا، بەقەد مێرووولەیەك دەبن، لەسەر شەکڵو شێوەی مرۆڤ دەبن، وەگەڵێ فەرموودەی تری لەم بابەتانە هەن، کەباس لە چۆنێتیو چەندێتی ئەندامو لەشو قەبارەی دۆزەخیانو ناموسوڵمانان لە دۆزەخدا دەکەن، لەگەڵ هەندێ جیاییو جیاوازی لەهەندێ لایەنەوە لەناو ئەم فەرموودانەدا.

لەبەر رووناكیی ئەم خالآنەی دواوەو كۆمەڵێ هۆكاری تر، كە لەراڤە نامە سەرچاوە بتمانە پێكراوەكاندا روونكراونەتەوە، ئەم جۆرە جیاوازیو بەرواڵەت لەگەڵ یەك نەگونجاویی ئەم فەرموودانە قەیدی نییە. چونكە:

١-لە پلەی یەكەما، مەبەستی سەرەكی لەم دەربڕینانە، ئەوەیە كە ئێمەی موسوڵمان لەحاڵی شڕی دۆزەخیان بەباشی حاڵی ببین، كە لەدۆزەخا – خودا پەنامان بدا – چەندە سزایان سەختە، هەتا شەیتانو دەستەو بەستەی شەیتانو بریقو باقی ژیانی چەند رۆژەی ئەم جیهانە، تەفرەمان نەدەنو بۆ مێشێ گامێشێ لە كیس خۆمان نەدەینو، لەقارو بێباكی خودای گەورەو سەروەر بترسینو، هەمیشە ئەو رۆژە رەشەو ئێشو ئازارو سزای دۆزەخی نەبڕاوەمان لەبەرچاو بێ، دووربین بینو كورتبین نەبین!

٢ - سزای دۆزەخیەكان لە دۆزەخدا هەموویان وەك یەك نین، بەڵكوو جیاوازییەكی زۆر هەیە، لەنێوانی چەندێتیو چۆنێتیی سزای دۆزەخیەكاندا، لەناو خۆیاندا، بۆ نموونە: سزای فیرعەونو نەمروودو شەددادو ئەبو جەهل، گەلێ گەلێ قورسو سەخترە، لەسزای ناموسوڵمانێكی رەشۆكی، كە لەجیهاندا، نەداوای خوایەتی كردبێ، نە زوڵمو زۆرو ناهەقی كردبێ لەكەسێ، تەنیا لەسەر ئەوە سزا دەدرێ كە بێباوەڕ بووە، بەگوێی خوداو پێغەمبەری ئەوی نەكردووەو، دوای نەفسو هەوەسو شەیتان كەوتووە!

٣ - گەلێ جار جۆری سزاو، چۆنێتی لەشو جەستەیان، ئاماژەیە بۆ تاوانەكانی جیهانیان، وەك حەشركردنی دەعیە زلان، لەسەر شێوەی پیاوێ بەقەد میرووچەیێ بێ! یا زمانی غەیبەتكار، فرسەخێ، یا زیاتر، وەك حەسیرو بەرە رادەخرێو خەڵك بەسەریدا هاتوچۆ دەكەن!

٤ بۆیە جەستەو ئەندامەكانی بێباوەڕان گەورە دەكرێن، هەتا زیاتر ئازارو ئێش بچێژن، دیارە ئەو گۆڕانكاریەیش بەپێی چۆنێتیو چەندێتیی تاوانەكانیانە لەم

جیهانــەدا، لەبەرئــەوە جیــایی هەیــە لــەنێوانی ئەنــدامی دۆزەخیــەکا، لەگــەڵ دۆزەخییەکی تردا.

٥ - ئـەم جـۆرە جیاوازییانـە هـەموو تـەئویل دەکـرێنو بـەپێی کـەسو جێگـەو شـوێنو جـۆری تـاوان لێـك دەدرێنـەوەو هاوسـازیو هاوگونجانیـان بـۆ دەکـرێ، لەبەرئـەوە لـەم رووەوە هـیچ کێشـەیێ دروسـت ناکـەن، بەوێنـە: دەگـوترێ: هەنـدێ بێباوەڕ بەپێی تاوانەکەی ئەسـتووری چـەرمەکەی سێ رۆژە رێگەیـە، وە هەنـدێکی تر، ئەستووریی پێستەکەی چلو دوو باڵە بـەپێی تاوانەکـەی، وە هەنـدێ تـر پێـنج رۆژە رێگەیە، لەبەر هەمان هۆ، وە هەروەها... تاد.

**٦ - خەڵکە هۆشیاربن خودا بێباکە!**

کەسێ بەچاوی ژیریی، سەرنجی حـاڵی ژیـانی زۆرینـەی دروسـتکراوان بـدا، لـەم جیهانی یەکەمەدا، کەچۆن بەتانو پـۆی مەینـەتو خـەمو خەفـەتو ئـێشو ئـازارو کارەساتی دڵتەزێن، چنراوەو تـەنراوە، بـۆی دەردەکـەوێ: کـە لایـەنی تـاریکی ژیـان، نموونەیەکی زیندووە لەژیانی ناو دۆزەخ.

ئەو هەمکە ئێشو ئازارو ترسو ناخۆشیە، کەبـەبێ پسانو هەمیشـەو رۆژانـە، بە بەرچاومانەوە، دووبـارەو سێ بـارەو دەبـارەو سـەد بـارەو هـەزار بـارە دەبنـەوە، تابلۆیەکن لە تابلۆکانی ژیانی ناو ئاگری سووری دۆزەخ!!

بەچاوی خۆم دیومە، کە مرۆڤی داماو، بەدەستی ژانی گورچیلە، یا ژانە دڵ، یـا نەوباتی رەبو، یا ئێشی خۆرەو شێرپەنجەو گاگرینەوە، بە دەسـەعاتو بـەزیاتریش، لەســەر سـەر خولاوەتـەوەو کەسـیش دەسـتەڵاتی هیچـی نـەبووە بـۆی کـەبیکات، هەیانبووە بەری سەختیی ژانو ئێشەکەیی نەگرتووەو لەتاوانا دڵی وەستاوە!

کوڕێکی لاوم دی، ئەفسـەری ئیحتیـاط بـوو، پزیشـك بـوو، مەسـیحی بـوو، نـاوی دوکتور مومتـاز بـوو، تووشـی زەبحـە صـەدرییە بـوو، لـە خەسـتەخانەی کـەرکووکی سەربازی، دەرزیـەکی زایلۆکـاینی لـە دەمـارەوە لەخۆیـدا، لـەتاو ژانـی سینگـو دڵـی، بەرگەی نەگرتو کوشتی!

لەڕاستیدا یەك چرکە نییە لەم ژینەدا، کە ئێش‌و ئازارو خەم‌و خەفەت‌و مەینەت، وەك قیسپ نەبارێن، وا بەبەرچاوەوە کە ڕۆژانە بە ملیۆنەها ڕۆح، بە هەق‌و بەناهەق دەکێشرێ، لەش بێ سەرو بێ گیان دەکرێ، ڕۆڵە لەبەر دایك هەڵ دەگیرێ، گیانلەبەرانی بێ تاوان دەبن بەژێر هەرەسی بوومەلەرزەو رووخانی دارو بەردو کان‌و خانوو ئوتومبێل‌و فڕۆکەوە، لافاوی مەرگ بەهەزارو یەك ناوەوە، گیانی نازداران دروێنە دەکا، ڕۆژانە بە هەزاران لاوو کچ‌و کوڕو ژن‌و پیاو دەبن بەداوی شێرپەنجەو دەردی کوشندەی ترەوە، هەر موبتەلایە، بەساڵ، بە دەساڵ، لەژێر باری ئێش‌و ئازاری هەمە جۆری جیا جیای گوڵی‌و گەڕی‌و دەردی بێ دەرمانا دەتلێنەوە! لەبەر زۆری کوشتن بەگوللەو بۆمباو مین... ژیان بووە بە تاقیگای جەنگپەرستان!.

ئەم هەموو ئاژەڵە، لە قەسابخانەکانا، سەر دەبڕێن، ئەم هەموو مەڵ‌و مۆرو ئاسك‌و بزن‌و مەڕە، بەردەوام، گورگ‌و شێرو پڵنگ‌و هەڵۆو داڵ‌و مرۆڤ، پەلپەلیان دەکەن‌و چاوو دڵ‌و جەرگ‌و هەناویان، لەت لەت‌و کوت کوت دەکەن!

تەنانەت دەریاکانیش، بەو هەمکە زلی‌و پانی‌و پۆرییەی خۆیانەوە، بەخوێنی ماسی سك هەڵدڕاوو نەهەنگی شەقو پەقکراو سوور بوون!

بەهاران ئەم گشتە گیانلەبەرە خنجیلەو نەشمیلانە، لەدایك دەبن، بەهەزارو یەك شێوە دەڕازێنەوەو بە دەنگ‌و ڕەنگی جوان‌و خۆشیان، سروشت دەکەن بە تابلۆی بەهەشت، کەچی لەناکاوێکا، لە پایزانا، بەبێ تاوان، وەیشوومەو گەردەلوولی مەرگ‌و سەرماو سۆڵەی پایز، لە بەهەشتی ژین وەدەریان دەنێ!

دەی ئەم کۆمیدییە سەرمەدییە، ئەم شانۆی مەرگەساتە، ئەم بەردەوامبوونی ئەم هەموو ئێش‌و ئازارو ئەشکەنجەیە، بەڵگەیە لەسەر بێباکی خودای گەورەو بێباك، هەروەك کوتومت، نموونەیەکە لە ژیانی ناو دۆزەخی ئەو جیهان. خوا پەنامان بدا. ئامین.

كاكـــــه! بزانـــــه: خــــودا بــــێ باكـــــه
دڵـــــت لەبەنـــــدی دنیـــــا ڕەهاكـــــه
خوشـــكی موســـوڵمان! تـــۆش وەكـــوو كاكـــه
بــــەگوێی براتكـــــه: ڕوو لــــەخودا كــــه!

دووەم: وەك هەمووومان دەزانین، جوانترینو ناسراوترین ڕاڤە نامە (شـەرح) بـۆ صەحیحی موسلیم، هەتا ئەم سەردەمە ڕاڤە نامەكەی ئیمامی نەوەوییـە، تەنانـەت دانـانی سـەر باسـەكانو نـاوی بابەتـەكانی فـەرموودەكان، لـە پلـەی یەكەمـدا دەگەڕێتەوە بۆ ئیمامی نـەوەوی، جا لـەم ڕووەوە پوختـەیێ لـە ژیاننامـەی ئیمامی نەوەوی دەنووسین:

١- ناوو نەژادو نـەسەبی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ):-

(الإمام الحافظ، الأَوْحَدُ، القُدْوَةُ، شَيْخُ الإِسْلاَمِ، عَلَمُ الأَوْلِيَاءِ، محيى الدين، أَبُـو زَكَرِيَّا يَحْيى بْنُ شَرَفٍ، الإمام الرَّبَّانِيُّ، الشافِعِيُّ الثَّانِي).

٢- مێژووی لەدایكبوونیو سەردەمی منالّی:

لەمانگی موحەررەمی ساڵی (٦٣١) كۆچیدا، لە گوندی نـەوا، لـە بـاوكو دایكێكـی زۆر باش لەدایك بووە، گوندی نەوا سەر بەشاری حۆرانە لە سووریا، كەوەك دەڵـێن: سووریا بەهەشتی خودایە لەسەر ڕووی زەوی. كەسناو (كونیە)ی (أبو زكریا). نازناو (لەقەب)ی (محیی الدین)ە.

بەمندالّی دەستی كردووە بەخوێنـدن، لەتەمـەنی دەساڵیدا دەسـتی كـردووە بـە لەبـەركردنی قورئـانو خوێنـدنی پـەڕاوەكانی شـەرع (فقـە). حـۆران، یـا حـەوران وڵاتێكی بە پیتو فەڕە، دەكەوێتە ڕووی ڕووگەی دیمەشقەوەو سەر بە دیمەشقە.

واڕێ دەكەوێ لەو دەمەدا شێخی خواناس، شێخ یاسینی مەڕاكیشی لـەوێوە ڕەت دەبێ، دەڕوانێ وا كۆمەڵێ منالّ زۆری لێ دەكەن كە لەگەڵیانا یـاری بكـات، ئـەویش لەدەستیان رادەكاو، لەبەر خۆشیەوە قورئان لەبەردەكاو دەوری دەكاتەوە.

لەبەرئەوە شێخ یاسین دەچێ بۆلای باوکی ئیمامی نەوەوی و ئامۆژگاری دەکا کە چاوی خێری لێی بێ و تەرخانی بکات بۆ خوێندنی ئایینی، ئەویش بەگوێی دەکا.

باوکی دەگێڕێتەوە: شەوی بیست و حەوتی مانگی رەمەزان بوو، نەوەوی تەمەنی حەوت ساڵان بوو، لە تەنیشتمەوە خەوتبوو، دەوری نیوە شەو خەبەری بۆوە، گوتی: (بابە! ئەم رووناکییە چییە کەوا ماڵەکەی پڕکردووە!؟).

خێزان هەموو خەبەریان بۆوە، ئێمە هیچمان نەدی. باوکی فەرمووی: ئیتر زانیم کەشەوی لەیلەتولقەدرە.

٣- دەستکردنی بە فەقێیەتی:

لەساڵی (٦٤٩)دا، دەچێ بۆ دیمەشق و لەوێ دەبێ بە فەقێ و لەوێ لە خوێندنگای رەواحییە دادەمەزرێ، بەنانی فەقێیەتی، لە قوتابخانەکەی رەواجییە دەژی، کە لەتەنیشت مەسجیدول ئەمەوییەوە دەبێ، بەچوار مانگ و نیو پەڕاوی (التنبیه) لەبەردەکا، ئەوجا لە خزمەتی باوکیدا، لەساڵی (٦٥١)ی کۆچیدا دەچێ بۆ حەج، زۆرینەی کات لەرێگە نەخۆش دەبێ و تای لێ دێ، تایەکە بەری نادا، هەتا رۆژی عەرەفە کە لەسەر کێوی عەرەفە حاجیان دەوەستن، کە رێکەوتی رۆژی هەینی دەکات!

چل و پێنج شەو لەمەدینە لە خزمەت پێغەمبەردا دەمێنێتەوە، لەپاش حەجەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دیمەشق.

خۆی دەفەرموێ: لەم ماوەیەدا، رۆژانە، دوازدە وانەم لە خزمەتی مامۆستاکانمدا دەخوێند، ئەو پەراویزو حاشیانەی کە پێویست بوون بۆ روونکردنەوەی واتاو دەربڕینە سەخت و جێگە قورسەکان، خۆم دەمنووسینەوەو کتێبەکانم خۆش دەکرد، خودای گەورە پیت و فەڕی خستە کاتەکەم، ویستم کە خەریکی پزیشکی بم، خۆم خەریك کرد بە پەڕاوی (القانون في الطبّ)ەوە کە دانراوی شێخی ئیبنو سینایە، بەڵام دڵم تاریك بوو، چەند رۆژێ نەمدەتوانی

خەریکی هیچ ببم، تەنانەت بەزەییم بەخۆما دەهاتەوە، هەتا قانوونەکەم فرۆشتو لەو بیرو بیردۆزەیە پەشیمان بوومەوە، ئیتر خودا دلی رووناك کردمەوەو ئەو حالەتەم نەما).

**دانانی کتێب:**

٤- له دەوری سالی (٦٦٠)دا، کە تەمەنی لەدەوری (٣٠) سالێدا بووە، دەست دەکا بەدانانی کتێبو پەڕاو هەتا کاتی مردن.

٥- سەرۆکایەتی مەشیخەی حەدیث:

لەسالی (٦٦٥)دا، له تەمەنی سیی‌و چوار سالێدا، دەبێ بە سەرۆکی مەشیخەی دارول حەدیث، له دیمەشق، وە هەتا کاتی مردنی لەو پایەدا دەمێنێ.

٦- زوهدو تەقوای:

پێشەوا نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) هەتا خەیاڵ برپکات، خاوەنی زوهدو وەرعو تەقوا بوو، بەواتای وشە بۆ خودا لێبڕا بوو، شێخ موحیەدین دەفەرموێ: (گلەییم لەلای کرد: کە بۆچی وا گوزەرانت لەخۆت گرانکردووە؟ له خواردنو جلو بەرگو گوزەرانا، خۆت جەڕەبابە داوە، تەنانەت ناچیتە گەرماوو حەمامیش، دەترسم کە تووشی نەخۆشی ببیتو ئەم گوزەرانە زبرە لەکارو ئیشت بکات!).

کەچی فەرمووی: (فیسارە کەس ئەوەندە بەرۆژوو بوو، وە ئەوەندە خواپەرستی کردووە، هەتا پێستی شین هەلگەڕابوو!).

نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) میوەو خەیاری نەدەخوارد، دەیفەرموو: (نەبادا جەستەم شێدار بکاو خەوم لێ بخات!).

٧- کورتەیەکی پوختی ژیانی: ئیبنو عەطار دەفەرموێ: زوهدو وەرعو کەراماتی نەوەوی ئەوەندە مەشهوورە پێویستی بەباس نییە.

ئەمەیش کورتەیەکی پوختی ژیانیەتی: (هەتا بلێیت زاهیدو دنیا نەویست بوو، لە پەرستنو عیبادەتو زیکرو یادی خوداو ویرددا قالو کولا بوو، شەو نوێژێکی زۆری دەکرد، شەوو رۆژ خەریکی خواپەرستیو کتێب دانان بوو، بەهەناسە لەخودا بێ ئاگا نەبوو، زۆر سەخی بوو، مانگانەیەکی باشی هەبوو،

هەمووی دەكرد بەخێر، ساڵ دوازدە مانگە بەرۆژوو بوو، پێنج رۆژ نەبێ، رۆژی یەكەمی جەژنی رەمەزانو چوار رۆژەكەی جەژنی قوربان، زۆرینەی كات بەوە دەژیا كە باوكی لەنەواوە بۆی دەهێناو مووچەكەی خۆی كەهی سەرۆكایەتی مەشیخەی دارولحەدیث بوو دەیكرد بەخێر.

ئەمەیش خواردنو خواردنەوەی بوو: ئێوارە رۆژووی دەشكانو ژەمی نانی ئێوارەی دەخوارد، قەت دوو پێخۆری نەدەخوارد، شەوو رۆژی یەك ژەم نانی دەخواردو بەس، لەپێش مەلا بانگانیشا، لەجیاتی پارشێو جامێ ئاوی دەخواردەوە).

ئیبنو عەططار كە فەقێی بوو، فەرمووی: لەبارەی میوەوە قسەم لەگەڵیدا كرد، كە بۆچی نایخۆیت؟

فەرمووی: (دیمەشق ئەوقافی زۆرە، خاوەن باخەكانیش زۆریان منالی هەتیونو لەژێر چاودێری كەسی تردانو زۆر لە باخەكانیش دەدرێن بە ملكانە، كە مامەڵەی وایش راجیایی تیادایە كە دروستە یانا، ئیتر چۆن دڵم بەرایی بدا كە لەشتی وا بخۆم؟!).

٨- ئەمەیش ماڵو حاڵو داراییو سامانی بوو: (ژنی نەهێناوە، منالی نەبووە، لە گۆشەی مدرسەی رەواحیەدا، لەپەنا مزگەوتا دەژیا، دیاریو دەسەنەی لەكەس وەرنەدەگرتو نەدەچوو بۆ سەر دەعوەتی كەس، مەگەر چۆنها، جارێ شێخ بورهانەدینی ئەسكەندەرانی، تكای زۆری لێ كرد، كە لەلای ئەو بەربانگ بكاتەوە، فەرمووی: بەربانگەكە بهێنە بۆ ئێرە، لێرە پێكەوە بەربانگ دەكەینەوە!

ئەمەیش هەموو سامانەكەی بوو: حەسیرێ لەسەری دەخەوت، مەوجێ لەكاتی خەودا دەیدا بەخۆیدا، گۆزەیەكی هەبوو بۆ ئاو لێخواردنەوە، مێزەرێكی خامو جبەیەكی خامو دیشداشەو دەرپێیەكی خامو جووتێ سۆلو ئاو بێنەو دەست بشۆ!!).

٩- دانراوو بەرهەمە قەڵەمییەكانی:

بەرهەمو پەڕاوی زۆرە، لەهەموویان ناودارتر:

(ڕەوضەو شەرحی صەحیحی موسلیم‌و مەجمووع‌و مینهاج‌و رياض الصّالحين‌و ئەذکارە).

١٠- **مەرگی** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ):

ئیبنو عەططار، کە ژیاننامەی نەوەوی لەشەش جزما کۆکردۆتەوە دەفەرموێ: (دەستووری مامۆستا نەوەوی وابوو: هیچی لەکەس وەرنەدەگرت مەگەر لەکەسێ، کە دڵنیابایە لە ئایین‌و نیازی پاکی‌و لەوەیش کە مەبەستی پێی سوودو کەڵکی دنیایی نییە...). ئیبنو عەططار دەفەرموێ: لەپێش مەرگیدا بەدوو مانگ، لە خزمەتیدا دانیشتبووم ئەوەندەم زانی، هەژارێ هاتە ژوورەوە بۆلای، گوتی: لەلای فیسارە شێخەوە، لە وڵاتی صەرخەد، هاتووم، سڵاوی لێ دەکردی‌و ئەم مەسینەیەی بۆت ناردووە). ئەویش وەری گرت‌و بەمنی فەرموو، لەناو جێگەی کەرەستەکانا دایبنێ. هەستی کرد کەمن سەرسامم لە قەبووڵی ئەم دیارییە، فەرمووی:

(هەژارێ تریش زەمیلەیەکی بۆم ناردووە، زەمیلەو مەسینە کەرەستەی سەفەرن!).

ئیبنو عەططار فەرمووی: لەپاش چەند ڕۆژێکی کەم لە خزمەتیدا بووم، فەرمووی: (مۆڵەتم پێدرا کەبچم بۆ سەفەر!). منیش عەرزیمکرد: چۆن؟

فەرمووی: (لێرەدا دانیشتبووم) لەو کاتەدا لە ماڵەکەی لەناو قوتابخانەی ڕەواحییەدا، دانیشتبوو، پەنجەرەیێ لەبەردەمیا بوو، دەیڕوانی بەسەر قوتابخانەکەدا، فەرمووی: (لێرەدا بەرەو قیبلە دانیشتبووم، پیاوێ بەناو هەوادا لەلای چەپی فێرگاکەوە بۆلای ڕاستی، بە بەردەمما تێ پەڕی‌و فڕی‌و فەرمووی پێم: هەڵسە بڕۆ بۆ سەردانی بەیتولەقدیس!).

ئەوجا نەوەوی بەمنی فەرموو: (هەستە بابچین ماڵاوەیی‌و خواحافیزی لە هاوەڵ‌و دۆست‌و خۆشەویستانمان بکەین!). منیش لەگەڵیدا چووم بۆ گۆڕستان‌و سەردانی گۆڕی هەندێ لە مامۆستاکانی خۆی کردو دێنی کردن‌و گریا بۆیان، ئەوجا

دێنیو سەردانی دۆستو برادەرانی، کە لەژیانا مابوون کردو بۆ سبەینێ بەیانی سەفەری کرد).

لەساڵی (٦٧٦)ی کۆچیدا، گەڕایەوە بۆ نەوا، لەپێشدا هەموو ئەو کتێبانەی کە لە ئەوقافی خواستبوو گەڕاندنیەوە بۆ ئەوقاف، وەك گوتمان رۆیشت بۆ دێنیو سەردانی گۆڕی مامۆستاکانیو بۆیان پاڕایەوەو نزای باشی کرد بۆیانو لەسەریان گریا، سەردانی دۆستو برادەرانی خۆی کردو خواحافیزی لێیان کرد، وە سەردانی باوکی لەگوندی نەواکرد، ئەوجا رۆیشت دێنیو سەردانی بەیتولمەقدیسو خەلیلی کرد، کەوان لە فەلەستین.

ئەوجا گەڕایەوە بۆ گوندی نەوا، لەوێ لەماڵی باوکی نەخۆش کەوت.

ئیبنو عەططار (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: کەبیستم نەخۆش کەوتووە لەنەوا، چووم بۆسەردانی، لە دیمەشقەوە چووم، کە چومە خزمەتی، زۆری پێ شادمان بوو، دوایی، کە خەریك بوو، تەواو چاك ببێتەوە، فەرمووی پێم: (بڕۆرەوە بۆ ناو ماڵو منالّت)، منیش گەڕامەوە بۆ دیمەشق. شەوی چوار شەممە، بیستو چواری مانگی رەجەب، ساڵی (٦٧٦) شەش سەدو حەفتاو شەشی کۆچی، لەماڵی باوکی، لەنەوا، مەرگ دەبێ بەمیوانیو لەنەوا دەنێژرێ، چلو پێنج ساڵو چەند مانگێ ژیاوە.

ئیبنو عەططار فەرمووی:

من لەسەر روخسەتی خۆی، رۆژی بیستی رەجەب بەجێم هێشت، تەندروستی زۆر باش بوو، کەچی شەوی بیستو چواری رەجەب، کە شەوی چوار شەممە بوو، فەرمانی هەق بەجێ دەهێنێو دەمرێ.

من ئەو شەوە نووستبووم، لە خەوما بینیم کەوا کەسێ، لە مزگەوتی گەورەی دیمەشق، بانگەواز هەڵ دەدا: (وەرن بۆ نوێژکردن لەسەر تەرمی فیسارە مامۆستا) خەڵکیش بەهۆی ئەم جاڕدانەوە شەڵەژان، منیش لەخەو خەبەرم بۆوە، جا بۆ شەوی هەینی پەیامی مەرگی نەوەویمان پێ گەیشت، جا لەمزگەوتی گەورەی دیمەشق نوێژی غائیبیان لەسەر کردو موسوڵمانان زۆر زۆر پەرۆش بوون بۆیو خەفەتیان خوارد بۆی. (بە هەزاران هەزار رەحمەتی خودای لێ بێ).

**یادی پیاو چاکان ڕەحمەتی لێ دەبارێ:**

باوکم حاجی فارس حەمە خان حەسەن موصطەفا حەنیف، لەماڵی خۆمان لە سلێمانی، لە گەڕەکی چوارباغ، زۆر نەخۆش بوو، ماوەیێ لەسەرجێ کەوت، گایەکی کڕیبوو بۆ خێر، فەرمووی پێمان: (سەری ببڕن، با لەپێش خۆمەوە ڕەوانەی بکەم). منیش عەرزیمکرد: بۆ چاوەڕوانی ڕۆژی هەینی نەکەین، کە ڕێکەوتی ڕۆژێکی پیرۆز دەکا!

فەرمووی: فریا ناکەوێ، من ناگەمە ڕۆژی هەینی دەمرم!).

لەم کاتەدا باوکم دەستی کرد بەگریان، عەرزیمکرد: باوە! بۆچی دەگری؟ تۆ، لەخودا بەزیادبێ، حەجت کردووە، عەمرەت کردووە، سەردانی گۆڕی پێغەمبەرت کردووە، نوێژو ڕۆژوو قایم بووی، بەشی خۆت، سوپاس بۆ خودا، چاکەو باشەت لەپێش خۆتەوە ڕەوانە کردووە. فەرمووی: من لەمردن ناترسم، بەلام بۆ ئەوە دەگریم کە لەئێوە جیادەبمەوە، بەڕاستی هیچ شتێ وەك جیابوونەوە لە خۆشەویستانو موفارەقەی ئەحباب ناخۆش نییە). ئەوکاتە دوو خوشکم هەبوو، ناویان عائیشەو خاوەر بوو، لە گوندەکەی خۆمان لە برایماوە شوویانکردبوو، لەوێ مابوون، دوو ڕۆژبوو هاتبوون بۆلای باوکم.

ئامۆزایەکی باوکم هەبوو، ناوی دادە ڕەحەی لالە عەزیز بوو، دادە ڕەحە هاوسەری حاجی ئەو ڕەحیمی برایماوەیی بوو، حاجی ئەو ڕەحیمو حەمەی ئەولا، کە خزمو دۆستی باوکم بوون، چەند ساڵێ بوو، مردبوون.

ئەو شەوەی کە باوکم عەمری خودا دەکا، دادە ڕەحە خەو دەبینێ: (حاجی ئەورەحیمی مێردیو حەمەی ئەولا، لەکانی ئەحمەد بەگ خەریکن دەستنوێژ دەگرن، پێیان دەڵێ: ئەوە خێرە کەوان لێرە؟). دەڵێن: حاجی فارسی حەمە خان مردووە، ئەچین بۆلای ئەو). کانی ئەحمەد بەگ والەسەر شاخی دارەغا، لەسەر ڕێگەی برایماوە سلێمانی. ئیتر دادە ڕەحە هات بۆلای باوکم، بەقسە فریای نەکەوت بەلام فریای تەرمەکەی کەوت.

مـــــردن بەوێنــــــەی راوچـــــــی شــــــارەزا
بــــــۆ پـــــاکۆی رۆحمــــــان وا نــــــەپارێزا
هەرکـــــەس نـــــاو دێـــنین لــــە دۆســــت و یـــاران
یـــــا وا لەجێـــــدا، یـــــا وا لەقـــــەبران
ئێمـــــە گیـــــای مـــــەرگین، پیاڵـــــەی دەنۆشـــــین
هاکاشـــــایی ژیـــــن، بـــــوو بـــــە زاری و شـــــین
ئـــــەی خـــــودا! رەحمـــــێ بکـــــە بـــــە حاڵمـــــان
گـــــۆڕی ئـــــاگرین، نـــــەبێ بـــــە ماڵمـــــان!

| ژمارەی فەرمووده | ناوی خاوەن ژیاننامه | ژمارەی زنجیرەیی |
|---|---|---|
| ١٧١٠ | ئەبو دوجانه: سەماکی کوڕی خەرەشه | ٢١١ |
| ١٧١١ | ئەبو سوفیان: صەخری کوڕی حەرب باوکی موعاوییه | ٢١٢ |
| ١٧١٢ | جولەیبیب | ٢١٣ |
| ١٧١٥ | مەسرووقی کوڕی ئەجدەع | ٢١٤ |
| ١٧٢٠ | ئوم بەشیر کچی برائی کوڕی مەعروور | ٢١٥ |
| ١٧٣٣ | خوفافی کوڕی ئەیمای غیفاری‌و ئەیمای کوڕی رەحەضه | ٢١٦ |
| ١٧٣٤ | ئەقرەعی کوڕی حابیس. خۆی‌و دە کوڕی لە غەزای یەرمووکا شەهید دەبن | ٢١٧ |
| ١٧٤٨ | ئووەیسی قەرەنی | ٢١٨ |
| ١٧٥٠ | ئەبو بەرزەی ئەل-ئەسلەمی | ٢١٩ |
| ١٧٩٢ | سولەیمانی کوڕی صورەد | ٢٢٠ |
| ١٧٩٤ | نەوواسی کوڕی سەمعان | ٢٢١ |
| ١٨٤٠ | ئوم کولثووم: کچی عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیط | ٢٢٢ |
| ١٨٤٨ | حوذەیفەی کوڕی ئوسەید | ٢٢٣ |

| ۲۲٤ | ئەبو مالیکی ئەشجەعی | ۱۸۷۲ |
|---|---|---|
| ۲۲٥ | طاریقی کوڕی ئەشیەم | ۱۸۷۲ |
| ۲۲٦ | سعدی کوڕی طاریقی کوڕی ئەشیەم | ۱۸۷۲ |
| ۲۲۷ | حەنظەلەی ئەل‌ئوسەیدی | ۱۸۸۷ |
| ۲۲۸ | جووەیریەی کچی ئەلحارث/ هاوسەری پێغەمبەر | ۱۹۰۳ |
| ۲۲۹ | ژیاننامەی ئیمامی موسلیم | ۱۹۰۹ |
| ۲۳۰ | الأغَرّ المزنی | ۱۹۱٦ |
| ۲۳۱ | ئەبو ئومامەی ئەلباهیلی = صدی بن عجلان | ۱۹۳٦ |
| ۲۳۲ | موحەممەدی کوڕی شیرین = ئیبنو سیرین | ۱۹٥۷ |
| ۲۳۳ | ئەبو عەمری باوکی ئیبنو سیرین | ۱۹٥۷ |
| ۲۳٤ | عییاضی کوڕی حیماری موجاشیعی | ۱۹۷۳ |
| ۲۳٥ | ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) | ۱۹۸٦ |



# ٦٤- نامەی فەرتەنە گەلو ئاژاوەکان

{بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، لاپەڕە: ٥٢٢ لە ژمارە: (٥٤٨١)ەوە هەتا ژمارە: ٥٦٣٣ لە زنجیرە: ١١٦ هەروا بڕوانە: تەجریدی بوخاری بە کوردی، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٩٤ لە ژمارە: (٢٠٩٢)ەوە هەتا ژمارە: ٢١٠٣}.

تەجریدی بوخاری = پوختەی صەحیحی بوخاری کە ناسراوە بە (مختصر صحیح البخاری) دانراوی: ئەبولعباس زین الدین الزبیدی.

## ١٥٢٣) نزیکبوونەوەی فەرتەنەو ئاژاوە گەورەکانو سەر تیاچوونو لەناوچوون کاتێ گەندەڵیو چەپەڵی پەرەی سەندو زۆر بوو

## بَابٌ: فِي اقْتِرابِ الفِتَنِ وَالهلاَكِ إذَا كَثُرَ الخَبَثُ

١٩٨٧- عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) اسْتَيْقَظَ مِنْ نَوْمِهِ وَهُوَ يَقُولُ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ، مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ». (وَعَقَدَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ عَشَرَةً). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: «نَعَمْ إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ». {الحديث: ٧١٦٤ = ٧١٩١ فم: ف.م = فتح الملهم شرح صحيح الإمام مسلم رحمة الله تعالى. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري بالكوردي/٤، رقم: ١٣٤١ = ٣٣٤٦، ٣٥٩٨، ٧٠٥٩، ٧١٣٥ فتح الباري. ترمذي. فتن: ٢١٨٧. ابن ماجة. فتن: ٣٩٥٣. تحفة الأشراف: ١٥٨٨٠}:

زەینەبی کچی جەحش، هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرانی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەو ڕاپەڕیو هات بۆلام، ڕووی سوور هەڵگەڕابوو، شەڵەژابوو، دەیفەرموو: {لا إلهَ إلاَّ الله، (بەڕاستی سەیرە!) هاوار لە خۆم بۆ عەرەب، بۆ ئەم شەڕەی کەوا بەرەو پیریان دێ، وای لەم ڕۆژە ڕەشەی کە یەخەی عەرەب دەگرێ، ئەمڕۆکە لەبەربەست (سەدد)ی یەئجووجو مەئجووج، بەقەد ئەمە کون بوو!}.

سوفیان کە مامۆستای عەمری ناقیدی مامۆستای ئیمامی موسلیمە (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) هێمای ژمارەی دەی کێشا بەم شێوەیە: سەری پەنجەی شایەتمانی خۆی نوساند بە گرێی پەنجە کەڵەیەوەو کردی بە ئەڵقەیەکی بچکۆلەو، نیشانیدا، کە مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئاماژەکەی، شتێکی زۆر کەم بووە، وەك ئەم ئەڵقە بچکۆلەیە، کە بریتییە لە کونێکی بچکۆلە.

زەینەب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر پیاو چاکانیشمان تیادابێ هەر دەفەوتێین‌و لەناو دەچین؟ فەرمووی: (بەڵێ، کە پیسی‌و گەندەڵی پەرەی سەند!). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٨١ — نامەی فەرتەنەو گەل‌و ئاژاوەکان} .

**ڕونکردنەوە:**

زەینەبی کچی جەحش، پورزای پێغەمبەر بوو، لە پێشا ناوی بەرڕە بوو، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) مارەیکرد، ناوەکەی گۆڕی بە زەینەب، یەکێکە لە دایکانی بڕواداران، ژنێکی زۆر خوا پەرست بوو، شەو نوێژی زۆری دەکرد، ڕۆژووی زۆری دەگرت، کاری دەکردو دەیکرد بە خێر، عائیشە دەفەرموێ: زەینەب ژنێکی دەست ڕەنگین بوو، کەوڵی خۆش دەکرد، دروومانی دەکرد، کوندەو مەشکەی پینە دەکرد، کرێکەی وەردەگرت‌و دەیکرد بە خێر. کاتێ پێغەمبەر گواستیەوە لە تەمەنی (٣٥) سی‌و پێنج ساڵیدا بوو، ساڵی بیستی کۆچی لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا وەفاتی کرد، کە لەو ساڵەدا، لەسەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەردا، وڵاتی میصر ئازاد کرا، یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بوو، کە لەپاش مەرگی پێغەمبەر بمرێت، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ). {بڕوانە: ژمارە: ١٦٧٥ لە زنجیرە: ١٢٨٠ لە پێشەوە ڕۆیشت} + {تاج/٣، زنجیرە: ٤٠، لە ژمارە: ٣٤٤٣ هەتا ٣٤٤٤} + {تەجریدی بوخاری/٣، رقم: ١١٠٧ = ٢٩٩٣ + رقم: ١١٢١ = ٢٦٦١ فتح الباری} + {مختصر صحیح مسلم رقم: ٢١٥٣ = ٦٩٥١ صحیح مسلم} .

١٩٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ». وَعَقَدَ وُهَيْبٌ بِيَدِهِ تِسْعِينَ. {الحديث: ٧١٦٨ = ٧١٩٥ فم = ف.م = فتح الملهم شرح صحيح مسلم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمڕۆ لەبەربەستی یەئجووجو مەئجووج بەقەی ئەمە کونی تێبوو).

وهەیب کە لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا، مامۆستای مامۆستای مامۆستاکەی شێخی موسلیمە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) هێمای ژمارەی نەوەدی کێشا، بەم شێوەیە: سەری پەنجەی شایەتمانی خۆیی نووساند بە بنی پەنجە کەڵەیەوە لە دیوی ناوەوە، پیشانیدا کە مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئاماژەکەی، کونێکی زۆر بچکۆلە بووە، وەك ئەم ئەڵقەیەی کەمن بەم دوو پەنجەیەی دەستی ڕاستم کێشامو پیشانی ئێوەم دا.

## ١٥٢٤) داباریـنی ئاژاوەو ئاشووب وەك لێزمەی باران. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

## بَابٌ: فِي نُزُولِ الْفِتَنِ كَمَوَاقِعِ الْقَطْرِ

١٩٨٩- عَنْ أُسَامَةَ بْن زيد (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَشْرَفَ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ قَالَ: «هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى؟ إِنِّي لأَرَى مَوَاقِعَ الْفِتَنِ، خِلَالَ بُيُوتِكُمْ كَمَوَاقِعِ الْقَطْرِ». {الحديث: ٧١٧٤ = ٧٢٠٢ فم}:

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ لەسەر قەڵایێ لە قەڵاکانی مەدینە سەرنجی دەوروبەری داو فەرمووی: (ئەرێ ئەوەی کە من دەیبینمو چاوم لێیەتی، ئێوەیش دەیبیننو چاوتان لێیەتی؟).

یاران عەرزیان کرد: نەء، هیچ نابینین. فەرمووی: (دەسا من دەبینم کە کوشتنو ئاشوبو بگرەو بەردەو کوشتو بڕ، وەك دڵۆپی لێزمەی باران، لەناو کووچەو کۆڵانو ماڵەکانتانا بە خوڕەم دادەبارێن!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٣١٩٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەوەبوو وابوو لە پاش مەرگی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) ئاشووب و فەرتەنە بەرپابوو، وەك كەری دەروێش سەری دەكرد بە هەموو ماڵێكا، بە كوشتنی ئیمامی عوثمان دەستی پێكرد، شەڕی جەمەل قەوما، هەروا صفین، هەروا هەرای ئەلحەررە بەرپابوو، حوسەین شەهید بوو...... تاد

**١٥٢٥) ئاشوب وەك نەخش لە دڵ دەكێشرێ و دەبێ بەخاڵی رەش بۆی.**

(٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

**باب: عَرْضُ الفِتَنِ عَلَى القُلُوبِ وَنَكْتُهَا فِيهَا**

١٩٩٠- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ فَقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ؟ فَقَالَ قَوْمٌ: نَحْنُ سَمِعْنَاهُ. فَقَالَ: لَعَلَّكُمْ تَعْنُونَ فِتْنَةَ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَجَارِهِ؟ قَالُوا: أَجَلْ. قَالَ: تِلْكَ تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ، وَلَكِنْ أَيُّكُمْ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ الَّتِي تَمُوجُ مَوْجَ الْبَحْرِ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: فَأَسْكَتَ الْقَوْمُ، فَقُلْتُ: أَنَا. قَالَ: أَنْتَ لِلَّهِ أَبُوكَ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «تُعْرَضُ الْفِتَنُ عَلَى الْقُلُوبِ كَالْحَصِيرِ عُودًا عُودًا فَأَيُّ قَلْبٍ أُشْرِبَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، وَأَيُّ قَلْبٍ أَنْكَرَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ بَيْضَاءُ، حَتَّى تَصِيرَ عَلَى قَلْبَيْنِ: عَلَى أَبْيَضَ مِثْلِ الصَّفَا فَلاَ تَضُرُّهُ فِتْنَةٌ مَا دَامَتِ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ، وَالآخَرُ أَسْوَدُ مُرْبَادًّا كَالْكُوزِ مُجَخِّيًا، لاَ يَعْرِفُ مَعْرُوفًا وَلاَ يُنْكِرُ مُنْكَرًا، إِلاَّ مَا أُشْرِبَ مِنْ هَوَاهُ». قَالَ حُذَيْفَةُ: وَحَدَّثْتُهُ أَنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا يُوشِكُ أَنْ يُكْسَرَ. قَالَ عُمَرُ: أَكَسْرًا لاَ أَبَا لَكَ، فَلَوْ أَنَّهُ فُتِحَ لَعَلَّهُ كَانَ يُعَادُ، قُلْتُ: لاَ بَلْ يُكْسَرُ. وَحَدَّثْتُهُ أَنَّ ذَلِكَ الْبَابَ رَجُلٌ يُقْتَلُ أَوْ يَمُوتُ، حَدِيثًا لَيْسَ بِالأَغَالِيطِ. قَالَ أَبُو خَالِدٍ: فَقُلْتُ لِسَعْدٍ: يَا أَبَا مَالِكٍ مَا أَسْوَدُ مُرْبَادًّا؟ فَقَالَ: شِدَّةُ الْبَيَاضِ فِي سَوَادٍ. قَالَ: قُلْتُ فَمَا الْكُوزُ مُجَخِّيًا؟ قَالَ: مَنْكُوسًا».

{الحديث: ٣٦٥، ٧١٩٧ = ٧٢٢٥ فم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية/١، رقم: ٣١٠ = ٥٢٥، ١٤٣٥، ١٨٩٥، ٣٥٨٦، ٧٠٩٦، فتح الباري. ترمذي. فتن: ٢٢٥٨ ابن ماجة. فتن: ٣٩٥٥. تحفة الأشراف: ٣٣٣٧}

حوذەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی عومەردا دانیشتبووین (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کامتان بە گوێی خۆی باسو خواسی ئاشووبو فەرتەنەکانی لەزاری پیرۆزی حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە؟

پیاو گەلێ فەرموویان: ئێمە لێمان بیستووە.

عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕەنگ بێ ئێوە وابزانن کە مەبەستم فیتنەو ئاژاوەی ئەو جۆرە پیاوانە بێ! کە بەدەست خاوو خێزانو هاوسای خۆیانەوە گرفتار دەبن. گوتیان: بەڵێ، مەبەستمان ئەوەیە. عومەر فەرمووی: نا، من مەبەستم ئەوە نییە، چونکە ئەوە نوێژو ڕۆژوو خێرکردن پاکی دەکاتەوە بەڵام کامتان باسو خواسی ئەو فیتنەو فەرتەنەیەتان لە حەزرەت ژنەوتووە، کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدا؟

حوذەیفە فەرمووی: خەڵکەکە کشو مات بوون، من گوتم: من لێیم بیستووە، فەرمووی: کوڕە! تۆ باوکیشت مەردی خودا بوو بۆیە ڕۆڵەی وەك تۆی لێکەوتۆتەوە. گوتم: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم بیست فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (وەك چۆن حەسیر تەڵ تەڵ دەچنرێو کاتێ کەسێ لەسەری بخەوێ، قامیشو تەڵی چینەکانی دەچەقێنە لاتەنیشتی خەوتوو، وە چاڵو چوێڵی دەکەنو وەك نەخش دەینەخشێنن، ئاشووبو ئاژاوەو فەرتەنەیش، ئاوەها چین لەدوای چین دەچەقنە تەنیشتی دڵ، جا هەر دڵێ بە ئاشووبو فەرتەنە گۆش بکرێ، نوختەیەکی ڕەشی لێ هەڵ دەکەنرێ، ئەو دڵەیشی ئاشووبو فەرتەنەی نەوێ، خاڵێکی سپی لێ دەنەخشێنرێ، هەتا سەرەنجام دڵان دەبن بەدوو بەشەوە: جۆرێکیان پاكو سپییە، وەك بەردی مەڕ مەڕی ساخی ساف وایە، قایمو مەحکەمەو هەمیشە پاکەو چڵك هەڵناگرێ، تا جیهان جیهانە ئاژاوە زیانی پێ ناگەیەنێ، جۆرەکەی تریشیان ڕەش باوێکی ڕەش دێزی ڕەش بۆرە، وەك گۆزەو دیزەی دەمەو نخوون وایە، هەواڵی چاکەو خراپە نازانێ، هەر خەریکی کەیفو هەوەس بازیو ئارەزوو بازیی خۆیەتی!

حوذەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم بە عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ): کە لەنێوانی تۆو ئەو ئاشووبو فەرتەنەیەدا، دەرگایێ هەیە هێشتا داخراوە، بەلاّم هاکا شکاندیان، عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبابی خۆت کەوێ، گوتت: ئەو دەرگایە دەشکێنرێ؟ بریا هەر هیچ نەبایە بکرایەتەوە باشتر بوو، چونکە ئومێد هەبوو کە پێکەوە بدرێتەوە؟

حوذەیفە فەرمووی: گوتم: نەخەیر، بەلّکوو دەشکێنرێ، ئەوەیشم پێی گوت کە مەبەست لەو دەرگایە پیاوێکە یا دەکوژرێ یا دەمرێ (ئەو پیاوەیش عومەر خۆی بوو، کە بە شەهید بوونی ئەو دەرگای فەرتەنەو ئاشووبو ئاژاوە شکاو ئیتر لەوساکەوە هەتا ئێستا، فەرتەنەو ئاژاوە، هەر ڕۆژەی بەناوێکەوەو لە شێوەیەکا، لەناو گەلی ئیسلامدا سەر هەلّدەدا).

حوذەیفە فەرمووی: قسەی ڕاستو دروستو دۆغریم بۆ عومەر کرد، نەوەك قسەی بێ سەرو بەرو بێ سەرو بنو هەلّەشەو پەلّەشە!

ئەبو خالید دەفەرموێ بە سەعیدی مامۆستامم گوت: ئەی باوکی مالیك! واتای ئەم ڕستەیە چییە (وَالآخَرُ أَسْوَدُ مُرْبَادًّا)؟ فەرمووی: (ئەوی تریان بازوویەکی ڕەش بۆزە) فەرمووی: پێشم گوت: ئەی واتای (الْكُوزِ مُجَخِّيًا) چییە؟ فەرمووی: واتە: وەك گۆزەو دیزەی دەمەو نخوون کراو. {تاج/٥، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٥٥١٦ — سەرەتای بەرپابوونی فەرتەنەکان ← بڕوانە: ژمارە: ٢٠٣٥ لەدواوە دێت}.

### ١٥٢٦) شەیتان کۆمەلّ کۆمەلّ لەشکری خۆی بۆ تێکدانو تێکبەردانی خەلّك لە یەکتری دەنێرێ. (٧٠٣٤ - ٧٠٤١)

### بَابٌ: بَعْثُ الشَّيْطَانِ سَرَايَاهُ يَفْتِنُونَ النَّاسَ

١٩٩١- عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، فَيَقُولُ: مَا صَنَعْتَ شَيْئًا. قَالَ: ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى

فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ، قَالَ: فَيُدْنِيهِ مِنْهُ وَيَقُولُ: نِعْمَ أَنْتَ ». قَالَ الأَعْمَشُ أُرَاهُ قَالَ « فَيَلْتَزِمُهُ ». {الحديث: ٧٠٣٧ = ٧٠٦٢ = ف.م = فتح الملهم شرح صحيح مسلم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەهریمەن (واتە: ئیبلیس. واتە: شەیتان) تەختو بارەگای حوکمڕانی خۆی، دوور لە ئاوەدانی لەسەر رووی ئاوی دەریا هەڵ دەدا، ئەوجا لەوێوە لەشکرو دەستو پێوەندو پێکوڕەو وەچەی خۆی بەهەر چوار لادا دەنێرێ، بۆ ئاژاوە نانەوەو خراپە بەرپا کردن، ئیتر کامەیان ئاژاوەو فەرتەنەی گەورەتر بەرپا بکا، پایەی ئەوەیانە لەخۆیەوە نزیك دەکاتەوە، جا هەیانە لە دەستەو بەستەو ئەڵقە بە گوێکانی، دەگەڕێتەوە بۆ لایو پێی دەڵێ: جا ئەوە چییە، ئەگەر وابێ هیچت نەکردووە! ئیتر هەروەها بەرودوا، دێنەوە بۆلایو دەڵێن: ئەم خراپەیەو ئەم خراپەیەمان بەمو بەو کرد، بەڵام هیچی بەدڵی شەیتان نابێ، تا یەکێکیان دێتەوە دەڵێ: من لە کوڵکی ئەو پیاوە نەبوومەوە هەتا ژنەکەیم پێ تەڵاق دا).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیتر شەیتان ئەوەیان لەخۆی نزیك دەکاتەوەو پێی دەڵێ: ئافەریم بۆ خۆت تۆ زۆر باشیتو بەدڵی منیت).

ئیمامی ئەعمەش، کە کەسی سێیەمە، لە رشتەی ئەم فەرموودەیەدا فەرمووی: وا دەزانم فەرمووشی: (شەیتان لەخۆشیانا دەست دەکاتە ملی ئەوەیان کە دەڵێ: ژنەکەم بە مێردەکەی تەڵاقدا، ئەوەندە کارەکەی ئەوی بەلاوە پەسەند دەبێ).
{تاج/٥، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٥٢٥٣ — باسی شەیتانو سوپای شەیتان}.

شەیتان و دەستەی شەیتان ئەوەندە
چەشە دادەنێن، بۆ راوی بەندە
چییەو چی نییەو، یا چۆنەو چەندە؟
زەهری کوشندە: لە شێوەی قەندە!

## ١٥٢٧) ئاشووبو شێوەكانی. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

## بابٌ: فِي الفِتَنِ وَصِفَاتِهَا

١٩٩٢- عَنِ ابْنِ إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِىَّ كَانَ يَقُولُ قَالَ حُذَيْفَةُ بْنُ الْيَمَانِ وَاللَّهِ إِنِّى لأَعْلَمُ النَّاسِ بِكُلِّ فِتْنَةٍ هِىَ كَائِنَةٌ فِيمَا بَيْنِى وَبَيْنَ السَّاعَةِ وَمَا بِى إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَسَرَّ إِلَىَّ فِى ذَلِكَ شَيْئًا لَمْ يُحَدِّثْهُ غَيْرِى وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ وَهُوَ يُحَدِّثُ مَجْلِسًا أَنَا فِيهِ عَنِ الْفِتَنِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَهُوَ يَعُدُّ الْفِتَنَ « مِنْهُنَّ ثَلاَثٌ لاَ يَكَدْنَ يَذَرْنَ شَيْئًا وَمِنْهُنَّ فِتَنٌ كَرِيَاحِ الصَّيْفِ مِنْهَا صِغَارٌ وَمِنْهَا كِبَارٌ ». قَالَ حُذَيْفَةُ فَذَهَبَ أُولَئِكَ الرَّهْطُ كُلُّهُمْ غَيْرِى.{الحديث: ٧١٩١ = ٧٢١٩ فم}:

ئەبو ئیدریسی خەولانی فەرمووی: حوزەیفەی كوڕی یەمان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەزاتێ كە زاتی خودایە لەم ڕۆوە هەتا ڕۆژی قیامەت هەرچی فیتنەو فەرتەنەیێ ڕوو دەدات، من لەهەموو كەسێكی تر باشتری لێ دەزانم، ئەمەیش لەبەرئەوە نییە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە قسەی بۆ كەسی تر نەكردبێ، نەء لەبەر ئەمە نییە، بەڵام جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو كۆڕێكی دانیشتندا، كەمن خۆم لەوێ دانیشتبووم باسی گەلێ فیتنەو ئاشووبو فەرتەنەی بۆمان كرد، دەستی كرد بە ژماردنیانو فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (سێ ئاشووب لەو ئاشووبانە كەم شت لێیان ڕزگار دەبێ، هەندێكیشیان وەك بای هاوین وان، پڕن لە زەرەرو زیانو ئێشو ئازار بۆ هەمووان، وردو درشتیان هەیە).

حوزەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو دەستەیە، كە لەو كۆڕەدا بوون، من نەبێ كەسیان نەماون، هەر لەبەر ئەوەیە كە دەڵێم: من لەهەموو كەسێ باشتری لێ دەزانم. {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٤٩٩ — خەبەردان لە فیتنە گەلو جۆرەكانی}.

١٩٩٣- عَنْ حُذَيْفَةَ -رضي الله عنه- قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مَقَامًا مَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِى مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ حَدَّثَ بِهِ حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابِى هَؤُلاَءِ وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّىْءُ قَدْ نَسِيتُهُ فَأَرَاهُ فَأَذْكُرُهُ كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ. {الحديث: ٧١٩٢

= ٧٢٢٠ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٤٤ تجريد = ٦٦٠٤. أبو داود. فتن: ٤٢٤٠. تحفة الأشراف: ٣٣٤٠}:

**حوزەیفە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هەڵسایەوە لەسەر دوانگە (مینبەر) وتارێکی گرنگی دوورو درێژی بۆماندا، لەناو ئەو وتارەدا، هەرچی ڕوویدا بوو، لەوەو پێش‌و هەرچی ڕوودەدا لەوەو پاش هەتا ڕۆژی قیامەت، هەمووی باسکرد بۆمان، ئیتر ئەوەی لە یادی مابێ ئەوا لە یادی ماوەو گەنجینەی ڕازو نهێنییەکان بوو بەماڵی، ئەوەیشی لە یادی چووبێتەوە، ئەوا لە یادی چووەتەوەو گەنجی ناو ئەو گەنجینەیەی بەفیڕۆ داناوە!**

**ئەم برادەرانەی من ئەم باسە زۆر باش دەزانن، چونکە ئەوانیش وەك من ئامادەی بیستنی ئەو وتارە بوون، من بەش بە حاڵی خۆم جاری وادەبێ شتێ لەو بابەتانە کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەو وتارەدا باسیانی کرد، ڕوودەدا، من لەبیرم نەماوە، بەڵام کە ڕوودەدات‌و دەیبینم، ئەوجا یادم دەکەوێتەوەو لە دڵی خۆمدا دەڵێم ئەمە ئەوەیە کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لە وتارەکەیدا باسی کرد بۆمان، وەکوو چۆن پیاوێ لەپاش ماوەیێ چاوی بە چارەی پیاوێکی ناسیاوی خۆی بکەوێتەوە، کە لەیادی نەمابێ، بەڵام کە دەیبینێ دیسانەوە دەیناسێتەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٤٩٨}.**

**١٩٩٤- عَنْ حُذَيْفَةَ -رضي الله عنه- أَنَّهُ قَالَ أَخْبَرَنِى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ فَمَا مِنْهُ شَىْءٌ إِلاَّ قَدْ سَأَلْتُهُ إِلاَّ أَنِّى لَمْ أَسْأَلْهُ مَا يُخْرِجُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ. {الحديث: ٧١٩٤ = ٧٢٢٢ فم}:**

**حوزەیفە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: هەتا ڕۆژی هەستانەوە (قیامەت) دێت، هەرچی کارەساتێ ڕوو دەدا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بەمنی فەرمووە، شتێ نییە کە نەیم پرسیبێ لێی، بەڵام ئەوەم لێی نەپرسی کەچی خەڵکی مەدینە لە مەدینە دەردەکات). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٥٠٠ — خەبەردان لە فیتنە گەل‌و ...}.**

١٩٩٥- عَنْ أَبِى زَيْدٍ - يَعْنِى عَمْرو بْنَ أَخْطَبَ - قَالَ صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- الْفَجْرَ وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الظُّهْرُ فَنَزَلَ فَصَلَّى ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الْعَصْرُ ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ فَأَخْبَرَنَا بِمَا كَانَ وَبِمَا هُوَ كَائِنٌ فَأَعْلَمُنَا أَحْفَظُنَا.{الحديث: ٧١٩٦ = ٧٢٢٤ فم}:

ئەبو زەید (واتە: عەمری کوڕی ئەخطەب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەر نوێژیی نوێژی بەیانی بۆ کردین، ئەوجا سەرکەوتە سەر دوانگەکەو دەستی کرد بە وتاردان بۆمانو دوانی بۆداین هەتا نوێژی نیوەڕۆ داهات، ئەوسا لە دوانگەکە دابەزیو نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردینو، دیسان سەرکەوتەوە سەر دوانگەکەو دەستی کردەوە بە خوتبەدانو وتاردان هەتا نوێژی عەصر بوو، ئەنجا هاتەوە خوارەوەو نوێژی عەصری بۆمان کردو دیسانەوە چووەوە سەر دوانگەکەو دەستی کردەوە بە وتاردان بۆمان هەتا خۆر ئاوابوو، ئەوەی لەوەو پێش رووی داوەو ئەوەی لەمەودوا روودەدا، هەواڵی گشتی پێمان فەرموو، جا لەسەر ئەم بنیاتە زاناترینی ئێمە ئەوەمانە، کە زۆرتری لەو فەرمایشتانەی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لەبەر ماوەو رەوانی کردووە). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٥٠١ — خەبەردان لە فیتنە گەڵو جۆرەکانی} + {ریاض/٤، ژمارە: ١٨٦١}.

**روونکردنەوە:**

ئەبو زەید ناوی عەمری کوڕی ئەخطەبی کوڕی ریفاعەی ئەنصاری خەزرەجییە، بە ئەبو زەید زیاتر ناسراوە، سیازدە غەزای لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا کردووە، نیشتەجێی بەصرە بوو، تەمەنی لە سەد ساڵ زیاتر بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نزای لاویو گەنج بوونەوەی کرد بۆی، هەتا مرد تەڵێ لە سەرو ریشی سپی نەبوو بوو.

**١٥٢٨) باسی ئاشووبو ئەوانەی کە کاتی ئاشووبەکانیان دەزانی.** (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

**بَابٌ: فِي الفِتَنِ وَمَنْ يَحْفَظُهَا**

١٩٩٦- عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ قَالَ جُنْدُبٌ جِئْتُ يَوْمَ الْجَرَعَةِ فَإِذَا رَجُلٌ جَالِسٌ فَقُلْتُ لَيُهَرَاقَنَّ الْيَوْمَ هَا هُنَا دِمَاءٌ. فَقَالَ ذَاكَ الرَّجُلُ كَلاَّ وَاللَّهِ. قُلْتُ بَلَى وَاللَّهِ. قَالَ كَلاَّ وَاللَّهِ. قُلْتُ بَلَى وَاللَّهِ . قَالَ كَلاَّ وَاللَّهِ إِنَّهُ لَحَدِيثُ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- حَدَّثَنِيهِ. قُلْتُ بِئْسَ الْجَلِيسُ لِي أَنْتَ مُنْذُ الْيَوْمِ تَسْمَعُنِي أُخَالِفُكَ وَقَدْ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَلاَ تَنْهَانِي ثُمَّ قُلْتُ مَا هَذَا الْغَضَبُ فَأَقْبَلْتُ عَلَيْهِ وَأَسْأَلُهُ فَإِذَا الرَّجُلُ حُذَيْفَةُ. {الحديث: ٧٢٠٠ = ٧٢٢٨ فم}:

موحەممەد (واتە: ئیبنو سیرین) (رەحمەتی خودای لێ بێ)، فەرمووی: جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سوفیانی بەجەلی، کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو (درووودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لە هاوەڵانی) فەرمووی: لە رۆژوی ئەلجەرەعەدا، کە خەڵکی کووفە چوون لەو شوێنەدا پێشیان لەو کاربەدەستە گرت کە ئیمامی عوثمان کردبووی بە گەورەی سەر کووفەو ئەوانیش قەبوڵیان نەبوو، گێڕایانەوەو داوایان لە عوثمان کرد کە لەباتی ئەو ئەبو مووسای ئەشعەرییان بۆ بنێرێ، ئەویش وایکرد.

ئیبنو سیرین فەرمووی: جوندوب فەرمووی: رۆژی جەرەعە کە شوێنێکە لە نزیك کووفەوە دەکەوێتە سەر رێگەی ئەلحیرە، منیش چووم، روانیم وا پیاوێ لەوێ دانیشتووە، منیش لەبەر خۆمەوە بە مەزەندەی عەقڵ گوتم: بەخودا بەزەینم ئەمڕۆ لەم شوێنەدا لەنێوانی خەڵکی کووفەو لایەنگرانی ئەم سەرەك شارە تازەیە دەبێ بە شەڕو خوێنێکی زۆری تیا دەڕێژرێ.

کەچی پیاوە دانیشتووەکە گوتی: نا بەخودا شتی وانییە، منیش گوتم: بەرێ بە خودا، شتی وا روودەدا، دووبارە گوتیەوە: نا بەخودا شتی وانییە، منیش دووبارە گوتمەوە: بەرێ بەخودا شتی وا هەیە، سێ بارە فەرمووی: نا بەخودا شتی وانییە، چونکە من لە خۆمەوە وانالێم، بەڵکوو سەبارەت بە هەڵوێستی ئەمڕۆ من

فەرموودەیەکم لە خودی پێغەمبەر بیستووە، کە ناوەڕۆکی ئەو فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ، کە هێشتا ماوەیەتی بۆ بەرپابوونی فەرتەنەو ئاشووبی ناوخۆیی موسوڵمانان!!

منیش گوتم دەی وابێ، تۆ هاونشینێکی خراپی بۆ من، ئەوەتا گوێت لەمنە، جار لەدوا جار سوێند دەخۆم کە شەڕ ڕوودەدات، کەچی جڵەو گیریم لێ ناکەیت؟! ئەوجا لەدڵی خۆما گوتم: ئەم تووڕە بوونەی بۆچییە؟ بابچم پرسیاری لێ بکەم، کە چووم سەیرم کرد ئەمە حوزەیفەی کوڕی یەمانە، کە شارەزاییەکی تەواوی هەیە، سەبارەت بە ئاژاوەو ئاشووبو فەرتەنەکان!

**١٥٢٩) سەرەتای ئاژاوەکان لەلای خۆرهەڵاتی شاری مەدینەوە سەر هەڵ دەدەن.**

(٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

**بَابٌ: الْفِتْنَةُ نَحْوَ الْمَشْرِقِ**

١٩٩٧- عَنْ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: يَا أَهْلَ الْعِرَاقِ مَا أَسْأَلَكُمْ عَنِ الصَّغِيرَةِ وَأَرْكَبَكُمْ لِلْكَبِيرَةِ سَمِعْتُ أَبِى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « إِنَّ الْفِتْنَةَ تَجِىءُ مِنْ هَا هُنَا ». وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ « مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنَا الشَّيْطَانِ ». وَأَنْتُمْ يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ وَإِنَّمَا قَتَلَ مُوسَى عليه السلام الَّذِى قَتَلَ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ خَطَأً فَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ (وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا). {الحديث: ٧٢٢٦٩ = ٧٢٥٧ فم}:

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەی خەڵکی عێراق! گوتەو گوتارو کردارتان ئاسمانو ڕێسمانە، بە قسە هیچتان نەهێشتۆتەوەو بە کردەوەیش هیچتان دیارنییە، ئەوەتانێ ئەم گشتە پرسیارە، لەبارەی شتی بچووکەوە دەکەن، کە نیشانەی ئەوەیە کە ئێوە خاوەن وەرعو تەقوان، کەچی بە کردەوە لە هەموو کەسێ زیاتر پەلاماری گوناهی گەورە گەورە دەدەنو بێ باکانە ئەنجامیان دەدەن؟! ئەمەتان لەچیو ئەوەتان لەچی؟!

ئەوجا سالم بۆ پشتیوانی بۆچوونەکەی خۆی فەرمووی: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرم بیست، کە خۆتان دەزانن عەبدوڵلا باوکمە، دەیفەرموو: بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەری خودام بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئاژاوەو ئاشووبو فەرتەنە گەل ئالێرەوە سەر هەڵ دەدەنو پشێوییەکان ئا لەمێوە بەرپا دەبن!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی ئاماژەیکرد بۆ خۆرهەڵات کە عێراقیش دەکەوێتە خۆرهەڵاتەوەو فەرمووی: (ئا لێرەوە ئاژەوەکان سەر هەڵ دەدەنو بەرپا دەبن، کە دوو شاخەی شەیتانی لێوە هەڵ دێ!!).

ئەوجا سالم بۆ زیادە روونکردنەوەو دەربڕینی بێزاری تەواو لە کردارو رەفتاری خەڵکی عێراق، موقابەلەو بەرابەرییەك دەکات، لە نێوانی پیاو کوشتنەکەی مووسا بە هەڵەو لە نێوانی شەڕی برا کوژیدا، کە عێراقیەکان ئاگرەکەی خۆش دەکەن، بۆ ئەم مەبەستە سالم فەرمووی: ئەی خەڵکی عێراق! ئەوەتا ئێوە بەردەوام سەرگەرمی شەڕی براکوژینو یەکتری دەکوژنو دەربەستی ئەوە نایەنو خەمی بۆ ناخۆن، دیارە بە ئاژاوەو فەرتەنەی دانانێنو شتەکان بە پێچەوانەوە لێك دەدەنەوە، دەنا چی هەیە کە لە رشتنی خوێنی موسوڵمانان بە ناڕەوا، ناڕەواتر بێ؟!

دەبوو پەندو ئامۆژ لەم داستانەی مووسا وەربگرن، کە بە هەڵە، پیاوێکی قیبطی کوشت، کە لەسەر ئایینی مووساش نەبوو، بەڵکوو لە دەستو پێوەندی فیرعەونی دوژمنی مووساش بوو، لەگەڵ ئەوەشا، کە شتەکە بەهەڵە بوو، بە قەستی نەبوو، مووسا خەمبار بوو، وە بێزاری دەربڕی لەوکارە ناشیرینەو بە ئاژاوەی دانا، وەك خودای باڵا دەستو شکۆمەند لە قورئانا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: {وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا – طه – ٢٠/٤٠}. واتە:

ئەی مووسا! ئەوەبوو تۆ پیاوێکت بە هەڵە لە قیبطییەکانی هۆزی فیرعەون کوشتو لەم بارەیەوە خەمبار بوویت، کە خودا لەسەر ئەوە تۆڵەت لێ بستێنێو

ئەگەر بەر هەوێڵی فیرعەونیش بکەوی لەباتی ئەو زەلامە بتکوژێتەوە، بەڵام ئێمە بە رەحمەتو دانایی خۆمان تۆمان لەو خەمانە رزگار کرد، گەرچی تووشی چەندین ئەزموونو تاقیکردنەوەی سەختمان کردیت). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٣٥٧٦، ٣٥٧٨ — گەورەیی وڵاتی شام + تاج/٥، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٥٥١٨، ٥٥١٩، ٥٥٢٠ — سەرەتای بەرپا بوونی فەرتەنەکان...}.

## ١٥٣٠) گەنجی گەنجینەی کیسراو قەیصەر دەست موسوڵمانان دەکەوێو لە رێگەی خودادا بەخت دەکرێن. (٧٢٢٦ - ٧٢٥٧)

## بَابٌ: لَتُنْفَقُنَّ كُنُوزُ كِسْرَى وَقَيْصَرَ فِي سَبِيلِ اللهِ

١٩٩٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « قَدْ مَاتَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلاَ قَيْصَرَ بَعْدَهُ وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُمَا فِى سَبِيلِ اللَّهِ ». {الحديث: ٧٢٥٦ صحيح مسلم/ تحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٢٨٧ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ٢٠٢٨ = ٣٠٢٧، ٣١٢٠، ٣٦١٨، ٦٦٣٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وا کیسرا لەناوچوو، ئیتر لەپاش ئەو کیسرای تر نابێ، قەیسەریش لەناو ئەچێو لەپاش ئەویش قەیسەری تر نابێ، بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، گەنجو سامانو گەنجی ناو گەنجینەی ئەم دوو پادشایە دەست موسوڵمانان دەکەونو، بەخت دەکرێن لە رێگەی خوادا). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٣١٩٣ — شتی پەنهانو نەزانراوی ئاشکرا کردووە}.

١٩٩٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « لَتَفْتَحَنَّ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ أَوْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ كَنْزَ آلِ كِسْرَى الَّذِى فِى الأَبْيَضِ ». قَالَ قُتَيْبَةُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. وَلَمْ يَشُكَّ. {الحديث: ٧٢٦٠ = ٧٢٩١ فم}:

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (تاقمێ لە موسوڵمانان) یا فەرمووی: (تاقمێ لە

باوەڕداران وڵاتی کیسرا ئازاد دەکەن‌و سامان‌و دارایی‌و گەنجی ناو گەنجینەکەی کیسرا، کەوا لە کۆشکە سپییەکەیدا بە تاڵانی دەگرن‌و دابەشی دەکەن لە ڕێگەی خودادا).

پێشەوا موسلیم ئەم فەرموودەیە لەدوو مامۆستای خۆیەوە دەگێڕێتەوە: کە قوتەیبەی کوڕی سەعیدو ئەبو کاملی ئەلحەجدەرین، ئەبو کامیل، وەك پێشەوە بە گومانە وە گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (تاقمێ لە موسوڵمانان) یا فەرموویەتی (تاقمێ لە باوەڕداران). بەڵام قوتەیبە بەبێ گومان دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (تاقمێ لە موسوڵمانان وڵاتی کیسرا ئازاد دەکەن‌و سامان‌و دارایی‌و گەنجی ناو گەنجینەکەی کیسرا، کەوا لە کۆشکە سپییەکەیدا بە تاڵانی دەگرن‌و دابەشی دەکەن لە ڕێگەی خودادا).

### ١٥٣١) لەناوچوونی گەلی ئیسلام بەهۆی شەڕی براکوژییەوە. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)
### بابٌ: هِلاَكُ هذهِ الأمّةِ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ

٢٠٠٠- عَنْ ثَوْبَانَ -رضي الله عنه- قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنَّ اللَّهَ زَوَى لِىَ الأَرْضَ فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا وَإِنَّ أُمَّتِى سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِىَ لِى مِنْهَا وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ الأَحْمَرَ وَالأَبْيَضَ وَإِنِّى سَأَلْتُ رَبِّى لأُمَّتِى أَنْ لاَ يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ عَامَّةٍ وَأَنْ لاَ يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ وَإِنَّ رَبِّى قَالَ يَا مُحَمَّدُ إِنِّى إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَإِنَّهُ لاَ يُرَدُّ وَإِنِّى أَعْطَيْتُكَ لأُمَّتِكَ أَنْ لاَ أُهْلِكَهُمْ بِسَنَةٍ عَامَّةٍ وَأَنْ لاَ أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ يَسْتَبِيحُ بَيْضَتَهُمْ وَلَوِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بِأَقْطَارِهَا - أَوْ قَالَ مَنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا - حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضًا وَيَسْبِى بَعْضُهُمْ بَعْضًا ».
{الحديث: ٧١٨٧ شيحا = ٧٢١٥ فم. أبو داود. فتن: ٤٢٥٢. ترمذي. فتن: ٢١٧٦ تحفة الأشراف: ٢١٠٠} :

ثەوبان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورەو مەزن تەنگی زەوی بۆم کێشاو پێچایەوەو هێنایەوە یەك بۆ بەرچاوم، وڵاتی زۆرم دی، لە ڕۆژهەڵات‌و، لە ڕۆژئاوا، بێگومان قەڵەمڕەوی دەوڵەتی

نەتەوەی ئیسلامی من دەگاتە ئەو شوێنانەی کە دیانم، خودا ولاتی رۆم بە خۆیو گەنجی زێرینیەوە، لەگەڵ ولاتی فارسدا، بە خۆیو گەنجی زیوینیەوە بەخشیوە پێم، من داوام لە پەروەردگاری خۆم کرد، کە ئەم چاکەیەیش لەگەڵ گەلی منا بکا: کە بە قاتو قڕیو گرانی گشتی تێکڕا بە جارێ نەیان فەوتێنێ، دوژمنێکی واشیان، لە غەیری خۆیان بەسەردا زاڵ نەکا، کە بە ڕەچەڵەکیانا بچێتە خوارەوەو لە ڕەگو ڕیشە دەریان بێنێو شانو شکۆی ئیسلام نەهێڵێ. کەچی پەروەردگارم فەرمووی: ئەی موحەممەد! بڕیاری من ڕەدبوونەوەی بۆ نییە، جا والەبەر خاتری تۆ بەڵێن دەدەم بە ئومەتت کە بە قاتو قڕیو گرانی گشتی تێکڕا بە جارێ نەیانفەوتێنم، هەروا دوژمنێکی واشیان، لە ناموسڵمان، بەسەردا زاڵ نەکەم کە لە ڕەگو ڕیشە دەریان بێنێ، گریمان سەر تۆپ خەڵکی سەر ڕووی زەوی سەرانسەر هەموویان گەلەکۆمەیان لێبکەن، هێشتا دەرەقەتیان نایەن، بەلام ئەمەیان بە مەرجی ئەوە پێ دەدەم کە لەناو خۆیانا نەبن بە گەلی خۆ خۆرو سەرو ماڵو ناموسی یەکتری بە تالان نەبەن!). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٩٣ – نامەی فەرتەنە گەلو........} .

٢٠٠١- عَنْ عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَقْبَلَ ذَاتَ يَوْمٍ مِنَ الْعَالِيَةِ حَتَّى إِذَا مَرَّ بِمَسْجِدِ بَنِى مُعَاوِيَةَ دَخَلَ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ وَصَلَّيْنَا مَعَهُ وَدَعَا رَبَّهُ طَوِيلاً ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَيْنَا فَقَالَ -صلى الله عليه وسلم- « سَأَلْتُ رَبِّى ثَلاَثًا فَأَعْطَانِى ثِنْتَيْنِ وَمَنَعَنِى وَاحِدَةً سَأَلْتُ رَبِّى أَنْ لاَ يُهْلِكَ أُمَّتِى بِالسَّنَةِ فَأَعْطَانِيهَا وَسَأَلْتُهُ أَنْ لاَ يُهْلِكَ أُمَّتِى بِالْغَرَقِ فَأَعْطَانِيهَا وَسَأَلْتُهُ أَنْ لاَ يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَمَنَعَنِيهَا ». {الحديث: ٧١٨٩ شيحا = ٧٢١٧ فم}:

عامیری کوڕی سەعد فەرمووی: باوکم فەرمووی: ڕۆژێکیان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە عوالی مەدینەوە دەهاتەوە، کە کۆمەڵێ گوندن، لە دەوروبەری شاری مەدینە، جاران نزیکەکەیان چوار میل بوو، دوورەکەیان هەشت میل بوو، هەتا گەیشتە مزگەوتەکەی بەنی موعاویە، کە ناسراوە بە (مسجد الإجابة) کە دەکەوێتە باکووری گۆڕستانی بەقیعەوە، لەوێ ڕۆیشتە ناو مزگەوتەکەو دەوری دوو باڵ دوور

لەلای راستی میحرابەکەوە دوو رکات نوێژی سوننەتی دیاری مزگەوتی تیاکرد، ئێمەیش بە جەماعەت لەگەڵیا ئەو نوێژەمان کرد، وە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر زۆر لەخودا پاڕایەوە، ئەوجا هاتەوە بۆلای ئێمەو فەرمووی: (داوای سێ داوام لە پەروەردگاری خۆم کرد، دوانیانی پێمداو یەکێکیانی پێم نەدا: داوام لە پەروەردگاری خۆم کرد کە بەگرانیو قاتو قڕی گەلەکەم قڕ نەکات، ئەمەی بەخشی پێم، داوام لە پەروەردگارم کرد کە بە لافاوو نووقم بوون لە دەریادا، گەلی ئیسلامم لەناو نەبات، ئەم داوایەیشی پێم بەخشی، داوام لێی کرد کە خۆ خۆر نەبنو شەڕ لەگەڵ یەکتری نەکەن، بەڵام ئەمەیانی پێم نەدا).

**روونکردنەوە:**

١- عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، تابیعییە، گێڕانەوەی زۆری لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ئەنجامداوە، وەك سەعدی باوکیو ئیمامی عوثمانو عەبباسی کوڕی عەبدولوطەلیب.

ئیبنو سەعد دەفەرموێ: ساڵی سەدو چواری کۆچی، لە مەدینە، لە سەردەمی جێنشینی وەلیدی کوڕی عەبدولەلیکدا مردووە. پیاوێکی راستگۆی متمانەدار بوو. بۆ ژیاننامەی باوکی بڕوانە ئەم ژمارانە کە لەپێشەوە رابووردوون. (٢٩٦، ٣١٠، ٤٧٤).

٢- ئەوەوی (رەزای خودای لێ بێ) ئەو هەواڵانەی کە لەم فەرموودانەدا هاتوون، هەموویان بە موعجیزەی گەورە گەورە دادەنێو باس لەوە دەکا کە ئەم هەواڵانە هەموویان روویان داوە.

**١٥٣٢) بست بەبست لاسکایی رەفتاری نەتەوەکانی پێش خۆتان دەکەنەوە.**

**(٦٧١٧ - ٦٧٢٥)**

**بَابٌ: لتتبعُنَّ الَّذين مِنْ قَبْلِكُمْ**

٢٠٠٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِى جُحْرِ ضَبٍّ

لاَتَّبَعْتُمُوهُمْ ». قُلْنَا يَا رَسُولَ اللّهِ آلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى قَالَ « فَمَنْ ». {الحديث: ٦٧٢٣ شيحا – ٦٧٣٧ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٣٧٨ = ٣٤٥٦، ٧٣٢٠. ترمذى. تفسير القرآن: ٢٩٧٦. نسائى. آداب القضاء: ٥٤٣٨. تحفة الأشراف: ١٦٢٤٨} :

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بست بە بستو هەنگاو بە هەنگاو لاسایی میللەتەکانی پێش خۆتان دەکەنەوەو چاو لە ڕەوشتو ڕەفتاری نالەبارو ناهەمواری ئەوان دەکەن، کوێرانە پەیڕەوییان دەکەن، تەنانەت ئەگەر گریمان ئەوان خۆیان بترنجێننە ناو کونی بزن مژەوە، ئێوەیش چاویان لێ دەکەنو خۆتانی تێ دەترنجێننو دەڵێن: ئەمانە بە بەلاش خۆیان ناکەن بە کونی بزن مژەدا، دیارە کە سوودو کەڵکێکی هەر هەیە!!).

فەرمووی: ئێمەیش عەرزیمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! مەبەستت لە میللەتەکانی پێش ئێمە کێیە، ئایا مەبەستت لێیان جوولەکەکانو گاورەکانە؟ فەرمووی: (ئەی کێ؟). {تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٢ – ڕەفتار کردن بە قورئانو بە سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)} .

**ڕوونکردنەوە:**

سوبحانەڵلا!؟ بەڕاستی ئێستا ئاوایە، ئەو خەڵکە بە بلیۆری ڕۆژئاوا وەك مەیموون، هەڵ دەپەڕێ، ڕێك وەك ئەوان باو باوی سوورو سەماو دەهۆڵو زوڕناو گۆرانیو مەیو بادەو یاریو قومارە، ئەوەی بۆ زوڕنا ژەنێ دەکرێ، بۆ ڕۆستەمی زاڵیش ناکرێ، ئەوەی بۆ گۆرانیبێژێ دەکرێ مەلیك مەحموود زیندوو ببێتەوە بۆی ناکرێ، بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو: لە کەناڵێکی لایەنێکەوە، بە بۆنەی هاتنی سەری ساڵی زاینییەوە، کچێ دەیگوت: (بە ماچو بە سەما پێشوازیمان لە ساڵی نوێ کرد!).

قەت قەت وەك ئەمڕۆ فەلسەفەو حیکمەتو ئەدەبو زانستە گیانیو بەهرەییەکان ئاوا ساکارو ساویلکە نەبوون، غەزوی ثەقافیو مێشك شۆردنەوەی جەماوەرو خەریککردن بە فلیمی نێرو مێیو برەودان بە بەرەڵایی، کارێکی وایان

کردووه، جەماوەریان سڕکردووه، گەنجەکان بە زۆری بوون بە عەبەثیو بە هێبی، باوەڕیان بەهیچ نەماوه، نە بەخودا نە بە بەها کۆمەڵایەتیەکان، دوژمنی داگیرکەر پێویستی بە شیرو تیر نەماوه، بۆ گرتنی سەرو ماڵو خاكو نامووسی نەتەوەکان، بۆ غاراتکردنی سەرو ماڵو نامووسیان، لەباتی سوپاو شەڕو شۆڕ، بە مەیو بادەو بەنگو بەرەڵایی سڕی کردوون.

جێگەی داخە لاوەکانی خۆمان بە بەریقی ئەم هێرشە ناهەقە وا شەوارە کەوتوون، زۆربەیان وەك هەویر لە دەستی نانەوادا، خۆیان تەسلیمی راگەیاندنی رۆژهەڵات کردووه، بە واتای وشە بوون بە دیلو دەروێشی ئەکتەرو سەماکارو نووسەرەکانی ئەوان، فڕیان بەسەر وڵاتو ئایینو مەردایەتیو کوردایەتیو ئایینداریيەوە نەماوه، هەروەك چۆن مەیموونێ لاسکایی لۆتییەك بکاتەوە ئاوا بەبێ زیادو کەم!

جا لەم روانگەیەوە ئەم چیرۆکە عەنتیکەیەتان عەرزدەکەم کە نموونەیەکی زۆر جوانە، بۆ ئەم بارودۆخە ناهەموارەی کە ئەم موراهیقو دەمڕووتو لەززەت پەرستانە، بەناوی راگەیاندنی ئازادەوە، لە وڵاتدا، بەبێ رەقابەو چاودێری کەس، پیادەی دەکەن: (خوا لێخۆشبوو رەفیق چالاك، جارێ گێڕایەوە، گوتی: جارێ تەمسیلییەکی جوانمان رێك خست، لە هۆڵێکی هونەری ئەنجامماندا، کچمان دەست نەکەوت بۆ شوێنی رەگەزی مێ، کوڕێکی لاوی جوان، بە بەرگی ژنانەوە ئەو رۆڵەی بینی. گوتی: ئەوا من بە خەیاڵی خۆم هیچم نەهێشتۆتەوە، دەمەوێ گەلی کوردی خۆم فێری رەوشتی بەرزو بەها بەرزە کۆمەڵایەتییەکان دەکەم، هانیان دەدەم لەسەر ئایینی پاكو بێگەردو دووریان دەخەمەوە لە کۆنە پەرستیو کۆیلەییو سەر شۆڕیو هانیان دەدەم لەسەر ئازایەتیو مەردایەتیو کوردایەتی پاكو پیرۆزو، شتی قێزەونیان لەبەر چاو دەخەم، بە هەزارو یەك زمان بۆیان روون دەکەمەوە. لە راستیشدا ئەمە پەیامی هونەری رەسەنو هونەرمەندانی دڵسۆزی گەلو نیشتمانن، وە ئەمە بەشێوەی گشتی لە بەرهەمە پێشکراوەکانیانا رەچاو دەکرێ، وە سوپاس بۆ

خودا تا رادەیەکی باش دڵسۆزیو نیاز پاکی، لەکارە هونەرییەکانی وڵاتی خۆماندا دەبینرێ، تەنانەت زۆریشیان پابەندن بە ئایینی خۆیانەوەوماڵو منداڵیان پابەندن بە دینو رەفتاری بەرزەوە.

جا خوا لێخۆشبوو رەفیق چاڵاك گوتی: ئەوا ئێمەی دەستەی هونەرمەندەکان، لەپاش پێشکەشکردنی شانۆکەمان، شادمانین بەم خزمەتە جوانە، لە هەموو لایەکەوە پیرۆزباییو دەسخۆشیمان لێ دەکەنو بە چەپڵە رێزان ئافەرینمان دەکەن، تەنانەت چەندین حاجیو شێخو مەلایش، هەریەکی بە شێوەیێ، لەم بەرهەمەدا یارمەتییان داینو کار ئاسانییان بۆ کردین... جا وا ئێمەی دەستەی هونەرمەندەکان لەناو جەماوەرەکەدا مەستی ئەم سەرکەوتنەین، ئەوەندەمان زانی، کۆمەڵێ لاوی دەم رووتو کەللە پووت، کە خۆیان بە دەرەبەگو شتی وا دادەنا، سەر گەورەکەیان لەبەردەم جەماوەرەکەدا، هات بۆلای منو دەستی نایە سەرشانی کوڕەکە، کە رۆڵی کچی دەبینی، وە بەناوی هەموویانەوە، بەبێ شەرمانە، بە دەنگێکی شێرانە، وەك فەرمان دەرکا بۆ خزمەتکارێکی خۆی، دەقاو دەق بەمنی گوت:

(کاکی گەوواد! ئەم قەحبەیە ئەمشەو دابنێ بۆ ئێمە کە ئەم کۆمەڵەین، نەیدەیت بەکەسی تر کرێکەی چەندە بە زیادەوە دەیدەین!).

گوتی: منیش لەوەندە زیاترم پێ نەگوت:

(کاکی موراهیقی دەم راستی ئەم کۆمەڵە دەم رووتە، ئەمە قەحبە نییە ئەمە نێرە پیاوە، منیش گەوواد نیم، بەڵام کەرم چونکە دەمەوێ کەرێکی وەك تۆ بکەم بە بەشەر! دانایانی پێشینان جوانیان گوتووە کە دەڵێن: کەسێ هەوڵ بدا کەر بکا بە بەشەر، بەرە بەرە خۆشی دەبێ بەکەر!).

منی هەژاری دڵسۆزی گەلی کوردی خۆم تەنیا ئەوەندەم لەدەست دێ کە عەرزی دەستەڵاتدارانی دڵسۆزی کورد بکەم: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەم گەلی ئیسلامی منە، بە دەستی دەستەیەکی دەم رووتی هەرزەکاری هەرزەی پەتەڕی لەناودەچن).

**١٥٣٣) گەلی ئیسلامی من بەدەستی دەستەیەکی دەمڕووت لە هۆزی قورەیش لەناو دەچن، خۆتانیان لێ بپارێزن. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)**

**باب: يُهْلِكُ أُمَّتِى هذا الحَىُّ مِنْ قُرَيش، والأمْرُ بِاعْتِزَالِهِمْ**

٢٠٠٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- عَنِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « يُهْلِكُ أُمَّتِى هَذَا الْحَىُّ مِنْ قُرَيْشٍ ». قَالُوا فَمَا تَأْمُرُنَا قَالَ « لَوْ أَنَّ النَّاسَ اعْتَزَلُوهُمْ ». {الحديث: ٧٢٥٤ شيحا = ٧٢٨٥ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٤٣٣ = ٣٦٠٤، ٣٦٠٥، ٧٠٥٨}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئەم چینەی ئەم گەلی ئیسلامی منە، بەدەستی دەستەیەکی دەمڕووتی هەرزەکاری هەرزەو پەتەڕی لەناو دەچن، کە لەهۆزی قورەیشن!).

عەرزیانکرد: جا ئەی پێغەمبەری خودا! لەم بارەیەوە فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (کاشکی ئەو خەڵکە تێکەڵییان نەکردنایە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٥٥١٧ — سەرەتای بەرپابوونی فەرتەنەکان}.

**١٥٣٤) ئاژاوە گەلێ دەقەومێن هەتا لێیان دووربی کەمە**

**بَابُ: تَكُونُ فِتَنٌ القاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ القَائِم**

٢٠٠٤- عَنْ أَبِى بَكْرَةَ -رضي الله عنه- قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ أَلاَ ثُمَّ تَكُونُ فِتْنٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِى فِيهَا وَالْمَاشِى فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِى إِلَيْهَا أَلاَ فَإِذَا نَزَلَتْ أَوْ وَقَعَتْ فَمَنْ كَانَ لَهُ إِبِلٌ فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِهِ وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ ». قَالَ فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ مَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ إِبِلٌ وَلاَ غَنَمٌ وَلاَ أَرْضٌ قَالَ « يَعْمِدُ إِلَى سَيْفِهِ فَيَدُقُّ عَلَى حَدِّهِ بِحَجَرٍ ثُمَّ لْيَنْجُ إِنِ اسْتَطَاعَ النَّجَاءَ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ ». قَالَ فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ أُكْرِهْتُ حَتَّى يُنْطَلَقَ بِى إِلَى أَحَدِ الصَّفَّيْنِ أَوْ إِحْدَى الْفِئَتَيْنِ فَضَرَبَنِى رَجُلٌ بِسَيْفِهِ أَوْ يَجِىءُ سَهْمٌ فَيَقْتُلُنِى قَالَ « يَبُوءُ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِكَ وَيَكُونُ مِنْ أَصْحَابِ

النَّـارِ ». {الحديث: ٧١٧٩ شـيحا = ٧٢٠٧ فـم. تجريـد البخـاری = پوختـەی صـحیحی بوخاری/٥، رقم: ٢٠٩٧ = ٣٦٠١، ٧٠٨١، ٧٠٨٢. تحفة الأشراف: ١٤٩٥٣}:

ئەبو بەکرە (بڕوانە: ژمارە: ٤٦) (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (بـەڵێ فیتنـەو ئاشـووبو ئـاژاوە گـەلێ، بـەرودوا دەقـەومێن، ئاگـاداربن لەپاشـدا فەرتەنەیـەکی گـەلێ گـەورە بـەرپا دەبـێ، یەخـەی موسـڵمانان بەگشتی دەگرێ، پیاو هەتا لێیـان دووربـێو دووریـان لـێ بگـرێ هێشـتا هـەر کەمـە، بەتایبەتی فەرتەنە گشتییەکە، چونکە ئـەوەی کە دەسـتی ئـەوی تیانـەبێ چاکترە لەوەی کە دەسـتی ئـەوی تیادابـێ، ئـەوەی کـە دەسـتی ئـەوی تیادایـە هێشـتا باشـترە لەوەی کە بە فیتی ئەو بەرپا بووە.

(هوشیار بن! کە ئـەو فەرتەنەیـە روویـدا) یـا فـەرمووی: (هوشـیار بـن کـە ئـەو فەرتەنەیە قەوما، ئێوە پەڕی لێ بگرنو، هەر کەسێ بچێ بەلای کاروباری تایبـەتی خۆیـەوەو تـوخنی ئـەو فەرتەنەیـە نەکـەوێو هەرچـۆن بـووە لـە دەسـتەی ئـەو فەرتەنەیە خۆی بدزێتەوە، بەم ڕەنگە: ئەوەی وشتری هەیـە بچـێ بـە سـەرەوکاریی وشترەکانیەوەو، ئەوەی ڕانی بـزنو مـەڕی هەیـە بچـێ بـەلای ڕانەکەیـەوەو، ئـەوەی زەویو زاری هەیە بچێ بە سەرەوکاری زەویو زارەکەیەوە، ئـیتر هـەتا بـۆی دەکـرێ تێکەڵ بەخەڵکی ئەو فەرتەنەیە نەبێ )

پیـاوێ عـەرزیکرد: ئـەی رەوانـەکراوی خـودا! ئـەی ئەگـەر کەسـێ وشـترو رانو زەویو زارو شتی وای نەبوو چی بکا؟

فەرمووی: (شمشێرەکەی بێنێو بە بەردێ دەمـە تیژەکـەی بشـکێنێو ئینجا تـا دەتوانێ هەڵبێو خۆی دەرباز بکا!

ئەی خودایە! تۆ ئاگات لێیەتی کە ئەوا من ئەرکی سەرشانی خۆم بەجێ هێنـاو پێم گوتنو پێیانم راگەیاند، خودایـە! تـۆ ئاگـات لێیـەتی کـە ئـەوا مـن پـێم گـوتنو پێیـانم راگەیانـد، خودایـە! تـۆ ئاگـات لێیـەتی کـە ئـەوا مـن پـێم گـوتنو پێیـانم راگەیاندن).

پیاوێكی تریش عەرزیكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئەگەر بەزۆر بردمیان بۆ شەڕی برا كوژیو لە ریزی شەڕدا كابرایەك لە تاقمەكەی تر بەشیر یا بە تیر لێی دامو كوشتمی، ئەوە چۆن؟

فەرمووی: (ئەوە زۆردارەكەی كەتۆ بەزۆر دەبا بۆ ئەو شەڕە، تاوانی خۆیو تاوانی كوژرانی تۆی بە ئەستۆ دەبێ، وە بە هۆی ئەوەوە شایانی ئاگری دۆزەخ دەبێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە:٥٤٨٧ — ترساندن لە فیتنە گەل}

**١٥٣٥) كاتێ دوو موسڵمان بە شمشێرەوە رووبەڕووی یەكتری وەستان، بكوژو كوژراو لە دۆزەخدان.** (٧١٦٤ — ٧٢٧٢)

**بابٌ: إذَا تواجَهَ المُسلِمَانِ بسَيْفَيْهِمَا فالقاتِلُ والمقتولُ في النَّار**

٢٠٠٥- عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ خَرَجْتُ وَأَنَا أُرِيدُ هَذَا الرَّجُلَ فَلَقِيَنِى أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ أَيْنَ تُرِيدُ يَا أَحْنَفُ قَالَ قُلْتُ أُرِيدُ نَصْرَ ابْنِ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- - يَعْنِى عَلِيًّا - قَالَ فَقَالَ لِى يَا أَحْنَفُ ارْجِعْ فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِى النَّارِ ». قَالَ فَقُلْتُ أَوْ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ قَالَ « إِنَّهُ قَدْ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ ». {الحديث: ٧١٨١ ترقيم شيحا = ٧٢٠٩ ترقيم فم = ف.م = فتح الملهم تجريد/١، رقم: ٢٩ = ٣١، ٦٨٧٥، ٧٠٨٣ فتح البارى شرح صحيح البخارى. أبو داود. فتن: ٤٢٦٨. نسائى. تحريم الدم. تحفة الاشراف: ١١٦٥٥}:

ئەحنەفی كوڕی قەیس (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دەرچووم بچم یاریدەی عەلی كوڕی ئەبو طالیب بدەم، لە دژی كۆمەڵەی ئەلجەمەل، گەیشتم بە ئەبوەبكرە، فەرمووی: ئەوە بۆ كوێ دەچیت؟ گوتم: دەمەوێ هۆزەكەم ببەم بۆ هاوبەشی لە جەنگی ئەلجەمەلدا، وە یاریدەی عەلی كوڕی ئەبو طالیب بدەم كە ئامۆزای پێغەمبەری خودایە: ئەحنەف فەرمووی: ئەبوبەكرە فەرمووی پێم: ئەی ئەحنەف! بگەڕێرەوەو مەچۆ بۆ ئەم شەڕی برا كوژییە، چونكە من بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە كە دەیفەرموو: (هەركاتێ دوو موسڵمان بە شمشێرەوە

روو به ڕووی یەکتری وەستانو دەستەو شمشێر بەرامبەر بە یەکتری راوەستانو یەکێکیان یەکێکیانی کوشت، ئەوا بکوژو کوژراو هەردووکیان جێگەیان ناو ئاگری دۆزەخە!).

ئەحنەف فەرمووی: ئەبوبەکرە فەرمووی: منیش گوتم، یا کەسێ تر گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باشە وا بکوژ دۆزەخییە، چونکە بکوژە، ئەی کوژراوەکە بۆچی؟ خۆ ئەو کەسی نەکوشتووە؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (چونکە ئەویش لە دڵەوە بە خواستی دڵ ویستوویەتی برا موسڵمانەکەی بکوژێ!).

**ڕونکردنەوە:**

ئەحنەفی کوڕی قەیس، ئەبو بەحری بەصری تەمیمی، ناوی ضەحاکی کوڕی قەیسە، پیاوێکی تەمەن درێژ بوو، بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتووە بەڵام دانانرێ بە صەحابە، چونکە ئەو کاتە ئیسلام نەبووە، لەپاش مەرگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ ) ئیسلام بووە، پیاوێکی سەلارو هێمنو لەسەر خۆ بوو، پیاوێکی باوەڕ پێکراو بوو، بەڵام فەرموودەی کەم دەگێڕایەوە.

## ١٥٣٦} عەمماری کوڕی یاسیر دەستەی لە خودا یاخی دەیکوژێ. {٧١٦٤ - ٧٢٧٢}
## بَابٌ: تَقْتُلُ عَمَّاراً الفِئَةُ البَاغِيَةُ

٢٠٠٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ –رضي الله عنها- قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « تَقْتُلُ عَمَّارًا الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ ». {الحديث: ٧٢٥٣ ترقيم شيحا = ٧٢٨٤ فم} :

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی حودا لەسەر پێغەمبەرو هەموو هاوەڵانو هاوسەرانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی عەممار! موژدەت لێ بێ، دەستەی ناهەقیکارو لەخودا یاخی دەتکوژن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە:٣٤١٢ — چاکێتی عەمماری کوڕی یاسیر}.

**١٥٣٧) قیامەت هەڵناسێ هەتا دوو بەرەی زۆر گەورە دەچن بەگژ یەكتردا، داوای هەردوو لاشیان هەر یەك شتە. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)**

**بَابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ دَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ**

٢٠٠٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه – قال: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَذَكَرَ أَحَادِيثَ مِنْهَا وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ وَتَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ وَدَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ ». {الحديث: ٧١٨٥ = ٧٢١٣ فـم. تجريد البخارى/٥ن رقم: ٢١٠٣ = ٧١٢١ فتح البارى. تحفة/ ١٤٧٠٦ :}

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (درودو سلاو پیتو فەڕو میهرەبانی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ، سەرو ماڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێو گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیكەرانی گۆڕی نازداری بێ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێ، هەتا دوو بەرەی زۆر گەورە دەچن بەگژ یەكا، كوشتارێكی فرە گەورەو سامناك لە نێوانیاندا روودەدا، داوای هەر دوو لاشیان هەریەك داوایە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٦٨ — نیشانەی داهاتنی قیامەت}.

**روونكردنەوە:**

زۆرینەی راڤەكاران دەڵێن: مەبەست لەم دوو بەرە گەورەیە، كۆمەڵەی عەلیو كۆمەڵەی موعاوییە بووە. بەڵام مرۆڤ كە كۆی نیشانەكانی نزیكبوونەوەی قیامەت رەچاو دەكا، لەگەڵ ئەو هەموو جەنگە گەورانەدا، كە لەنێوانی لایەنە جیا جیاكاندا بووە، دەبینێ شەڕی عەلیو موعاوییە، لە چاو ئەو شەڕە گەورەو زەبەلاحانەدا، وەك گەمەی منالان وایە، لەهەموو رویەكەوە، لەرووی گەورەیی رووبەری مەیدانی جەنگەكانەوە، لەرووی ژمارەی هاوبەشكەرانو جەنگاوەرانو كوژراوانو زامارانو وڵات وێرانكردنو كاریگەری لەسەر رەوشتی گشتی جیهانی، تەنانەت لە جەنگی خاچ پەرستان، یا لە جەنگی جولەكەو عەرەب، یا لە جەنگی یەكەمو دووم، یا لە جەنگی عێراقو ئێرانو سەدان جەنگی گەورە گەورەدا، هەر كامێ لەم جەنگانە

بگرى، له هەموو رویەکەوە لە جەنگى عەلى‌و موعاويە گەورەتر بوون، بە زەینم ئەم جەنگە ماوە، وەلە ناکاوا هەڵ دەگیرسێ‌و دەتەقێتەوە، خودا پەنامان بدا لێى.

**١٥٣٨) قيامەت هەڵناسێ، تاواى لێ دێ پياو دەدا بە لاى گۆڕدا، دەڵێ: خۆزگە من لە شوێنى ئەم مردووە بوومايە.** (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

**بَابٌ: لا تقوم السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ: يَالَيْتَنِى مَكَانَهُ**

٢٠٠٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لاَ تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ عَلَى الْقَبْرِ فَيَتَمَرَّغُ عَلَيْهِ وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِى كُنْتُ مَكَانَ صَاحِبِ هَذَا الْقَبْرِ وَلَيْسَ بِهِ الدِّينُ إِلاَّ الْبَلاَءُ ». {الحديث: ٧٢٣١ = ٧٢٦٢ فم. تحفة الآشراف: ١٣٤٥٦}

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (سوێندم بەو کەسە کە گيانى منى وا لە دەستا، ئەم جيهانە تەواو نابێ‌و بەسەر ناچێ‌و قيامەت هەڵناسێ، هەتا واى لێ دێ، پياو دەدا بەلاى گۆڕدا، لە تاوانا تەپاو تل دەکا لەسەرى‌و، دەڵێ: خۆزگەم بە خۆى، خۆزگا من دەبووم لە شوێنى خاوەنى ئەم گۆڕە، بە ڕاستى لە کێشەو بەرەى دونيا ڕزگارى بوو، کەواش دەڵێ ئەوە نەبێ لەبەر بێ دينى خۆى وابڵێ، نەء، بەڵام لەتاو دەردو بەلاى زۆر وا دەڵێ). {تاج/٥، زنجيرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٥٩} + {رياضى صالحين/٤، زنجيرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٢١}

**١٥٣٩) دوا رۆژ بەرپا نابێ هەتا کوشت‌و بڕين زۆر دەبێ.** (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

**بَابٌ: لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الهرجُ**

٢٠٠٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: قالَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الْهَرْجُ ». قَالُوا وَمَا الْهَرْجُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ «الْقَتْلُ الْقَتْلُ». {الحديث: ٧١٨٦ = ٧٢١٤ فم. تجريد البخارى/٥، رقم: ٢١٠٣ = ٧١٢١} :

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (دوا رۆژ هەڵناسێ‌و قيامەت بەرپا نابێ هەتا کوشت‌و بڕين زۆر دەبێ).

یاران گوتیان: مەبەست لە کوشتو بڕین چییە؟ فەرمووی: (مەبەست کوشتنە کوشتن!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٦٨}.

## ١٥٤٠) قیامەت هەڵناسێ هەتا دەبێ بە ئاخوران‌و بخورانێکی وا بکوژ نازانێ لەبەر چی خەڵك دەکوژێ. (٧١٦٥ - ٧٢٧٢)

## بَابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يَدْرِى القَاتِلُ فِيمَا قَتَلَ

٢٠١٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لاَ تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَأْتِىَ عَلَى النَّاسِ يَوْمٌ لاَ يَدْرِى الْقَاتِلُ فِيمَ قَتَلَ وَلاَ الْمَقْتُولُ فِيمَ قُتِلَ ». فَقِيلَ كَيْفَ يَكُونُ ذَلِكَ قَالَ « الْهَرْجُ. الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِى النَّارِ ». {الحديث: ٧٢٣٣ شيحا = ٧٢٦٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەو کەسە کە گیانی منی بەدەستە، ئەم جیهانە ناڕواو دنیا تەواو نابێ، هەتا ئەو خەڵکە دەکەونە سەردەمێکی واوە دەبێ بە ئاخوران‌و بخوران‌و فەرتەنەو ئاشوبێکی وا لە وڵاتدا، بکوژ نازانێ لەسەر چی خەڵك دەکوژێ، هەروەها کوژراویش نازانێ لە پێناوی چیدا کوژراوە). عەرزیکرا: ئەوە چۆن چۆنی دەبێ؟ فەرمووی: (دەبێ بە ئاخوران‌و بخوران‌و کوشت‌و بڕ!). ئەوجا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (بکوژ‌و کوژراو لەو بارو دۆخەدا هەردوو لە ناو ئاگری دۆزەخدان).

## ١٥٤١) دوا ڕۆژ بەرپا نابێ هەتا ئاگرێ لە خاکی حیجاز دەردەچێ

## بَابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الحِجَازِ

٢٠١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ ، تُضِىءُ أَعْنَاقَ الإِبِلِ بِبُصْرَى». {الحديث: ٧٢١٨ = ٧٢٤٩ فم}:

ئەبو هورەریرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێ، هەتا ئاگرێ لە خاکی حیجاز دەردەچێ، گەردنی

وشتر له شاری بوصرا، له شام رووناك دهكاتهوه). {تاج/٥، زنجيره: ١٠٥، ژماره: ٥٥٦٠ – نيشانهى داهاتنى قيامهت} + {تهجريدى بوخارى/٥. ژماره: ٢١٠١ - ٧١١٨}.

**رونكردنهوه:**

١- بوصرا شارى خۆرانه، وا له شام سێ رۆژه رێ له ديمهشقهوه دووره.

٢- ئهم نيشانهيه، رووى داوه، ئيمامى نهوهوى لهم شوێنهدا، دهفهرموێ: له سهردهمى ئێمهدا له مهدينه، له ساڵى (٦٥٤)ى كۆچيدا ئهم ئاگره رويدا، وه ئێمهو خهڵكى شام به گشتى ههواڵى ئهو ئاگرهمان له رێگهى تهواتورهوه پێ گهيشت. له فهتحولولهمدا لهم شوێنهدا رووداني ئهم ئاگره له مهدينه دووپات دهكاتهوه له فهتحولباريدا، له ژماره: ٧١١٨، ٧١١٩ به روونىو به درێژى رووداني ئهم ئاگره دووپات دهكاتهوهو عهسقهلانى ئاماژه بۆ ئهمه دهكاو دهفهرموێ: (قَالَ النَّوَوِيّ: تَوَاتَرَ العِلْمُ بِخُرُوجِ هذِهِ النَّار عِنْدَ جَمِيعِ أَهْلِ الشَّامِ).

شايانى باسه ئهوكاته ئيمامى نهوهوى (رهحمهتى خوداى لێ بێ)، تهمهنى (٢٤) بيستو چوار ساڵ بووه. قورطوبيش له (التذكرة) ئاماژه بۆ رووداني ئهم ئاگره دهكا. ئيبنو كهثير (رهحمهتى خوداى لێ بێ) له روداوهكانى ساڵى (٦٥٤) شهش سهدو پهنجاو چواردا. له پهڕاوه ناودارهكهى خۆيدا بهناوى (البداية والنهاية) زۆر به دورو درێژى باسى رودانى كارهساتى دهرچوونى ئهم ئاگره دهكا، شتى زۆر سهير سهيرو سهر سورهێنهر دهگێڕێتهوه. {بڕوانه: بهرگى/١٣، لاپهڕه: ١٦٠ – ثم دخلت سنة أربع وخمسين وستمائة}.

**١٥٤٢) ههتا جارێكى تر هۆزى دهوس بوتى زولخهلهصه نهپهرستنهوه قيامهت ههڵناسێ. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢) بَابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَعْبُدَ دَوْسٌ ذَا الخَلَصَةِ**

٢٠١٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ –رضي الله عنه- قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَضْطَرِبَ أَلْيَاتُ نِسَاءِ دَوْسٍ حَوْلَ ذِى الْخَلَصَةِ ». وَكَانَتْ

صَنَماً تَعْبُدُهَا دَوْسٌ فِى الْجَاهِلِيَّةِ بِتَبَالَةَ. {الحديث: ٧٢٢٧ شيحا = ٧٢٥٨ فم. بخاري. فتن: ٧١١٦. تحفة الأشراف: ١٣٢٩٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (قیامەت هەڵناسیٚ هەتا دووبارە، وەك سەردەمی نەفامیو نەزانی پێش هاتنی ئیسلام، ژنانی هۆزی دەوس، بەدەوری بتی زیلخەلەصەدا سمت بادەدەنەوەو تەوافی دەکەنەوە). ذولخەلەصە یا (ذیلخەلەصە) ناوی بتیٚ بوو لە تەبالەی یەمەن بوو، هۆزی دەوس لە تەبالەی یەمەن دەیانپەرست!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٦١ — باسی نیشانەی داهاتنی قیامەت}.

**١٥٤٣) قیامەت هەڵناسیٚ هەتا دووبارە وەك جارانی سەردەمی نەزانی، بوتی لاتو بوتی عوززا دەپەرستنەوە!**

**بَابٌ: لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُعْبَدَ اللاَّتُ وَالعُزَّى.** {٧١٦٤ - ٧٢٧٢}

٢٠١٣- عَنْ عَائِشَةَ -رضي الله عنها- قَالَتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « لاَ يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى تُعْبَدَ اللاَّتُ وَالْعُزَّى ». فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ كُنْتُ لأَظُنُّ حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ (هُوَ الَّذِى أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ) أَنَّ ذَلِكَ تَامٌّ قَالَ « إِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً فَتَوَفَّى كُلَّ مَنْ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَيَبْقَى مَنْ لاَ خَيْرَ فِيهِ فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِينِ آبَائِهِمْ ». {الحديث: ٧٢٢٨ شيحا = ٧٢٥٩ فم}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: بیستم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەم شەوو ڕۆژە هەر دەمێننو ناڕۆنو لاناچنو قیامەت هەڵناسیٚ، هەتا دووبارە وەك سەردەمی نەزانیی پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، خەڵك بتی لاتو عوززا دەپەرستنەوە).

منیش عەرزم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ من وام دەزانی ئەم ئایەتە کە خودا ناردوویەتی موژدەکەی تا سەردەبێو ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەتا

هەتایە زاڵو سەرکەوتوو دەبێ، بەسەر ئایینەکانی تردا، هەتا رۆژی قیامەت، واتە ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

{هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ – التوبة – ٩/٣٣}.

واتە: خودا ئەو خودایەیە کە موحەممەدی پێغەمبەری خۆی لەگەڵ هیدایەتو دینی ئیسلامدا، کە ئاینێکی راستو دروستو هەقە ناردووە، بۆ ئەوەی دینەکەی خۆی دەربخا بۆ گشت خەڵکی جیهانو رۆژێ لە رۆژان، وەك سەردەمی موحەممەدی مەهدی بێ، گشت ئاینەکانی تر ببەزێنێو خۆی ببێ بە تاقە دینی سەر رووی زەوی، هەرچەند فرە خواکانو هاوەڵدانەران بۆ خودا ئەوەیان پێ ناخۆش بێ، ئیسلام هەر سەردەکەوێ).

عائیشە فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: خۆ من کە ئەم ئایەتە هاتە حوارەوە لە خوداوە بۆ تۆ، من وام دەزانی کە ئەم مژدەیەی وا لەم ئایەتەدا هەتا سەر دەبێ، کەچی تۆش وا دەفەرمووی، کە دیسان خەڵکان دەچنەوە سەر ئایینی پوچەڵی باو باپیرانیانو لاتو عوزرا دەپەرستنەوە؟!

پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە راستیدا، لەمەولا ئەوەی کە لەم ئایەتەدا باس کراوە، لە زاڵبوونو سەرکەوتنی ئیسلام بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا، چەندە حەزو خواستی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ، وادەبێو روودەداو دێتەجێ، بەڵام لەپاشا خودا بایەکی خۆش هەڵدەکاو دەینێرێ، ئیتر ئەوەی کە تۆسقاڵێ ئیمانو باوەڕ لەناو دڵیدا بێ گیانی دەکێشێ، ئەوانە دەمێننەوە کە بێ فەڕو بێ خێرن، ئەوانە دەگەڕێنەوە بۆسەر ئایینە کۆنە پووچەکەی باوو باپیرانیان!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە:٥٥٦٢ – نیشانەی داهاتنی قیامەت}.

## ١٥٤٤) قیامەت هەڵناسێ هەتا شارێ غەزو دەکرێ، لایەکی لە دەریادایەو لایەکەی تری لە وشکانیدایە

## باب: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُغْزَى مَدِينَةٌ جَانِبُهَا فِي الْبَحْرِ وَالآخَرُ فِي الْبَرِّ

٢٠١٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- أَنَّ النَّبِىَّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « سَمِعْتُمْ بِمَدِينَةٍ جَانِبٌ مِنْهَا فِى الْبَرِّ وَجَانِبٌ مِنْهَا فِى الْبَحْرِ ». قَالُوا نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَغْزُوَهَا سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ بَنِى إِسْحَاقَ فَإِذَا جَاءُوهَا نَزَلُوا فَلَمْ يُقَاتِلُوا بِسِلاَحٍ وَلَمْ يَرْمُوا بِسَهْمٍ قَالُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيَسْقُطُ أَحَدُ جَانِبَيْهَا ». قَالَ ثَوْرٌ لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ « الَّذِى فِى الْبَحْرِ ثُمَّ يَقُولُوا الثَّانِيَةَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيَسْقُطُ جَانِبُهَا الآخَرُ ثُمَّ يَقُولُوا الثَّالِثَةَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيُفَرَّجُ لَهُمْ فَيَدْخُلُوهَا فَيَغْنَمُوا فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْمَغَانِمَ إِذْ جَاءَهُمُ الصَّرِيخُ فَقَالَ إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَرَجَ. فَيَتْرُكُونَ كُلَّ شَىْءٍ وَيَرْجِعُونَ ». {الحديث: ٧٢٦٢ = ٧٢٩٣ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئەرێ ناوی ئەو شارەتان بیستووە لایەکی لە وشکانیدایەو لایەکی لە دەریادایە؟).

عەرزیانکرد: بەڵێ ناویمان بیستووە، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): قیامەت هەڵناسێ هەتا حەفتا هەزار کەس لە بەنی ئیسحاق (واتە: لە کوردە موسوڵمانەکانی شام = مِنْ أَكْرَادِ الشَّامِ الْمُسْلِمِينَ — غايه المأمول شرح التاج الجَامِعْ للأصول/ مجلد خامس، ص٣٢٩، طبعة رابعة). ئەو شارە غەزا دەکەن. (کە پێی دەگوترێ قوستەنتەنییە، کە ئێستا پێی دەڵێن: ئەستەمبووڵ). جا کە دەگەنە ئەوێ (واتە: کوردە موسوڵمانەکانی شام کە دەگەنە قوستەنتەنییە) لەوێ باروبنەی خۆیانی لێ دەخەنو لە دەوروبەری شارەکە هەوار هەڵ دەدەن، ئیتر نە بەچەك شەڕ دەکەنو نە تیر دەهاوێژن، بەڵکوو دەڵێن: {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ} واتە: هەر خودا خودایەو خودا لە هەموان گەورەترە. جا بە فەرمانی خودا، بە پیتو فەڕی ئەم وشە پیرۆزەیە، لەسەر دەستی ئەو پاڵەوانو دلێر مەردانەدا، دانیشتوانی لایەکی شارەکە خۆیان دەدەن بەدەستەوە).

ئەور کە کەسی سێیەمە لە مامۆستایانی رشتەی ئەم فەرموودەیە، لە مامۆستاکانی ئیمامی موسلیم، دەفەرمویٚ: من وادەزانم کە فەرمووی: (ئەو لایەی شارەکە کەوا لە دەریادا، بە نەعرەتەی یەکەم ئەو لایە رزگارو ئازاد دەکریٚ کەوا لەناو دەریادا).

ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا دیسان دووبارە دەڵێن: {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ} ئیتر ئەو لاکەی تریشی خۆ دەدەن بەدەستەوەو خۆیان تەسلیم دەکەن، ئەوجا سێبارە دەڵێن: {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ} ئیتر دەرووی تەواویان بۆ دەکرێتەوەو دەڕژێنە ناو شارەکەوە، دەست دەکەن بە تالاّنی گرتن‌و دەستکەوت کۆکردنەوە، لە کاتێکدا کە خەریك دەبن لەناو خۆیاندا تالاّنی دابەش بکەن، لەپڕ لەناکاو قیژەکەریٚ دەقریشکێنیٚ‌و دیٚ بۆلایان‌و دەڵیٚ: جەجاڵ هەڵساوە، ئیتر ئەوانیش هەموو شتیٚ بەجیٚ دەهێڵن‌و دەگەڕێنەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٥٥٥٤ — گرتنەوەی قوستەنتەنییە}. باسێکی دوورو درێژم لەسەر ئەم فەرموودەیە، لە تاجول ئوصولدا نووسیوە، ئەگەر رەچاوی بفەرمووی بیٚ بەهرە نابیٚ.

### ١٥٤٥) هاکا لەبن رووباری فوراتەوە کێویٚ زێڕ دەرکەویٚ. (٧٢٦٤ - ٧٢٧٢)

### بَابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ

٢٠١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ يَقْتَتِلُ النَّاسُ عَلَيْهِ فَيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ وَيَقُولُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ لَعَلِّي أَكُونُ أَنَا الَّذِي أَنْجُو». {الحديث: ٧٢٠١ شيحا=٧٢٢٩ فم. تجريد/٥، رقم: ٢١٠٢ = ٧١١٩ فتح الباري. أبو داود. فتن: ٤٣١٣}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناسیٚ هەتا کێویٚ زێڕ، لەبن فوراتەوە دەرنەکەویٚ، هەرکەسیٚ پیادا گەیشت با هیچی لیٚ نەباو هیچی لیٚ هەڵنەگریٚ!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٦٣}.

٢٠١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - « يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا » .

{ریـاض/٤، زنجـیرة: ٣٧٠، ذمـارة: ١٨٢٢} + {الحـدیث: ٧٢٠٣ شـیحا = ٧٢٣١ فـم. تجرید/٥، رقم: ٢١٠٢ = ٧١١٩ فتح الباری}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی:** (هاکا گەنجێ لە زێڕ لەبن ڕووباری فوراتـەوە دەرکـەوت، هەرکەسـێ پیـادا گەیشـتو لەو سەردەمەدا بوو، با هیچی لێ نەباو هیچی لێ هەڵ نەگرێ). {تـاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٦٣ — باسی نیشانەی داهاتنی قیامەت} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٢٢}.

## ١٥٤٦) قیامەت هەڵناسێ هەتا دەچن بەگژ هۆزێکا، ڕوومەت گووپنن.

(٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

## بَابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْماً كَأَنَّ وُجُوهَهُمْ المجانُّ المُطَرَّقَةُ

٢٠١٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ —رضـي الله عنـه- قَـالَ قَـالَ رَسُولُ اللَّـهِ -صـلى الله عليـه وسلم- « تُقَاتِلُونَ بَيْنَ يَدَىِ السَّاعَةِ قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ حُمْرُ الْوُجُوهِ صِغَارُ الأَعْيُنِ ». {الحديث: ٧٢٤٣ = ٧٢٧٠. تجريد/٤، رقـم: ١٤٣٢ = ٢٥٩٠ + رقم: ١٢٠٣ = ٢٩٢٨}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی:** (لەپێش هەڵسانی قیامەتا، بە ماوەیەکی کەم، ئێوە کوشتاری گەلێ دەکەن، پێڵاویـان مووە، ڕوخساریان سوورو لووتیان فسو چاویان وردیلەو ڕوویـان خـڕپنو گۆشـتنە، دەق وەك قـەڵغانێ بـە سـیرمەی ژێـی کـەوان سیرمە ڕێـژ کرابـێو قـات لـەبان قـات جووتبەقێ کرابێ). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٥٤٤}.

## ١٥٤٧) قیامەت هەڵناسێ هەتا پیاوێ لەبەرەی قەحطانی باپیرەی یەمەنییەکان پەیدا دەبێ. (٧١٦٣ - ٧٢٧٢) بَابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ

٢٠١٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه — أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسـلم - قَالَ « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِـنْ قَحْطَـانَ يَسُـوقُ النَّـاسَ بِعَصَـاهُ » .{الحـديث: ٧٢٣٧ = ٧٢٦٨ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٠٠ = ٣٥١٧، ٧١١٧ فتح الباری}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (قیامـەت هەڵناسـێ هـەتا پیـاوێ لـە هـۆزی قـەحطان هـەڵ دەکـەوێ، مەردوم وەك گەلە ڕان بە گۆچان لێ دەخورِێو دەبێ بە پادشایان). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٦٦ — باسی نیشانەی داهاتنی قیامەت}.

**ڕوونکردنەوە:**

لە راڤە نامە (شەرحە)کاندا دەفەرموێ: (ئەم پیاوە کە یەکێکە لـە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی دوا ڕۆژ، ناسراوە بە (قـەحطانـی) وە لـەپاش مەهـدی دێ، وە لەسەر ڕێبـازی شـیرینی مەهـدی دەڕواو سـەرۆکێکی زۆر باشـی موسـوڵمانان دەبـێ). {بڕوانـە: تەجریـدی بوخـاری بـە کـوردی = پوختـەی موختەصـەری صـەحیحی بوخاری، بەرگی چوارەم، ژمـارە: ١٣٩١ = ٣٥٠٠، ٧١٣٩ فـتح البـاری شـەرحی صـەحیحی بوخاری}.

**١٥٤٨) قیامەت هەڵناسێ هەتا پیاوێ دەبێ بە پادشا، ناوی جەهجاه دەبێ.**

**(٧١٦٤ - ٧٢٧٢) بَابٌ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ الْجُهْجَاهُ**

٢٠١٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « لاَ تَذْهَبُ الأَيَّامُ وَاللَّيَالِى حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ الْجَهْجَاهُ ». {الحديث: ٧٢٣٨ = ٧٢٦٩ فم. ترمذى. فتن: ٢٢٢٨، تحفة الأشراف: ١٤٦٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (شەوو ڕۆژ هەروا دەمێنێ، تا پیاوێکی نارەسەن لـە مەوالییـەکان دەبـێ بـە پادشـای ئیسـلام، نـاوی جـەهجاه دەبـێ). {تـاج/٥، زنجـیرە: ١٠٥، ژمـارە: ٥٥٦٧ — نیشـانەی داهاتنی قیامەت}.

**١٥٤٩) قیامەت هەڵناسێ هەتا ناوی خودا لەسەر ڕووی زەوی نامێنێو کەسێ نابێ بڵێ: ئەڵڵا ئەڵڵا (باب: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّي لاَ يُقَل فِى الآرْض االلَّه اللَّه)**

٢٠٢٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِى الأَرْضِ اللَّهُ اللَّهُ ». {الحديث: ٣٧٣ = ٣٨٧ فتح اللهم}:

ئەنــەس (رەزای خـودای لـێ بـێ) فــەرمووی: خۆشەویســت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فــەرمووی: (قیامەت هەڵناسێ هەتا وای لێ دێ کەس نابێ لەسەر زەوی ناوی خودا بێنێو بڵێ: ألله ألله!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٨٠ — نیشانەی داهاتنی قیامەت}.

**١٥٥٠) لە یەمەنەوە خودا نەرمە بایێ دەنێرێ گیانی هەموو موسڵمانێ دەکێشێ.** (٣٠٨) (**باب: تُبْعَثُ رِيحٌ مِنَ الْيَمَنِ فَتَقْبِضُ مَنْ مَنْ قَلْبِهِ إِيمَانٌ**

٢٠٢١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- «إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ رِيحًا مِنَ الْيَمَنِ أَلْيَنَ مِنَ الْحَرِيرِ فَلاَ تَدَعُ أَحَدًا فِى قَلْبِهِ - قَالَ أَبُو عَلْقَمَةَ: مِثْقَالُ حَبَّةٍ وَقَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: مِثْقَالُ ذَرَّةٍ - مِنْ إِيمَانٍ إِلاَّ قَبَضَتْهُ ». {الحديث: ٣٠٨ = ٣٢٤ فم}:

ئــەبو هــورەیرە (رەزای خـودای لـێ بـێ) فــەرمووی: خۆشەویســت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی:(خودای گەورە لە یەمەنەوە نەرمە بایێ دەنێرێ، لە ئاوریشم نەرمترە، هەرکەسێ سەنگی دانەوێڵەیێ باوەڕ بە خودا لە دڵیا هەبێ ئەو بایە گیانی دەکێشێ)، ئەمە لەفظی ئەبو عەلقەمەیە بەڵام لەفظی عەبدولعەزیز ئاوایە: (هەرکەسێ کێشی گەردێ باوەڕ لە دڵیابێ ئەو بایە گیانی دەکێشێ).{تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٧٨} .ئەبو عەلقەمەو عەبدولعەزیز، هەردوکیان مامۆستای ئیمامی موسلیم بوون.

**١٥٥١) هەتا مەردوم هەموو گەندو بەد نەبن قیامەت هەڵناسێ.** (٧٣٢٨ – ٧٣٣٩)
**باب: لاَتقُومُ السَّاعَةُ إلاَ عَلَى شِرارِ النَّاس**

٢٠٢٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن المسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ عَلَى شِرَارِ النَّاسِ». {الحديث: ٧٣٢٨ = ٧٣٦٢ فم}:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەتا مەردوم هەموو خراپو گەندو بەد نەبنو بێ باوەڕ نەبن قیامەت هەڵناسێ). {تاج/٥، زنجیرە:١٠٥، ژمارە: ٥٥٧٩ — نیشانەی داهاتنی قیامەت}.

**١٥٥٢) قیامەت هەڵناسێ هەتا کۆمەڵێ پێغەمبەرە درۆزنە پەیدا دەبن.**

**(٧١٦٤ - ٧٢٧١) بَابٌ: لاَتَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يخرجَ دَجَّالُون كَذَّابُونَ**

٢٠٢٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - عَنِ النَّبِىِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَقْتَتِلَ فِئَتَانِ ، فَيَكُونَ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ ، دَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ ، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبًا مِنْ ثَلاَثِينَ ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ » . {الحديث: ٧٢٧١ = ٧٣٠٢ فم. بخاري. مناقب: ٣٦٠٩. ترمذي. فتن: ٢٢١٨. تحفة الأشراف: ١٤٧١٩} :

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (قیامەت هەڵناسێ هەتا نزیکەی سیی پێغەمبەرە درۆزنەی تەفرە دەری هەلاتباز پەیدا دەبن، هەموویان بەدرۆ خۆیان بە پێغەمبەری خودا دەزانن!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥٥٣٠}.

٢٠٢٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ - رضى الله عنه - قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « إِنَّ بَيْنَ يَدَىِ السَّاعَةِ كَذَّابِينَ ». (وفي رواية قال جابر): فأحذروهم. {الحديث: ٧٢٦٩، ٧٢٧٠ شيحا = ٧٣٠٠، ٧٣٠١ فم} :

**جابیری کوڕی سەموورە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەڕاستیدا بەر لەهاتنی قیامەت بە ماوەیەکی کەم، کۆمەڵێ درۆزن پەیدا دەبن).

لە گێڕانەوەی ژمارە (٧٣٠١)ی فەتحولمولهم شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ: جابیر فەرمووی: وریابن ئاگاتان لەخۆتان بێ، ئەم جۆرە درۆزنانە تەفرەتان نەدەن!).

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لەم درۆزنانەی کە لەم فەرموودەیەدا، ئاماژەیان بۆ کراوە، هەر ئەو هەلاتبازانە نییە کە داوای پێغەمبەرایەتیو مەهدێتی دەکەن، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵك پەیدا دەبن، بە هەزارو یەك ناوەوە بانگەشەی

درۆو دەستبڕانە بۆ خۆیان دەکەنو کۆمەڵ کۆمەڵ مەردوم لاس دەدەنو تەفرەیان دەدەنو لەڕێ دەریان دەکەنو بەرەو هەڵدێری ئایینیو جیهانی ئاڕاستەیان دەکەنو لە مرۆڤەوە دەیانکەن بە ئاژەڵ!

لە راستیدا ئێستا وایە، بێ ڕەوشتیو بێ دینیو بەرەڵایی وا زۆر بووە، لە ژمارە نایێ، بە دەنگو بە رەنگو بە نووسینو بە جۆرەها بەرنامەی ژەهراوی پۆل پۆل خەڵك لە رەوشتی بەرز، لە ئایینی پاك، لە مەردایەتیو ئازایەتی دەتەکێننەوەو بەرەو کوفرو بێ دینیو بەد رەوشتیو ئاژاڵی، وەك گاگەلو رانی بزنو مەڕ لێیان دەخوڕنو فێری سوورڕدانو سەماو مەیو بادە نۆشیو حیزیو دزیو بێناموسییان دەکەن، ئاشکرا بە گەنجو لاوەکان دەڵێن: وەك تەگەو بەرانو مەڕو بزن تێك بەربنو درێغی مەکەن، بە فیلمی رووتو قووت لە کەناڵە ئاسمانییەکانەوە، تامی تامییان دەدەنو بە یاساو بە پۆلیس بارودۆخی تایبەتی وایان بۆ دەرەخسێنن کە بۆ ژنو مێردیش نەڕەخسێن، وەك: سەکۆی سەربەستیو پارکی ئازادی، کە جاران بەم شوێنانەیان دەگوت: گەواد خانەو قەحبە خانە. إِنَّا لِلّهِ وَ إِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ.

### ١٥٥٣) شەڕی موسوڵمانانو جوولەکە. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

### بَابٌ فِي قِتَالِ الْمُسْلِمِينَ الْيَهُودَ

٢٠٢٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ فَيَقْتُلُهُمُ الْمُسْلِمُونَ حَتَّى يَخْتَبِئَ الْيَهُودِىُّ مِنْ وَرَاءِ الْحَجَرِ وَالشَّجَرِ فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوِ الشَّجَرُ يَا مُسْلِمُ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا يَهُودِىٌّ خَلْفِى فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ. إِلاَّ الْغَرْقَدَ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ ». {الحديث: ٧٢٦٨ شيحا = ٧٢٩٩ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = پوختەی صەحیحی بوخاری بە کوردی. بەرگی دووەم: ١٢٠٢ = ٢٩٢٦، ٣٥٩٣. فتح الباري. شرح صحيح البخاري} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (دروودو سڵاوی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێو سەرو ماڵ گشتی بە قوربانی گەردی بەر ئاستانەی ئارامگای پیرۆزی بێ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێ

هەتا شەڕی موسوڵمانو جوولەکە روودەدا، موسوڵمانان دەچن بەگژ جوولەکەدا، جوولەکە شەڕتان لەگەڵدا دەکەن، شەڕێکی دوورو درێژ، تا لە ئەنجامدا خودا ئێوەی موسوڵمانان زاڵ دەکا بەسەر ئەواندا، کاتێ موسوڵمانەکان دەست دەکەن بە کوشتاریان جوولەکەکان وادەشکێن، لەبن بەردو دارو بنچكو دەوەندا خۆیان پەنا دەدەنو خۆیان دەشارنەوەو خۆیان حەشار دەدەن، بەردو دارو درەختو دەوەنەکە دەڵێن: ئەی کاکەی موسوڵمان! ئەی بەندەی باشی خودا! ئەی عەبدی خاسی خودا! ئەمە جوولەکەیەکە لە پشتمەوە خۆی حەشارداوە، وەرە ئەو دوژمنی خودایە بکوژە، تەنیا داری دڕکەزی وانالێ، چونکە ئەو لە درەختی جوولەکەیە، حەشاریان دەداو راستییان لێ نالێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٧٠}+{ریاض الصالحین/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٢٠}.

**١٥٥٤) کاتێ قیامەت هەڵ دەستێ رۆم لەهەمووکەسێ زۆرترن.** (٧١٦٤ - ٧٢٠٨)

**بَابٌ: تقومُ السَّاعةُ والرُّومُ أكْثرُ النَّاس**

٢٠٢٦- عَنْ مُوسَى بْنُ عُلَىّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ الْمُسْتَوْرِدُ الْقُرَشِىُّ عِنْدَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرُّومُ أَكْثَرُ النَّاسِ ». فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو أَبْصِرْ مَا تَقُولُ. قَالَ أَقُولُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ إِنَّ فِيهِمْ لَخِصَالاً أَرْبَعًا إِنَّهُمْ لأَحْلَمُ النَّاسِ عِنْدَ فِتْنَةٍ وَأَسْرَعُهُمْ إِفَاقَةً بَعْدَ مُصِيبَةٍ وَأَوْشَكُهُمْ كَرَّةً بَعْدَ فَرَّةٍ وَخَيْرُهُمْ لِمِسْكِينٍ وَيَتِيمٍ وَضَعِيفٍ وَخَامِسَةٌ حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ وَأَمْنَعُهُمْ مِنْ ظُلْمِ الْمُلُوكِ. {الحديث: ٧٢٠٨ = شرح صحيح مسلم، تحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٢٣٦ فم = ف.م = فتح الملهم شرح صحيح مسلم}:

موسای کوڕی عەلی (رەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: موستەوریدی قورەیشی (رەزای خودای لێ بێ) لەلای عەمری کوڕی عاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتێ کە قیامەت بەرپا دەبێ، میللەتی رۆم لەهەموو میللەتێکی تر زۆرتر دەبن، عەمری کوڕی عاصیش پێی فەرموو: لە قسەکەت ورد بەرەوە، بزانە دەڵێی چیو ئەم قسەیە کوێ دەگرێتەوە!

موستەوریدیش فەرمووی: چیم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە ئەوە دەڵێم: زیاتر ناڵێم! ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە، قسەی من نییە. عەمریش فەرمووی: دەی لەسەر ئەم قسەیەی تۆدا، دەسا ئەم میللەتانی رۆمە، چوار رەوشتی باشیان وەها تیادا:

یەکەم: لەکاتی ئاژاوەو ئاشووبدا، زۆر بە حەوسەڵەو هێمن‌و لەسەرخۆن.

دووەم: لەپاش قۆرت‌و چورتم‌و گرفتاری‌و پێکان، زوو دێنەوە سەرخۆیان.

سێیەم: لەکاتی شەڕو هەرادا، لەپاش کشانەوە، گورج تێ هەڵ دەچنەوەو هەڵمەت دەبەنەوە بۆسەر دوژمنی خۆیان.

چوارەم: بۆ هەژاران‌و بێ نەوایان‌و هەتیوانیش زۆر باشن، سەرەڕای ئەم چوار رەوشە باشانەیش، رەفتارێکی شیرینی جوانی تریشیان هەیە، کە لەگەڵ ئەم چوارەدا دەکەنە پێنج بەهرەی گەورە، کە ئەویش ئەمەیە: (کە ناهێڵن سەرۆك‌و پادشاکانیان، زۆرو ستەم‌و ناهەقی بکەن‌و لەم لایەنەوە لەهەموو کەسێ باشتر رێگە نادەن بە سەرۆك‌و پادشاکانیان، کە زۆرو ستەم‌و ناهەقی بکەن!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٥٥٥٥ — ئەو حەلە رووم زۆرن بەڵام سەرکەوتن بۆ موسوڵمانانە} ..

**روونکردنەوە:**

١- مەبەست لە رۆم (رووم) گەلە مەسیحییەکانە، کە زۆرینەی ئەورووپاو ئەمەریکاو ئوسترالین‌و لە کیشوەری ئەفریقاو ئاسیاش زۆر زۆرن. وەخۆشی وایە.

٢- موستەورید ناوی تەواوی (موستەوریدی کوڕی شەددادی ئەل - فیهرییە) هاوەڵی پێغەمبەرە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەرگ بوو بەمیوانی، موستەورید لاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو، لەپێشا لە کووفە نیشتەجێ بوو، پاشان لە میصر جێگیر بوو، خۆی‌و باوکی لە یارانی پێغەمبەرن، لە صەحیحی موسلیمدا فەرموودەی هەیە، وەك ئەم فەرموودەیەی کەواین لە خزمەتیدا، بوخاریش بە تەعلیق فەرموودەیەکی ئەوی گێڕاوەتەوە. لە ئەسکەندەرییە، لە ساڵی چل‌و پێنجی کۆچیدا مردووە.

٣- مووسای کوڕی عولەیی کوڕی رەباح، لە متمانە دارەکانی خەڵکی میصرە، لە ساڵی نەوەدی کۆچی لە ئەفریقا لەدایکبووە، ساڵی (١٦٣)ی کۆچی لە ئەسکەندەرییە مردووە، باوکیشی کە ناوی عولەیی کوڕی رەباح بوو، متمانەدار بوو، عولەیی ناوی عەلی بوو، بەڵام لەترسی بەنی ئومەییە گۆڕی بە عولەیی، بە موصەغەری، چونکی هەرکەسێ ناوی عەلی بوایە، ئەمەوییەکان دەیانکوشت، رێك وەك ئێستا لە بەغدا هەرکەس ناوی عومەر یا ئەبوبەکر، یا عوثمان، یا عائیشە بێ دەیکوژن!

**١٥٥٥) شەڕی رووم و زۆری کوشتن لەکاتی دەرچوونی جەجاڵدا.** (٧١٦٤ - ٧٢١٠)

**بَابٌ: فِي قِتَالِ الرُّومِ وكثرة الْقَتْلِ عِنْدَ خُرُوجِ الدَّجَّالِ**

٢٠٢٧- عَنْ يُسَيْرِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: هَاجَتْ رِيحٌ حَمْرَاءُ بِالْكُوفَةِ فَجَاءَ رَجُلٌ لَيْسَ لَهُ هِجِّيرَى إِلاَّ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ جَاءَتِ السَّاعَةُ. قَالَ فَقَعَدَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَقَالَ إِنَّ السَّاعَةَ لاَ تَقُومُ حَتَّى لاَ يُقْسَمَ مِيرَاثٌ وَلاَ يُفْرَحَ بِغَنِيمَةٍ. ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا - وَنَحَّاهَا نَحْوَ الشَّأْمِ - فَقَالَ عَدُوٌّ يَجْمَعُونَ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ وَيَجْمَعُ لَهُمْ أَهْلُ الإِسْلاَمِ. قُلْتُ الرُّومَ تَعْنِى قَالَ نَعَمْ وَتَكُونُ عِنْدَ ذَاكُمُ الْقِتَالِ رَدَّةٌ شَدِيدَةٌ فَيَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ فَيَفِيءُ هَؤُلاَءِ وَهَؤُلاَءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً أخرى لِلْمَوْتِ لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يَحْجُزَ بَيْنَهُمُ اللَّيْلُ فَيَفِيءُ هَؤُلاَءِ وَهَؤُلاَءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ ثُمَّ يَشْتَرِطُ الْمُسْلِمُونَ شُرْطَةً لِلْمَوْتِ لاَ تَرْجِعُ إِلاَّ غَالِبَةً فَيَقْتَتِلُونَ حَتَّى يُمْسُوا فَيَفِيءُ هَؤُلاَءِ وَهَؤُلاَءِ كُلٌّ غَيْرُ غَالِبٍ وَتَفْنَى الشُّرْطَةُ فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الرَّابِعِ نَهَدَ إِلَيْهِمْ بَقِيَّةُ أَهْلِ الإِسْلاَمِ فَيَجْعَلُ اللَّهُ الدَّبْرَةَ عَلَيْهِمْ فَيَقْتُلُونَ مَقْتَلَةً - إِمَّا قَالَ لاَ يُرَى مِثْلُهَا وَإِمَّا قَالَ لَمْ يُرَ مِثْلُهَا - حَتَّى إِنَّ الطَّائِرَ لَيَمُرُّ بِجَنَبَاتِهِمْ فَمَا يُخَلِّفُهُمْ حَتَّى يَخِرَّ مَيْتًا فَيَتَعَادُّ بَنُو الأَبِ كَانُوا مِائَةً فَلاَ يَجِدُونَهُ بَقِيَ مِنْهُمْ إِلاَّ الرَّجُلُ الْوَاحِدُ فَبِأَيِّ غَنِيمَةٍ يُفْرَحُ أَوْ أَيُّ مِيرَاثٍ يُقَاسَمُ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعُوا بِبَأْسٍ هُوَ أَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ فَجَاءَهُمُ الصَّرِيخُ إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَلَفَهُمْ فِى ذَرَارِيِّهِمْ فَيَرْفُضُونَ مَا فِى أَيْدِيهِمْ وَيُقْبِلُونَ فَيَبْعَثُونَ عَشَرَةَ فَوَارِسَ طَلِيعَةً. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- «

إِنِّي لأَعْرِفُ أَسْمَاءَهُمْ وَأَسْمَاءَ آبَائِهِمْ وَأَلْوَانَ خُيُولِهِمْ هُمْ خَيْرُ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ يَوْمَئِذٍ أَوْ مِنْ خَيْرِ فَوَارِسَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ يَوْمَئِذٍ ». {الحديث: ٧٢١٠ = ٧٢٣٨ فم}:

يوسەیری كوڕی جابیر فەرمووی: لە كووفە بایەكی سوور هەڵیكرد، پیاوێ هەبوو، دەم بە هاوار بوو، هەرشتێكی سەیری دەبینی، بە هەڵەداوان دەهات بۆ لای عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودو دەیگوت: ئەی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود! وا قیامەت هات، ئەمجارەیش كە با سوورەكەی بینی وەك دەستووری جارانی هات بۆ لای‌و گوتی: ئەی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود! وا قیامەت هات.

فەرمووی: عەبدوڵڵا راكشابوو، رێك دانیشت‌و فەرمووی: قیامەت وا هەڵناسێ، قیامەت هەڵناسێ هەتا لەبەر شەڕو شۆڕو كوشتاری زۆر كەس نایپەرژێتە سەر دابەشكردنی كەلەپوور، هەروەها كەس لەبەر هەمان هۆ دڵی بە دەسكەوتی جەنگ خۆش نییە.

ئەوجا عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود بەدەستی ئاماژەی بەرەو شام كردو فەرمووی: (دوژمنێك لەشكرێكی زۆر كۆدەكەنەوە بۆ خەڵكی ئیسلام‌و ئەهلی ئیسلامیش لەشكر كۆدەكەنەوە بۆ ئەوان). منیش عەرزیم كرد: مەبەستت لەو دوژمنە رۆمەكانە، كە گاورەكانی سەر بە ئایینی عیسای مەسیحن؟! فەرمووی: بەڵێ، مەبەستم ئەوانە. ئەوجا عەبدوڵڵا فەرمووی: ئیتر لەوكاتەدا جەنگ بەرپا دەبێ‌و كوشتار دەست پێدەكاو دەبێ بە هەڵمەت بردن‌و هێرش لەدوا هێرش!

جا موسوڵمانەكان كۆمەڵێ لە سوپاكە جیادەكەنەوەو دەیانكەن بە بەرایی خۆیان، كە ئەو كۆمەڵە هەڵبژاردەیە مەرج دەكەن‌و پەیمان دەدەن كە نابێ بگەڕێینەوە، ئیللا بە ئیحدەلحوسنەیەینەوە نەبێ، وەك قورئان دەفەرمووێ:

{قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلاَّ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ – التوبة – ٩/٥٢}. واتە: بفەرموو ئێوە چاوەڕوانی چی لە ئێمەی خەباتگێڕی موسوڵمان دەكەن؟ جگە لە یەكێ لەم دوو بەهرە جوان‌و شیرینە: یا سەركەوتن، یا شەهیدبوون!).

جا شەڕ دەست پێدەکا، لەپاش خۆئامادە کردن بۆی لەهەردوو لاوە، ئەو ڕۆژە تاشەو دادێت شەڕو کوشتار بەردەوام دەبێت، کە شەو دادێ، هەر سوپایەی دەگەڕێتەوە بۆ سەنگەری خۆی، هیچ لایان سەرکەوتنی گەورە بەدەست ناهێنن، بەڵام کۆمەڵە هەڵبژاردەکە، کە بەرایی لەشکری موسوڵمانەکان بوون، هەموو شەهید دەبنو کەسیان لێ دەرناچێ. دیسانەوە موسوڵمانەکان کۆمەڵێ تر جیادەکەنەوە، ئەوانیش مەرجو پەیمان دەکەن: یا مردن، یا سەرکەوتن، هەمدیسان دەبێتەوە بە شەڕو کوشتار لەنێوان هەردوولادا، هەتا شەو دادێو شەو دەکەوێتە نێوانیانو، هەر لەشکرەی دەگەڕێتەوە بۆ سەنگەری خۆی، هیچ لایان سەرکەوتنی تەواو مسۆگەر ناکەن، بەڵام کۆمەڵە هەڵبژاردەکە دیسان هەموویان شەهید دەبنو تاقیان لێ دەرناچێ، بۆ جاری سێیەم موسوڵمانان کۆمەڵێ تر هەڵدەبژێرن، دیسان ئەوانیش مەرجو پەیمان دەکەن: کە یا مردن، یا سەرکەوتن. جا هەمدیسانەوە دەبێتەوە بە شەڕو کوشتارو شەڕ بەردەوام دەبێ هەتا ئێوارێ دادێ، ئەوجا هەر لەشکرەی دەگەڕێتەوە بۆ سەنگەری خۆی، کەسیان سەرکەوتنی تەواو دابین ناکەن، بەڵام دیسانەوە کۆمەڵە هەڵبژاردەکە هەموو شەهید دەبن.

جا لە ڕۆژی چوارەمدا، ئەوەی کەماوە لە موسوڵمانان رادەپەڕنو دەچن بۆ شەڕ لەگەڵیانا، وە خودا تووشی شکستێکی زۆر گەورەیان دەکاو موسوڵمانەکان دەشکێنو دەبێ بە جەنگێکی خوێناوی بێ وێنەی کەس نەدیدە، تەنانەت مەیدانی کوشتارەکە ئەوەندە پانو پۆڕو درێژەو ئەوەندە شوێن دەگرێتەوەو ئەوەندە لاشەی بێ گیان لە مەیدانا دەکەوێ، ئەگەر مەلو باڵندە بەسەر تەرمی کوژراوەکانا بفڕێ، پێش ئەوەی کە ئەوپەڕیان بکەوێ، ماندوو دەبێو لە پەلوپۆ دەکەوێو خرپ بەردەبێتەوەو دەمرێ!

بەرە بابێ لەسەد کەس پیاوێکیان لێ دەمێنێ، ئیتر چۆن چۆنی دڵیان بە تاڵانی خۆش بێ، یا بەچی دڵێکەوە دڵ بە کەلەپوور دابەشکردن خۆش بکەن، جا لە بارودۆخو کەشێکی ئاوادا، لەناکاو هاوار هەڵ دەستێ: کە بەڵایێ لەمەیش خراپتر

روویـداوە، هـاوار کـەرێ دێ بۆلایـانو هاواریـان لێ دەکـا: کـەوا جـەجاڵ هەڵسـاوەو بەربۆتە ناو ماڵو مناڵیان!!

ئیتر موسوڵمانەکان دەست لە هەموو سامانو دەستکەوتێ، کە دەستیان کەوتووە هەڵ دەگرنو بەدەستی خاڵیو بە پەرۆشەوە دەگەڕێنەوە بۆ ناو خێزانەکانیان.

موسـوڵمانەکان دەسـوار چـاك لـەپێش خۆیانـەوە دەکـەن بـە پـێش قـەرەوڵو دەیاننێرن بۆ سۆراخی جەجاڵ).

خۆشەویسـت (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (مـن زۆربـاش نـاوی خۆیـانو نـاوی باوکیانو رەنگی ماینو ئەسپەکانی ژێریان دەزانم، لەو رۆژەدا خۆیان باشترین سوار گەلی سەر رووی زەوین!). یا فەرمووی: (لەو رۆژەدا ئەو دە سوارە لە باشـترین سـوار گەلی سەر رووی زەوین!!).

### ١٥٥٦) باسی ئەو سەرکەوتنو وڵات ئازادکردنانەی کە بەر لە هەڵسانی جەجاڵ موسوڵمانان بەدەستی دەهێنن. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

### بَابٌ: ما يكون من فتوحات المسلمين قبل الدجال

٢٠٢٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ عَنْ نَافِعِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فِى غَزْوَةٍ - قَالَ - فَأَتَى النَّبِىَّ -صلى الله عليه وسلم- قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ الْمَغْرِبِ عَلَيْهِمْ ثِيَابُ الصُّوفِ فَوَافَقُوهُ عِنْدَ أَكَمَةٍ فَإِنَّهُمْ لَقِيَامٌ وَرَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَاعِدٌ - قَالَ - فَقَالَتْ لِى نَفْسِى ائْتِهِمْ فَقُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ لاَ يَغْتَالُونَهُ - قَالَ - ثُمَّ قُلْتُ لَعَلَّهُ نَجِىٌّ مَعَهُمْ. فَأَتَيْتُهُمْ فَقُمْتُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ - قَالَ - فَحَفِظْتُ مِنْهُ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ أَعُدُّهُنَّ فِى يَدِى قَالَ « تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ ثُمَّ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللَّهُ ». قَالَ فَقَالَ نَافِعٌ يَا جَابِرُ لاَ نَرَى الدَّجَّالَ يَخْرُجُ حَتَّى تُفْتَحَ الرُّومُ. {الحديث: ٧٢١٣ = صحيح مسلم بشرح النووى، تحقيق الشيخ مأمون شيحا = ٧٢٤١ صحيح مسلم بشرح فتح الملهم = فم = ف.م. تحفة الأشراف: ١١٥٨٤}:

جابیری کوڕی سـەموورە، کـە خـۆی سـەحابەی پێغەمبـەرە، فـەرمووی: نـافیعی کـوڕی عوتبـەی خـاڵۆزام (رەزای خـودا لـە جـابیرو لـە نـافیع بـێ) فـەرمووی: لـە

غەزایەكا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، لەلای رۆژاوای مەدینەوە دەستەیێ پیاو هاتنە خزمەتی، بەرگی خورییان لەبەردابوو، كە گەیشتنە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای تەپۆڵكەیەكا بوو، ئەوان بە پێوە بوون، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبوو، لە دڵی خۆما گوتم: بابچم بۆلایان، بكەومە نێوانی ئەوانو نێوانی پێغەمبەرەوە نەبادا بە هەلی بزاننو پێغەمبەر بكوژن، لەپاشا گوتم: بەشكوو رازو قسەی نهێنی خۆی هەبێ لەگەڵیانا، ئاخری خۆم پێ نەگیراو چوومو لەنێوانی ئەوانو لەنێوانی ئەوا وەستامو، ئیتر ئەم چوار وتەیەم لە فەرمایشتەكانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەركرد، بە پەنجەكانم دەمژماردن: فەرمووی: لەپێشا جەزیرەتولعەرەب (دوورگەی عەرەب) غەزا دەكەنو خودا فەتحی دەكا بۆتان، لەپاش ئەویش وڵاتی فارس غەزا دەكەنو خودا ئازادی دەكا بۆتان، لەپاش ئەویش وڵاتی رۆم غەزا دەكەنو خودا ئازادی دەكا بۆتان، لەپاشدا دەچن بەگژ ججاڵو ئەویش لەناوی دەبا بۆتان).

عەبدولـەلیكی راوی فەرمووی: جا نافیع (رەحمەتی خودای لێ بێ) بە جابیری كوڕی سەموورەی فەرموو: ئەی جابیر! وادەزانین هەتا وڵاتی رۆم نەگیرێ جەجاڵ هەڵناسێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٥٥٥٦ – ئەو حەلە رۆم زۆرن بەڵام سەركەوتن بۆ موسوڵمانانە}.

**روونكردنەوە:**

١- ژیاننامەی جابیری كوڕی سەموورە، لەپێشەوە لە ژمارە: (١٤٦)دا رابورد.

٢- نافیعی كوڕی عوتبە خاڵۆزای جابیری كوڕی سەموورەیە، لە رۆژی ئازادكردنی مەككەدا موسوڵمان بووە، عوتبەی باوكی بە بێباوەڕێ لەپێش ئازادكردنی مەككەدا كوژرا. لە فەتحولولهیمدا بەدەق دەفەرموێ: نافیعی كوڕی عوتبەی كوڕی ئەبو وەقاص خاڵۆزای جابیری كوڕی سەموورەیە، بەڵام لە (تهذیب التهذیب)و لە (الإصابة في تمییز الصحابة)دا دەڵێ: (رَوى جابرُ بْنُ سَمُرَةَ – وَهُوَ ابنُ عَمَّتِهِ - عَتَهُ) جا رەنگ بێ: مەبەست ئەوەبێ كە خاڵۆزاو پورزای یەكتری بن،

عوتبەو سەموورە بە خوشكو كچی خۆیان ژن بەژنیان كردبێ واتە: عوتبە خوشكی خۆی داوە بە سەموورە، نافیعی كوڕی عوتبە دەبێ بە خاڵۆزای جابیر، سەموورەیش كچی خۆی دابێ بە عوتبە، جابیری كوڕی سەموورە دەبێ بەكوڕی پووری نافیع لە باوكەوە.

**١٥٥٧) ئازادكردنی قوستەنتەنییە.** (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

**بَابٌ: فِي فَتْحِ قسطنطنية**

**٢٠٢٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بِالأَعْمَاقِ أَوْ بِدَابِقَ فَيَخْرُجُ إِلَيْهِمْ جَيْشٌ مِنَ الْمَدِينَةِ مِنْ خِيَارِ أَهْلِ الأَرْضِ يَوْمَئِذٍ فَإِذَا تَصَافُّوا قَالَتِ الرُّومُ خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ. فَيَقُولُ الْمُسْلِمُونَ لاَ وَاللَّهِ لاَ نُخَلِّى بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا. فَيُقَاتِلُونَهُمْ فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لاَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ أَبَدًا وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللَّهِ وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ لاَ يُفْتَنُونَ أَبَدًا فَيَفْتَتِحُونَ قُسْطُنْطِينِيَّةَ فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْغَنَائِمَ قَدْ عَلَّقُوا سُيُوفَهُمْ بِالزَّيْتُونِ إِذْ صَاحَ فِيهِمُ الشَّيْطَانُ إِنَّ الْمَسِيحَ قَدْ خَلَفَكُمْ فِى أَهْلِيكُمْ. فَيَخْرُجُونَ وَذَلِكَ بَاطِلٌ فَإِذَا جَاءُوا الشَّأْمَ خَرَجَ فَبَيْنَمَا هُمْ يُعِدُّونَ لِلْقِتَالِ يُسَوُّونَ الصُّفُوفَ إِذْ أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ فَأَمَّهُمْ فَإِذَا رَآهُ عَدُوُّ اللَّهِ ذَابَ كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِى الْمَاءِ فَلَوْ تَرَكَهُ لاَنْذَابَ حَتَّى يَهْلِكَ وَلَكِنْ يَقْتُلُهُ اللَّهُ بِيَدِهِ فَيُرِيهِمْ دَمَهُ فِى حَرْبَتِهِ».{الحديث:٧٢٠٧=٧٢٣٥ فتح الملهم} :**

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (قیامەت هەڵناسێ هەتا لەشكری رۆم لە ئەعماق هۆردوبەز دەكەن). یا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەشكری رۆم لە دابیق باروبنەی لێ دەخەنو دەگەنە دەوروبەری مەدینەی درەخشان، جا لەشكرێ لە مەدینەوە بۆیان دەردەچن، لەو سەردەمەدا باشترینی دانیشتوانی سەر رووی زەوی خۆیانن، كاتێ هەردوو لەشكری بەرابەری یەكتری رێز دەبەستن بۆ شەڕ، رۆمەكان بە موسوڵمانەكان دەڵێن: ئێوە رێگەمان بۆ چۆڵ بكەن، ئێمە بەس لەگەڵ ئەوانەدا جەنگ دەكەین، كە دیلیان لە ئێمە گرتووەو ماڵو منالیان بە تالانی بردووین. موسوڵمانەكانیش دەزانن كە

مەبەستیان لەم قسەیە بیانوو مەهانەیە، لەبەرئەوە دەفەرموون: نا بەخودا شتی وا ناکەینو ڕێگەتان پێ نادەینو نایەڵین کە پەنجەیان بۆ ببەن، چۆن شتی وا دەکەین ئەوانە برای ئایینی ئێمەن، چۆن پشتیان بەردەدەین، ئیتر دەچن بەگژیاندا. جا سێیەکی لەشکری موسوڵمانەکان دەشکێنو هەڵدێن، ئەوانە هەتا هەتایە خودا تەوبەو پەشیمانییان لێ گیرناکا، سێیەکێکیشیان لێ دەکوژرێنو دەبن بە باشترین شەهیدان لەلای خودا، سێیەکەکەی تریشیان شەڕ دەبەنەوەو سەردەکەون، ئەمانەیش هەرگیزاو هەرگیز تووشی ئاشووبو دووچاری فیتنە نابن، جا لەشکری ڕۆم دەشکێننو، بەشەڕ شوێنیان دەکەون هەتا دەیانکەنەوە بەناو قوستەنتەنییەداو، قوستەنتەنییە دەگرن، جا لەپاش گرتنی قوستەنتەنییە، پشوویێ دەدەنو شیرەکانیان بەداری زەیتوونا هەڵ دەواسنو جەنگ تەواو دەبێو، خەریك دەبن ماڵی تالانی دابەش دەکەن، لەودەمەدا لەناکاو شەیتان دەقریشکێنێ بەناویانداو، دەڵێ: جەجاڵە کۆرە مووشی هەلاتباز لە شوێنی ئێوە شادبووە بە کەسو کارو ماڵو مناڵتان!

ئەم قسەیەیش لەخۆیا درۆیە، چونکە جەجاڵ ناچێتە مەدینەو هێشتایش هەڵ نەساوە، بەڵام ئەوان لەشار دەردەچنو دەڕۆن تا دەگەنە شام، ئەوسا جەجاڵ پەیدادەبێ، جا وا ئەوان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ شەڕ، ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن، ڕۆژێ قامەت بۆ نوێژ دەکرێ، لەوکاتەدا عیسای کوڕی مەریەم (دروودو سلاوی خودای لەسەر بێ) لە ئاسمانەوە دادەبەزێو بەرنوێژیی ئەو نوێژەیان بۆ دەکا، جا کە جەجاڵ ئەو دوشمنی خودایە هەر کە چاوی بە عیسای کوڕی مەریەم دەکەوێ، ئیتر وەك خوێی ناو ئاو دەتوێتەوە، ئەویش ئاوا دەتوێتەوە، گریمان ئەگەر عیسا وازیشی لێ بهێنێو نەیکوژێ، خۆی لە خۆیەوە هەر لەناو دەچێو دەتلیسێتەوە، بەڵام خودا بەدەستی عیسا دەیکوژێ، وە عیسا خوێنی جەجاڵیان بەسەری نێزەکەیەوە پێ نیشان دەدا، تا خەڵك باش باوەڕبکەن کەوا جەجاڵ تۆپیوە!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٥٥٥٣ — گرتنەوەی قوستەنتەنییە}.

**روونكردنەوە:**

هەندێ دەفەرموون: ئەعماق شوێنێكە لە دەوروبەری شاری مەدینە، نەوەوی دەفەرموێ: ناوی شوێنێكە لە نزیكی حەلەبەوە، هەروا راجیایی لە (دابق)یشدا هەیە، هەندێ دەفەرموون: ناوی شوێنێكە لەمەدینە كراوە بە بازاڕ، هەندێ تر دەفەرموون: ناوی گوندێكە لە نزیكی حەڵەبەوە.

## ١٥٥٨) لەشكرێ پەلاماری بەیتوڵڵا دەدات رۆدەچن بەناخی زەویدا.

(٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

## باب: فِي الخَسْفِ بالجَيْشِ الَّذِى يَوْمُّ البَيْتَ

٢٠٣٠- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ ابْنِ الْقِبْطِيَّةِ قَالَ دَخَلَ الْحَارِثُ بْنُ أَبِى رَبِيعَةَ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَفْوَانَ وَأَنَا مَعَهُمَا عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ فَسَأَلاَهَا عَنِ الْجَيْشِ الَّذِى يُخْسَفُ بِهِ وَكَانَ ذَلِكَ فِى أَيَّامِ ابْنِ الزُّبَيْرِ فَقَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « يَعُوذُ عَائِذٌ بِالْبَيْتِ فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ ». فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهًا قَالَ « يُخْسَفُ بِهِ مَعَهُمْ وَلَكِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ ». وَقَالَ أَبُو جَعْفَرٍ هِىَ بَيْدَاءُ الْمَدِينَةِ. {الحديث: ٧١٦٩ = ٧١٩٦ فم}:

عوبەیدوڵڵای كوڕی ئەل قیبطییە فەرمووی: لەخزمەتی حاریثی كوڕی ئەبو رەبیعەو عەبدوڵڵای كوڕی صەفواندا چووین بۆ خزمەتی ئوم سەلەمەی دایكی باوەڕدارانی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لە هاوەڵانو هاوسەرانی بێ) پرسیاری ئەو لەشكرەیان لێ كرد كە رۆدەچن بەناخی زەویدا؟ ئەم سەردانو پرسیارو وەڵامەیش لەو سەردەمەدا بوو، كە عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر فەرمانڕەوا بوو لە مەدینە، ئوم سەلەمەیش فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پەنا بەرێ پەنا دەباتە بەر بەیتو هانا دەباتە بەر خانەی خودا، هەتا زۆردار نەیكوژێ، جا لەشكرێ دەنێرن بۆ گیانی، كاتێ لەشكرەكە دەگەنە بیابانی بەیداء، كە ناوی شوێنێكی تایبەتە لەنێوانی مەككەو مەدینەدا،

دەشتێکی لووس‌و پووسە، وا لەنزیکی ذولحولەیفەوە، کە لەشکرەکە دەگەنە ئەوێ هەموویان رۆدەچن بەناخی زەویدا).

منیش عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو لەشکرە کەدەچن بۆ گیانی ئەو پەنا هێنەرە، کە پەنا دەباتە بەر خانەی خودا، هەموویان وەك یەك نین، هەیانە بە زۆر هێنراوەو پێی ناخۆشە کە هاتووە بۆ ئەم ئەرکە ناڕەوایە، ئەی ئەوە چۆن رۆدەچێ لەگەڵ ئەو ناهەقیکارانەدا؟ فەرمووی: (ئەویش لەگەڵ ئەوانا رۆدەچێ بەناخی زەویدا، بەڵام لە رۆژی قیامەتدا، لەسەر نیازی خۆی زیندوو دەکرێتەوەو بەپێی نیازی دڵی پاداش دەدرێتەوە، بەچاك یا بەخراپ).

ئەبو جەعفەری ئەل‌باقیر، فەرمووی: ئەو شوێنە کە ئەو لەشکرەی تیادا رۆدەچن بیابانەکەی مەدینەیە، کەوا لە نزیکی ذولحولەیفەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٧، ژمارە: ١٧٢٤ + تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٥٤٨٣} + {تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩ — لە هۆزی سەقیف هەلاتبازو ... هەڵ دەکەوێ} + {ریاض الصالحین/٤، زنجیرە، ٣٧٠، ژمارە: ١٨٣٠}.

## ١٥٥٩) باسی نیشتەجێبوون لە مەدینەو گەشەکردنی خانوبەرە لێی لەپێش داهاتنی قیامەتدا. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

## بَابٌ: فِي سُكْنَى الْمَدِينَةِ وَعِمَارَتِهَا قَبْلَ السَّاعَةِ

٢٠٣١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « تَبْلُغُ الْمَسَاكِنُ إِهَابَ أَوْ يَهَابَ ». قَالَ زُهَيْرٌ قُلْتُ لِسُهَيْلٍ فَكَمْ ذَلِكَ مِنَ الْمَدِينَةِ قَالَ كَذَا وَكَذَا مِيلاً. {الحديث: ٧٢١٩ = ٧٢٥٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خانووبەرە دەگاتە ئیهاب) زوهەیر کە کەسی سێیەمە لەپاش ئیمامی موسلیم لە رشتەی ئەم فەرموودەیەدا، فەرمووی: بە سوهەیلی مامۆستای خۆمم گوت: (ئیهاب چەندێ لە مەدینەوە دوورە؟) فەرمووی: چەند میلێ لە مەدینەوە دوورە. {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٧١}.

**١٥٦٠) پیاوێكی دوولاق باریكی حەبەشەیەی كەعبە دەرووخێنێ.** (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

**بَابٌ: يُخَرِّبُ الكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الحَبَشَةِ**

٢٠٣٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ - رضى الله عنه - عَنِ النَّبِىِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « يُخَرِّبُ الْكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الْحَبَشَةِ ». {الحديث: ٧٢٣٤ = ٧٢٦٥ فم. تجريد البخارى/٢، رقم: ٧٦٣ = ١٥٩١، ١٥٩٦، ١٥٩٥. نسائى. مناسك: ٢٩٠٤. تحفة الأشراف: ١٣٣٣٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوێكی دوو لاق باریكی حەبەشەیی كەعبە دەڕوخێنێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٧، ژمارە: ١٧٢٥}.

**١٥٦١) هاكا خەڵكی عێراق پارەو پووڵو سەرانەكەی سەریان نەدەن.**
(٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

**باب: فِي مَنْعِ العِرَاقِ دِرْهَماً**

٢٠٣٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-:« مَنَعَتِ الْعِرَاقُ دِرْهَمَهَا وَقَفِيزَهَا وَمَنَعَتِ الشَّامُ مُدْيَهَا وَدِينَارَهَا وَمَنَعَتْ مِصْرُ إِرْدَبَّهَا وَدِينَارَهَا وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ ». شَهِدَ عَلَى ذَلِكَ لَحْمُ أَبِى هُرَيْرَةَ وَدَمُهُ. {الحديث: ٧٢٠٦ = ٧٢٣٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هاكا وڵاتی عێراق خەرجی خەڵەو خەرمانو، مەكاتو باجیماڵو خەرجی پووڵو پارەیان نەدا، هەروا هاكا خەڵكی شام سەرانەو باجو خەرجی خەڵەو خەرمانو پوولیان نەدا، هەروەها هاكا خەڵكی میصر سەرانەو باجو خەرجی خەڵەو خەرمانو پارەو پوولیان نەدا، بەرە بەرە دەگەڕێنەوە بەرەو ئەو شوێنە كە لێوەی بەهەر چوارلادا بڵاو بوونەوەو ئیسلامتان پەخشەوە كرد). سێ جار خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم رستەیەی دواوەی دووبارە كردەوە: (بەرە بەرە دەگەڕێنەوە .... تاد). ئەوجا ئەبو هورەیرە فەرمووی: گۆشتو خوێنی ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ

بێ) لەسەر راستو دروستی ئەم فەرموودەیە شایەتی دەدا. {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٥٥٩٣ — باسی خەلیفە مەهدی} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٧٢}.

٢٠٣٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « لَيْسَتِ السَّنَةُ بِأَنْ لاَ تُمْطَرُوا وَلَكِنِ السَّنَةُ أَنْ تُمْطَرُوا وَتُمْطَرُوا وَلاَ تُنْبِتُ الأَرْضُ شَيْئًا ». {الحديث: ٧٢٢٠ = ٧٢٥١ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گرانیو ساڵی نەهاتی بەبێ بارانی نییە، بەڵام نەهاتە ساڵی راستی ئەوەیە کە پەستا بارانتان بۆ بباریٚ، کەچی زەوی هیچ شینایی سەوز نەکا!). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥٥٠٣ — خەبەردان لە فیتنە}.

## ١٥٦٢) سپاردە هەڵ دەگیرێ (ئەمانەت نامێنێ) بڕوا لەدڵ دەسڕێتەوە. (٣٦٥ - ٣٦٦)

## بَابُ: فِي رَفْعِ الْأَمَانَةِ وَالإِيمانِ مِنَ الْقُلُوبِ

٢٠٣٥- عَنْ حُذَيْفَةُ قَالَ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- حَدِيثَيْنِ قَدْ رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا وَأَنَا أَنْتَظِرُ الآخَرَ حَدَّثَنَا « أَنَّ الأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِى جِذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ ثُمَّ نَزَلَ الْقُرْآنُ فَعَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ وَعَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ ». ثُمَّ حَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِ الأَمَانَةِ قَالَ « يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْوَكْتِ ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْمَجْلِ كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ فَنَفِطَ فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا وَلَيْسَ فِيهِ شَىْءٌ - ثُمَّ أَخَذَ حَصَاةً فَدَحْرَجَهَا عَلَى رِجْلِهِ - فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ لاَ يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّى الأَمَانَةَ حَتَّى يُقَالَ إِنَّ فِى بَنِى فُلاَنٍ رَجُلاً أَمِينًا. حَتَّى يُقَالَ لِلرَّجُلِ مَا أَجْلَدَهُ مَا أَظْرَفَهُ مَا أَعْقَلَهُ وَمَا فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ ». وَلَقَدْ أَتَى عَلَىَّ زَمَانٌ وَمَا أُبَالِى أَيَّكُمْ بَايَعْتُ لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَىَّ دِينُهُ وَلَئِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا أَوْ يَهُودِيًّا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَىَّ سَاعِيهِ وَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ لأُبَايِعَ مِنْكُمْ إِلاَّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا. {الحديث: ٣٦٥ = ٣٧٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٥، رقم: ٢٠٢٠ = ٦٤٩٧، ٧٠٨٩، ٧٢٧٦}:

**حوذەیفەی کوڕی یەمان** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو فەرمایشتی لەبارەی سپاردەوە پێمان فەرموو، یەکێکیانم بەچاوی خۆم دی هاتەدی، کە بریتی بوو، لە هاتنی سپاردە (ئەمانەت) وە چاوەڕوانی ئەوی تریشیانم کەبێتە دی، کە بریتییە لە نەمانی ئەمانەت. واتە: سپاردە. فەرمایشتی یەکەم ئەوەبوو فەرمووی پێمان: (ئەمانەت – واتە: سپاردە – کە هاتە خوارەوە لەناخی دڵی پیاو چاکانا، رەگو ریشەی داکوتاو جێگەی خۆی گرت، بەرە بەرە قورئانیش دەهاتە خوارەوە، هەروا سوننەتی پێغەمبەریش لەدوا قورئان دەهات، ئیتر ئەوانیش بە فێربوونی قورئانو بەزانینی شەریعەتو یاسا نامەی خودا، سپاردەیان بە باشیو بەجوانی پەروەردە دەکرد).

فەرمایشتی دووەم: ئەوە بوو کە باسی نەمانی ئەمانەتی بۆ کردین. فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتێ ئەمانەت هەڵ دەگیرێ، بەرەبەرە نامێنێو شوێنەواری کوێر دەبێتەوە، پیاو دەبێ خەوی لێ دەکەوێو لەو خەوەدا سپاردە لە دڵی وەردەگیرێتەوە، بەرە بەرە شوێنەکەشی لەناو دڵا کوێر دەبێتەوە لەسەر ئەم شێوەیە:

ئەمجار شوێنەکەی وەك نیتکەیەکی رەش دەمێنێتەوە، دووەمجار کەخەوی لێ دەکەوێ ئەوەیشی ماوە لە دڵیا ئەویش دەڕواو هیچی نامێنێ. ئیتر شوێنەکەی وەك تلۆقی لێ دێ. نووری ئەمانەت (واتە: رووناکی سپاردە) کاتێ لە دڵ باردەکا، وەك ئەو پشکۆیە وایە بینێیت بە قاچی خۆتاو، شوێنەکەی هەڵتۆقێ، تەماشا دەکەیت قاچت بلۆق دەکاو بلۆقەکەو شوێن بلۆقەکە هەتا ماوەیێ دەمێنێ، بەڵام پشکۆکە نەماوەو سکڵەکە دیار نییە، ئەمانەتیش کە لەدڵ باری کرد ئاوایە!

ئەوجا بۆ پتر رونکردنەوەی مەبەستەکە، چەوێکی هەڵگرتو تلانیەوە بەسەر قاچی خۆیاو، نیشانیدا کە پشکۆکە ئاوا بێ بە قاچی خۆیدا، فەرمووی: (ئیتر بەرەبەرە کەس متمانە بە کەس ناکا، تاوای لێ دێ خەڵك مامەڵەو سەودا لەگەڵ یەکتری دەکەن، بەڵام خەریك دەبێ کە کەس ئەمانەت بەجێ نەهێنێ، تاوای لێ دێ

پیاوی ئەمیندارو دەست پاك واكەم دەبێ، دەڵێن: لەناو فیسارە خێڵدا پیاوێكی دەست پاكی ئەمیندار ماوە!

وای لێ دێ دەبێ بە پاشا گەردانییەكی وا، قسەو بەڵێنو گوتاریان بایەخی نامێنێ، پیاوی وا پەیدا دەبێ سەنگی دەنكە خەرتەلەیێ چییە، باوەڕو ئیمان لەدڵیدا نییە، كەچی پێی دەڵێن: ئای لەم شا پیاوە، چەندە ژیرو تیژ بیرو هۆشیارە، یا چەندە سەلارو ناسكو نازدارە، یا چەندە بە جەرگو رەشیدو ئازایە! (بەڕاستی ئێستا رێك وایە: ٢٠١٠/١١/١٠)

حوذیفە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو سەردەمە بەسەر چوو، كەمن دەربەست نەبووم كە لەگەڵ هەركامێكتانا مامەڵەو سەودام بكردایە دەربەست نەبوومو مەترسیم نەبوو، چونكە مامەڵەكارەكە ئەگەر خۆی موسڵمان بوایە، ئەوا ئایینو دینەكەی نەیدەهێشت كە گزیو ناپاكیم لێ بكا، خۆ ئەگەر گاورو جوولەكەیش بوایە، سەركارەكەی سەری، بەرپرسە موسڵمانەكەی سەری، نەیدەهێشت كە گزیو ناپاكیم لێ بكا!.

بەڵام ئەمڕۆ مەگەر لەگەڵ فیسارە كەسو ئەو فیسارە كەسدا، بتوانم مامەڵەو سەودا بكەمو لێیان دڵنیابم، كە ناپاكیم لەگەڵدا ناكەن! {تاج/٥، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٥٢١٧ — باسی سپاردە هەڵ دەگیرێ = ریاض/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٠}. {بڕوانە: ژمارە: (١٩٩٠) كە لەپێشەوە رابورد + ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٦١}.

### ١٥٦٣) لەپێش هاتنی ئاخر زەمانا جێنشینێ دەبێ ماڵ بە چنگو مشت، بەبێ شومار بە خەڵك دەبەخشێ. (٧١٦٤ - ٧٢٧٢)

### بَابٌ: يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ خَلِيفَةٌ يَحْثِي الْمَالَ حَثْيًا

٢٠٣٦- عَنِ الْجُرَيْرِيِّ عَنْ أَبِى نَضْرَةَ قَالَ كُنَّا عِنْدَ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ فَقَالَ يُوشِكُ أَهْلُ الْعِرَاقِ أَنْ لاَ يُجْبَى إِلَيْهِمْ قَفِيزٌ وَلاَ دِرْهَمٌ. قُلْنَا مِنْ أَيْنَ ذَاكَ قَالَ مِنْ قِبَلِ الْعَجَمِ يَمْنَعُونَ ذَاكَ. ثُمَّ قَالَ يُوشِكُ أَهْلُ الشَّأْمِ أَنْ لاَ يُجْبَى إِلَيْهِمْ دِينَارٌ وَلاَ مُدْىٌ. قُلْنَا مِنْ أَيْنَ ذَاكَ قَالَ مِنْ قِبَلِ الرُّومِ. ثُمَّ سَكَتَ هُنَيَّةً ثُمَّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- «

يَكُونُ فِى آخِرِ أُمَّتِى خَلِيفَةٌ يَحْثِى الْمَالَ حَثْيًا لاَ يَعُدُّهُ عَدَدًا ». قَالَ قُلْتُ لأَبِى نَضْرَةَ وَأَبِى الْعَلاَءِ أَتَرَيَانِ أَنَّهُ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ فَقَالاَ لاَ. {الحديث: ٧٢٤٢ = ٧٢٧٥ فم}:

جورەیره (رەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: ئەبو نەضرە فەرمووی: لە خزمەتی جابیری کوڕی عەبدوڵلا دا بووین، فەرمووی: هاکا خەڵکی عیٚراق خەرجی خەڵەو خەرمانو، مەکاتو باجی ماڵو خەرجی پوولو پارەیان نەدا! گوتمان: ئەوە لەبەرچی؟ فەرمووی: عەجەم ئەم وڵاتە داگیر دەکەنو قەدەغەی ئەوەیان لیٚ دەکەن کە یارمەتی موسوڵمانان بدەن. لەپاشا فەرمووی: هاکا خەڵکی شام سەرانەو باجو خەرجی خەڵەو خەرمانو پوولو پارەیان نەدا! گوتمان: ئەی ئەوە لەبەرچی؟ فەرمووی: بەهۆی رۆمەوە. لەپاشا جابیر تۆزیٚ راماو فەرمووی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (لە چینی پاشینی ئۆمەتی مندا جیٚنشینیٚ دەبیٚ بەلا گویٚلو لامشت پارەو پوول دەبەخشیٚتەوەو بەژماردن نایژمیٚریٚ). جورەیری قسەبەر (راوی) دەفەرمویٚ: گوتم: بە ئەبو نەضرەو ئەبو عەلاء: ئایا ئیٚوە لەو باوەڕەدان کە ئەو جیٚنشینە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بیٚ؟ فەرموویان: نەء. {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٥٥٩٣ — باسی خەلیفە مەهدی} ← {بڕوانە: ژمارە: ٢٠٢٣} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٢٤}.

## ١٥٦٤) باسی ئەو نیشانەو هەواڵە سەر سوڕهیٚنەرانەی کە لەپیٚش هاتنی قیامەتدا دەقەومیٚن. (٧١٦٤ - ٧٢١٤)

## بَابٌ: فِي الآيَاتِ الَّتِي تَكُونُ قَبْلَ السَّاعَةِ

٢٠٣٧- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ الْغِفَارِىِّ (رضي الله عنه) قَالَ اطَّلَعَ النَّبِىُّ -صلى الله عليه وسلم- عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ فَقَالَ « مَا تَذَاكَرُونَ ». قَالُوا نَذْكُرُ السَّاعَةَ. قَالَ « إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ ». فَذَكَرَ الدُّخَانَ وَالدَّجَّالَ وَالدَّابَّةَ وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَثَلاَثَةَ خُسُوفٍ خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْيَمَنِ تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ. {الحديث: ٧٢١٤ = ٧٢٤٢ فم}:

حـوذەیفـەی کـوڕی ئوسـەیدی غیفـاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: جـارێ لـەناو خۆماندا، ئێمە لە ژێرخانێکا بووین، گوفتوگۆمان دەکرد، لەوکاتـەدا حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هـات بەسـەرمانا، فـەرمووی: (ئـەوە باسـی چـی دەکـەن؟) گوتمـان: باسـی قیامەت دەکەین. فەرمووی: (قیامەت بەرپا نابێ، تـا ئـەم دە نیشـانەیە لەپێشـیەوە روونەدەن). ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ئەم نیشانانەی کـرد: دووکەڵەکە (کە پێشی دەڵێن: ئایەتی دوخان، کە چل رۆژ دەخایـەنێ، بـەری هەناسـەی کـافران دەگرێ، بۆ موسوڵمانانیش لە چەشنی هەڵامەتە، لـەم ئایەتـەدا باسـکراوە: {فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ} وە جـەجاڵو دابـبـەتول ئـەرض کـە لـەم ئایەتـەدا باسکراوە: {أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ - النمـل/٨٢}. وە دەرچـوونی خـۆر لە خۆرئاواوە، خۆر لەباتی ئـەوەی وەك هـەموو رۆژێ لـە خۆرهەڵاتـەوە هـەڵبێ، لـە خۆرئاواوە هەڵدێ، وە هاتنە خوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم (درووودی خودا لەسەر خـۆیو لەسـەر دایکـی بـێ) وە پەیـدابوونی یـەئجووجو مـەئجووجو سـێ رۆچـوون (خەسف): رۆچـوونێ لـە رۆژهـەڵات، رۆچـوونێ لـە رۆژئـاوا، رۆچـوونێ لـە دورگـەی عەرەب، لەدوا ئەمانـە ئـاگرێ لـە وڵاتـی یەمەنـەوە دەردەچـێ، خـەڵك بـەرەو خـاکی مەحشەر رادەپێچێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٦٩}.

## ١٥٦٥) بە کردەوەی باش دەست پێشکەری لە قەومانی ئەو فەرتەنەو ئاشووبانە بکەن کە وەك شەوە زەنگ خەڵك دادەگرن. (٣٠٩)

## بَابٌ: بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ

٢٠٣٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِى كَافِرًا أَوْ يُمْسِى مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا ». {الحديث: ٣٠٩ = ٣٢٥ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (بە کردەوەی باش دەست پێشکەری لە قەومانی ئەو فەرتەنەو ئاشووبانە بکەن کە وەك شـەوە زەنـگ خـەڵك دادەگـرنو دنیـا تاریـك دەکـەن، خـەڵك وا سـەریان لێ

دەشێویٚ‌و ڕێیان لیٚ دەگۆڕیٚ، پیاو هەیە بەیانی موسوڵمانەو ئێوارە کافرە، ئێوارە موسوڵمانەو بەیانی کافرە، ئایینی خوٚی دەفرۆشیٚ بۆ شڕەو پڕو پیتی جیهان).
{تاج/٥، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٥١٨٢}.

### ١٥٦٦) بە کردەوەی باش پێش دەستی لەشەش شت بکەن. (٧٣١٨ - ٧٣٢٥)
### بَابٌ: بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ سِتّاً

٢٠٣٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ سِتًّا الدَّجَّالَ وَالدُّخَانَ وَدَابَّةَ الأَرْضِ وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَأَمْرَ الْعَامَّةِ وَخُوَيِّصَةَ أَحَدِكُمْ ». {الحديث: ٧٣٢٣ = ٧٣٥٨ فم = ف.م = فتح الملهم شرح صحيح الإمام مسلم}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **فەرمووی:** (بەکاری چاکە هەتا دەتوانن پێش دەستی لەم شەش کارەساتە سامناکانە بکەن: یەکەم لە جەجاڵ. دووەم: لەو دووکەڵەی کە سەراسەر جیهان دادەگریٚ، وە چل ڕۆژ دەمێنێتەوە، ئەمەیش لەپێش هەستانی قیامەتدا ڕوودەدات. سێیەم: دابەتولئەرض (دەعبا بن عەردیلە). چوارەم: لە کارەساتی هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، کە نیشانەیەکی گەورەی هاتنی قیامەتە. پێنجەم: لە مەرگ کە وەك ملۆزم، یەخەی یەك بەیەکتان دەگریٚ‌و کەستان لە چنگی قوتاری نابیٚ. شەشەم: لە هاتنی ڕۆژی دوا ڕۆژ، کە وەك کارەساتێکی گشتی وایە، هەمووان وەك یەك دادەگریٚ). {تاج/٥، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٥١٨٤ — کاری چاك زوو بکریٚ}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- لە ڕاڤە نامە (شەرحە)کانا، دەفەرموون: هاتنی هەریەك لەم نیشانانە کاتی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام مەرج نییە کە لەسەر ئەم ڕیز بەندییە، ڕوودەن، کە لە فەرموودەکاندا گوتراون.

٢- مەبەست لە (داببەتولئەرض = دەعبا بن عەردیلە) ئەوەیە، کە لە ئایەتی هەشتاو دوو لە سوورەتی نەملدا دەفەرموێ: کاتێ فەرمانی سزادان‌و قاری خودا هاتە سەر ئەو کافرانە، ئەوە لەوکاتەدا لە زەوی صەفا، لە نزیکی کابەتوڵلادا، لە شاری مەککە، حەیوانێ دەردەکەین، بەناوی داببەتولئەرض، کە بەفەرمانی ئێمە دێتە زمان‌و قسە دەکا لەگەڵ خەڵکەکەدا، کە مرۆڤەکان لەو رۆژگارەدا گەیشتوونەتە قۆناغێکی وا هیچ ئیمان‌و باوەڕێکیان نەماوە بە قسەی خوداو پێغەمبەر، لەبەرئەوە کاتی ئەوە هاتووە پەردە لابرێ‌و بە چاوی خۆیان راستیەکان‌و حەقایق ببینن!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٠ — سوورەتی نەمل}.

### ١٥٦٧) خواپەرستی لەکاتی ئاخوران‌و بخورانا. (٧٣٢٦ - ٧٣٢٧)

### باب: العِبَادَةِ فِي الهَرَجِ

٢٠٤٠- عنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رضي الله عنه) رَدَّهُ إِلَى النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « الْعِبَادَةُ فِى الْهَرْجِ كَهِجْرَةٍ إِلَىَّ ». {الحديث: ٧٣٢٦ = ٧٣٦٠ فم}:

مەعقەلی کوڕی یەسار (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خوا پەرستی لەکاتی تێکەو لێکەدا (واتە: لەکاتی هەرەج‌و مەرەج‌و حەیصەو بەیصەدا، کە کەس بەکەس نییە) وەك کۆچکردن وایە بۆلای من لەشاری مەدینە!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٥٥٨٦ — خێرو گەورەیی‌و خودا پەرستی لە ئاخر زەمانا}.

### ١٥٦٨) سەرگوزەشتەی ئیبنو صەییاد. (٧٢٧٣ - ٧٢٨٧)

### بَابُ: فِي قِصَّةِ ابْنِ صَيَّادٍ

٢٠٤١- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضي الله عنه) قَالَ خَرَجْنَا حُجَّاجًا أَوْ عُمَّارًا وَمَعَنَا ابْنُ صَائِدٍ - قَالَ - فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فَتَفَرَّقَ النَّاسُ وَبَقِيتُ أَنَا وَهُوَ فَاسْتَوْحَشْتُ مِنْهُ وَحْشَةً شَدِيدَةً مِمَّا يُقَالُ عَلَيْهِ - قَالَ - وَجَاءَ بِمَتَاعِهِ فَوَضَعَهُ مَعَ مَتَاعِى. فَقُلْتُ إِنَّ الْحَرَّ شَدِيدٌ فَلَوْ وَضَعْتَهُ تَحْتَ تِلْكَ الشَّجَرَةِ - قَالَ - فَفَعَلَ - قَالَ - فَرُفِعَتْ لَنَا غَنَمٌ فَانْطَلَقَ فَجَاءَ

بِعُسٍّ فَقَالَ اشْرَبْ أَبَا سَعِيدٍ. فَقُلْتُ إِنَّ الْحَرَّ شَدِيدٌ وَاللَّبَنُ حَارٌّ. مَا بِى إِلاَّ أَنِّى أَكْرَهُ أَنْ أَشْرَبَ عَنْ يَدِهِ - أَوْ قَالَ آخُذَ عَنْ يَدِهِ - فَقَالَ أَبَا سَعِيدٍ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آخُذَ حَبْلاً فَأُعَلِّقَهُ بِشَجَرَةٍ ثُمَّ أَخْتَنِقَ مِمَّا يَقُولُ لِىَ النَّاسُ يَا أَبَا سَعِيدٍ مَنْ خَفِىَ عَلَيْهِ حَدِيثُ رَسُولِ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم- مَا خَفِىَ عَلَيْكُمْ مَعْشَرَ الأَنْصَارِ أَلَسْتَ مِنْ أَعْلَمِ النَّاسِ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « هُوَ كَافِرٌ ». وَأَنَا مُسْلِمٌ أَوَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « هُوَ عَقِيمٌ لاَ يُولَدُ لَهُ ». وَقَدْ تَرَكْتُ وَلَدِى بِالْمَدِينَةِ أَوَ لَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « لاَ يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ وَلاَ مَكَّةَ ». وَقَدْ أَقْبَلْتُ مِنَ الْمَدِينَةِ وَأَنَا أُرِيدُ مَكَّةَ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِىُّ حَتَّى كِدْتُ أَنْ أَعْذِرَهُ. ثُمَّ قَالَ أَمَا وَاللَّهِ إِنِّى لأَعْرِفُهُ وَأَعْرِفُ مَوْلِدَهُ وَأَيْنَ هُوَ الآنَ. قَالَ قُلْتُ لَهُ تَبًّا لَكَ سَائِرَ الْيَوْمِ. {الحديث: ٧٢٧٩ = ٧٣١٠ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵێ لە مەدینەوە کەوتینە رێگە بۆ مەککە، بۆ حەج یا فەرمووی: بۆ عەمرە دەچووین، ئیبنو صەییادیشمان لەگەڵدا بوو، لە قۆناغێ لاماندا، خەڵکەکە هەریەکە بەلایەکدا بڵاوەیان لێکرد، منو ئەو ماینەوە، ترسو سامێکی تەواوم لێ نیشت، لەبەر ئەو قسانەی کە لەبارەی ئەوەوە دەکرێت، کە گوایە دەڵێن حجاڵە، فەرمووی: جا ئیبنو صەییاد کەلوپەلەکەی خۆی هێنایە لای کەلوپەلەکەی من، منیش گوتم: خۆت دەزانی زۆر گەرمەو گەرماکەی سەختە، ئەوە بۆ شتو مەکەکانت لەبن ئەو شێخەڵەی تردا دانانێیت، ئەویش لەوێ داینا، فەرمووی: لەدوورەوە رانێ پەزمان بەدیی کرد، چوو پڕ کاسەیێ شیری هێناو گوتی: ئەبو سەعید! شیر بخۆرەوە، منیش راستێکەی نەم ویست کە شیری دەستی ئەو بخۆمەوە بەڵام لەبەر ئەو گوتم: زۆر گەرمایەو شیریش خۆی گەرمە ناخۆمەوە ئەویش وەك هەست بەوە بکا، گوتی: ئەی ئەبو سەعید! لەتاو قسەو پرتە پرتی ئەم خەڵکە دەمەوێ پەتێ لەدارێ هەڵخەمو خۆم بخنکێنم. ئەی ئەبو سەعید! گشت کەسێ فەرموودەو فەرمایشتەکانی پێغەمبەری لێ ون بێ بەڵام لە ئێوە ون نابێ، کە کۆمەڵەو گەلی ئەنصارو یاریدەدەرانن، تۆ خۆت یەکێکی

لەو كەسانەی كە زۆر باش شارەزای فەرموودەكانی پێغەمبەرن (دروودی خودای لەسەر بێ) باشە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیفەرمووە:(كە ججاڵ كافرە وەلحاڵ، من موسڵمانم، ئەدیی ئەو نەیفەرمووە: كە ججاڵ نەزۆكەو منالی نابێ، بەلام ئەوەتانێ كە من منالم هەیەو منالەكانم ئێستاكە وان لە مەدینە، ئەدیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی ججالەوە نەیفەرمووە: (كە ججاڵ ناچێتە مەكەو مەدینە، كەچی ئەوەتا من لە مەدینەوە هاتووم دەشچم بۆ مەككە. ئەبو سەعید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوەندە بە كەساسی سكالای حالی خۆی كرد، تا خەریكبووم دلم پێی بسووتێ، كەچی ئینجا ئیبنو صەییاد گوتی: وەلێ بەخودا من چاك ئەو (واتە: ججاڵ) دەناسمو دەزانم كە كێیەو لەكوێ لە دایك دەبێو ئێستاكەش لە كوێیە.

ئەبو سەعید فەرمووی: منیش پێیم گوت: هەتا ماوی هەر رەنجە رۆبیو ببی بە پەندی پساتێ!). {تاج/٥، زنجیرە:٩٦، ژمارە: ٥٥٢٥ — سەرگوزەشتەی ئیبنو صەییاد}.

٢٠٤٢- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ أن ابنّ صيادٍ سأل النَبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- عَنْ تُرْبَةُ الْجَنَّةِ. فقَالَ: دَرْمَكَةٌ بَيْضَاءُ مِسْكٌ خالص. {الحديث: ٧٢٨١ = ٧٣١٢ فم}:

ئەبو سەعید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو صەییاد لە بارەی خاكی بەهەشتەوە، پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد كە لەچییە؟ فەرمووی: (رەنگی وەك رەنگی ئاردی سپی پاك وایە، بۆنیشی وەك بۆنی میسك خۆشە). {بروانە: تاج/٥، زنجیرە: ١٣٤، ژمارە: ٥٧١١ — باسی خانوی بەهەشتو خاكو زیخو چەوی}.

٢٠٤٣- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَحْلِفُ بِاللَّهِ أَنَّ ابْنَ صَائِدٍ الدَّجَّالُ فَقُلْتُ أَتَحْلِفُ بِاللَّهِ؟ قَالَ: إِنِّى سَمِعْتُ عُمَرَ يَحْلِفُ عَلَى ذَلِكَ عِنْدَ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- فَلَمْ يُنْكِرْهُ النَّبِيُّ -صلى الله عليه وسلم-. {الحديث: ٧٢٨٢ = ٧٣١٣ فم. تجريد البخارى بالكوردى ٥/، رقم: ٢١٢٤ = ٧٣٥٥ فتح البارى شرح صحيح البخارى. أبو داود. ملاحم وفتن: ٤٣٣١. تحفة الأشراف: ٣٠١٩}:

موحەممەدی کوڕی مونکەدیر فەرمووی: بە چاوی خۆم دیومە کە جابیری کوڕی عەبدوڵلا سوێندی بەخودا دەخوارد کە ئیبنو صەییاد جاڵە، منیش گوتم: چۆن سوێند بەخودا دەخۆی لەسەرئەوەو لەسەرچی بنیاتێ سوێند دەخۆی؟ جابیر فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب بووە لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەمە سوێندی دەخوارد، کە ئیبنو صەییاد جاڵە، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی نەدەگرت‌و لەم لایەنەوە خاموش بوو. {تاج/٥، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥٥٣٨ — سەر گوزەشتەی ئیبنو صەییاد}.

٢٠٤٤- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) انْطَلَقَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فِى رَهْطٍ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ حَتَّى وَجَدَهُ يَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ عِنْدَ أُطُمِ بَنِى مَغَالَةَ وَقَدْ قَارَبَ ابْنُ صَيَّادٍ يَوْمَئِذٍ الْحُلُمَ فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- ظَهْرَهُ بِيَدِهِ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- لاِبْنِ صَيَّادٍ « أَتَشْهَدُ أَنِّى رَسُولُ اللَّهِ ». فَنَظَرَ إِلَيْهِ ابْنُ صَيَّادٍ فَقَالَ أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الأُمِّيِّينَ. فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ لِرَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَتَشْهَدُ أَنِّى رَسُولُ اللَّهِ فَرَفَضَهُ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَقَالَ « آمَنْتُ بِاللَّهِ وَبِرُسُلِهِ ». ثُمَّ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَاذَا تَرَى ». قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ يَأْتِينِى صَادِقٌ وَكَاذِبٌ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « خُلِّطَ عَلَيْكَ الأَمْرُ ». ثُمَّ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنِّى قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا ». فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ « هُوَ الدُّخُّ ». فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « اخْسَأْ فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ ». فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ذَرْنِى يَا رَسُولَ اللَّهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنْ يَكُنْهُ فَلَنْ تُسَلَّطَ عَلَيْهِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْهُ فَلاَ خَيْرَ لَكَ فِى قَتْلِهِ ». وقالَ سالم بن عبدالله: وَقَالَ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ سمعت عَبْدَ اللَّهِ ابْنَ عُمَرَ - رضى الله عنهما — يقول: انْطَلَقَ بعد ذلك رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - وأُبَىُّ بْنُ كَعْبٍ الأنصاري الى النخل التي فيها ابْنِ صَيَّادٍ ، حتى إذا دخل رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - النَّخْلَ ، طَفِقَ يَتَّقِى بِجُذُوعِ النَّخْلِ ، وهو يَخْتِلُ أن يَسمَع من ابْنُ صَيَّادٍ شَيئاً قبلَ أن يراه ابْنُ صَيَّادٍ ، فرآه رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم

– وهو مضطجع على فراش فِي قَطِيفَةٍ لَهُ فِيهَا رَمْرَمَةٌ ، فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم – وهو يتقي بجذوع النخل، فَقَالَتْ لابْنُ صَيَّادٍ يَا صَافِ (وهو اسم ابن صياد)، هَذَا مُحَمَّدٌ ، فثار ابْنُ صَيَّادٍ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - « لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ » . قال سالم: قال عبدالله بن عمر: فَقَامَ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - فِي النَّاسِ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ « إِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ ، وَمَا مِنْ نَبِيّ إِلاَّ قَدْ أَنْذَرَهُ قَوْمَهُ ، لَقَدْ أَنْذَرَهُ نُوحٌ قَوْمَهُ ، وَلَكِنْ سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ ، تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ ». وقَالَ ابْنُ شِهَابٍ وَأَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيُّ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ بَعْضُ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ يَوْمَ حَذَّرَ النَّاسَ الدَّجَّالَ « إِنَّهُ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ يَقْرَؤُهُ مَنْ كَرِهَ عَمَلَهُ أَوْ يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ ». وَقَالَ « تَعَلَّمُوا أَنَّهُ لَنْ يَرَى أَحَدٌ مِنْكُمْ رَبَّهُ عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى يَمُوتَ ». {الحديث: ٧٢٨٣ = ٧٣١٤، ٧٣١٥، ٧٣١٦، ٧٣١٧ فـم. تجريد البخاري/٢، رقم: ٦٤٢ = ١٣٥٤، ٣٠٥٥، ٦١٧٣، ٦٦١٨ فتح الباري. ترمذي. الفتن: ٢٢٣٥. تحفة الأشراف: ٦٨٥٩، ١٩٩٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لەگەڵ دەستەیێ لە یارانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوون بۆ سووسەکردنی هەواڵو باسو خواسی ئیبنو صەییاد، کە مقۆ مقۆ داکەوتبوو، کە گوایە ئیبنو صەییاد، لە ئەنجاما دەبێ بە ججاڵ، جا کە دەیدۆزنەوە دەڕوانن وا لەناو دەستەیێ منالا یاری دەکات، لەلای قەلاکەی بەنی مەغالە لە مەدینە، ئەوکاتە ئیبنو صەییاد نزیکی ڕەسیدە بوون بوو، ئیبنو صەییاد بەخۆی نازانێ هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپشتیەوە دەستی دەکێشێ بە پشتیا، لەپاشا بە ئیبنو صەییادی فەرموو: (ئایا شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام؟) جا ئیبنو صەییاد تەماشای پێغەمبەری کردو سەرنجێکی داو گوتی: شایەتی دەدەم کەتۆ پێغەمبەری عەرەبە نەخوێندەوارە بێ سەوادەکانی، ئەنجا بە پێغەمبەری گوت: ئەی تۆ شایەتی دەدەی کەمن پێغەمبەری خودام؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) شتی وای نەسەلماندو

رەتی كردەوەو فەرمووی: (باوەڕم بە خوداو بە پێغەمبەرانی خودا هەیەو بەس). ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (لە هەواڵە نهێنییەكان، لە دەنگ و باسی غەیب چی لێ دەزانی؟) گوتی: راستیشم بۆدێو درۆیشم بۆدێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەریان لێ شێواندویت). لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (من شتێكم بۆ تۆ گرتۆتە ناو دڵم، ئایا دەتوانی كە هەڵی بێنیو بزانی چی والەدڵما؟).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی گرتبووە ناو دڵی: {يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ} كە باسی ئەم دووكەڵە لە ژمارە (٢٠٣٩)دا، رابورد.

ئیبنو صەییاد گوتی: ئەوە دوخە! نیوەی وشەی (الدخان)ی زانی، بەڵام بۆی تەواو نەكرا.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (چغە! رادەت ناكەوێ كە لە پلەو پایەی خۆت، كە كوڵە نانییەو كاهینییە، سەركەویتو پەی بەنهێنیو غەیبی خودایی ببەییو بچیتە ریزی پێغەمبەران).

عومەری كوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لێم گەڕێو مۆڵەتم بدە با لەگەردنی بدەم. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر ئەوبێ — واتە: ئەگەر ئیبنو صەییاد جاڵ بێ — ئەوا تۆ دەرەقەتی نایەیت، چونكە ویستی خودا لەسەر ئەوەیە كە دەبێ لەئاخر زەمانا جاڵ هەڵسێ، خۆ ئەگەر ئەویش نەبێ، خێر لەكوشتنیدا نییە بۆ تۆ).

سالمی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لە باوكیو لە باپیری بێ) فەرمووی: لە عەبدوڵلای باوكم بیست دەیفەرموو: لەپاشدا جارێكی تریش پێغەمبەر خۆیو ئوبەییەی كوڕی كەعبی ئەلئەنصاری — چوون بۆ ناو ئەو باخە خورمایەی كە ئیبنو صەییاد لەوێ بوو — پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە نزیك بووەوە، خۆی دەدایە پەنا بنكی دارە خورماكانو لەپاڵ قەدی ئەوانەوە بە ماتە مات، بە ئاسپایی لێی دەچووە پێشەوە بەڵكوو پێش ئەوەی كە لە ئیبنو

صەیاد ئاشکرا ببێ، بەدز کە شتێکی لێ ببیستێ، ئیبنو صەییاد لەسەر رایەخێك پاڵکەوتبوو، لەناو پارچەیەك قەیفەدا بوو، لەبەرخۆیەوە، لەناو قەیفەکەدا ورتە ورتی بوو، دایکی ئیبنو صەییاد لەسەر ئەو حاڵەی پێشەوە، پێغەمبەری بینی، کەوا خۆی دەداتە پاڵ قەدی دار خورماکان، لەبەرئەوە کوڕەکەی ئاگادار دەکاتەوەو بانگی دەکات: صافی! هۆ صافی! ئەوە موحەممەدە. ئیبنو صەییاد رادەپەڕێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر دایکی لێی بگەڕایە خۆی ئاشکرا دەکرد کە چییەو چی نییە).

سالی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوە وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا، سوپاسو ستایشێ کە شایستەی خودای گەورە بێ کردیو ئینجا هاتە سەر باسی ججاڵو فەرمووی: (من هۆشیارتان دەکەمەوەو مەترسیتان دەخەمە بەر، هەموو پێغەمبەرەکانی تری پێش منیش گەلەکانی خۆیانیان ئاگادار کردۆتەوەو مەترسی ئەوەیان خستونەتە بەر، نووح هۆزو گەلی خۆی سەبارەت بە ججاڵ هۆشیار کردۆتەوە، بەڵام من لەگەڵ ئەوانا ئەم جیاوازییەم هەیە: من لەبابەت ئەم نەحلەتییەوە، قسەیەکتان بۆ دەکەم، کە هیچ پێغەمبەرێ لەپێش منەوە ئەم قسەو نیشانەیەی باس نەکردووە بۆ گەلی خۆی، ئەویش ئەمەیە: جەجاڵ یەکڵەچاوە، کە خودای گەورە یەکڵە چاو نییە!).

زوهری کە ناسراوە بە ئیبنو شەهاب دەیفەرموو: عومەری کوڕی ثابتی ئەنصاری هەواڵی بەمن دا: کە هەندێ لە یارانی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو یارانی بێ) کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو رۆژەی کە سەبارەت بە جەجاڵ هۆشیاری دا بە خەڵك، فەرمووی: (لەناوچاوانی جەجاڵ نووسراوە: (کافر) گشت موسوڵمانێ دەیخوێنێتەوە) یا فەرمووی: (هەرکەسێ کردەوەی ئەو نەحلەتییەی پێ ناخۆش بێ، دەیخوێنێتەوە!). هەروەها حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆتان دەزانن کە کەستان لە جیهاندا، خودای خۆی بەچاوی سەر نابینێ هەتا دەمرێ ئەوسا لە بەهەشتا دەیبینێ، دەی خەڵك بە

ئاسایی كه جه‌جاڵ هه‌ڵده‌ستێ به‌چاوی سه‌ریان ده‌یبینن، ده‌ی ئه‌گه‌ر خوا بووایه له‌جیهاندا به‌چاوی سه‌ر نه‌ده‌بینرا). {تاج/٥، زنجیره: ٩٦ — سه‌رگوزه‌شته‌ی ججاڵ = تاج/٥، زنجیره: ١١٢، ژماره: ٥٦١٠ + ژماره: ٥٦١١ + ٥٦١٦} + {ریاض/٤، زنجیره: ٣٧٠، ژماره: ١٨١٧ — باسی په‌خشانه جوانه‌كان...}.

٢٠٤٥- عن ابْنُ عَوْنٍ عَنْ نَافِعٍ قَالَ كَانَ نَافِعٌ يَقُولُ ابْنُ صَيَّادٍ. قَالَ قَالَ ابْنُ عُمَرَ لَقِيتُهُ مَرَّتَيْنِ - قَالَ - لَقِيتُهُ مرتين فَقُلْتُ لِبَعْضِهِمْ هَلْ تَحَدَّثُونَ أَنَّهُ هُوَ قَالَ لاَ وَاللَّهِ - قَالَ - قُلْتُ كَذَبْتَنِى وَاللَّهِ لَقَدْ أَخْبَرَنِى بَعْضُكُمْ أَنَّهُ لَنْ يَمُوتَ حَتَّى يَكُونَ أَكْثَرَكُمْ مَالاً وَوَلَدًا فَكَذَلِكَ هُوَ زَعَمُوا الْيَوْمَ - قَالَ - فَتَحَدَّثْنَا ثُمَّ فَارَقْتُهُ - قَالَ - فَلَقِيتُهُ لَقْيَةً أُخْرَى وَقَدْ نَفَرَتْ عَيْنُهُ - قَالَ - فَقُلْتُ مَتَى فَعَلَتْ عَيْنُكَ مَا أَرَى قَالَ لاَ أَدْرِى - قَالَ - قُلْتُ لاَ تَدْرِى وَهِىَ فِى رَأْسِكَ قَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ خَلَقَهَا فِى عَصَاكَ هَذِهِ. قَالَ فَنَخَرَ كَأَشَدِّ نَخِيرِ حِمَارٍ سَمِعْتُ - قَالَ - فَزَعَمَ بَعْضُ أَصْحَابِى أَنِّى ضَرَبْتُهُ بِعَصًا كَانَتْ مَعِىَ حَتَّى تَكَسَّرَتْ وَأَمَّا أَنَا فَوَاللَّهِ مَا شَعَرْتُ - قَالَ - وَجَاءَ حَتَّى دَخَلَ عَلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ فَحَدَّثَهَا فَقَالَتْ مَا تُرِيدُ إِلَيْهِ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّهُ قَدْ قَالَ « إِنَّ أَوَّلَ مَا يَبْعَثُهُ عَلَى النَّاسِ غَضَبٌ يَغْضَبُهُ ». {الحديث: ٧٢٨٧ ترقيم صحيح مسلم حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٣٢١ فم = ف.م = ترقيم فتح الملهم شرح صحيح مسلم}:

ئیبنو عه‌ون فه‌رمووی: نافیع فه‌رمووی: عه‌بدوڵلای كوڕی عومه‌ر (ڕه‌زای خودا له نافیع‌و ئیبنو عه‌ون‌و عه‌بدوڵلا و عومه‌ر بێ) فه‌رمووی: دووجار گه‌یشتم به ئیبنو صه‌ییاد، جارێكیان كه پێی گه‌یشتم كۆمه‌ڵێ له هاوه‌ڵانی خۆیی له‌گه‌ڵدا بوو، به هه‌ندیكیانم گوت: ئێستاش هه‌رده‌ڵێن ئیبنو صه‌ییاد پێغه‌مبه‌ره‌و له خوداوه سرووش‌و نیگای بۆ دێ؟ كه‌چی به‌درۆ گوتی: نا به‌خودا شتی واناڵێین!! ئیبنو عومه‌ر فه‌رمووی: گوتم: درۆت له‌گه‌ڵ من كرد به خودا، به درۆ منت به‌درۆ خسته‌وه، ئه‌ی ئه‌وه نه‌بوو، كه هه‌ندێ له ئێوه به منیان ده‌گوت، كه ئه‌و نامرێ هه‌تا له هه‌مووتان ده‌وڵه‌مه‌ندتر نه‌بێ‌و له هه‌مووتان منداڵی زۆرتر ده‌بێ، به‌قسه‌ی ئه‌وان بێ ئێستائه‌و وه‌هایه، ده‌ی قسه‌ی وا ئیدیعای وه‌حی‌و نوبووه‌ت‌و سرووش‌و

پیغەمبەرایەتییە بۆ ئیبنو صەییاد، ئیتر چۆن دەڵێن: ئێمە شتی وامان نەگوتووەو نایشیلێین؟

فەرمووی: لەم جارەدا قسەم لەگەڵ ئیبنو صەییادو کۆمەڵەکەی کردو پاشان بەجێیم هێشت. ئیبنو عومەر فەرمووی: جارێکی تریش پێی گەیشتم، چاوی هەڵ ئاوسا بوو، بەرزەوە بوو بوو، فەرمووی: پێیم گوت: کەی چاوت وای لێهاتووە!؟ گوتی: نازانم. گوتم: چاوت وا بەسەرتەوەو کەچی نازانی چی لێهاتووە! گوتی: خودای دەکرد خودا بەم داردەستەی تۆوە دروستی دەکرد! فەرمووی: ئەوجا وەك کەر پرمەیەکی زۆر توندی کرد، کە هەرگیز پرمەی وام نەبیستووە. فەرمووی: بە قسەی هەندێ لە هاورێکانم ئەوەندەم لێ دابوو، دار دەستەکەی خۆمم تیادا شکاندبوو، بەڵام بەخودا من ئاگام لەخۆم نەمابوو، جا کە چووم بۆلای حەفصەی خۆشکم کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، وە دایکی رۆحی موسوڵمانان بوو، ئەمەی روویدا لە نێوانی منو ئیبنو صەییاددا، باسم کرد بۆ حەفصەی خوشکم، حەفصە فەرمووی پێم: چیتە بەسەر ئیبنو صەییادەوە، ئاخر نازانی کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (یەکەم جار کە ججاڵ هەڵدەستێو دێ بۆ گیانی خەڵك لە شتێکەوە تووڕە دەبێ). کەواتە: شتی وا مەکە ئەی ئیبنو عومەر! تاتۆ نەبی بەهۆی هەڵسانی ججاڵ). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥٥٣٧، ٥٥٣٦}.

٢٠٤٦ – عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « لأَنَا أَعْلَمُ بِمَا مَعَ الدَّجَّالِ مِنْهُ مَعَهُ نَهْرَانِ يَجْرِيَانِ أَحَدُهُمَا رَأْىَ الْعَيْنِ مَاءٌ أَبْيَضُ وَالآخَرُ رَأْىَ الْعَيْنِ نَارٌ تَأَجَّجُ فَإِمَّا أَدْرَكَنَّ أَحَدٌ فَلْيَأْتِ النَّهْرَ الَّذِى يَرَاهُ نَارًا وَلْيُغَمِّضْ ثُمَّ لْيُطَأْطِئْ رَأْسَهُ فَيَشْرَبَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مَاءٌ بَارِدٌ وَإِنَّ الدَّجَّالَ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ عَلَيْهَا ظَفَرَةٌ غَلِيظَةٌ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ كَاتِبٍ وَغَيْرِ كَاتِبٍ ». {الحديث: ٧٢٩٤ = ٧٣٢٨ فم. تجريد البخاری ٤/، رقم: ١٣٧٥ = ٣٤٥٠، ٧١٣٠}:

حوذیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا من لە جەجاڵ خۆی باشتر دەزانم کە کاتێ هەڵدەستێ، چی پێیە بۆ تەفرەدانی خەڵکان، لە داوای خودایەتیدا، دوو

روباری لەگەڵدایە، خۆی بۆ هەرکوێ بچێ ئەو دوو روبارە لەگەڵیا دەڕۆن، یەکێکیان لەبەرچاو ئاوێکی روونەو ئەوی تریان لەبەرچاو ئاگرێکی سووری بڵێسەدارە، هەرکەسێ تووشی جەجاڵ بوو بابچێتە سەر ئەو روبارەیان کە بە ئاگری دەزانێو با چاوی خۆی بقووچێنێو سەری خۆی دانەوێنێ. بەبێ ترس‌و بیم، ئاوی لێ بخواتەوە، دەبینێ کە ئەوەیان کە ئەو بە ئاگری دەزانێ، ئاوێکی ساردی فێنکە، لەڕاستیدا جەجاڵ کە لافی خوایەتی لێ دەدا، داواکەی درۆیەکی پەتی‌و ئاشکرایە، چونکە خودا دەبێ بێگەرد بێ‌و بێ نەنگ بێ‌و لەهیچ روویەکەوە لە دروستکراوانی خۆی نەچێ، بەڵام جەجاڵ لەشی هەیە، جەستەی هەیە، چاوێکی ساف‌و لووسە وەك بەری دەست، تانەیەکی ئەستووری وەك تەختە پەردە وا لەسەر چاوی، لەنێوانی هەردوو چاوی نووسراوە: (کافر) هەموو موسوڵمانێ دەیخوێنێتەوە، چ خوێندەوار بێ، چ نەخوێندەوار بێ دەیخوێنێتەوە!). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٥٦١٦} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٠٩} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨١٧}.

٢٠٤٧- عَنْ حُذَيْفَةَ (رضي الله عنه) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « الدَّجَّالُ أَعْوَرُ الْعَيْنِ الْيُسْرَى جُفَالُ الشَّعَرِ مَعَهُ جَنَّةٌ وَنَارٌ فَنَارُهُ جَنَّةٌ وَجَنَّتُهُ نَارٌ ». {الحديث: ٧٢٩٣ = ٧٣٢٧ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٧٥ = ٣٤٥٠، ٧١٣٠ فتح الباري}:

**حوذەیفە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درووودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (جەجاڵ چاوی چەپیشی زەدە دارەو کوێرە مووشە، لەشی کوڵکن‌و تیسکنە، بەهەشت‌و دۆزەخی لەگەڵە، بەڵام لەڕاستیدا بە پێچەوانەوەیە، چونکە دۆزەخەکەی بەهەشتەو بەهەشتەکەی دۆزەخە!). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٥٦١٣}.

٢٠٤٨- عنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ قَالَ ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ فَخَفَّضَ فِيهِ وَرَفَّعَ حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِى طَائِفَةِ النَّخْلِ فَلَمَّا رُحْنَا إِلَيْهِ عَرَفَ ذَلِكَ فِينَا فَقَالَ « مَا شَأْنُكُمْ ». قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ غَدَاةً فَخَفَّضْتَ فِيهِ وَرَفَّعْتَ حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِى طَائِفَةِ النَّخْلِ. فَقَالَ « غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُنِى عَلَيْكُمْ إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ فَأَنَا

حَجِيجُهُ دُونَكُمْ وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ وَاللَّهُ خَلِيفَتِى عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ إِنَّهُ شَابٌّ قَطَطٌ عَيْنُهُ طَافِئَةٌ كَأَنِّى أُشَبِّهُهُ بِعَبْدِ الْعُزَّى بْنِ قَطَنٍ فَمَنْ أَدْرَكَهُ مِنْكُمْ فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورَةِ الْكَهْفِ إِنَّهُ خَارِجٌ خَلَّةً بَيْنَ الشَّأْمِ وَالْعِرَاقِ فَعَاثَ يَمِينًا وَعَاثَ شِمَالاً يَا عِبَادَ اللَّهِ فَاثْبُتُوا ». قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا لَبْثُهُ فِى الأَرْضِ قَالَ « أَرْبَعُونَ يَوْمًا يَوْمٌ كَسَنَةٍ وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ ». قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ فَذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِى كَسَنَةٍ أَتَكْفِينَا فِيهِ صَلاَةُ يَوْمٍ قَالَ « لاَ اقْدُرُوا لَهُ قَدْرَهُ ». قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا إِسْرَاعُهُ فِى الأَرْضِ قَالَ « كَالْغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ فَيَأْتِى عَلَى الْقَوْمِ فَيَدْعُوهُمْ فَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَجِيبُونَ لَهُ فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ فَتُمْطِرُ وَالأَرْضَ فَتُنْبِتُ فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ أَطْوَلَ مَا كَانَتْ ذُرًا وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعًا وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ ثُمَّ يَأْتِى الْقَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيَرُدُّونَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ فَيُصْبِحُونَ مُمْحِلِينَ لَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَىْءٌ مِنْ أَمْوَالِهِمْ وَيَمُرُّ بِالْخَرِبَةِ فَيَقُولُ لَهَا أَخْرِجِى كُنُوزَكِ. فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ ثُمَّ يَدْعُو رَجُلاً مُمْتَلِئًا شَبَابًا فَيَضْرِبُهُ بِالسَّيْفِ فَيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْنِ رَمْيَةَ الْغَرَضِ ثُمَّ يَدْعُوهُ فَيُقْبِلُ وَيَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ يَضْحَكُ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِىَّ دِمَشْقَ بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ وَاضِعًا كَفَّيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ فَلاَ يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلاَّ مَاتَ وَنَفَسُهُ يَنْتَهِى حَيْثُ يَنْتَهِى طَرْفُهُ فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدٍّ فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يَأْتِى عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللَّهُ مِنْهُ فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِى الْجَنَّةِ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللَّهُ إِلَى عِيسَى إِنِّى قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِى لاَ يَدَانِ لأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ فَحَرِّزْ عِبَادِى إِلَى الطُّورِ. وَيَبْعَثُ اللَّهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ. وَيُحْصَرُ نَبِىُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ حَتَّى يَكُونَ رَأْسُ الثَّوْرِ لأَحَدِهِمْ خَيْرًا مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لأَحَدِكُمُ الْيَوْمَ فَيَرْغَبُ نَبِىُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ فَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمُ النَّغَفَ فِى رِقَابِهِمْ فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ يَهْبِطُ نَبِىُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى الأَرْضِ فَلاَ يَجِدُونَ فِى الأَرْضِ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلاَّ مَلأَهُ زَهَمُهُمْ وَنَتْنُهُمْ فَيَرْغَبُ نَبِىُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى اللَّهِ فَيُرْسِلُ

اللَّهُ طَيْرًا كَأَعْنَاقِ الْبُخْتِ فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ مَطَرًا لاَ يَكُنُّ مِنْهُ بَيْتُ مَدَرٍ وَلاَ وَبَرٍ فَيَغْسِلُ الأَرْضَ حَتَّى يَتْرُكَهَا كَالزَّلَفَةِ ثُمَّ يُقَالُ لِلأَرْضِ أَنْبِتِي ثَمَرَتَكِ وَرُدِّي بَرَكَتَكِ. فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ الْعِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ وَيَسْتَظِلُّونَ بِقِحْفِهَا وَيُبَارَكُ فِي الرِّسْلِ حَتَّى أَنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الإِبِلِ لَتَكْفِي الْفِئَامَ مِنَ النَّاسِ وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْبَقَرِ لَتَكْفِي الْقَبِيلَةَ مِنَ النَّاسِ وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْغَنَمِ لَتَكْفِي الْفَخِذَ مِنَ النَّاسِ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الْحُمُرِ فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ ». {الحديث: ٧٢٩٩ = ٧٣٣٣ فم} :

**نەوواسی کوڕی سەمعان** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: سەر لەبەیانییەك، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **بەدوورو درێژی باسی چەتوونیو هارو هاجیو سووكو تڕۆیی جەجاڵی بۆمان کرد، تەنانەت وامانزانی کە ئێستا هەڵساوەو والەناو باخە خورماکانا، جا سەر لە ئێوارێ کە چووینەوە بۆ خزمەتی هەستی کرد کە ئێمە پەستی ئەو باسو خواسەین، فەرمووی: ئەوە چیتانە کەوا پەستو خەمبارن؟ عەرزیمانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ سەر لەبەیانی بە دوورو درێژی باسی سووكو تڕۆییو هارو هاجیو چەتوونی جەجاڵت بۆ کردین، تەنانەت لەئێمە وابوو کە هاتووەو والەناو باخە خورماکاندا خۆی حەشارداوە!!**

**فەرمووی: (من لەشتێ تر دەترسم کە زیانی هەبێ بۆتان هەتا لە جەجاڵ، ئەگەر جەجاڵ هەڵسا وەمن خۆم مابووم لەناوتانا، ئەوا من لەجیاتی ئێوە چاری دەکەم، خۆ ئەگەر لەپاش منیش هەڵساو پەیدابوو ئەوە هەرکەسە چارەسەری خۆی بکات، سەرەڕای ئەمەیشە خودا بۆ خۆی لەپاش من سەرەوکاریی هەموو موسوڵمانێ لەجیاتی من دەکات، بزانن کە جەجاڵ لاوێکی موو کرژی سەر ئاڵۆسکاوییە، چاوێکی تروسکە ناکا، بەلای منەوە شێوەی لە عەبدولعوززای کوڕی قەتەن دەچێ، جا هەرکەسێ لەئێوە تووشی ئەو بوو، با دە ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتی کەهفی بەسەردا بخوێنێ، لە ڕێگەیەکەوە کە دەکەوێتە میانی شامو عێراقەوە جەجاڵ**

پەیدا دەبێ‌و دێ بۆ گیانی ئێوە گەل، وە بەڕاستو بە چەپا ئاژاوە دەنێتەوەو ئاشووبو خراپە بەرپا دەکا، ئەی بەندەکانی خودا! خۆڕاگرن لەبەر باری خودادا).

گوتمان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! چەندە لە ولاتدا دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: (چل رۆژ، رۆژێکی بەقەد ساڵێکە، رۆژێکی بەقەد مانگێکە، رۆژێکی بەقەد هەفتەیەکە، رۆژەکانی تریشی وەك ئەم رۆژە ئاساییانەی ئێستای ئێوە گەل وان، ئاوا رۆژانێکی ئاسایین. گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو رۆژەی کە بەقەد ساڵێکە، یا ئەو رۆژەی کە بەقەد مانگێکە، یا بەقەد هەفتەیەکە، ئایا نوێژی یەك رۆژی ئاسایی بەسی دەکا یانا؟ فەرمووی: (نەء، بەسی ناکا، بەڵکوو دەبێ بە ئەندازەی خۆی ئەندازەی بگرن‌و گشت بیستو چوار سەعاتێ پێنج نوێژی ئاسایی تیادا بکەن، وە هەر نوێژەی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا بیکەن). گوتمان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! خێرایی‌و سستی، لەکاتی گەڕانیدا بەناو ولاتدا چۆنە؟

فەرمووی: (زۆر خێرایە، وەك بارانی دەم با وایە، دەچێتە سەر هەندێ هۆزو گەل‌و بانگیان لێ دەکا کە ئیمانی پێ بهێنن‌و بەخودای خۆیانی بزانن، ئەوانیش باوەڕی پێ دەکەن‌و بەگوێی دەکەن، ئەویش فەرمان بە ئاسمان دەکا باران دەبارێنێ، وە بەزەوی دەڵێ شینایی دەڕوێنێ، جا ئاژەڵ‌و ماڵاتیان هەتا بڵێی بە شەوق‌و بە شیرو بە تێرو تەسەل دەبێ، بەڵام دەچێتە سەر هەندێ هۆزی تر، داوایان لێ دەکات کە بەخودای خۆیانی بزانن، ئەوانیش بەرپەرچی دەدەنەوە، ئەویش بەجێیان دێڵێ، کەچی لەپاش ئەو دەکەونە سەغڵەتی‌و قاتو قڕی‌و گرانییەکی واوە هیچ ماڵ‌و سامانیان بەدەستەوە نامێنێ، جەجاڵ بەلای کاولەدا رادەبووری‌و پێی دەڵێ: ئەی کەلاوە کۆن! هەرچی گەنج‌و غەزنەیەك وا لەناوتا یەقی کەرەوەو هەڵی رێژە دەرەوە، ئەویش وادەکاو بەگوێی دەکا، ئیتر هەرچی غەزنەو گەنجی ناو ئەو کەلاوەیە هەیە، هەمووی وەك پوورەی هەنگ چۆن شوێنی شاکەیان دەکەون، ئەو گەنجەیش ئاوا دوای جەجاڵ دەکەوێ!!

له پاشدا پیاوێکی جەهێل، کەلە هەرەتی لاویدا دەبێ، جەجاڵ گازی دەکا بۆ لای خۆیو بەقەمە دوو کەرتی دەکاو، بەقەد تیراوێژێ دوو کەرتەکەی لەیەکتری دوور دەکەونەوە، ئەوجا بانگی دەکاتەوە بۆلای خۆیو پیاوەکە زیندوو دەبێتەوەو بەروویەکی گەشو دەم بە زەردەخەنەوە دێتەوە بۆلای، ئیتر جەجاڵ خەریکی ئەم کەینو بەینەی خۆی دەبێو سەر قاڵو سەر جەنجاڵی فێڵو فەرەجی خۆی دەبێ، لەناکاو خودای گەورەو سەروەر عیسای کوڕی مەریەم (سڵاوی خودا لەخۆیو لەدایکی بێ) دەنێرێ، جا لەلای منارە سپیەکە، دادەبەزێ، کە دەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی دیمەشقەوە، دوو دەست جلی لەبەردایە، بە وەرسو بە زەعفەران رەنگ کراون، هەردوو لەپی خۆی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە، ئەوەندە پاكو خاوێنە دەڵێی تازە لە گەرماو خۆی شۆردووەو دەرچووە، کەسەر دادەنەوێنێ ئاوی لێ دەتکێ، هەر کافرو ناموسڵمانێ، بۆنی هەناسەی بکا کوتوپڕ دەمرێ، تا چاویشی بڕ بکا بۆنی هەناسەی دەڕوا، جا عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) منەیی جەجاڵ دەکاو دەگەڕێ بەدوایدا، هەتا لەدەرگای لود پێی دەگاو لەوێ دەیکوژی، ئەنجا گرۆیێ دێنە خزمەتی عیسای کوڕی مەریەم، ئەوانە خودا لەشەڕی جەجاڵ پاراستوویانی، عیسا دڵنەواییان دەکاو دەیانخەوێنێتەوەو خەمیان دەڕوێنێتەوەو، پایەو پلەی خۆیانیان لە بەهەشتدا پێ دەفەرموێ.

ئیتر ئەوا عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر گەرمی ئەم کاروبارەی خۆیەتی، لەناکاو خودا نیگای بۆ دەنێرێ: ئەی عیسا! ئەوا من چینێکم لەبەندەکانی خۆم بەرەڵا کردووە کەس بەشەڕو هەرا دەرەقەتیان نایێ، جا تۆ بەندە موسڵمانەکانم دەرکەو بیانبە بۆ کێوی طوور لەوێ قایمیان بکە، ئەوسا خودا یەئجووجو ماجووج بەرەڵا دەکا، ئیتر لەهەموو قوتکەو یاڵو بەرزاییەکەوە بەتەکان دێنو جم دەدەن!

کە بەراییان دەگەنە سەر دەریاچەی طەبەرییە هەموو ئاوەکەی دەخۆنەوەو چۆڕی لێ دەبڕن، جا کاتێ دواییەکەیان دێن دەڵێن: جارێ لە جاران لەم شوێنەدا ئاو هەبووە. ئیتر عیسای پێغەمبەری خوداو هاوڕێکانی وا گیر دەخۆنو، وا

تەنگەتاو دەبن تەنانەت سەرەگایێ بۆ یەکێکان لەو رۆژەدا لەسەد لیرەی زەردی زێری یەکێکی ئەمرۆی ئێوە باشترە بۆی، عیساو هاوڕێکانی بەکوڵو بەسۆزی دڵ لە خودای گەورە دەپاڕێنەوە کە یەئجووجو مەئجووج لەناو بەرێو خۆی چاریان بکاو بیانفەوتێنێ، جا خودا مافەتەیان تێ دەخاو کرمێ دەداتە گەردنیانو سەرجەم بەیەك دەم هەموو دەتۆپن، لەپاشا عیساو هاوڕێکانی دادەپەڕنە خوارەوە بۆ ناو وڵات، دەڕوانن شوێنی بستێ لەسەر رووی زەوی نەماوە کەپڕی نەبوبێ لەبۆ دڕنو لە بۆگەنی کەلاکی ئەوان، جا عیسای پێغەمبەری خوداو هاوڕێکانی، بەدڵێکی پاك لەخودا داوادەکەنو دەپاڕێنەوە کە چاری ئەم کێشەیان بۆ بکا، خوداش دێ بەدەنگیانەوەو پاڕانەوەکەیان لێ گیرا دەکاو، باڵندەیەکی گەورە دەنێرێ وەك گەردنی وشتری ملدرێژ، ئەو مەلانە کە لاکەکانیان هەڵ دەگرنو لە کوێ خودا ئارەزووی هەبێ لەوێ توورپیان دەدەن، ئەسا خودای گەورە بارانێکی سەقامگیر دەنێرێ، چ خانووبەرەو ماڵ، چ دەوارو رەشماڵ گشتی دەگرێتەوەو، سەر رووی گۆی زەوی گشتی وەك ئاوێنەی ساف پاك پاك دەشواتەوە، ئەوسا بەزەوی دەگوترێ بێرەوە بەرو دەست بکەرەوە بە پیتو فەڕ خستنەوە وەك جاری جارانت، جا لەو رۆژەدایە کە دەستەیێ پیاو لەیەك هەنار تێر دەخۆن، لەبن سێبەری قاوغەکەشدا وچان دەگرنو دەحەسێنەوە!

ئاژەڵی لەوەڕ خۆریش پیتو فەڕێکی وای تێ دەکەوێ شیری ژەمی وشترێکی تازە زاو بەشی عەشاماتێ دەکا، ژەکی ژەمی مانگایەکی تازە زاو بەشی خێڵێ دەکا، فرۆی ژەمی مەڕێ، یا بزنێکی دۆشەنی بەشی تیرەیەك لە ئێڵێ دەکا، ئیتر تا ماوەیێ ئاوا بەم چەشنە لەم خێرو خۆشییەدا دەمێننەوە، تا ناگاه خودای گەورە کزە بایەکی خۆش هەڵ دەکاو، دەدا لەبن باخەڵیانو گیانی هەموو خاوەن باوەڕو موسڵمانێ دەکێشێ، دەمێننەوە خەڵکە خراپو گەندو گەندەڵەکەو بەدکارانی مەردومەکە، ئیتر وەك کەر گەلو دێڵە بەبا بە بەرچاوی یەکترییەوە بەبێ شەرمو

شۆ، لەیەك هەڵدێن‌و سواری یەكتری دەبن‌و لەناو خۆیانا لە یەكتری دەپەڕن!).
{وەك ئێستای پاركی ئازادی ٢٠١٠/١١/١٥ز}.

ئیتر لەسەر ئەو بەدكارو گەندو گەندەڵانە قیامەت هەڵدەستێ!!). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٥٦٢٦} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٠٨}.

**ڕوونكردنەوە:**

لەم فەرموودەدا كۆمەڵێ بەهرەی جوان‌و باش هەیە وەك:

١- هەر پێنج نوێژە فەرزەكان، خۆیان‌و سوننەتەكانیان، هەموو بیست‌و چوار سەعاتێ، بە پێی كاتی شوێنە موعتەدیلەكان، هەر نوێژێ لە كاتی خۆیدا ئەنجام دەدرێ، وە كورتی‌و درێژی شەوو ڕۆژ بەپێی چوار وەرزەكە ڕەچاو دەكرێ.

٢- بۆ ڕۆژووش هەمان شت ڕەچاو دەكرێ، هەموو بیست‌و چوار سەعاتێ بە شەوو ڕۆژێ دادەنرێ، وە بەپێی وەرزو وڵاتی موعتەدیل، كە شەوو ڕۆژ لە وڵاتی موعتەدیل دا ئاساییەو زانراوەو دیاری كراوە، ڕۆژوویش هەموو بیست‌و چوار سەعاتێ، بە پێی وەرزەكان‌و وڵاتە موعتەدیلەكان ئەندازەی ڕۆژو ئەندازەی شەو دیاری دەكرێ‌و ئەوەی بە ڕۆژ دادەنرێ كاتی ڕۆژوو گرتنەوەو ئەوەی بە شەو دادەنرێ كاتی ڕۆژوو شكاندن‌و تەراویح‌و شەو نوێژو شتی تری وایە، هەروا شەوی لەیلەتولقەدرو ئیسراو میعراج‌و... تاد.

٣- بۆ زەكاتیش هەروا، بۆ سەرفیترەش هەروا.

٤- بۆ حەج‌و عەمرەیش هەروا، ئیتر هەموو عیبادەت‌و بۆنەیێ هەروا.

٢٠٤٩ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَوْمًا حَدِيثًا طَوِيلاً عَنِ الدَّجَّالِ فَكَانَ فِيمَا حَدَّثَنَا قَالَ « يَأْتِى وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ الْمَدِينَةِ فَيَنْتَهِى إِلَى بَعْضِ السِّبَاخِ الَّتِى تَلِى الْمَدِينَةَ فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ يَوْمَئِذٍ رَجُلٌ هُوَ خَيْرُ النَّاسِ - أَوْ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ - فَيَقُولُ لَهُ أَشْهَدُ أَنَّكَ الدَّجَّالُ الَّذِى حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- حَدِيثَهُ فَيَقُولُ الدَّجَّالُ أَرَأَيْتُمْ إِنْ قَتَلْتُ هَذَا ثُمَّ

أَحْيَيْتُهُ أَتَشُكُّونَ فِي الأَمْرِ فَيَقُولُونَ لاَ. قَالَ فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يُحْيِيهِ فَيَقُولُ حِينَ يُحْيِيهِ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ فِيكَ قَطُّ أَشَدَّ بَصِيرَةً مِنِّى الآنَ - قَالَ - فَيُرِيدُ الدَّجَّالُ أَنْ يَقْتُلَهُ فَلاَ يُسَلَّطُ عَلَيْهِ ». قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ يُقَالُ إِنَّ هَذَا الرَّجُلَ هُوَ الْخَضِرُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ. {الحديث: ٧٣٠١ = ٧٣٣٥ فم. تجريد البخاري/٢، رقم: ٨٦٧ = ١٨٨٢ ، ٧١٣٢ فتح الباري}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە درێژی باسی جەجاڵی بۆ کردین، لەناو باسەکەدا فەرمووی: (جەجاڵ کاتێ دێ، لێی قەدەغە کراوە کە لە دەربەندەکەی مەدینە ڕەت بێ‌و، بچێتە ناو شاری مەدینە، جا دێت کە بێت بۆناو شاری مەدینە، دێت هەتا دەگاتە لای شۆرەکاتەکانی دەرەوەی مەدینەو لەوێ بارو بنەی خۆی لێ دەخا، جا ئەو ڕۆژە پیاوێ بۆی دەردەچێ، ئەو پیاوە باشترین کەسە لەو ڕۆژگارەدا). یا فەرمووی: (لە باشترینی کەسانی ئەو ڕۆژگارەیە، پێی دەڵێ: گەواهو شایەتی دەدەم کە تۆ ئەو جەجاڵەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ئەوی پێگوتووین. جەجاڵیش دەڵێ: ئایا پێم بڵێن ئەگەر ئەم پیاوە بکوژم‌و لەپاشا زیندووی بکەمەوە، ئیتر هیچ سوو (شەك)و گومانێکتان دەمێنێ لە کارو باری منا، وەئەو کاتە زۆر باش دەیسەلمێنن کە من خودای ئێوەم؟ دەڵێن: بەڵێ، دەیسەلمێنین‌و گومانمان نامێنێ. فەرمووی: جا دەیکوژێ‌و پاشان زیندووشی دەکاتەوە، پیاوەکەش کە جەجاڵ زیندووی دەکاتەوە، پێی دەفەرموێ: بەخودا هەرگیز وەك ئێستا بە تەواوی لێم یەقین نەبووە کە تۆ جەجاڵی، جا بۆ جاری دووەم ججاڵ دەیەوێ پیاوەکە بکوژێتەوە، بەڵام لەلایەنی خوداوە قەدەغە دەکرێ‌و دەستەڵاتی ناشکێ بەسەریدا).

ئەبو ئیسحاق، کە ناوی ئیبراهیمی کوڕی سوفیانی ئەلفەقیهە، کە ڕاوی صەحیحی موسلیمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: دەڵێن: ئەو پیاوە کە جەجاڵ سەری دەبڕێ‌و دوایی زیندووی دەکاتەوەو لەجاری دووەمدا دەستەڵاتی بەسەریدا ناشکێ، دەڵێن: ئەو پیاوە حەزرەتی خدری زیندەیە. {تاج/٥، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٥٦٢٤ — جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو شارێ، مەکەو مەدینەی لێ دەرچێ}.

**رونكردنەوە:**

لەفەتحولباریدا حافظی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: بەلگەو قەوالەی ئەوانەی کە دەڵێن: ئەو پیاوە کە جەجاڵ دەیکوژێ، حەزرەتی خدری زیندەیە ئەو فەرموودەیەیە، کە ئیبنو حیببان لەصەحیحەکەیدا دەریهێناوە، بە ڕشتەی خۆی کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەوانەیە کە هەندێ کەس لەوانەی کە فریای جەجاڵ دەکەون، ئەو کەسانە بن کە منی بینیوە، یا فەرمودەی منی بیستووە!). هەروا عەسقەلانی دەفەرموێ: شێوازی بوونی ئەم فەرموودەیە بە بەلگە لەسەر ئەوە کە ئەو پیاوە کوژراوە خدرە ئەوەیە: چونکە لە زەمانی کاتی پەیدابوونی جەجاڵدا کەسێ پێغەمبەری بینیبێ، بێجگە لە خدر کەس نەماوە.

٢٠٥٠ — عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فَيَتَوَجَّهُ قِبَلَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَتَلْقَاهُ الْمَسَالِحُ مَسَالِحُ الدَّجَّالِ فَيَقُولُونَ لَهُ أَيْنَ تَعْمِدُ فَيَقُولُ أَعْمِدُ إِلَى هَذَا الَّذِى خَرَجَ - قَالَ - فَيَقُولُونَ لَهُ أَوَمَا تُؤْمِنُ بِرَبِّنَا فَيَقُولُ مَا بِرَبِّنَا خَفَاءٌ. فَيَقُولُونَ اقْتُلُوهُ . فَيَقُولُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ أَلَيْسَ قَدْ نَهَاكُمْ رَبُّكُمْ أَنْ تَقْتُلُوا أَحَدًا دُونَهُ - قَالَ - فَيَنْطَلِقُونَ بِهِ إِلَى الدَّجَّالِ فَإِذَا رَآهُ الْمُؤْمِنُ قَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَذَا الدَّجَّالُ الَّذِى ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ فَيَأْمُرُ الدَّجَّالُ بِهِ فَيُشَبَّحُ فَيَقُولُ خُذُوهُ وَشُجُّوهُ. فَيُوسَعُ ظَهْرُهُ وَبَطْنُهُ ضَرْبًا - قَالَ - فَيَقُولُ أَوَمَا تُؤْمِنُ بِى قَالَ فَيَقُولُ أَنْتَ الْمَسِيحُ الْكَذَّابُ - قَالَ - فَيُؤْمَرُ بِهِ فَيُؤْشَرُ بِالْمِئْشَارِ مِنْ مَفْرِقِهِ حَتَّى يُفَرَّقَ بَيْنَ رِجْلَيْهِ - قَالَ - ثُمَّ يَمْشِى الدَّجَّالُ بَيْنَ الْقِطْعَتَيْنِ ثُمَّ يَقُولُ لَهُ قُمْ. فَيَسْتَوِى قَائِمًا - قَالَ - ثُمَّ يَقُولُ لَهُ أَتُؤْمِنُ بِى فَيَقُولُ مَا ازْدَدْتُ فِيكَ إِلاَّ بَصِيرَةً - قَالَ - ثُمَّ يَقُولُ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لاَ يَفْعَلُ بَعْدِى بِأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ - قَالَ - فَيَأْخُذُهُ الدَّجَّالُ لِيَذْبَحَهُ فَيُجْعَلَ مَا بَيْنَ رَقَبَتِهِ إِلَى تَرْقُوَتِهِ نُحَاسًا فَلاَ يَسْتَطِيعُ إِلَيْهِ سَبِيلاً - قَالَ - فَيَأْخُذُ بِيَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ فَيَقْذِفُ بِهِ فَيَحْسِبُ النَّاسُ أَنَّمَا قَذَفَهُ إِلَى النَّارِ وَإِنَّمَا أُلْقِىَ فِى الْجَنَّةِ ». فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « هَذَا أَعْظَمُ النَّاسِ شَهَادَةً عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِينَ ». {الحديث: ٧٣٠٣ = ٧٣٣٧ فم، تجريد/٢، رقم: ٨٦٧ = ٧١٣٢، ١٨٨٢}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ جەجاڵ هەڵدەستێ، پیاوێ لەموسڵمانان. ڕووەو لای ئەو دەکەوێتە رێ، چەتەو چەکدارەکانی جەجاڵ بەری لێ دەبڕنەوەو پێی دەڵێن: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ دەفەرموێ: دەچم بۆلای ئەم کابرایەی کە پەیدابووە، دەڵێن: دیارە کەتۆ وادەڵێی، دەڵێی بڕوا ناکەی بە خوداکەی ئێمە؟ دەفەرموێ: خودای ئێمە دیاریو ئاشکرایەو نومایانەو شاراوەو پەنهان نییە، وەك ئەم خودا درۆینەی ئێوەیە. دەڵێن: ئادەی بیگرنو بیکوژن. لەناو خۆیاندا دەڵێن: شتی وانابێ، چونکە خوداکەمان ڕێگەی نەداوین کە کەسێ بەبێ فەرمانی خۆی بیکوژین. فەرمووی: ئەوجا دەیبەن بۆلای جەجاڵ کە موسڵمانەکە چاوی پێی دەکەوێ، دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە ئەمە ئەو جەجاڵەیە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) باسی ئەوی بۆ کردووین. فەرمووی: ئەنجا جەجاڵ دەستور دەدا پیاوە موسڵمانەکە لەسەردەم رادەخەنو چوار مێخەی دەکێشنو ئەنجا دەڵێ: ئادەی دارکارییەکی باشی بکەن. ئیتر دارکارییەکی زۆر باشی بەرو پشتی دەکەن!

جەجاڵ دەڵێ: ئایا هێشتا باوەڕم پێ ناهێنی؟ فەرمووی: ئەویش دەفەرموێ: تۆ جەجاڵە کۆری هەلاتبازی گەڕۆکی. فەرمووی: ئیتر جەجاڵ دەستور دەدا لە تەوقە سەریەوە، بەشەقە مشار وەك تەختەدار دایدەهێنن، هەتا نافەکی، جا جەجاڵ خۆی بەنێوانی هەردوو کەرتەکەیدا دەڕوا، لەپاشا پێی دەڵێ: هەڵسە! ئەویش ڕاست دەبێتەوە سەرپێ، جا پێی دەڵێ: ها باوەڕم پێ دەهێنی؟ ئەویش دەڵێ: ئەوەندەی تر بۆم ڕوون بۆوە کە تۆ چیتو چی نیت. ئەوجا دەڵێ: ئەی خەڵکینە! ئیتر لە پاش من ناتوانێ کەسی تر وا لێ بکا، فەرمووی: ئەوجا جەجاڵ دەیگرێ تا سەری ببڕێ بەڵام بە فەرمانی خودا بەربینی لە غەوغەوەیەوە هەتا چەڵەمەی سینگی دەبێ بەیەك پارچە مس! ئیتر ڕێگەی ئەوەی نابێ! فەرمووی: ئەوسا هەر چوار پەلی دەگرێو فڕەی دەدا، لە خەڵك وایە کە ئەوە فڕەی داوەتە ناو دۆزەخەوە بەڵام لەڕاستیدا دەبرێ بۆ ناو بەهەشت).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەلای خودای پەروەردگاری هەردوو جیهان گەورەترین شەهید ئەم پیاوەیە!). {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨١٥}.

**روونکردنەوە:**

لە (٢٠٠٨/٥/٢٨)دا، ئەم تێبینیەم لێرەدا نووسیوە، لە تاجول ئوصلدا، لە بەرگی پێنجەمدا، زنجیرە/١١٣دا، لەدوا وەرگێڕانی فەرموودەی ژمارە (٥٦٢٥). وا ئێستا لێرەشدا دوبارەی دەکەمەوە: (سُبْحَانَ اللـه! سەرنج بدەن تەنانەت جەجاڵ، بە جەجالی خۆی، قایل نییە، کە کەسێ لە دەستو پێوەندەکەی خۆی، کەسێکی تر لە نەیارەکانی بکوژێ! کەچی ئێستا لە هەندێ وڵات، کوشتنو بڕین ئەوەندە ئاسان بووە، وای لێ هاتووە هەموو کوێخای گوندێ، یا کاربەدەستێ، بەبێ پرسو راکردن بەکەسێ، مافی ئەوەی پێ دراوە کە خەڵکی بێ تاوان، بەبڕو بیانووی پڕو پووچ لە سێدارە بدا.

سُبْحَان الله! لە ئێمە وابوو کە هەر صەددامو ڕژێمەکەی ئەو وایە، بەڵام ئێستا دەرکەوت کە ڕژێم هەر ڕژێمە، هەمیشە دەستدار دەیباو بی دەست تەماشا دەکا.

{وەرگێڕ — ٢٠١٠/١١/٢٠ز}

٢٠٥١ — عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ مَا سَأَلَ أَحَدٌ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- عَنِ الدَّجَّالِ أَكْثَرَ مِمَّا سَأَلْتُ قَالَ « وَمَا يُنْصِبُكَ مِنْهُ إِنَّهُ لاَ يَضُرُّكَ ». قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّ مَعَهُ الطَّعَامَ وَالأَنْهَارَ قَالَ « هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ ». {الحديث: ٧٣٠٤ = ٧٣٣٨ فم. البخاري. فتن: ٧١٢٢}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کەسی تر ئەوەندەی من بە زۆری، لەبابەت جەجاڵەوە پرسیاری زۆری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەکردووە، جارێکیان فەرمووی: ڕۆڵەکەم! چییە وا لێی خەجڵیو وا خەمو پەژارەی دایگرتووی؟ مەترسە زیانی بۆ تۆ نابێ. عەرزیمکرد: بۆیە ئەوەندە دەترسم چونکە دەڵێن: چەند کێوێ نانو خۆراکو گۆشتو چەند چەمێ ئاوی لەگەڵە! فەرمووی:

(درودی خودای لەسەر بێ) : (با ئەوانیشی لەگەڵدا بێ، ئەو لەلای خودا سووكو تڕۆیەو رادەی ئەوەی ناكەوێ كە بەهۆی ئەم جۆرە چەواشەكاریو چاو بەستو چاوو راوەوە، بتوانێ كە سەر لە موسڵمانانی پاك بشێوێنێ، بەڵكوو ئەوە دەبێ بەهۆی بەهێزبوونی باوەڕی باوەڕدارو، دەبێ بەهۆی راستكردنەوەی بەلگەی راستو رۆشن لەسەر ناموسڵمانانو ناپاكان!). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٥٦١٥}.

٢٠٥٢ — عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ قَالَ سَمِعْتُ يَعْقُوبَ بْنَ عَاصِمِ بْنِ عُرْوَةَ بْنِ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيَّ يَقُولُ سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو وَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ مَا هَذَا الْحَدِيثُ الَّذِى تُحَدِّثُ بِهِ تَقُولُ إِنَّ السَّاعَةَ تَقُومُ إِلَى كَذَا وَكَذَا. فَقَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ - أَوْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهُمَا - لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لاَ أُحَدِّثَ أَحَدًا شَيْئًا أَبَدًا إِنَّمَا قُلْتُ إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدَ قَلِيلٍ أَمْرًا عَظِيمًا يُحَرَّقُ الْبَيْتُ وَيَكُونُ وَيَكُونُ ثُمَّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فِى أُمَّتِى فَيَمْكُثُ أَرْبَعِينَ - لاَ أَدْرِى أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ أَرْبَعِينَ شَهْرًا أَوْ أَرْبَعِينَ عَامًا - فَيَبْعَثُ اللَّهُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ كَأَنَّهُ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ فَيَطْلُبُهُ فَيُهْلِكُهُ ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ سَبْعَ سِنِينَ لَيْسَ بَيْنَ اثْنَيْنِ عَدَاوَةٌ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ رِيحًا بَارِدَةً مِنْ قِبَلِ الشَّأْمِ فَلاَ يَبْقَى عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ أَحَدٌ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ أَوْ إِيمَانٍ إِلاَّ قَبَضَتْهُ حَتَّى لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ دَخَلَ فِى كَبِدِ جَبَلٍ لَدَخَلَتْهُ عَلَيْهِ حَتَّى تَقْبِضَهُ ». قَالَ سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « فَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ فِى خِفَّةِ الطَّيْرِ وَأَحْلاَمِ السِّبَاعِ لاَ يَعْرِفُونَ مَعْرُوفًا وَلاَ يُنْكِرُونَ مُنْكَرًا فَيَتَمَثَّلُ لَهُمُ الشَّيْطَانُ فَيَقُولُ أَلاَ تَسْتَجِيبُونَ فَيَقُولُونَ فَمَا تَأْمُرُنَا فَيَأْمُرُهُمْ بِعِبَادَةِ الأَوْثَانِ وَهُمْ فِى ذَلِكَ دَارٌّ رِزْقُهُمْ حَسَنٌ عَيْشُهُمْ ثُمَّ يُنْفَخُ فِى الصُّورِ فَلاَ يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إِلاَّ أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا - قَالَ - وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ - قَالَ - فَيَصْعَقُ وَيَصْعَقُ النَّاسُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ - أَوْ قَالَ يُنْزِلُ اللَّهُ - مَطَرًا كَأَنَّهُ الطَّلُّ أَوِ الظِّلُّ - نُعْمَانُ الشَّاكُّ - فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ ثُمَّ يُقَالُ يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَلُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ. وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ - قَالَ - ثُمَّ يُقَالُ أَخْرِجُوا بَعْثَ النَّارِ فَيُقَالُ مِنْ كَمْ فَيُقَالُ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ - قَالَ -

فَذَاكَ يَوْمَ يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا وَذَلِكَ يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ ». {الحديث: ٧٣٠٧ = ٧٣٤١ فم}:

نوعمانی کوڕی سالم فەرمووی: لە یەعقووبی کوڕی عاصیمی کوڕی عورووەی کوڕی مەسعودی ئەل - ثەقەفیم بیست (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێ) دەیفەرموو: بۆخۆم گوێم لێ بوو پیاوێك هاتە خزمەتی عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی بە عەبدوڵلا: ئەم جۆرە فەرموودەیە چییە کە دەیگێڕێتەوەو گوایە دەڵێیت: قیامەت لەئەوەندەو ئەوەندەدا هەڵ دەستێ؟ ئەویش فەرمووی: (سُبْحَان الله) یا فەرمووی: (لا إله إلأ اللّه). من چۆن قسەی وادەکەم، بەس خودا دەزانێ کە قیامەت کەی هەڵ دەستێ، یا وشەیە یادو ذیکری تری ئاوای فەرموو ئەوجا عەبدوڵلا فەرمووی: بەڕاستی نیازم وایە کە لەمەولا بۆ هیچ کەسێ هیچ فەرموودەیێ نەگێڕمەوە هەتا هەتایە، من وام نەگوتووە، بەڵکو گوتوومە: دڵنیابن کە ئەوەندەی پێ ناچێ تەڕنێکی گەورە دەبینن: خانەی خودا دەسووتێ (حەججاج بە فەرمانی یەزیدی کوڕی معاویە دایە بەر مەنجەنیقو سووتاندی) وە ئەوەو ئەوەی تر بەر لە هاتنی قیامەت روودەدەن. ئینجا عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جەجاڵ کە پەیدا دەبێ لەناو ئۆمەتما چل رۆژ) یا فەرمووی: (چل مانگ) یا فەرمووی: (چل ساڵ دەمێنێتەوەو دەڕانێ، پاشان خودای گەورەو سەروەر عیسای کوڕی مەریەم (دروودی خودا لەسەر خۆیو دایکی) دەنێرێ، عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) بە شێوەی شیرینیو بە ئێسکی سووکیو بە لەشو لاری پاكو خاوێنی، دەق لە عورووەی کوڕی مەسعوود دەکا، کە عوروە نموونەی شێوە شیرینیو پاكو تەمیزی بووە، لە ناو یارانی پێغەمبەرداو یەکێ بووە لە هاوەڵانی. جا حەزرەتی عیسا (سلاوی خودای لەسەر بێ) دەگەڕێ بەشوێن جەجالا هەتا پەیدای دەکاو دەیکوژێ، ئیتر هەتا حەوت ساڵ خەڵك بە شادیو خۆشیو بێ شەڕو شۆڕو دوژمنایەتی دەمێننەوە، کەس لەکەس ناکەوێو هەموو وەك برای خۆشەویست دەژین، ئەوجا خودا لەلای شامەوە شەماڵێکی

خۆش‌و فێنك دەنێرێ، جا هەر كەسێ لەسەر رووی زەوی بەقەد تۆسقاڵێ خێرو چاكە، یا باوەڕو ئیمان لەناو دڵیابێ ئەو بایە گیانی دەستێنێ، تەنانەت ئەگەر بێتو یەكێ لەئێوە خۆی بكا بەناو جەرگەی كێوێكا، ئەو شنە بایە دوای دەكەوێ بۆ ئەوێ‌و لەوێ گیانی دەكێشێ.

عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئا ئەمەم بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتووە: دەیفەرموو: (جا دەمێنێتەوە خەڵكە بەد ڕەوشت‌و بەد ڕەفتارو بەد كردارەكان، وا بەخێرای پەلاماری خراپەو خراپەكاری دەدەن‌و دەم دەژەندنە ئارەزوو بازی، دەڵێی: مەلی سووك فڕن، خووی بەدو ڕەفتاری ناهەمواریان، لە ڕەفتارو خووی دڕندە خوێن خۆرەكان دەكا، نەچاكە بە چاكە دەزانن‌و نە خراپە بە خراپە دادەنێن، جا شەیتان دێتە بەرچاویان‌و لە رووبەروو پێیان دەڵێ: ئەرێ بەگوێم دەكەن یان نا؟ دەڵێن: ئادەی بفەرموو، فەرمانمان بەچی پێ دەكەی؟! ئەویش فەرمانیان پێ دەكا بە پەرستنی بوت‌و شتی وا، كەچی لەگەڵ ئەو حاڵەیشا، رزق‌و رۆژیان زۆر زۆرو مشەیە، وە رابواردن‌و ژێواریان تا بڵێی باش‌و خۆشە، لەدوایدا فوو دەكرێ بە صوورداو كۆتای بە دنیا دەهێنرێ، ئیتر دەست بەجێ ئەوەی كە گوێی لێ بێ كوتوپڕ ملی لار دەبێتەوەو دەمرێ، یەكەم كەس كە گوێی لێ دەبێ پیاوێ دەبێ لەو كاتەدا خەریكە ئەستێڵی وشترەكانی سوخ دەدا، هەتا ئامادەی بكا بۆ ئاودانیان، جا كە ئەو پیاوە دەمرێ، خەڵكیش بەدوای ئەودا دەست دەكەن بە مردن، پاشان خودا بارانێ دەنێرێ. یا فەرمووی: (بارانێ دەبارێنێ، وەك رنە باران، یا فەرمووی: وەك سێبەر، ئیتر بەو پرووشە بارانە جەستەی مرۆڤەكان سەر لەنوێ هەموو دەڕوێنەوە، تا ماوەی چل ساڵ لە نێوانی دوو فوو (نەفخە)كەدا جیهان چۆڵ‌و هۆڵ دەبێ، لە پاشا جارێكی تریش فوو دەكرێتەوە بە صوورداو كوتوپڕ مردووەكان هەموو راست دەبنەوەو تەماشای دەوروبەری خۆیان دەكەن، ئینجا دەگوترێ: ئەی بەرەی ئادەمیزاد! ئەی مرۆڤینە!

وەرن کۆببنەوە لەحوزوری خودای خۆتاندا، وەك خودای گەورەو مەزن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

{وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ – الصافات – ٣٧/ ٢٤}.

واتە: ئادەی رایان بگرن لە ئێستگای لێپرسینەوەدا، چونکە ئەوانە بەرپرسیارنو پرسیاریان لێ دەکرێ، لە کردەوەو بیرو باوەڕیان). پاشان دەگوترێ: ئادەی نێردەی دۆزەخ جیاوەکەن، با بڕۆن بۆناو ئاگر! دەگوترێ: بەشی دۆزەخ چەند لە چەندە؟ دەفەرموێ: لەهەموو هەزارێ، نۆسەدو نەوەدو نۆی بۆ دۆزەخە! فەرمووی: ئەمەیە ئەو رۆژەی کە لەبەر سامو بیمی، سەری منداڵو لاوەکان سپی دەبێ، وەك قورئان دەفەرموێ:

{فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا – سورة المزمل – ٧٣/ ١٧}.

واتە: ئەگەر هەروا لەسەر بێ بڕوایی بمێننەوە چۆن خۆتان دەپارێزن لە سزای ئەو رۆژەی کە بە سامو ترسو بێمی خۆی منالان پیر دەکات).

هەروەها ئەوە ئەو رۆژەیە کە خودای گەورە لەبارەیەوە فەرموویەتی: {يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ – سورة القَلَمِ – ٦٨/ ٤١}.

واتە: ئەی پێغەمبەری نازدار! باسی ئەو رۆژە سەختە بکە کە بەڕاستی کاتی تەنگو چەڵەمەیە، کە داوێنی تیادەکرێ بەلاداو، لەبەر پەرێشانی حاڵی شڕی خەڵك، قاچو قول هەڵدەکرێو لە مەیدانا قولی رەشو سپی دەردەکەوێ). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٥٦٣٥ + مجلد تاج/٤، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٤٠٧٦ – سورة الزمر}.

**روونکردنەوە:**

١- عوروەی کوڕی مەسعوودی ئەل – ثەقەفی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەپێش ئیسلام بوونیدا، ئامادەی رێکەوتننامەی حودەیبییە بووە نوێنەری هۆزی قوڕەیش بوو لەم صوڵحەدا، دەستێکی باڵای بوو لەسەر گرتنی ئەم رێکەوتنەدا، کاتێ ویستی ئیسلام ببێ، لەدوای غەزای تائیف شوێن پێغەمبەر کەوت، بەرلەوە بگاتەوە مەدینە، عوروە گرتیەوەو ئیسلام بوو، وە داوای لە پێغەمبەر کرد کە بچێتەوە بۆ

ناو هۆزەکەیو داوایان لێ بکا کە ئیسلام ببن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاخر دەتکوژن؟!) عەرزیکرد: قوربان! منیان لە چاویان خۆشتر دەوێ، وە خۆشی وابوو، لەناویانا زۆر خۆشەویست بوو، بەڵام کە دەستی کرد بە پەخشی بانگەوازی ئیسلام، لەهەموو لایەکەوە دایانە بەر تیرو تیر بارانیان کرد، تیرێ بەری کەوت پێی شەهید بوو، لەپیاو ماقووڵانی هۆزەکەی بوو.

٢- ئیبنو صەییاد منالێکی جوولەکە بوو، لە مەدینە بوو، ناوی صاف بوو، وەسفو نیشانەکانی، لە تاجول ئوصولدا، لە فەرموودەیەکا باسکراوە، بەرگی/٥، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٥٦٢٢ — نیشانەکانی جەجاڵە کۆرە...).

ئەم منداڵە لە مەدینە لەسەردەمی پێغەمبەردا لەدایك بوو، ئەم منداڵە هەندێ نیشانەی سەیر سەیری تیادا بوو، لە نیشانەکانی جەجاڵ دەچوو، لەبەر ئەوە کەوتنە گومانەوە لێی، وە زۆر شتی سەیرو عەنتیکە روودەدا لێی، وەك لە فەرموودەکانەوە دەردەکەوێ. تەنانەت هەر بە منداڵی داوای پێغەمبەرایەتی کردووە، لەپاشا گەورە بووەو ژنی هێناوەو منالی بووەو بە گەورەیش غەرایبو عەجایبی لێ بینراوە.

## ١٥٦٩) یەکەم نیشانە لە نیشانە گەورەکانی هاتنی قیامەت هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە. (٧٢٨٨ - ٧٣١١)

## بَابٌ: أَوَّلُ الآيَاتِ طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا

٢٠٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنه) قَالَ حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- حَدِيثًا لَمْ أَنْسَهُ بَعْدُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « إِنَّ أَوَّلَ الآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ عَلَى النَّاسِ ضُحًى وَأَيُّهُمَا مَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا فَالأُخْرَى عَلَى إِثْرِهَا قَرِيبًا ». {الحديث: ٧٣٠٩ = ٧٣٤٣ فم}:

ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولا ئاوایە:

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم فەرموودەیەم لە زاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، وە هەتا ئێستا هێشتا زۆر بە باشی لەبەرم

ماوەو لە یادم نەچۆتەوە، بەگوێی خۆم گوێم لێی بوو فەرمووی: (یەکەم نیشانەی هەرە گەورەی داهاتنی قیامەت کە روودەدات، یەکێکە لەم دوو رووداوە گەورەیە: یا دەرچوونو هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، یا پەیدا بوونی دەعبا بن عەردیلەیە کە ناوداره بە دابەتولئەرز، کە لەکاتی چێشتەنگاودا لە زەوی صەفا دەردەچێ، لەنزیکی کابەتوڵڵا (بروانە: ژمارە: ٢٠٣٩ لە پێشەوە) کە لەزەوی دەردەچێ دەدا بەسەر مەردومدا، جا ئەم دوو نیشانەیە هەر کامێکیان لەپێش ئەوی تریانەوە روویدا، ئیتر ئەوی تریشیان دوا بەدوای ئەو بە زووی روودەدات). {موسلیمو ئەبو داوود گێرِویانەتەوە}.

ئەبو داوود (رەزای خودای لێ بێ) ئەمەی پتر کردەوە: عەبدوڵلا، کە خۆی نامە ئاسمانییە پێشووەکانی خوێندبوو، دەیفەرموو: من وادەزانم کە دەرچوونی خۆر لە خۆرئاواوە، پێش دەرچوونی دەعبا بن عەردیلە دەکەوێ). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٧٧ — نیشانەی داهاتنی قیامەت + تاج/٤، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٠٢٠ — سوورەتی نەمل}.

### ١٥٧٠) نیشانەکانی جەجاڵە کۆرە، کە گەورەترین فەرتەنەیەو باسی پەیدابوونیو داستانی جەسساسە. (٧٣١٢ - ٧٣١٧)

### باب: صِفَةُ الدَّجَّالِ وَخُرُوجُهُ وَ حَدِيثُ الجَسَّاسَةِ

٢٠٥٤- عن عَامِرُ بْنُ شَرَاحِيلَ الشَّعْبِىُّ (شَعْبُ هَمْدَانَ) أَنَّهُ سَأَلَ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ أُخْتَ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ فَقَالَ حَدِّثِينِى حَدِيثًا سَمِعْتِيهِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- لاَ تُسْنِدِيهِ إِلَى أَحَدٍ غَيْرِهِ فَقَالَتْ لَئِنْ شِئْتَ لأَفْعَلَنَّ فَقَالَ لَهَا أَجَلْ حَدِّثِينِى. فَقَالَتْ نَكَحْتُ ابْنَ الْمُغِيرَةِ وَهُوَ مِنْ خِيَارِ شَبَابِ قُرَيْشٍ يَوْمَئِذٍ فَأُصِيبَ فِى أَوَّلِ الْجِهَادِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَلَمَّا تَأَيَّمْتُ خَطَبَنِى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَخَطَبَنِى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عَلَى مَوْلاَهُ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ وَكُنْتُ قَدْ حُدِّثْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ أَحَبَّنِى فَلْيُحِبَّ أُسَامَةَ ». فَلَمَّا كَلَّمَنِى رَسُولُ اللَّهِ -صلى

الله عليه وسلم- قُلْتُ أَمْرِى بِيَدِكَ فَأَنْكِحْنِى مَنْ شِئْتَ فَقَالَ « انْتَقِلِى إِلَى أُمِّ شَرِيكٍ ». وَأُمُّ شَرِيكٍ امْرَأَةٌ غَنِيَّةٌ مِنَ الأَنْصَارِ عَظِيمَةُ النَّفَقَةِ فِى سَبِيلِ اللَّهِ يَنْزِلُ عَلَيْهَا الضِّيفَانُ فَقُلْتُ سَأَفْعَلُ فَقَالَ « لاَ تَفْعَلِى إِنَّ أُمَّ شَرِيكٍ امْرَأَةٌ كَثِيرَةُ الضِّيفَانِ فَإِنِّى أَكْرَهُ أَنْ يَسْقُطَ عَنْكِ خِمَارُكِ أَوْ يَنْكَشِفَ الثَّوْبُ عَنْ سَاقَيْكِ فَيَرَى الْقَوْمُ مِنْكِ بَعْضَ مَا تَكْرَهِينَ وَلَكِنِ انْتَقِلِى إِلَى ابْنِ عَمِّكِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ ». - وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِى فِهْرٍ فِهْرِ قُرَيْشٍ وَهُوَ مِنَ الْبَطْنِ الَّذِى هِىَ مِنْهُ - فَانْتَقَلْتُ إِلَيْهِ فَلَمَّا انْقَضَتْ عِدَّتِى سَمِعْتُ نِدَاءَ الْمُنَادِى مُنَادِى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يُنَادِى الصَّلاَةَ جَامِعَةً. فَخَرَجْتُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَصَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَكُنْتُ فِى صَفِّ النِّسَاءِ الَّتِى تَلِى ظُهُورَ الْقَوْمِ فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- صَلاَتَهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَضْحَكُ فَقَالَ « لِيَلْزَمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مُصَلاَّهُ ». ثُمَّ قَالَ « أَتَدْرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُمْ ». قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ « إِنِّى وَاللَّهِ مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلاَ لِرَهْبَةٍ وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ لأَنَّ تَمِيمًا الدَّارِىَّ كَانَ رَجُلاً نَصْرَانِيًّا فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ وَحَدَّثَنِى حَدِيثًا وَافَقَ الَّذِى كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ مَسِيحِ الدَّجَّالِ حَدَّثَنِى أَنَّهُ رَكِبَ فِى سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ مَعَ ثَلاَثِينَ رَجُلاً مِنْ لَخْمٍ وَجُذَامَ فَلَعِبَ بِهِمُ الْمَوْجُ شَهْرًا فِى الْبَحْرِ ثُمَّ أَرْفَئُوا إِلَى جَزِيرَةٍ فِى الْبَحْرِ حَتَّى مَغْرِبِ الشَّمْسِ فَجَلَسُوا فِى أَقْرُبِ السَّفِينَةِ فَدَخَلُوا الْجَزِيرَةَ فَلَقِيَتْهُمْ دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ لاَ يَدْرُونَ مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ فَقَالُوا وَيْلَكِ مَا أَنْتِ فَقَالَتْ أَنَا الْجَسَّاسَةُ. قَالُوا وَمَا الْجَسَّاسَةُ قَالَتْ أَيُّهَا الْقَوْمُ انْطَلِقُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِى الدَّيْرِ فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالأَشْوَاقِ. قَالَ لَمَّا سَمَّتْ لَنَا رَجُلاً فَرِقْنَا مِنْهَا أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً - قَالَ - فَانْطَلَقْنَا سِرَاعًا حَتَّى دَخَلْنَا الدَّيْرَ فَإِذَا فِيهِ أَعْظَمُ إِنْسَانٍ رَأَيْنَاهُ قَطُّ خَلْقًا وَأَشَدُّهُ وِثَاقًا مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ مَا بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى كَعْبَيْهِ بِالْحَدِيدِ قُلْنَا وَيْلَكَ مَا أَنْتَ قَالَ قَدْ قَدَرْتُمْ عَلَى خَبَرِى فَأَخْبِرُونِى مَا أَنْتُمْ قَالُوا نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ الْعَرَبِ رَكِبْنَا فِى سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ فَصَادَفْنَا الْبَحْرَ حِينَ اغْتَلَمَ فَلَعِبَ بِنَا الْمَوْجُ شَهْرًا ثُمَّ أَرْفَأْنَا إِلَى جَزِيرَتِكَ هَذِهِ فَجَلَسْنَا فِى أَقْرُبِهَا فَدَخَلْنَا الْجَزِيرَةَ فَلَقِيَتْنَا دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ لاَ يُدْرَى مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ فَقُلْنَا وَيْلَكِ مَا أَنْتِ فَقَالَتْ أَنَا الْجَسَّاسَةُ. قُلْنَا وَمَا الْجَسَّاسَةُ قَالَتِ اعْمِدُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِى الدَّيْرِ فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ

بِالأَشْوَاقِ فَأَقْبَلْنَا إِلَيْكَ سِرَاعًا وَفَزِعْنَا مِنْهَا وَلَمْ نَأْمَنْ أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً فَقَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ قُلْنَا عَنْ أَىِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ قَالَ أَسْأَلُكُمْ عَنْ نَخْلِهَا هَلْ يُثْمِرُ قُلْنَا لَهُ نَعَمْ. قَالَ أَمَا إِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ لاَ تُثْمِرَ قَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ بُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ. قُلْنَا عَنْ أَىِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ قَالَ هَلْ فِيهَا مَاءٌ قَالُوا هِىَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ. قَالَ أَمَا إِنَّ مَاءَهَا يُوشِكُ أَنْ يَذْهَبَ. قَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ عَيْنِ زُغَرَ. قَالُوا عَنْ أَىِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ قَالَ هَلْ فِى الْعَيْنِ مَاءٌ وَهَلْ يَزْرَعُ أَهْلُهَا بِمَاءِ الْعَيْنِ قُلْنَا لَهُ نَعَمْ هِىَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ وَأَهْلُهَا يَزْرَعُونَ مِنْ مَائِهَا. قَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ نَبِىِّ الأُمِّيِّينَ مَا فَعَلَ قَالُوا قَدْ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ وَنَزَلَ يَثْرِبَ. قَالَ أَقَاتَلَهُ الْعَرَبُ قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ كَيْفَ صَنَعَ بِهِمْ فَأَخْبَرْنَاهُ أَنَّهُ قَدْ ظَهَرَ عَلَى مَنْ يَلِيهِ مِنَ الْعَرَبِ وَأَطَاعُوهُ قَالَ لَهُمْ قَدْ كَانَ ذَلِكَ قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ أَمَا إِنَّ ذَاكَ خَيْرٌ لَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ وَإِنِّى مُخْبِرُكُمْ عَنِّى إِنِّى أَنَا الْمَسِيحُ وَإِنِّى أُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِى فِى الْخُرُوجِ فَأَخْرُجَ فَأَسِيرَ فِى الأَرْضِ فَلاَ أَدَعَ قَرْيَةً إِلاَّ هَبَطْتُهَا فِى أَرْبَعِينَ لَيْلَةً غَيْرَ مَكَّةَ وَطَيْبَةَ فَهُمَا مُحَرَّمَتَانِ عَلَىَّ كِلْتَاهُمَا كُلَّمَا أَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ وَاحِدَةً أَوْ وَاحِدًا مِنْهُمَا اسْتَقْبَلَنِى مَلَكٌ بِيَدِهِ السَّيْفُ صَلْتًا يَصُدُّنِى عَنْهَا وَإِنَّ عَلَى كُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلاَئِكَةً يَحْرُسُونَهَا قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَطَعَنَ بِمِخْصَرَتِهِ فِى الْمِنْبَرِ « هَذِهِ طَيْبَةُ هَذِهِ طَيْبَةُ هَذِهِ طَيْبَةُ ». يَعْنِى الْمَدِينَةَ « أَلاَ هَلْ كُنْتُ حَدَّثْتُكُمْ ذَلِكَ ». فَقَالَ النَّاسُ نَعَمْ « فَإِنَّهُ أَعْجَبَنِى حَدِيثُ تَمِيمٍ أَنَّهُ وَافَقَ الَّذِى كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْهُ وَعَنِ الْمَدِينَةِ وَمَكَّةَ أَلاَ إِنَّهُ فِى بَحْرِ الشَّامِ أَوْ بَحْرِ الْيَمَنِ لاَ بَلْ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ ». وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى الْمَشْرِقِ. قَالَتْ فَحَفِظْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-. {الحديث: ٧٣١٢ = ٧٣٤٦ فم} :

عامیری كوڕی شەراحیلی ئەل‌شەعبی، كە لە خێڵی شەعبی، هەمدانە، نەوەك لە خێڵی شەعبی حیمیەر، فەرمووی: لە فاطیمەی كچی قەیسم پرسی، كە خوشكی ضەححاكی كوڕی قەیس بوو. فاطیمە خۆی (ڕەزای خودای لێ بێ) لەژنە كۆچكارە پێشینەكان بوو، پێیم گوت: فەرموودەیەكم پێ بفەرموو، كە بەخودی خۆت لە زاری پێغەمبەرت بیستبێ، نەوەك بیدەیتە پاڵ كەسێكی تر كە ئەو لە پێغەمبەری

بیستبێ‌و تۆیش لەو کەسەیەت بیستبێ. فاطیمە فەرمووی: باشە وادەکەم ئەگەر حەز لەشتی وادەکەی؟ منیش عەرزیمکرد: بەڵێ بفەرموو فەرموودەکەم پێ بڵێ.

فاطیمە فەرمووی: شووم کرد بە ئەبو حەفصی کوڕی عەمری کوڕی موغیرە، کە یەکێ بوو لەلاو خاسەکانی هۆزی قورەیشی ئەو رۆژگارە.

جا لە سەرەتای غەزایەکا، کە لەخزمەتی پێغەمبەردا بوو، ئەبو حەفصی مێردم پێکرا، لە دواییدا منی سێ بەسێ تەڵاقدا، کاتێ بێوەژن کەوتم، چەند کەسێ لە هاوەڵانی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) کە یەکێکیان عەبدورەحمانی کوڕی عەوف بوو خوازبێنییان کردم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) خوازبێنی کردم بۆ ئوسامەی کوڕی زەید، کە ئازادکراوی خۆی بوو، وەمن ئەم فەرموودەم بۆ باسکرابوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ منی خۆش دەوێ با ئوسامەیشی خۆش بوێ!). جا منیش کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵما کرد، عەرزیمکرد: کاروباری خۆم دایە دەستی تۆ، لەکێم مارە دەبڕی کەیفی خۆتە، ئەویش فەرمووی: (دە بگوێزەرەوە بۆ ماڵی ئوم شەریك!).

فاطیمە فەرمووی: ئوم شەریك ژنێکی ئەنصاری داراو دەوڵەمەند بوو، دارایی زۆری خەرج دەکرد لە ڕێگەی خودادا، هەمیشە ماڵیان پڕبوو لە میوان، فاطیمە فەرمووی: کاتێ ویستم بگوێزمەوە بۆ ماڵی ئوم شەریك، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رای گۆڕیبوو، فەرمووی: (نا، وامەکە، چونکە ماڵی ئوم شەریك قەرەباڵغە، هەمیشە پڕە لەمیوان، حەزناکەم کە سەرپۆشەکەت بەربێتەوە، یادامێنی کراسەکەت هەڵماڵێ‌و قاچ‌و قولت دەرکەوێ‌و پیاوی بیانی شوێنێکت ببینن، کە خۆت حەز بەدەرکەوتنی ناکەیت، بەڵام بچۆ بۆلای خزمەکەت کە عەبدوڵلای کوڕی عەمرە، کە عەبدوڵلا ناسراوە بە (ئیبنو ئوممی مەکتووم). بچۆ بۆلای ئیبنو ئوممی مەکتووم، لەوێ عیددە بگرە، کە پیاوێکی کوێرە لەبەنی فیهرە، لە فیهری قورەیش، لەو هۆزەیە کە فاطیمەیش هەر لەو هۆزەیە. جا گواستمەوە بۆلای ئەو، کاتێ حەیەم هەڵهات‌و عیددەی شەرعیم تەواو بوو، گوێم لێ بوو،

بانگەواز کەرێ بە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگەوازی هەڵدا (الصَّلاةَ جَامِعَةً) با نوێژ کۆمان بکاتەوە.

فاطیمە فەرمووی: جا منیش دەرچووم، ڕۆیشتم بۆ مزگەوت، لە ڕیزی ئافرەتدا، کە لەپشت ڕیزی پیاوانەوە دەست پێ دەکات، لەپشت پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژم بە کۆمەڵ، بە جەماعەت کرد. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لە نوێژەکە بۆوە ڕۆیشتە سەر دوانگەکەو لەسەری دانیشتو پێدەکەنی، فەرمووی: (با کەس لەجێگەی خۆی نەبزوێو جێگە نوێژەکەی بەجێ نەهێڵێ).

پاشان فەرمووی: (ئایا دەزانن کەمن لەبەرچی ئێوەم کۆکردۆتەوە؟) یاران فەرموویان: خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن!

فەرمووی: (بەخودا بۆ ئەوەم کۆنەکردونەتەوە کە بەتەمای شتێ بم یا مەترسیم لەشتێ هەبێ، بەڵام بۆیەکەم کۆکردوونەتەوە هەتا ئەم داستانە خۆشو سەیرو عەنتیکەو پڕ سوودەتان بۆ باس بکەم: تەمیمی داری کە جاران کابرایەکی نەصرانی بوو، ئێستا هاتووەو پەیمانی بەمن داوەو موسوڵمان بووە، داستانێکی لە بابەت جەجاڵەوە بۆم گێڕایەوە، ڕێکی ئەو قسەیەی کەمن دەربارەی جەجاڵ بۆ ئێوەم کرد. تەمیم قسەی بۆم کرد، کەجارێ خۆیو (٣٠) سی پیاو لە هۆزی لەخمو هۆزی جوزام، سواری پاپۆڕێکی گەورەی دەریایی دەبن، تا مانگێکی ڕەبەق شەپۆلی دەریا یارییان پێ دەکا، لە پاشا لە ناو دەریادا لەپەنا دوورگەیەکا، لەکاتی خۆرئاوا بووندا لەنگەر دەگرن، ئەوجا لەناو بەلەمەکانی گەمێکەدا دادەنیشنو دەڕۆن بۆ وشکانیو دەچنە ناو ئەو دورگەوە کە لەناو دەریاکەدا بوو، دەعبایەکی تووکنەی کوڵکنەی تیسکنەیان تووش دەبێ، لەبەر تیسکو کوڵکو مووی زۆر، سەرو قنگی لەیەکتر جیا نەدەکرایەوە! پێی دەڵێن: خانە خراپ! تۆ چیتو چی نیت؟ دەڵێ: من جەسساسەم، دەڵێن: ئەی جەسساسە چییە؟ (جەسساسە واتە: هەست هەڵگرو سووسەکەرو پێشقەرەوڵی جەجاڵ، بە زمانی ئەمڕۆ واتە: سکرتێر!). دەعباکە

دەڵێ: ئەی پیاو گەلینە! بڕۆن بۆلای ئەو پیاوە کەوا لەناو ئەو دیرەدایە، چونکە بەڕاستی ئەو ئەڵهای دەنگو باسی ئێوەیەتی!

تەمیم گوتی: جا کە ناوی پیاوی بۆمان هێنا، لەم جێگە پەڕو چۆڵو هۆڵەدا، مەترسیمان لێ نیشت کە ئەم دەعبایە شەیاتینی بێو تەرنێکمان پێ بدا، گوتی: ئینجا بە پەلە تێمان قوچان تاکوو چووینە ناو دێرەکەوە، لەوێ زەلامێکی فیلەتەنی زەبەللاحمان بینی، هەرگیزاو هەرگیز مرۆڤی کەتەی زلی وامان نەدیوە، زۆر توندو قایم پێوەند کرابوو، هەردوو دەستی کەلەپچە کرابوون بە ملیەوە شەتەك درابوون، لە ئەژنۆیەوە تا قولەپێی بە کۆتو زنجیر شەتەك درابوو، پێمان گوت: نەگبەت! تۆ چیت؟ گوتی: من ئەوەم کەوام لەبەر چاوتانو زوو یا درەنگ دەزانن کە من کێم، بەڵام پێم بڵێن کە ئێوە کێنو چین؟ گوتمان: ئێمە کەسانێکین لە عەرەب، سواری کەشتییەك بووین، وا ڕێکەوت دەریا ئاڵۆزا، ئیتر هەتا مانگێ شەپۆل بەملاو بەولادا دەیهێناینو دەیبردین، تا لە ئەنجاما پەنامان هێنا بۆ ئەم دوورگەی تۆیەو لەنگەرمان گرتو بە قایەخ دابەزین بۆ ناو دوورگەکەو تووشی دەعبایەکی تیسکنی موودار بووین، لەبەر تووكو كوڵكو موو، سەرو قنگی لەیەك جیا ناکرێتەوە، پێمان گوت: نەگبەت! تۆ چیت؟ گوتی: من قەرەوڵم، گوتمان: قەرەووڵی چیت؟ گوتی: بچن بۆلای ئەو کابرایە کەوا لەناو ئەو دێرەدا، چونکە ئەو ئەڵهای باسو خواسی ئێوەیەتی، ئیتر ئێمەیش بە پەلە هاتین بۆلای تۆو لەو دەعبایەیش ترساین نەبادا شەیاتینی بێ!!

جا زەبەللاحەکە گوتی: باسی باخە خورماکانی بەیسانم بۆ بکەن. گوتمان: مەبەستت لە چییەتی، لەچیی ئەو باخە دەپرسیت؟ گوتی: ئایا دارە خورماکانیان بەردەگرن؟ گوتمان: بەڵێ، بەردەگرن، گوتی: ئەدیی زۆری نەماوە کە بەر نەگرن. گوتی: باسی دەریاچەکەی تەبەرییەم بۆ بکەن. گوتمان: مەبەستت لە چییەتی؟ گوتی: ئایا ئاوی تیایە یانا؟ گوتمان: پڕە لە ئاو، گوتی: هاکا وشکی کرد، گوتی: باسی کانیاوەکەی شاری زوغەری شامم بۆ بکەن، گوتمان: مەبەستت لە چییەتی، لەچی

شتێکی دەپرسی؟ گوتی: ئایا کانیاوەکە ئاوەکەی وشکی نەکردووە؟ ئایا خەڵکەکەی شینایی‌و بەراوو شتی وا لەبەر ئاوەکەیدا دەکەن؟ گوتمان: ئا پڕە لە ئاوو خەڵکەکەیشی بەراوی لەبەردا دەکەن. گوتی: ئەی دەنگوباسی پێغەمبەری عەرەبە بێ سەوادە نەخوێندەوارەکان چییەو چی نییە، چی بەسەر هات‌و بوو بەچی؟ گوتمان: لە مەککە دەرچووە، ئێستا وا لەمەدینە، گوتی: پێم بڵێن: ئایا عەرەبەکان شەڕیان لەگەڵیدا کرد یانا؟ گوتمان: بەڵێ. گوتی: ئەنجامەکەی چی بوو؟ گوتمان: پێغەمبەرەکەیان سەرکەوت‌و ئێستا عەرەبەکانی دەوروبەری هەموو بەگوێی دەکەن‌و وان لەژێر رکێف‌و دەسەڵات‌و فەرمانی ئەودا، گوتی: ئاوەهای لێهات؟ گوتمان: بەڵێ، گوتی: ئەدیی ئەگەر بەگوێی بکەن ئەوە بۆ خۆیان باشە، با پێشتان بڵێم کەمن کێم، من جەجاڵم، زۆری نەماوە کە رێگەم بدرێ بۆ دەرچوون‌و بکەومە گەڕو چەرخە، کاتێ پەیدا دەبم دەکەومە چەرخە، بە وڵاتا دەسووڕێمەوە، لەماوەی چل شەودا هەموو شارو گوندێ دەچم، مەککەو طەیبەی لێ دەرچێ، بەڵام ئەم دوو شوێنەیە لەمن قەدەغەیە، هەرچەند کە بمەوێ بچمە ناو یەکێ لەم دوو شارەوە، فریشتەیێ شمشێری رووت بەدەستەوە بەرم لێ دەبڕێتەوەو ناهێڵێ کە بڕۆمە ناوی، سەرەڕای ئەوەیش هەموو رێگەو بان‌و کەلەبەرێکیان قۆڵێ فریشتەی لەسەرە ئیشکی دەگرێ!).

فاطیمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داردەستەکەی دەستی ژەند لە مینبەرەکەوەو فەرمووی: (ئەم خاکە، ئەم شارە طەیبەیە، ئەم خاکە، ئەم شارە طەیبەیە، واتە: مەدینەیە). ئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوەبوو منیش لەم بابەتەوەو سەبارەت بەم داستانە قسەم بۆتان کرد!).

خەڵکەکەیش گوتیان: بەڵێ قسەت کرد، فەرمووی: (بەڕاستی ئەم قسەیەی تەمیمم بەدڵ بوو، چونکە دەق رێکی ئەو قسەیەیە کەمن کردم بۆ ئێوە لەبابەت جەجاڵ‌و مەدینەو مەککەوە).

ئینجا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (دوورگەکە لە دەریای شام، یا لە دەریای یەمەندا نییە، کە دەکەونە لای خۆرئاواوە، وەك تەمیمو هاوڕێکانی وا تێگەیشتبوون، بەڵام بەبێ گومان ئەو دوورگەیە لەلای خۆرهەڵاتەوەیە!

حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات کرد کە لێرەوەیە.

فاطیمەی کچی قەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم فەرمایشتەم لەزاری پیرۆزی حەزرەت خۆیەوە (درودی خودای لەسەر بێ) لەبەرکردووە. {تاج/٥، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٥٦٠٥} + {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- جەسساسە پێکوڕەی جەجاڵە، هەندێ دەڵێن: دەعبا بن عەردیلەیە، کەپێی دەگوترێ: دابەتول ئەرض.

٢- دەریاچەی طەبەرییە لە فەرموودەی (٢٠٤٨)دا رابورد، لە فەتحولولهیمدا دەفەرموێ: (ئەم دەریاچەیە لە ئاوەدانیەکانی ئوردونە، کێوی طوور دەڕوانێ بەسەریدا، شاری طەبەرییە لەسەر ئەم دەریاچەیە، ئیمامی طەبەری، کە دانەری سێ موعجەمەکەیە بۆلای ئەم دەریاچەیە نیسبەت دەدرێ.

٣- ژیاننامەی (تەمیمی داری) لە ژمارە (١٢٠٩)دا رابورد. بڕوانە: تەجریدی بوخاری بە کوردی ژمارە (١١٤٥ = ٢٧٨٠ — فتح الباری) بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٢٧٧) چاپی یەکەم.

٤- فاطیمەی کچی قەیسی کوڕی خالیدی ئەل — فیهرییە، خوشکی ضەحاکی کوڕی قەیسە، ئافرەتێکی خانەدانی جوانو خانو مانو هۆشمەند بوو، هاوسەری ئوسامەی کوڕی زەید بوو، کاتێ فاطیمە چوو بۆ سەردانی ضەحاکی برای، لەو سەردەمەدا کە ضەحاك سەرۆك شاری کووفە بوو، لەسەردەمی موعاوییەدا، شەعبی ئەم داستانو چیرۆکی جەسساسەی لێوە ریوایەت کرد، کاتێ حەزرەتی عومەر شەهید بوو، لە ماڵی فاطیمەدا، ئەنجومەنی راوێژ، کە شەش کەس بوون،

کۆبوونەوە، لە ئەنجاما ئیمامی عوثمان کرا بە جێنشین لەپاش ئیمامی عومەر. فاطیمە دە ساڵ لە ضەححاکی برای گەورەتر بوو، لەژنە کۆچکارە دێرینەکان بوو، {بڕوانە: تاجول ئوصول بە کوردی، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٥٩٦ چاپی چوارەم، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٠ و ٢٢٨١ و ٢٢٨٢ وتارە ناودارەکانی دەستەی راوێژ (ئەهلی شوورا) لەدوا شەهیدبوونی عومەر، لە ماڵی فاطیمەدا دران، لەپاش تەڵاقدانی مێردی یەکەمی کە ئەبو عەمری کوڕی فەحص بوو، چەند کەسێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خوازبێنییان کرد بۆ خۆیان، وەك عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانو ئەبو جەهم، بەڵام پێغەمبەر پێی فەرموو کە شووبکا بە ئوسەمەی کوڕی زەید، فاطیمە قوڕەیشییە}.

٥- عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتووم، بانگدەرێکی ناسراوی پێغەمبەر بوو، نابینا بوو، لە موسوڵمانە دێرینەکانی مەککە بوو، کۆچی کرد بۆ مەدینە، هەندێ دەڵێن: لەگەڵ موصعەبی کوڕی عومەیردا کۆچی کردووە، لەپێش تەشریف هێنانی پێغەمبەردا بۆ مەدینە، لەدارولقوڕڕاء دادەنیشت، لە زۆرینەی غەزاکانیدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچوو بۆ غەزا، ئەم عەبدوڵڵایەی دەکرد بە جێنشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە، عەبدوڵڵا لەو ماوەیەدا هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە غەزاکە دەگەڕایەوە، ئەو بەرنوێژی بۆیان دەکرد، لە ئیصابەدا شێخی عەسقەلانی، لە کۆمەڵێ لە نووسەرانی زانستی نژادو ژیننامەکانەوە راگوێز دەکا: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە سیازدە غەزادا، ئیبنو ئوم مەکتوومی کردووە بە جێنشینی خۆی لەسەر شاری مەدینە، وەك غەزای ئەبواءو بواطو ذیلعەسیرەو سووەیقو غەطەفانو ئوحودو حەمرائول ئەسەدو نەجرانو ذاتوریقاعو چوونی بۆ حەجی ماڵئاواییو ئەو غەزایەی کەچوو بەشوێن (کرز بن جابر)دا دەگەڕا، ئەم عەبدوڵڵایەیە، کە خودا لە سوورەتی (عَبَسَ)دا باسی کردووەو دەفەرموێ: {عَبَسَ وَتَولَّى، أن جاءَهُ الْأعْمَى}. {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٢٧، ٤٢٨ + تاج/٤، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٣٨١٣ + تاج/٤، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٤٢٠١ — سوورەتی عەبەسە}

٢٠٥٥- عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ إِلاَّ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ وَلَيْسَ نَقْبٌ مِنْ أَنْقَابِهَا إِلاَّ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ صَافِّينَ تَحْرُسُهَا فَيَنْزِلُ بِالسَّبَخَةِ فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ يَخْرُجُ إِلَيْهِ مِنْهَا كُلُّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ ». {الحديث: ٧٣١٦ = ٧٣٥٠ فم، تجريد البخاري بالكوردي = الترجمة الكردية، الرقم: ٨٦٦ = ١٨٨١، ٧١٢٤، ٧١٣٤، ٧٤٣٤. تحفة الأشراف: ١٧٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو ولاتێ، مەککەو مەدینەی لێ دەرچێ، هەموو ڕێو بانەکانی شاری مەدینە، فریشتە لەسەریان ریز بوون ئێشکیان دەگرن، جەجاڵ خۆیو کۆمەڵەکەی دێن کە بچن بۆ مەدینە، لەبەر فریشتە ڕێگەیان نابێ، لەبەرئەوە لە شۆرەکاتەکەی نزیکی مەدینە بارو بنەیان لێ دەخەن، کە ئەو شۆرەکاتە پێی دەگوترێ سەبەخەتولجورف، وا لەرووی شامەوە. ئەوجا شاری مەدینە، سێجار دەهەژێو دانیشتووەکانی رادەوەشێنێو سێ لەرزە دەکا، جا لەسەری جاری سێیەما ئیتر هەرچی کافرو مونافیقە کەوان لەناو شاری مەدینەدا، بەهۆی ئەو سێ بوومەلەرزەیەوە، خودا لە مەدینە دەریان دەچێنێو، دەچن بۆلای جەجاڵ، ناو شاری مەدینە تەنیا هەر موسوڵمانی پاکی تیادا دەمێنێ، ئەوانیش جەجاڵ زیانیان پێ ناگەیەنێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤١، ژمارە: ١٧٣٨} + {تاج/٥، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٥٦٢٣، ٥١٢٤ — جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو شارێ} + {تاج/٢، زنجیرە: ١٤١، ژمارە: ١٧٣٨} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨١١}.

## ١٥٧١) حەفتا هەزار كەس لە جوولەكەی ئەسپەهان شوێن جەجاڵ دەكەون.
(٧٣١٨ - ٧٣٢٥)

## بَابٌ: يَتْبَعُ الدَّجَّالَ مِنْ يَهُودِ أَصْبَهَانَ سَبْعُونَ أَلْفاً

٢٠٥٦- عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « يَتْبَعُ الدَّجَّالَ مِنْ يَهُودِ أَصْبَهَانَ سَبْعُونَ أَلْفًا عَلَيْهِمُ الطَّيَالِسَةُ ». {الحديث: ٧٣١٨ = ٧٣٥٢ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەفتا هەزار کەس لە جوولەکەی ئەسپەهان دوای جەجاڵ دەکەون، هەموو تەیلەسانیان لەبەردایە). {تاج/٥، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ٥٦٠٦ - جەجاڵ لە خۆرهەڵاتەوە سەر هەڵ دەدا...} . {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨١٢} .

**١٥٧٢) خەڵك لەتاو جەجاڵ ڕەودەکەن بۆ کێوەکان، لەو ڕۆژگارەدا عەرەب کەم دەبن. (٧٣١٨ - ٧٣٢٥) بَابٌ: فِي فِرَارِ النَّاسِ مِنَ الدَّجَّالِ فِي الجِبَالِ وَقِلَّةُ العَرَبِ**

٢٠٥٧- عن أُمُّ شَرِيكٍ أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِىَّ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « لَيَفِرَّنَّ النَّاسُ مِنَ الدَّجَّالِ فِى الْجِبَالِ ». قَالَتْ أُمُّ شَرِيكٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَأَيْنَ الْعَرَبُ يَوْمَئِذٍ قَالَ « هُمْ قَلِيلٌ ». {الحديث: ٧٣١٩ = ٧٣٥٣ فم} :

ئوم شەریك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو خەڵکە لەتاو جەجاڵ هەڵ دێن، تەنانەت لە تاوانا پەنا دەبەنە بەر کێوەکان!).

منیش عەرزیمکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! لەو ڕۆژو سەردەمەدا عەرەب لەکوێن؟ فەرمووی: (لەو ڕۆژەدا عەرەب زۆر کەمن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٣٥٥٩ — پایەی عەرەبو بەڕێزی...}+{ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨١٣} .

**١٥٧٣) لەو حەلەوە کە خودا ئادەمی دروست کردووە، هەتا ئەو دەمە کە قیامەت هەڵ دەستێ، ئاژاوەی گەورەی وەك جەجاڵ نەبووەو نەدەبێ. (٧٣١٨ = ٧٣٢٥) بَابٌ: مَا بَيْنَ خَلْقِ آدَمَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ خَلْقٌ أَكْبَرُ مِنَ الدَّجَّالِ**

٢٠٥٨- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ عَنْ رَهْطٍ مِنْهُمْ أَبُو الدَّهْمَاءِ وَأَبُو قَتَادَةَ قَالُوا كُنَّا نَمُرُّ عَلَى هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ نَأْتِى عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ فَقَالَ ذَاتَ يَوْمٍ إِنَّكُمْ لَتُجَاوِزُونِى إِلَى رِجَالٍ مَا كَانُوا بِأَحْضَرَ لِرَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مِنِّى وَلاَ أَعْلَمَ بِحَدِيثِهِ مِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « مَا بَيْنَ خَلْقِ آدَمَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ خَلْقٌ أَكْبَرُ مِنَ الدَّجَّالِ ». {الحديث: ٧٣٢١ = ٧٣٥٥ فم} :

حومەیدی كوڕی هیلال فەرمووی: كۆمەڵێ گێڕایانەوە بۆم كە لە تابیعین بوون (ڕەزای خودایان لێ بێ) كە یەكێكیان ئەبو دەهماو یەكێكیان ئەبو قەتادە بوو، دەیانگوت: بەسەر هیشامی كوڕی عامیردا تێ دەپەڕین و دەچووین بۆلای عیمرانی كوڕی حوصەین (ڕەزای خودایان لێ بێ) ڕۆژێ لەڕۆژان هیشام فەرمووی: ئێوە بەسەر مندا ڕەت دەبن و دەچن بۆلای بازێ پیاو كە ئەو زاتانە، نە لەمن زیاتر لە خزمەتی حەزرەتدا بوون و نە لەمنیش زیاتر ئاگایان لە فەرموودەی ئەو زاتەیە (دروودی خودای لەسەر بێ).

هیشام فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەو حەلەوە كە خودای گەورە ئادەمی دروست كردووە، تا ئەو چركە ساتە كە قیامەت هەڵ دەستێ، ئاشووب و فەرتەنەو ئاژاوەی گەورەی وەك جەجاڵ نەبووەو نەدەبێ. واتە: جەجاڵ گەورەترین فیتنەو فەرتەنەیە). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٥٦٢١ — نیشانەكانی جەجالە كۆرە...} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨١٤}.

**ڕوونكردنەوە:**

هیشامی كوڕی عامیری كوڕی ئومەییەی ئەنصاری، خۆی و باوكی هاوەڵی پێغەمبەر بوون، عامیر باوكی هیشام لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو، لەگەڵ كۆمەڵێ شەهیدی تردا لەیەك گۆڕدا نێژران، بەڵام عامیر خرایە رووی قیبلەوە چونكە قورئانی زۆرتر لەبەربوو، لە شەڕی ئوحوددا ئازایی و پاڵەوانییەكی زۆری نواند، هەتا شەهید بوو. هیشام لە بەصرە دادەنیشت، هەتا سەردەمی زیاد ما، فەرموودەی لە موسلیمدا هەیە، بەڵام لە بوخاریدا فەرموودەی نییە. عەرزی ئەبو هورەیرە كرا كە عامیر لە غەزای ئوحوددا خۆی فڕەداوەتە ناو ئاگری جەنگەوەو شتی وایش باش نییە، بەپێی ئایەتی: {وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ}.

ئەبو هورەیرە فەرمووی: بەڵكوو بە پێچەوانەوە عامیر كاری بەم ئایەتەی تر كردووە كە دەفەرموێ: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ}.

واتە: کەسانی بۆ خودا لێبڕاوی وەها هەن، گیانی خۆیان دەخەنە سەر سەواو دەیفرۆشن بەخودا، لە پێناوی بەدیهێنانی ڕەزامەندی خوادا).

## ١٥٧٤) عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئاسمان دێتە خوارەوە خاچ دەشکێنێ‌و بەراز دەکوژێ. (٣٨٧ - ٣٩٣)

## بَابٌ: نُزُولُ عِيسى عَلَيْهِ كالسَّلاَمُ وَكَسْرُ الصَّلِيبِ وَقَتَلُ الخنزير

٢٠٥٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « وَاللَّهِ لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلاً فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلاَصُ فَلاَ يُسْعَى عَلَيْهَا وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلاَ يَقْبَلُهُ أَحَدٌ ». {الحديث: ٣٨٩، ٣٩٢ = ٤٠٣ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٣٧٤ = ٣٤٤٩، ٢٤٧٦، ٣٤٤٨} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەخودا هیچ گومانی تیادا نییە، کە لەئاخر زەمانا، عیسای کوڕی مەریەم (سڵاوی خودا لە خۆی‌و لە دایکی) لە ئاسمان دێتە خوارەوە بۆ ناوتان، پێشەواکەتان لە خۆتانە کە موحەممەدی مەهدییە، عیسا لەناوتانا ئەی گەلی ئیسلام! دەبێ بەداد پرسێکی داد پەروەرو بە ناوبژیوانێکی هەقانی، بەپێی یاسا نامەی خودا، کە شەریعەتی ئیسلامە، لەنگەری حەق‌و عەدالەت‌و داد رادەگرێ، بەڵام وەك فەرمانداری لە فەرماندارانی ئەم گەلی ئیسلامە، نەك وەك پێغەمبەرێ کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بسڕێتەوەو ئایینێ تر لە جێگەی دابنێ، بەڵکوو ئەویش ئایینی پیرۆزی ئیسلام قەبووڵ دەکا، لەبەرئەوە خاچ (صەلیب) دەشکێنێ‌و خاچ پەرستی قەدەغە دەکاو بەس ئایینی ئیسلام لە خەڵك قەبووڵ دەکاو، بەراز دەکوژێ‌و، سەرانە هەڵ دەگرێ، چونکە بێباوەڕ یا دەبێ موسوڵمان بێ یا دەیکوژێ!

وە لەبەر زۆری‌و لێشاوی سامان‌و لەبەرئەوە کە کەس دڵی بەدنیا خۆش نابێ لەبەر نزیکەوە بوونی قیامەت، لەبەر ئەم هۆیانە ماڵ‌و سامان وەها دەبێزرێ کەس لێی ناپرسێ، وشتری گەنج کە باشترین سامانە بەرەڵڵا دەکرێ‌و لەبەر زۆری ماڵ

کەس کاری پێی نییە، لەلایەکی تریشەوە لەو سەردەمەدا، قینەبەریو رقە بەریو بەخیلی نامێنیو دوژمنایەتیو حەسوودی نامێنێ، عیسا (دروودو سلاوی خودای لێ بێ) خەڵك گاز دەکا کە سامانو ماڵیان پێ بدا، بەلام کەس نایەوێو وەری ناگرێ!).
{تاج/٥، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٣/٥٦٢٩ – پاشەکی...}.

٢٠٦٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ ». فَقُلْتُ لاِبْنِ أَبِى ذِئْبٍ إِنَّ الأَوْزَاعِىَّ حَدَّثَنَا عَنِ الزُّهْرِىِّ عَنْ نَافِعٍ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ « وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ ». قَالَ ابْنُ أَبِى ذِئْبٍ تَدْرِى مَا أَمَّكُمْ مِنْكُمْ قُلْتُ تُخْبِرُنِى. قَالَ فَأَمَّكُمْ بِكِتَابِ رَبِّكُمْ وَسُنَّةِ نَبِيِّكُمْ. {الحديث: ٣٩٢ = ٤٠٦ تجريد/٤، لاپەڕە: ٦٠، رقم: ١٣٧٦ = ٣٤٤٩ فتح البارى}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو کاتەی کە عیسای کوڕی مەریەم، لە ئاسمانەوە دێتە خوارێ بۆ ناوتانو پێشەواییتان بۆ دەکا، دەشێ ئەو ڕۆژگارە ئێوە حاڵتان چۆن بێ؟؟).

وەلیدی کوڕی موسلیم کە مامۆستای مامۆستای شێخی موسلیمە فەرمووی: عەرزی مامۆستاکەی خۆمم کرد کە ئیبنو ئەبی ذیئبە: (تۆ ئەم ڕستەیە ئاوا دەگێڕیتەوە: (فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ) بەلام ئیمامی ئەوزاعی لە ئیمامی زوهرییەوە، لە نافیعەوە لە ئەبو هورەیرەوە ئاوا گێڕایەوە بۆمان: (وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ). واتە: (ئەو سەردەمە کە عیسا لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە بۆ ناوتان، پێشەواکەتان کە موحەممەدی مەهدییە لە خۆتانە کە گەلی ئیسلامن، دەبێ ئەو کاتە ئێوە حاڵتان چۆن بێ؟). وەلید فەرمووی: کە ئەم پرسیارەم لە ئیبنو ئەبی ذئیب کرد، فەرمووی: ئایا دەزانی کە (أَمَّكُمْ مِنْكُمْ) واتای چییە؟ گوتم بفەرموو پێم بڵێ واتای چییە، فەرمووی: واتە: بەپێی قورئانی نامەی خودای گەورەو بە پێی سوننەتی پێغەمبەر، پێشەواییتان بۆ دەکاو ولات دەبا بەڕێوە). {تاج/٥، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٥٦٢٨ - پاشەکی} + {تاج/٥، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٥٦٢٧ – پاشەکی (پایانی - خاتیمەیێ)}.

٢٠٦١- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قال: سَمِعْتُ النَّبِىَّ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ: « لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِى يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ – قَالَ: فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ - عليه السلام- فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ: تَعَالَ صَلِّ لَنَا. فَيَقُولُ: لاَ. إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءُ. تَكْرِمَةَ اللَّهِ هَذِهِ الأُمَّةَ ». {الحديث: ٣٩٣ = ٤٠٧ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کۆمەڵێ لە ئۆمەتم هەر خەبات دەگێڕن‌و بە ئاشکراو بەبێ پەروا لە پێناوی هەق‌و ڕاستیدا، هەر جەنگ دەکەن‌و خودایش هەر سەریان دەخا بەسەر دوژمنی خۆیاندا، تا نزیکی ڕۆژی قیامەت).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا کاتێ عیسای کوڕی مەریەم (دروودی خودا لە خۆی‌و لە دایکی) لە ئاسمان دێتە خوارێ، فەرمانڕەوای ئەو کاتەی موسوڵمانان، کە موحەممەدی مەهدییە عەرزی عیسا دەکا: وەرە تۆ پێش بکەوەو بەر نوێژییەکەمان بۆ بکە. عیسایش (سڵاوی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: نا من بەرنوێژیتان بۆ ناکەم، خۆت پێش نوێژییان بۆ بکە، چونکە ئێوە کە گەلی موحەممەدن، خۆتان لەناو خۆتاندا، فەرمانبەرو فەرمانڕەوای یەکترین‌و دەشێ ئیمام‌و بەرنوێژو پێشەواو ئەمانەتان لەخۆتان بێ، ئەمە بڕیاری خودایەو کردوویەتی بە دەستی ڕێزو قەدرو لەم ئۆمەتەی ناوە). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٦٠٢ – کۆمەڵێ لە موسوڵمانان....}.

## ١٥٧٥) من‌و قیامەت وەك ئەم دوو پەنجەیەم ئاوا بەرودوا هاتووین. (٧٣٢٨ - ٧٣٣٩)
## باب: بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ هكذا

٢٠٦٢- عَنْ سَهْل بن سعد (رضي الله عنهما) قال: سَمِعْتُ رسول الله -صلى الله عليه وسلم- يُشِيرُ بِإِصْبَعِهِ الَّتِى تَلِى الإِبْهَامَ وَالْوُسْطَى وَهُوَ يَقُولُ « بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ هَكَذَا ». {الحديث: ٧٣٢٩ = ٧٣٦٣ فم. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٧١٢ = ٤٩٣٦، ٥٣٠١، ٦٥٠٣}:

ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا، کە ناسراوە بە پوختەی صەحیحی بوخاری ئاوایە: سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم چاوم لێ بوو، کە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەی ناوەڕاستیو پەنجەی شایەتمانی ئاوا پێکەوە جووتکردو ئاراستەی یارانی خۆی کردنو فەرمووی: (منو قیامەت وەك ئەم دوو پەنجەیە، ئاوا دوا بە دوای یەك هاتووین‌و، من دوا هەمێنی پێغەمبەرانم‌و لەدوای من هەتا قیامەت هەڵ دەستێ پێغەمبەری تر نابێ!). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٢٠٠ — سوورەتی نازیعات} + {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٥٧ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

## ١٥٧٦) هاتنی قیامەت زۆر نزیکە (٧٣٢٨ - ٧٣٣٩)

## باب: في تقريب قيام السَّاعَة

٢٠٦٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ: مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- هُنَيْهَةً ثُمَّ نَظَرَ إِلَى غُلاَمٍ بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ أَزْدِ شَنُوءَةَ فَقَالَ: « إِنْ عُمِّرَ هَذَا لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ ». قَالَ: قَالَ أَنَسٌ بن مالك، ذَاكَ الْغُلاَمُ مِنْ أَتْرَابِي يَوْمَئِذٍ. {الحديث: ٧٣٣٧ = ٧٣٧١ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: قیامەت کەی هەڵ دەستێ؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەنێ بێ دەنگ بوو، پاشان سەرنجی کوڕێکی هەرزەکاری دا کە لە هۆزی ئەزدی شەنوئە بوو، لەبەردەمیا بوو: ئەوجا فەرمووی: (ئەگەر ئەم منداڵە بژیو نەمرێ، بەرلەوە پیر ببێ قیامەتی ئێوە هەڵ دەستێ). واتە: هەتا ئەو حەلە زۆرینەتان دەمرن. فەرمووی: ئەنەس فەرمووی: (ئەو کوڕە ئەوکاتە لە تەمەنی منابوو). ئەنەس ئەو کاتە تەمەنی (١٧) حەڤدە ساڵ بووە. {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٥٨}.

٢٠٦٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: كَانَ الأَعْرَابُ إِذَا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- سَأَلُوهُ عَنِ السَّاعَةِ مَتَى السَّاعَةُ؟ فَنَظَرَ إِلَى أَحْدَثِ إِنْسَانٍ

مِنْهُمْ فَقَالَ: « إِنْ يَعِشْ هَذَا لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ قَامَتْ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ ». {الحديث: ٧٣٣٥ = ٧٣٦٩ فم. تجريد البخاري/٥، رقم: ٢٠٢٥ = ٦٥١١ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٦٨٣٥}:

**عائیشه** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی:** دەستووری عارەبە سارا نشینەکان وابوو، کە دەهاتن بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری قیامەتیان لێ دەکردو دەیانگوت: کەی قیامەتە؟ ئەویش تەماشای منالترینیانی دەکردو دەیفەرموو: (ئەگەر ئەم مرۆڤە بژی پیر نابێ کە ئێوە دەمرن‌و قیامەتتان هەڵ دەستێ). واتە: جیهان بە نیسبەت ئێوەوە تەواو دەبێ‌و دەڕۆن بۆ ئەو جیهان). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٥٥٥٨}.

**١٥٧٧) قیامەت لەپڕ هەڵدەستێ، هەیە وشترەکەی دەدۆشێ، بەڵام فریا ناکەوێ ئەو شیرە بخواتەوە قیامەت هەڵدەستێ!** (٧٣٢٨ - ٧٣٣٩)

**بَابٌ: تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرَّجُلُ يَحْلُبُ اللِّقْحَةَ فَمَا يَصِلُ إِلَى فِيهِ حَتَّى تَقُومَ**

٢٠٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرَّجُلُ يَحْلُبُ اللِّقْحَةَ فَمَا يَصِلُ الإِنَاءُ إِلَى فِيهِ حَتَّى تَقُومَ وَالرَّجُلاَنِ يَتَبَايَعَانِ الثَّوْبَ فَمَا يَتَبَايَعَانِهِ حَتَّى تَقُومَ وَالرَّجُلُ يَلِطُ فِي حَوْضِهِ فَمَا يَصْدُرُ حَتَّى تَقُومَ ». {الحديث: ٧٣٣٩ = ٧٣٧٣ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەحمەتی خودای لێ بێ) **فەرمووی:** **خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (قیامەت لەپڕ روودەدا، رێ دەکەوێ پیاوێ وشترەکەی دەدۆشێ‌و دەیکاتە جامێکەوە، جامە شیرەکە دەبات بۆ دەمی کە بیخواتەوە، بەڵام ناگاتە دەمی کە قیامەت هەڵدەستێ‌و فریا ناکەوێ کە بیخواتەوە! یا رێ دەکەوێ دوو پیاو کەل‌و پەلو تۆپە کوتاڵی خۆیانیان بڵاو کردۆتەوە لەبەینی خۆیانا، بەڵام فریای ئەوە ناکەون کە سەوداکەی ببڕنەوە، یا بیپێچنەوە کتوپڕ قیامەت بەرپادەبێ، پیاوی واهەیە خەریکە ئەستێڵەکەی سواخ دەداو میرازی دەکا، لەناکاو قیامەت هەڵدەستێ‌و فریاناکەوێ کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەی!).

## ١٥٧٨) نێوانی دوو فووەکە چلە، جەستەی مرۆڤیش هەمووی دەڕزێ نووکی بێخی جووجکەی سمتی نەبێ. (٧٣٤٠ - ٧٣٤٢)

## بَابٌ: مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ وَيبلى الإنسان إلا عجْب الذنب

٢٠٦٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ ». قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالُوا أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالُوا أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ « ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ ». قَالَ: « وَلَيْسَ مِنَ الإِنْسَانِ شَىْءٌ إِلاَّ يَبْلَى إِلاَّ عَظْمًا وَاحِدًا وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ». {الحديث: ٧٣٤٠ = ٧٣٧٤ فم. تجريد البخاري/٤، رقم: ١٦٩١ = ٤٨١٤، ٤٩٣٥. تحفة الأشراف: ١٢٥٠٨}:

ئەبو هورەیرە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەم فوو هەتا ئەو فوو چلە!). یاران گوتیان: ئەی ئەبو هورەیرە! مەبەست لەماوەی نێوانی دوو فووەکە، کە ناسراون بە نەفخەتەین، نەفخەی یەکەمو نەفخەی دووەم، مەبەست لەبەینی ئەم دووانە، کە ئەم فەرموودەیە ئاماژەی بۆ دەکا چل ڕۆژە؟ گوتی: نازانم. گوتیان: ئەی مەبەست چل مانگە؟ گوتی: نازانم. گوتیان: ئەی مەبەست چل ساڵە؟ گوتی: نازانم، چونکە من ژمێردراوەکەم لە حەزرەت نەبیستووە کە چییە، لەخۆمەوە ناتوانم بڕیاربدەم کە ڕۆژە، مانگە، ساڵە، چییە، یا هەفتەیە، یا چی ترە. فەرمووی: (جا خودای گەورە کاتێ دەیەوێ مردووەکان زیندوو بکاتەوە لە ئاسمانەوە بارانێ دەبارێنێ، ئیتر بەو بارانە جەستەی مردووەکان سەرلەنوێ هەموو دەڕوێنەوە، هەروەك چۆن دانەوێڵە بە باران دەڕوێ ئاوا). {ژمارە: ٢٠٥٢ لەپێشەوە رابورد}.

هەروەها حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەشو ئەندامو هەموو پارچەو شتەکانی جەستەی مرۆڤ دەڕزێ، نووکی بێخی جووجکەی سمتی نەبێ، کە بەقەد دەنکە خەرتەلەیێ دەبێ، ئەو ناڕزێ، لە ڕۆژی قیامەتا لەوێوە فریشتەکان بە فەرمانی خودا سەرلەنوێ هەموو کەسێ، وەك حاڵی ژیانی لەو ئێسکەوە دروست دەکەنەوە). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٤٠٧٦}.

### ١٥٧٩) ژنان خراپترین ئاژاوەو ئاشووبن بۆ پیاوان. (٦٨٧٢ - ٦٨٨٣)
### بَابٌ: أَضَرُّ فِتْنَةِ الرِّجَالِ النِّسَاءُ

٢٠٦٧- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَسَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ أَنَّهُمَا حَدَّثَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ: « مَا تَرَكْتُ بَعْدِى فِى النَّاسِ فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ ». {الحديث: ٦٨٨١ = ٦٩٠١ فم. تجريد البخاري/٥، رقم: ١٧٥٢ = ٥٠٩٦ فتح الباري} :

ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثەو سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموویان: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەپاش مردنی من، خراپترین ئاژاوەو ئاشووب لەناو ئومەتما، ئاژاوەو فیتنەی ژنانە بۆ پیاوان!). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٧، چ/٤ = چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٤٦٨} .

### ١٥٨٠) هۆشیاری لەبارەی تەفرەی ژنانەوە. (٦٨٧٢ - ٦٨٨٣)
### بَابٌ: التحذيرُ مِنْ فِتْنَةِ النِّسَاءِ

٢٠٦٨- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ: « إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ وَإِنَّ اللَّهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِى إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِى النِّسَاءِ ». {الحديث: ٦٨٨٣ = ٦٩٠٣ فم} :

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕاستە کەجیهانو سامانی جیهان، میوەیەکی سەوزی دلگیری شیرینو خۆشە، کەس لەمە لاری نییە، بەلام بەلاشو حەلاش نییەو لێپرسینەوەی هەیە، چونکە خودا چین لەدوای چین، ئێوە دەکا بە جێگەداری پێشینان تیادا، هەتا بڕوانێ کە کردارو ڕەفتارتان چۆنەو چۆن نییە، کەواتە هۆشیاربنو پارێز لە تەڵەو داوو تۆڕەکانی جیهان بکەن، هەروەها هۆشیاربنو ئاگاداری خۆتان بن، نەکەونە ناو داوی ژنان، چونکە یەکەم ئاشووبو ئاژاوەیێ کە نەوەی ئیسرائیل دووچاری بوون،

ئـەوەبوو کەوتنـە نـاو داوی ژنانـەوە!). {ریـاض/٢، زنجـیرە: ٥٥، ژمـارە: ٤٥٩} + {ریاض/١، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٧٠}.

**روونکردنەوە:**

پوختەی نامەی ئاژاوەو ئاشووبەکان بەپێی ریزی فەرموودەکان.

١- یـەئجووجو مـەئجووج هـۆزێکن لـەپێش هەڵسـانی قیامەتـدا پەیـدادەبن، هەقیقـەتێکی قورئـانین، ئینکارییـان کـوفرە، چـونکە ئینکـاری حەقیقـەتێکی قورئانییە، بەڵام بۆچوونو تەئویلاتی زۆر هەیە لەبارەیانـەوە، بەهـەرحاڵ کۆمـەڵێ فـەرموودەی راستو دروست لـە صـەحیحی موسلیمو لـە صـەحیحی بوخـاریو لـە پەڕاوەکانی سوننەنو مەسانیدەکاندا هەیـە، کـە جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکـەن کـە سەرهەڵدانو پەیدا بوونو دەرچوونی یـەئجووجو مـەئجووج، یەکێکـە لـە نیشـانەو ئاژاوەکانی نزیکبوونەوەی قیامەت. {بڕوانە: ژمارە: ٢٠٤٨} لـەم پـەڕاوە پیرۆزە. لـە مونجیددا دەڵێ: {یأجوج ومـاجوج هُمَـا العَـدُوَّانِ اللَّـذَانِ یُهَاجِمَـانِ تُبَّـاعَ المَسِیح في آخـر الزَّمَـانِ عَلَى مَا ذَكَرَتْ أَسْمَفَارُ الكتابِ المقَدس}.

٢- یـەکێکی تـر لەنیشـانەکانی نزیکبوونـەوەی قیامـەت نـەمانی ئەمانەتـەو مەردووم متمانەیان پێ ناکرێو ناپـاکیو دەست پیسیو فـڕو فێڵو دەست بـڕینو فـرتو فـێڵ زۆر دەبـنو دەبـن بەخوویـەکی سروشـتی لـەناخی دڵو دەروونـی جەماوەرو عەشاماتەکەدا وەك ئێستا.

٣- پایتـەختی شـەیتان نـاو قـوڵایی دەریـا گەورەکانـە، گـەورەترین دەسـتکەوتو سەرکەوتن، لەلای شەیتان، ئاژاوەی ناو خێزانو تێکدانی نێوانی ژنو مێردە.

٤- فیتنەو ئاژاوە گـەورەو بچووکیان هەیـە، خـودا بمانپـارێزێ لەهـەموو جـۆرە ئاژاوەیێ. ئامین.

٥- پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئامـاژەی کـردووە بـۆ کۆمـەڵێ فـەرموودە، یـەکێ لەوانـە: (گـەلێ موسـوڵمان کوێرانـە تەقلیـدی گـاورو جوولەکـەو کافرەکـان دەکـەنو بەبێ سێو دوو ئەوان چی بکەن ئەوانیش دەیکەن!).

ئێستا ئێمە ئەمە بەچاوی سەر دەبینین، لاسایی ئەوروپاو رۆژئاوا، ئاواتی گەورەی چینی بەناو رۆشنبیری ئەم سەردەمەی ئێمەیە، ئەم هەموو هۆکارە بەهێزانەی راگەیاندنو ئەم هەموو میدیایانە، کۆمەڵێ موراهیقو مێرد منداڵو کورو کاڵ دەیانبەن بەرێوە، بە کاڵی، بە کوڵاوی، بەشەو، بە رۆژ، بە گوتن، بە نووسین، بە وێنە، شەوو رۆژ گەندەڵی رەوشتی پەخش دەکەنەوە، بەهەموو جۆرێ، دەیانەوێ کە لاسایی بەرەڵایی‌و بەد رەوشتی ئەوروپا بکەنەوەو، بێجگە لەمەیی‌و بادەو یارو پارەو پول‌و رابواردن، یارو یاوەری تریان نییە.

٦- گەورەترین ئاژاوەی نێوانی موسوڵمانان شەڕی برا کوژی‌و خۆ خۆری‌و بێگانە پەرستییە، زۆرینەی کات ئەوانەی لە شەڕی برا کوژیدا دەکوژرێن، بکوژو کوژراو هەردوولا دۆزەخین.

٧- شەڕو شۆڕو کوشت‌و بڕی زۆرو ئارەق خواردنەوەو بومە لەرزەو بێ ئەدەبی ژنان‌و زۆر شتی تری لەم بابەتانە، کە ئێستا زۆریان رویان داوە، نیشانەی نزیکبوونەوەی قیامەتن.

٨- لەناو گەلی ئیسلاما جارێ تر بت پەرستی سەر هەڵدەداتەوەو لات‌و عوززا دەپەرسترێنەوە.

٩- هەتا ماوەیێ ناوی خودا بەهەموو زمانێ لەسەر رووی زەوی بەگشتی دەسڕێتەوە، کەسێ نابێ لەسەر روی زەوی بەهیچ شێوەیێ، وە بەهیچ زمانێ ناوی خودا بهێنێ.

١٠- پێغەمبەرە درۆزنە لەپێش قیامەتا زۆردەبن.

١١- شەڕێکی گەورە لەنێوان موسوڵمانان‌و جوولەکەدا دەقەومێ، لە ئەنجاما جوولەکەکان زۆر بە پیسی دەشکێن‌و قەڵاچۆ دەکرێن‌و کەس پەنایان نادەن، تەنانەت دارو بەردو درەخت‌و بنچکیش حاشا لە جوولەکە دەکەن‌و لێیان دەبن بە ملۆزم‌و شایەتییان لێ دەدەن.

١٢- لەكاتی هەڵسانی قیامەتدا، میلەتی گاور، کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ناسراون بە رووم، لەهەموو میللەتەکانی تر زۆرتر دەبن، وە ئێستا ئەمە وایە.

١٣- ئازادکردن و رزگارکردنی قوستەنتەنییە یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی هەڵسانی قیامەت.

١٤- شوێنەواری ئیسلام تەواو کوێر دەبێتەوە، هیچ دین و ئایینێ نامێنێ، تەنانەت کەعبەیش دەڕوخێ و مزگەوت و کەنیسەو پەرستگا نامێنێ.

١٥- نیشانە هەرە گەورەکانی هاتنی قیامەت: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە. دەجال. دابەتولئەرض. هاتنە خوارەوەی عیسا. هاتنی یەئجووج و ماجووج.

١٦- داستانی سەیری ئیبنو صەییاد، کە دەڵێن: دەبێ بە جەجاڵ.

١٧- جەجاڵ ئێستا لە دوورگەیەکە، لە دەریادا زیندانەو بەند کراوە، سکرتێرەکەی ناوی (جەسساسە)یە گەورەترین فیتنە لە جیهانا جەجاڵە.

١٨- کە عیسا دێتە خوارەوە بێجگە لە ئیسلام هیچ دینێ لەکەسی تر قەبووڵ ناکا.

١٩- عیسا لە ئاخر زەمانا خاچ پەرستی قەدەغە دەکا، خاچ دەشکێنێ، بەراز قەلاچۆ دەکا، سەرانە هەڵدەگرێ، ئاژەڵ و مالات باوی نامێنێ!



# ٥٦- نامەی نەویستی (زوهد)و گوێ بە جیهان نەدان‌و دڵ لاوێنەکان

## كِتَابُ الزُّهْدِ وَالرِّقَاقِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول، وەرگەڕاوە کوردییەکەی، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٩٤، لە ژمارە: ٥١٥٧ م = مُکَرَّر، هەتا ژمارە: ٥٢٥٧ + پوختەی صەحیحی بوخاری = تەجریدی بوخاری، زنجیرە: ٨٤، لاپەڕە: ٢٥٩ چاپی یەکەم، ژمارە: ١٩٩٧ هەتا ژمارە: ٢٠٤١}.

**١٥٨١) فەرمایشتی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ): (ئەی خودایە! رزق‌و رۆژیی خانەوادەی موحەممەد ئەوەندە بدە کە سەروبەر پێی هەڵبکەن).**

**(٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)**

**بَابٌ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتاً**

٢٠٦٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا ». {الحديث: ٧٣٦٧ = ٧٤٠١ فم. تجريد البخاري/٥، رقم: ٢٠٠٩ = ٦٤٦٠ فتح الباري}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودایە! رزق‌و رۆژیی کەسوکاری موحەممەد ئەوەندە بدە کە سەروبەر پێی بژین‌و بەس!). {تاج/٢، زنجیرە:٢٠، ژمارە: ١٢٦١ + ریاض/٢، لاپەڕە: ٧٣، زنجیرە:٥٦، ژمارە: ٥٠١}.

**١٥٨٢) سەختی گوزەرانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ). (٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)**

**بابٌ: شِدَّةُ عَيْشِ النَّبِيِّ (صَلَّي اللّله عَلَيْهِ وَسلَمَ)**

٢٠٧٠- عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: وَاللَّهِ يَا ابْنَ أُخْتِى إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلاَلِ ثُمَّ الْهِلاَلِ ثُمَّ الْهِلاَلِ، ثَلاَثَةَ أَهِلَّةٍ فِى شَهْرَيْنِ، وَمَا أُوقِدَ فِى

أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- نَارٌ – قَالَ: - قُلْتُ: يَا خَالَةُ فَمَا كَانَ يُعَيِّشُكُمْ؟ قَالَتِ: الأَسْوَدَانِ، التَّمْرُ وَالْمَاءُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- جِيرَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ، وَكَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ، فَكَانُوا يُرْسِلُونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مِنْ أَلْبَانِهَا فَيَسْقِينَاهُ. {الحديث: ٧٣٧٨ = ٧٤١٢ فم. پوختەی صەحیحی بوخاری = تەجریدی بوخاری ٣/، رەقم: ١٠٩٦ = ٢٥٦٧، ٦٤٥٨، ٦٤٥٩}:

عوروەی خوشکەزای حەزرەتی عائیشە (رەزای خودا لە حەزرەتی عائیشەو رەحمەتی خودا لەو) فەرمووی: پوورم پێی گوتم: ئەی خوشکەزای شیرینم! جاری وابووە سێ مانگی یەك شەوەمان دەبینی، یەك لە دوای یەك، کە دەق دەکاتە دوو مانگی رێك، لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا، ئاگر لە ماڵەکانی خێزانەکانی پێغەمبەردا نەدەکرایەوە بۆ نان‌و چێشت کردن!!

عوروە فەرمووی: منیش گوتم: ئەی باشە پووری! بەچی دەژیان‌و گوزەرانتان بەچی بوو؟ فەرمووی: بەس بەخورماو ئاو! بەڵام چەند ماڵێکی ئەنساری هاوسێی پێغەمبەر بوون، ئاژەڵی بەشیریان هەبوو، لەشیری ئەو ئاژەڵانە، بە دیاری بەشی پێغەمبەریان دەدا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو شیرەی دەرخواردی ئێمە دەدا). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢٢٠م – باسی گوزەرانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) }.

٢٠٧١- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَتْ: لَقَدْ مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَمَا شَبِعَ مِنْ خُبْزٍ وَزَيْتٍ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ. {الحديث: ٧٣٧٩ = ٧٤١٣ فم}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لە هەموو هاوەڵ‌و هاسەرانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا مرد، نەبووە لەیەك رۆژدا دوو ژەم لەنان‌و رۆن زەیتوون تێربخوا). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢١٨}.

**٢٠٧٢ – عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ -صلى الله عليه وسلم- يَوْمَيْنِ مِنْ خُبْزِ بُرّ إِلاَّ وَأَحَدُهُمَا تَمْرٌ. {الحديث: ٧٣٧٤ = ٧٤٠٨ فم، بخاري. رقاق: ٦٤٥٥. تحفة الأشراف: ١٧٣٣٥}.**

**عائيشه** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خێزانی موحەممەد** (درودی خودای لەسەر بێ) **هەتا موحەممەد** (درودی خودای لەسەر بێ) **وەفاتی کرد، دوو ڕۆژ لەسەر یەك، تێرسکی خۆیان لەنانی گەنم نەخواردووە، مەگەر ڕۆژێ نانی گەنمیان خواردبێ‌و ڕۆژەکەی تر خورمایان خواردبێ). {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٩١، ٤٩٣} + {تجرید البخاری/٥، ژمارە: ١٨١١ = ٥٤١١، ٦٤٥٤ فتح الباری}.**

**٢٠٧٣- عَنْ أَبِى حَاتِمٍ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: وَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ (وَقَالَ ابْنُ عَبَّادٍ وَالَّذِى نَفْسُ أَبِى هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ) مَا أَشْبَعَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَهْلَهُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ تِبَاعًا مِنْ خُبْزِ حِنْطَةٍ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا. {الحديث: ٧٣٨٣ = ٧٤١٧ فم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكرديَّة/٥، رقم: ١٨١١ = ٥٤١١ فتح الباري. ترمذي. زهد: ٢٣٥٨. تحفة الأشراف: ١٣٤٤٠}:**

**ئەبو حاتەم** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **فەرمووی: ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەمە لەفظی ئیبنو ئەبی عومەیرە، کە شێخی موسلیمەو موسلیم ئەم فەرموودەیەی لێوە دەگێڕێتەوە، بەلاّم موسلیم لە مامۆستایەکی تریەوە کە موحەممەدی کوڕی عەببادە، سوێندەکەی ئەبو هورەیرە ئاوا دەگێڕێتەوە:**

**بەوکەسە کە گیانی ئەبو هورەیرەی بەدەسە، لەوکاتەوە کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **کۆچی کردووە بۆ مەدینە، هەتا ئەو ڕۆژەی کە خودا بەڕەحمەت بردیەوە بۆلای خۆی، خۆی‌و خێزانەکەی، سێ ڕۆژ لەسەر یەك، تێر سکی خۆیانیان لەنانی گەنم نەخواردووە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥١٨٥ م + تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦١} + {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢١٥ م}.**

٢٠٧٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَمَا فِي رَفِّي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلاَّ شَطْرُ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ. {الحديث: ٧٣٧٧ = ٧٤١١ فم. بخاري. فرض الخمس: ٣٠٩٧، ٦٤٥١ فتح الباري}:

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرموی:** کاتێ پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (درودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، ئەوەی گیانلەبەر پێی بژی لە ماڵما نەبوو، هەنێ جۆ نەبێ، جا هەر لێیم دەخواردو هەر تەواو نەدەبوو، هەتا ماوەیەکی زۆری خایاند، لەپاشدا چووم پێوام، ئیتر پیتو فەڕەکەی نەماو تەواو بوو). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢١٦ م}.

**١٥٨٣) جاری وادەبوو کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **پڕ بەسکی خۆی خورمای قەسپی دەست نەدەکەوت.** (٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

**باب: كان النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لا يَجِدُ دَقَلاً يَمْلأُ بِهِ بَطْنَهُ**

٢٠٧٥- عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ يَخْطُبُ قَالَ: ذَكَرَ عُمَرُ مَا أَصَابَ النَّاسُ مِنَ الدُّنْيَا فَقَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَظَلُّ الْيَوْمَ يَلْتَوِي مَا يَجِدُ دَقَلاً يَمْلأُ بِهِ بَطْنَهُ. {الحديث: ٧٣٨٥ – ٧٤٢١ فم}:

**سیماکی کوڕی حەرب** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **فەرموی:** بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، نوعمانی کوڕی بەشیر وتاری دەدا، فەرمووی: عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) جارێ باسی ئەو خۆش گوزەرانیەی خەڵکی دەکرد، کە لە خۆشی دنیا، لەپاش مەرگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەو خەڵکە بەدەستیان هێناوە، فەرمووی: ئەوەتانێ ئێستا لە خۆشی دنیاو لە خواردنو خواردنەوە چیتان دەوێ هەیە لەبەر دەستتاندا، بەڵام من بەچاوی خۆم پێغەمبەرم (درودی خودای لەسەر بێ) دیوە، پڕ سکی خۆی خورمای قەسپی دەسگیر نەدەبوو هەتا بیخوات). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢٢٢ م} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٩٥}.

## ١٥٨٤) هەژارانی کۆچکاران پێش دەوڵەمەندەکان دەکەون بۆ بەهەشت.
(٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

## بَابٌ: سَبْقُ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الأَغْنِيَاءَ إِلَى الْجَنَّةِ

٢٠٧٦- عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ يقول: سمعت عبدالله بن عمرو بن العاص وسأله رجل فقال: ألسنا من فقراء المهاجرين؟ فقال له عبدالله: ألك امرأة تأوي إليها؟ قال: نعم، قال: ألك مسكن تسكنه؟ قال: نعم، قال: فأنت من الأغنياء! قال: فإن لي خادماً، قال: فأنت من الملوك، قال أبو عبدالرحمن: وَجَاءَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ وَأَنَا عِنْدَهُ فَقَالُوا له: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ إِنَّا وَاللَّهِ مَا نَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ لاَ نَفَقَةٍ وَلاَ دَابَّةٍ وَلاَ مَتَاعٍ. فَقَالَ لَهُمْ: مَا شِئْتُمْ؟ إِنْ شِئْتُمْ رَجَعْتُمْ إِلَيْنَا فَأَعْطَيْنَاكُمْ مَا يَسَّرَ اللَّهُ لَكُمْ، وَإِنْ شِئْتُمْ ذَكَرْنَا أَمْرَكُمْ لِلسُّلْطَانِ، وَإِنْ شِئْتُمْ صَبَرْتُمْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ: « إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَسْبِقُونَ الأَغْنِيَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى الْجَنَّةِ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا ». قَالُوا: فَإِنَّا نَصْبِرُ لاَ نَسْأَلُ شَيْئًا. {الحديث: ٧٣٨٨ = ٧٤٢٣ فم}:

ئەبو عەبدوڕەحمانی ئەلحوبلی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو، پیاوێ پرسی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ): ئایا ئێمە دادەنرێین بە یەکێ لە هەژارانی کۆچکاران؟! ئەو ماف و موژدانەی کەبۆ ئەوان هەیە بۆ ئێمەیش هەیە یان نا؟ عەبدوڵڵا فەرمووی پێی: ئایا ژنت هەیە کە لەلای بحەسێیتەوە؟ گوتی: بەڵێ هەمە، فەرمووی: ئەی ماڵێکت هەیە کە سرەوتی تیا بکەی و لەناویا بحەوێیتەوە؟ گوتی: بەڵێ خانووشم هەیە. فەرمووی: دەتۆ لە دەوڵەمەندەکانیت. کابرا گوتی: سا نۆکەریشم هەیە! فەرمووی: کەوابێ تۆ پادشای. ئەبو عەبدوڕەحمان فەرمووی: جارێکیش سێ کەس هاتن بۆ خزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص، من لەخزمەتیدا بووم لەوکاتەدا، بە عەبدوڵڵایان گوت: ئەی باوکی موحەممەد! بەخودا توانای هیچمان نییە، نە خەرجی، نە وڵاخی سواری، نە شمەك. عەبدوڵڵا فەرمووی پێیان: خۆتان سەرپشك بن یەکێ لەم سێ شتە هەڵبژێرن: ئەگەر ئەتانەوێ وەرنەوە بۆلامان خودا چی ڕەخساند بۆتان دەیدەین پێتان، ئەگەر حەزیش دەکەن کێشەکەتان عەرزی کاربەدەستان دەکەین،

ئەگەر حەزیش دەکەن ئەوا ئارام بگرن لەبەر باری خودادا، چونکە من لە پێغەمبەری خودام بیستووە دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (بێگومان کە هەژارانی کۆچکاران، لەڕۆژی قیامەتدا، بەچل ساڵ لەپێش دەوڵەمەندەکاندا دەچن بۆ بەهەشت). گوتیان: دەی کەوابێ ئارام دەگرینو داوای هیچ ناکەین). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٥٢٠٧ م هەتا ٥٢١٣ م}.

### ١٥٨٥) هەژاران زۆرینەی دانیشتوانی بەهەشتن. (٦٨٧٢ - ٦٨٨٣)

### باب: أكثر أهل الجنّة الفقراء

٢٠٧٧- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ وَإِذَا أَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ إِلاَّ أَصْحَابَ النَّارِ فَقَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ ». {الحديث: ٦٨٧٢ = ٦٨٩٢ فم. تجريد البخاري/٥، رقم: ١٧٧٥ = ٥١٩٦، ٦٤٤٧. تحفة الأشراف: ١٠٠. رياض/١، زنجيره: ٣٢، ژماره:٢٥٨}:

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە دەرگای بەهەشتا ڕاوەستام، سەرنجمدا زۆربەی بەهەشتییەکان کە چووبوونە ناوی هەژارانو مسکێنەکان بوون، بەڵام داراو دەوڵەمەندەکان هێشتا ڕاگیرابوون بۆ حسابو لێپرسینەوە لەسەر سامانو داراییەکەیان، گەرچی ئەوەی کە دۆزەخی بوون، بە فەرمانی خودا برابوون بۆ ناو دۆزەخ، لەبەردەرگای دۆزەخیشا ڕاوەستام، سەرنجمدا زۆربەی خەڵکەکەی ناوی ژنان بوون!). {ریاض/١، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٢٥٨}.

### ١٥٨٦) جیهان نەویستیو بێ بەهایی جیهان لەلای خودای گەورە. (٧٣٤٣ – ٧٣٨٨)

### بَابٌ: فِي الزُّهْدِ فِي الدُّنيا وَهَوانِهَا عَلَى اللَّه عَزَّ وَجَلَّ

٢٠٧٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مَرَّ بِالسُّوقِ دَاخِلاً مِنْ بَعْضِ الْعَالِيَةِ وَالنَّاسُ كَنَفَتَيْهِ فَمَرَّ بِجَدْيٍ أَسَكَّ مَيِّتٍ فَتَنَاوَلَهُ فَأَخَذَ بِأُذُنِهِ ثُمَّ قَالَ:

« أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنَّ هَذَا لَهُ بِدِرْهَمٍ؟». فَقَالُوا: مَا نُحِبُّ أَنَّهُ لَنَا بِشَيْءٍ وَمَا نَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: « أَتُحِبُّونَ أَنَّهُ لَكُمْ؟». قَالُوا: وَاللَّهِ لَوْ كَانَ حَيًّا كَانَ عَيْبًا فِيهِ لأَنَّهُ أَسَكُّ فَكَيْفَ وَهُوَ مَيِّتٌ؟ فَقَالَ: « فَوَاللَّهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ هَذَا عَلَيْكُمْ ». {الحديث: ٧٣٤٤ = ٧٣٧٨ فم}:

**جابیری کوڕی عەبدوڵلا** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **جارێ ڕۆیشت بۆ عەوالی مەدینە، کە چەند گوندێکن لەسەرووی مەدینەوە، لەوێوە بەناو بازاڕی مەدینەدا گەڕایەوە، خەڵکەکەیش لەملاو لایەوە لەگەڵیدا دەڕۆیین، بەلای کەلاکی گێسکێکی مردارەوەبوودا رابورد، دەستی برد گوێچکەیەکی گرتو پاشان فەرمووی: (کامتان ئەمەی بە درەمێ دەوێ؟). یاران فەرموویان: بە بەلاشیش نامانەوێ، جا چی لێبکەین؟! پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **دووبارە فەرموویەوە: (کامتان ئەمەی دەوێ؟). گوتیان: بەخودا، ئەگەر زیندووش بووایە هەر عەیبدار بوو، چونکە کەڕیلەیە، لەبەرئەوە نەمان دەویست، نەخوازەڵا کە ئێستا مردارەوە بوویشە، ئیتر چۆن بمانەوێ؟**

**جا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (دەی سوێندم بەخودا ئەم جیهانە لەلای خودا، سووكو ترۆترە لەم کەلاکە لەلای ئێوە!). {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٤٦٤} + {تاج/٥، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٦٢ م — نامەی زوهدو دونیا نەویستی...}.**

**٢٠٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكَافِرِ ». {الحديث: ٧٣٤٣ = ٧٣٧٧ فم}:**

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (جیهان زیندانی موسوڵمانەو بەهەشتی کافرانە). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٦١م}.**

## ١٥٨٧) مەترسی روو تێکردنی خۆشی جیهانو پەلاماردانی. (٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

## بَابٌ: خَشْيَةُ بَسْطِ الدُّنْيَا وَالتَّنَافُسُ فِيهَا

٢٠٨٠- عَنْ عَمْرِو بْنَ عَوْفٍ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ (رضي الله عنه) إِلَى الْبَحْرَيْنِ يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- هُوَ صَالَحَ أَهْلَ الْبَحْرَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَيْهِمُ الْعَلاَءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ، فَقَدِمَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِمَالٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ. فَسَمِعَتِ الأَنْصَارُ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ فَوَافَوْا صَلاَةَ الْفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- انْصَرَفَ، فَتَعَرَّضُوا لَهُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- حِينَ رَآهُمْ، ثُمَّ قَالَ: «أَظُنُّكُمْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدِمَ بِشَيْءٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ؟». فَقَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ، فَوَاللَّهِ مَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ. وَلَكِنِّي أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ الدُّنْيَا عَلَيْكُمْ، كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ». {الحديث: ٧٣٥١ = ٧٣٨٥ فم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١٢٧٧ = ٣١٥٨، ٤٠١٥، ٦٤٢٥ فتح البخاري}:

عەمری کوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبو عوبادەی کوڕی جەراحی نارد بۆ بەحرەین، کە سەرانەی وڵاتی بەحرەین بهێنێ، چونکە لەوەبەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خەڵکی وڵاتی بەحرەیندا ڕێکەوتبوو، عەلای کوڕی حەزرەمی کردبوو بە سەرداریان، کە ئەبو عوبەیدە هاتەوە ماڵێکی زۆری لە بەحرەینەوە لەگەڵ خۆی هێنابوو، یاریدەدەران (ئەنصار)یش بیستیانەوە کە ئەبو عوبەیدە هاتۆتەوە، سامانێکی باشی هێناوە بۆ موسوڵمانان، ئیتر بۆ نوێژی بەیانی هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆیان کردو گەڕایەوە، جا یاریدەدەران لەوکاتەدا داوای بەشیان لێکرد.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەم حاڵە بینینی بزەیەك گرتیو فەرمووی: (وادەزانم کە ژنەوتووتانە کە ئەبو عوبەیدە لە بەحرەینەوە شتێکی هێناوە؟). عەرزیانکرد: بەڵێ وایە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دە موژدەبێ

لە ئێوەو خۆشیتان لێ بێو هەمیشە ئومێدی خێرو هیوای خۆش، باڵ بکێشێ بەسەرتانا، دەسا بەزاتی خودا، من لەهەژاری لێتان ناترسم، بەڵام بەپێچەوانەوە مەترسی ئەوەم هەیە کە ئێوەش وەك نەتەوەکانی پێش ئێوە خۆشی جیهان رووتان تێبکا، دنیا بێت بە پیرتانەوەو ئێوەیش وەك ئەوان بەدەستو بەدەم پەلاماری دنیا بدەنو باوەشی پیابکەنو تێی ورووکێنو هەرکەسەتان بیەوێ کە هەر بۆخۆی بیماشێتەوە، جا ئەوکاتە وەك چۆن ئەوانی لەناوبرد، ئاوا ئێوەش لەناو ببات). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٤٥٢٣ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٥٩} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ٤٥٧}.

**روونکردنەوە:**

عەمری کوڕی عەوفی ئەنصاری ئامادەی غەزای بەدر بووە، لە مەدینە نیشتەجێ بوو، وەچەی نەبوو، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا مرد، کە مرد عومەر نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

## ١٥٨٨) کاتێ جیهان دەکرێتەوە مەترسی تێ ورووکانو بەخیلی بەیەکتر دروست دەبێ. (٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

## بَابٌ: خَوْفُ التَّنَافُسِ والتَّحَاسُدِ عِنْدَ فَتْحِ الدُّنْيَا

٢٠٨١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ: « إِذَا فُتِحَتْ عَلَيْكُمْ فَارِسُ وَالرُّومُ أَىُّ قَوْمٍ أَنْتُمْ؟». قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: نَقُولُ كَمَا أَمَرَنَا اللَّهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ، تَتَنَافَسُونَ، ثُمَّ تَتَحَاسَدُونَ، ثُمَّ تَتَدَابَرُونَ، ثُمَّ تَتَبَاغَضُونَ، أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ ثُمَّ تَنْطَلِقُونَ فِى مَسَاكِينِ الْمُهَاجِرِينَ فَتَجْعَلُونَ بَعْضَهُمْ عَلَى رِقَابِ بَعْضٍ ». {الحديث: ٧٣٥٣ = ٧٣٨٧ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ خودای گەورە وڵاتی فارسو وڵاتی

ڕۆمـی ئـازادکرد بۆتـان، دەبـێ حاڵتـان چۆن بـێو خۆشـگوزەرانی بـەرەو کوێتـان بەرێ؟).

عەبدوڕەحمانی کوڕی عـەوف عـەرزی کـرد: وەك خـودای گـەورە فـەرمانی پـێ کردووین سوپاسو ستایشی دەکەینو داوای خێرو بێری زیاتری لێ دەکەین.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (تۆ بڵێیت شتێ ڕوونەدات، وەك ئەوە پەلاماری ئەم خێرو خۆشییە بدەنو لەسەر ئەوە ببێ بـە ململانـێو کـێ بڕکێتـانو ئەوەیش سەربکێشێ بۆ حەسوودی بردن بـە یـەکتریو دووبـەرەکیو کینـەو دەغـەز کێشان لەیەکتری) یا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) شتێ ئاوای فەرموو، ئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لە ئەنجاما کاردەگا بەوە: ئەوانەی ئەمڕۆ هەژارانو بـێ نـەوایانی کۆچکارانن، دەیانکەن بـە ئاغـاو سـەروەرو هەنـدێکیان دەبـن بـە ئاغـاو دەسـەڵاتدار بەسـەر ئـەوانی تریانـەوەو ململانـێو خۆخـۆیی لەسـەر سـامانو دەسـتەڵات ڕوودەدات!).

**١٥٨٩) کورتی ماوەی جیهانو بڕانەوەی خۆشییەکەی، لەچاو بەردەوامی قیامەتو نەبڕانەوەی نازو نەعیمو خۆشییەکەی، وەك ئەوە وایە: پەنجەیە بکەی بە دەریایەکا.** (٧١٢٦ - ٧١٣١)

**بَابٌ: مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ الإِصْبَعَ فِي الْيَمِّ**

٢٠٨٢- عَنْ مُسْتَوْرِدٍ أَخِي بَنِى فِهْرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « وَاللَّهِ مَا الدُّنْيَا فِى الآخِرَةِ إِلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ هَذِهِ - وَأَشَارَ يَحْيَى بِالسَّبَّابَةِ - فِى الْيَمِّ فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ ». {الحديث: ٧١٢٦ = ٧١٥٣ فم}:

موستەوریدی کاکەی بەنی فیهری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (بـەخودا ئـەم جیهانـە لەچاو ئـەو جیهانـدا، وەك ئـەوە وایـە کـە یەکێکتان پەنجەیەکی خۆی بژەنێ بەئاوی دەریادا، جا باش باش سەرنج بدەن دەبێ پەنجەی چەنێ ئاو هەڵبگرێ!). واتە: ئەو تەڕییەی کە بە پەنجەیـەوە دەنووسـێ لـە ئاوی دەریاکە، ئەوە نموونەی دنیایـە، باقیمەنـدەی ئـاوی نـاو دەریاکـەیش نموونـەی

ئـەو جیهانـە. {تـاج/٥، زنجـیره: ٩٤، ژمـاره: ٥١٦٤ م. ج/٤} + {ریـاض/٢، زنجـیره: ٥٥، ژماره: ٤٦٣ – گەورەیی‌و خێری هەژماری...}.

## ١٥٩٠) گیرۆدەبوون بە خۆشی جیهانەوەو چۆنێتی کارو کردەوە لە جیهاندا.

(٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

## بَابٌ: فِي الِابْتِلَاءِ بِالدُّنْيَا وَكَيْفَ يُعْمَلُ فِيهَا

٢٠٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ: « إِنَّ ثَلاَثَةً فِى بَنِى إِسْرَائِيلَ أَبْرَصَ وَأَقْرَعَ وَأَعْمَى فَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَلَكًا فَأَتَى الأَبْرَصَ فَقَالَ أَىُّ شَىْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ لَوْنٌ حَسَنٌ وَجِلْدٌ حَسَنٌ وَيَذْهَبُ عَنِّى الَّذِى قَدْ قَذِرَنِى النَّاسُ. قَالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ قَذَرُهُ وَأُعْطِىَ لَوْنًا حَسَنًا وَجِلْدًا حَسَنًا قَالَ فَأَىُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الإِبِلُ - أَوْ قَالَ الْبَقَرُ شَكَّ إِسْحَاقُ - إِلاَّ أَنَّ الأَبْرَصَ أَوِ الأَقْرَعَ قَالَ أَحَدُهُمَا الإِبِلُ وَقَالَ الآخَرُ الْبَقَرُ - قَالَ فَأُعْطِىَ نَاقَةً عُشَرَاءَ فَقَالَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا - قَالَ - فَأَتَى الأَقْرَعَ فَقَالَ أَىُّ شَىْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ شَعَرٌ حَسَنٌ وَيَذْهَبُ عَنِّى هَذَا الَّذِى قَذِرَنِى النَّاسُ. قَالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ وَأُعْطِىَ شَعَرًا حَسَنًا - قَالَ - فَأَىُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الْبَقَرُ. فَأُعْطِىَ بَقَرَةً حَامِلاً فَقَالَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا - قَالَ - فَأَتَى الأَعْمَى فَقَالَ أَىُّ شَىْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ أَنْ يَرُدَّ اللَّهُ إِلَىَّ بَصَرِى فَأُبْصِرَ بِهِ النَّاسَ - قَالَ - فَمَسَحَهُ فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِ بَصَرَهُ. قَالَ فَأَىُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الْغَنَمُ. فَأُعْطِىَ شَاةً وَالِدًا فَأُنْتِجَ هَذَانِ وَوَلَّدَ هَذَا - قَالَ - فَكَانَ لِهَذَا وَادٍ مِنَ الإِبِلِ وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْبَقَرِ وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْغَنَمِ. قَالَ ثُمَّ إِنَّهُ أَتَى الأَبْرَصَ فِى صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ قَدِ انْقَطَعَتْ بِىَ الْحِبَالُ فِى سَفَرِى فَلاَ بَلاَغَ لِىَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ أَسْأَلُكَ بِالَّذِى أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الْحَسَنَ وَالْجِلْدَ الْحَسَنَ وَالْمَالَ بَعِيرًا أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِى سَفَرِى. فَقَالَ الْحُقُوقُ كَثِيرَةٌ. فَقَالَ لَهُ كَأَنِّى أَعْرِفُكَ أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ فَقِيرًا فَأَعْطَاكَ اللَّهُ فَقَالَ إِنَّمَا وَرِثْتُ هَذَا الْمَالَ كَابِرًا عَنْ كَابِرٍ. فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ وَأَتَى الأَقْرَعَ فِى صُورَتِهِ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِهَذَا وَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا رَدَّ عَلَى هَذَا فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ وَأَتَى الأَعْمَى فِى صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ انْقَطَعَتْ بِىَ الْحِبَالُ فِى سَفَرِى فَلاَ بَلاَغَ لِىَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللَّهِ

ثُمَّ بِكَ أَسْأَلُكَ بِالَّذِى رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا فِى سَفَرِى فَقَالَ قَدْ كُنْتُ أَعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصَرِى فَخُذْ مَا شِئْتَ وَدَعْ مَا شِئْتَ فَوَاللَّهِ لاَ أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ شَيْئًا أَخَذْتَهُ لِلَّهِ فَقَالَ أَمْسِكْ مَالَكَ فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ فَقَدْ رُضِىَ عَنْكَ وَسُخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ. {الحديث: ٧٣٥٧ = ٧٣٩١ فم. تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى = الترجمة الكردية = المجلد الرابع. الرقم: ١٣٨٢ = ٣٤٦٤، ٦٦٥٣ فتح البارى. رياض/١، زنجيره: ٥، ژماره: ٦٥. تحفة الأشراف: ٦٦٥٣}:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیو رەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: بە گوێچکەی خۆم ئەم داستانەم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بیست دەیفەرموو: سێ کەس لەنەوەی ئیسرائیل، واتە: لەبەنی ئیسرائیل، کە ناسراون بە گەلی جوولەکە: بەڵەکێكو کەچەڵێكو کوێرێك، خودای گەورە دەیەوێ تاقییان بکاتەوە، جا فریشتەیێ لەسەر شێوەی پیاوێ دەنێرێ بۆلایان، فریشتەکە دەچێتە لای بەڵەکەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: حەزم لە رەنگو بۆیەکی جوانو پێستێکی جوانەو ئەم بەڵەکییەشم نەمێنێ، کە بووە بەهۆی ئەوە کە خەڵك قێزو بێزم لێ دەکەنەوە، فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بەسەر جەستەیدا ئیتر یەك تۆز چەپەڵییەکەی نامێنێو، رەنگو بۆیەکی جوانو پێستێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئەوجا فریشتەکە پێی دەڵێ: حەزت لەچی جۆرەماڵێکە؟ پیاوەکە دەڵێ: حەزم لە وشترە، یاخود دەڵێ: حەزم لە رەشە وڵاخە، ئیسحاق – کە یەکێکە لە بگێڕەوە (راوی)یەکانی ئەم فەرموودەیە – گومانی لەوەدا بۆ پەیدا بوو کە بەڵەكو کەچەڵەکە کامیان داوای وشترو کامیان داوای رەشە وڵاخی کردبوو، فەرمووی: جا وشترە مێچکەیەکی هەراش ئاوسی لەسەر گووانی دەداتێو پێی دەڵێ: خودا پیتو فەڕی تێ بخا بۆت).

فەرمووی: ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆلای کەچەڵەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لە قژێکی جوانەو ئەم کەچەڵییەیشم نەمێنێ، کەبووە بەهۆی ئەوەی خەڵك قێزو بێزم لێ بکەنەوە).

فەرمووی: (جا فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بەسەریدا، ئیتر کەچەڵییەکەی دەڕواو قژێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئینجا پێی دەڵێ: حەز لەچی جۆرە سامانێ دەکەی؟ دەڵێ: لە رەشە وڵاخ، جا مانگایەکی ئاوسی دەداتێو پێی دەڵێ: خودا پیتو فەڕو بەرەکەتی تێ بخات بۆت).

فەرمووی: (ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆلای کوێرەکەو پێی دەفەرموێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لەدوو چاوی ساغو گەشە، کە خودا بیانداتە پێم، هەتا ئەم خەڵکەیان پێ ببینم!). فەرمووی: (جا دەستێ دەهێنێ بە چاوەکانیداو خودا چاوەکانی پێ دەداتەوە، جا پێی دەفەرموێ: ئەی حەز لەچی جۆرە سامانێ دەکەی؟ دەڵێ: لە مەڕ، جا مەڕێکی زاوی بەرخ بەبەرەی پێ دەدا، ئیتر بەرە بەرە ئاژەڵەکان زاوزێ دەکەنو ئەوانیش بەرهەمیان دەهێنن، تا وازۆر دەبن، ئەمیان بوو بەخاوەنی پڕ شیوێ وشترو ئەویان بوو بەخاوەنی پڕ دۆڵێ رەشە وڵاخو ئەوی تریشیان بوو بەخاوەنی پڕ شیوێ گەلە ڕان). فەرمووی: لەپاشدا فریشتەکە خۆی لێ گۆڕینو لەسەر شێوەو شکڵی ئەوسای بەڵەکەکە خۆی هاتەوە بۆلایو پێی فەرموو: پیاوێکی هەژاری داماوی رێبواری لێقەوماوم، سەر بەهیچ لایەکا دەرناکەم، سا مەگەر یەکەم بە پشتیوانی خوداو دووەم بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە جێگەو رێگەی خۆم، جا توبیتو ئەوکەسەی کە ئەم شێوە شیرینەو ئەم لەشو لارە جوانەو ئەم ماڵە زۆرەی پێ بەخشیوی، وشترێکم پێ بدە تا لەم سەفەرەمدا خۆمی پێ بگەیەنمە ماڵەوە، کەچی کابرا گوتی: خاوەن بەش زۆرن بەرتۆ ناکەوێ!

فریشتەکەیش پێی فەرموو: وەك من تۆ بناسمەوە وایە، ئەرێ تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە نیت کە خەڵك بێزی لێ دەکردیتەوە، وە ئەو هەژارە نیت کە خودا دەوڵەمەندی کردیت! گوتی: نەخێر من ئەو نیم، من ئەم ماڵو سامانەم لە باوكو باپیرمەوە بۆ بەجێ ماوە، ئەوانیش هەر بووە بوونو پشتاو پشت بە بەگزادەیی هاتوونەتە خوارەوە!

فریشتەکەیش دەفەرموێ: ئەگەر درۆ دەکەی، خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە).

فەرمووی: (جا لەسەر شێوەی شەکڵی پێشووی کەچەڵەکەدا، چوو بۆلای ئەویش، چی بە بەڵەکەکە گوت دیسان بەمیشی گوت، وە بەڵەکەکە چی بە فریشتەکە گوت، دیسان کەچەڵەکەیش ئەوەی پێی گوت، فریشتەکەیش فەرمووی: ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە!).

فەرمووی: (جا لە شێوەو شەکڵی پێشووی کوێرەکەیشدا هاتەوە بۆلایو پێی فەرموو: پیاوێکی هەژاری داماوی رێبواری لێقەوماوم سەر بەهیچ لایەکا دەرناکەم، سا مەگەر یەکەم بە پشتیوانی خوداو دووەم بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێنو جێگەی خۆم، جا توبیتو ئەو خودایەی کە چاوەکانی چاك کردیتەوە مەڕێکم پێ بدە بەشکوو لەم سەفەرەمدا پێی بگەمەوەماڵەوە. پیاوە کوێرەکە دەڵێ: ئای منیش وەك ئێستای تۆ کوێر بوومو دەزانم کە کوێر چەندە کوڵەوارە، وە خودا چاوی چاك کردمەوە، سەرەڕای ئەوەیشە هەژاریش بوومو دەزانم کە هەژاری چەندە ناخۆشە، جا کەواتە بەئارەزووی خۆت چی دەبەیت لەم سامانەی من بۆ خۆت ببە، دەست ناهێنمە رێگەت، وەچی دەهێڵیتەوە بۆمن ئارەزووی خۆتە، بەو خودایە هەرچی تۆ ئەمڕۆ لەم ماڵەی من، ببەیت بۆ خۆت، لە رێگەی خودادا دەست ناهێنمە رێگەت!

فریشتەکە فەرمووی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، من فریشتەم هەوەجێم بە ماڵ نییە، لەڕاستیدا رووداو و داستانەکە ئاوایە: ئێوە — واتە: تۆو بەڵەكو کەچەڵەکە — لەلایەنی خودای گەورەوە تاقی کرانەوە، خودا لەتۆ رازییە، چونکە خۆت لێ نەگۆڕاوە، بەڵام لەهەردوو هاوڕێکەت ناڕازییە). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٥٢٤٠ + ریاض/١، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٦٥ - المراقبة}.

## ١٥٩١) باسی نەبوونیو کەم دەستیو ئارامگرتن لەسەریو لەتاو برسێتی گەڵای دار خواردن. (٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

## بَابٌ: فِي قلة الدنيا والصبر عنها وأكل ورق الشجر

٢٠٨٤- عَنْ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ (رضي الله عنه) قال: وَاللَّهِ إِنِّي لأَوَّلُ رَجُلٍ مِنَ الْعَرَبِ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَلَقَدْ كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مَا لَنَا طَعَامٌ نَأْكُلُهُ إِلاَّ وَرَقُ الْحُبْلَةِ، وَهَذَا السَّمُرُ حَتَّى إِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ، ثُمَّ أَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ تُعَزِّرُنِي عَلَى الدِّينِ، لَقَدْ خِبْتُ إِذًا وَضَلَّ عَمَلِي. {الحديث: ٧٣٥٩ = ٧٣٩٣ فم. بخاري. مناقب سعد بن أبي وقاص: ٣٧٢٨، ٥٤١٢، ٦٤٥٣. ترمذي. زهد: ٢٣٦٥. ابن ماجة. فضائل أصحاب رسول الله: ١٣١. تحفة الأشراف: ٣٩١٣}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سوێندم بە خودای گەورە من یەکەم پیاو بووم لە عەرەب کە یەکەم تیرم هاویشت بەرەو دوژمن، لەرێگەی خودادا، ئەوسا حاڵمان گەلێ پەڕپووت بوو، گەلێ جار لە خزمەتی حەزرەتدا کە دەچووین بۆ غەزا، خۆراکمان تەنیا بەرو گەڵا دارو درەختی ئەو بیابانە بوو، کە لەناچاریدا نەبێ ناخورێ، تەنانەت وامان لێ هاتبوو کە سەراومان دەکرد، وەك پشقلی مەڕو بزن وابوو، یەکی دەگرت، کلۆ کلۆ دەوەستا من ئاوا لەگەڵ گەشەکردنی ئیسلامدا هێناومەو پەروەردە بووم، کەچی ئێستا خێڵی بەنی ئەسەد لەسەر ئاینداری سەر زەنشتی من دەکەن، تەنانەت نەفامەکانیان دەڵێن سەعد نوێژیش بەجوانی نازانێ!

بەڕاستی ئەگەر قسەی ئەوان ڕاست بێو سەر زەنشتەکەیان لەسەر هەق بێ، ئەوا واتای وایە کەمن نائومێد دەرچووموو ڕەنجم با بردوویەتی!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ٥٢٢٣م – گوزەرانی پێغەمبەر} + {ریاض/٢، زنجیرە:٥٦، ژمارە: ٥٠٠ – باسی خێرو بەهرەی برسێتیو سادەی...} + {ریاض/٣، زنجیرە:٢٥٣، ژمارە: ١٥٠٥ – باسی بەهرە(کەرامەت)ی پیاو چاکان} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦ – خێرو بەهرەی برسێتیو سادەی گوزەران...}.

٢٠٨٥ – عَنْ خَالِدِ بْنِ عُمَيْرٍ الْعَدَوِيِّ قَالَ: خَطَبَنَا عُتْبَةُ بْنُ غَزْوَانَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ الدُّنْيَا قَدْ آذَنَتْ بِصُرْمٍ، وَوَلَّتْ حَذَّاءَ، وَلَمْ يَبْقَ مِنْهَا إِلاَّ صُبَابَةٌ كَصُبَابَةِ الإِنَاءِ يَتَصَابُّهَا صَاحِبُهَا وَإِنَّكُمْ مُنْتَقِلُونَ مِنْهَا إِلَى دَارٍ لاَ زَوَالَ لَهَا فَانْتَقِلُوا بِخَيْرِ مَا بِحَضْرَتِكُمْ فَإِنَّهُ قَدْ ذُكِرَ لَنَا أَنَّ الْحَجَرَ يُلْقَى مِنْ شَفَةِ جَهَنَّمَ فَيَهْوِى فِيهَا سَبْعِينَ عَامًا لاَ يُدْرِكُ لَهَا قَعْرًا وَوَاللَّهِ لَتُمْلأَنَّ أَفَعَجِبْتُمْ وَلَقَدْ ذُكِرَ لَنَا أَنَّ مَا بَيْنَ مِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ مَسِيرَةُ أَرْبَعِينَ سَنَةً وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَيْهَا يَوْمٌ وَهُوَ كَظِيظٌ مِنَ الزِّحَامِ وَلَقَدْ رَأَيْتُنِى سَابِعَ سَبْعَةٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- مَا لَنَا طَعَامٌ إِلاَّ وَرَقُ الشَّجَرِ حَتَّى قَرِحَتْ أَشْدَاقُنَا فَالْتَقَطْتُ بُرْدَةً فَشَقَقْتُهَا بَيْنِى وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ فَاتَّزَرْتُ بِنِصْفِهَا وَاتَّزَرَ سَعْدٌ بِنِصْفِهَا فَمَا أَصْبَحَ الْيَوْمَ مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ أَصْبَحَ أَمِيرًا عَلَى مِصْرٍ مِنَ الأَمْصَارِ وَإِنِّى أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ فِى نَفْسِى عَظِيمًا وَعِنْدَ اللَّهِ صَغِيرًا وَإِنَّهَا لَمْ تَكُنْ نُبُوَّةٌ قَطُّ إِلاَّ تَنَاسَخَتْ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَاقِبَتِهَا مُلْكًا فَسَتَخْبُرُونَ وَتُجَرِّبُونَ الأُمَرَاءَ بَعْدَنَا. {الحديث: ٧٣٦١ = ٧٣٩٥ فم}:

خالیدی کوڕی عەمری ئەل-عەدەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عوتبەی کوڕی غەزوان، کاتێ فەرمانڕەوای سەر بەصرە بوو، وتارێکی بۆماندا، ستایش‌و سوپاسی خودای کردو فەرمووی: پاش سوپاسی خودا، واجیهان ملی پێوەناوەو نیشانەی کۆتایی‌و تەواوبوونی دەرکەوتووە، بەزوویی دەبڕێتەوە، ئەوەی کە لەدنیا ماوە، لەچاو ئەوەیدا کە ڕۆیشتووە، وەك خڵتەی بن جام وایە، کە خاوەنەکەی لەهەر چوار لای جامەکەوە کۆی بکاتەوە، تا بە تەواویی دایچۆڕێنێ!

بزانن کە ئێوە لەم جیهانە بێ بەقایەوە دەگوێزنەوە بۆ خانەی ئێجگاریی، کە بڕای بڕای بڕانەوەی نییە، دەی کەوایە زووکەن هەتا هەل لەکیس نەچووەو دەرفەت ماوە، هەرچی چاکەیەکتان لەدەست دێ، دریغی لێ مەکەن‌و لەپێش خۆتانەوە بیکەن‌و ڕەتی بکەن بۆ ئەو جیهان، چونکە خانەی ئێجگاریتان ئەوێیە، لەوێ کارتان بەچاکە زۆر زۆرەو پێویستیتان بەکاری چاکەی خۆتان هەیە، لەبەرئەوەی کە ڕۆژی ڕەشی زۆرتان لەپێشەوەیەو ڕێگەی سەختتان لەبەرە،

گەیشتۆتەوە بە ئێمە: کە بەردێ لەسەر لێواری دۆزەخەوە گلێر دەکرێتەوە، حەفتا ساڵ لەسەر یەك بەبێ وەستان هەر گلۆر دەبێتەوە، کەچی هێشتا هەر ناگاتە بنی!).

دە سوێندم بەزاتی خودا، ئەم دۆزەخە بەم گەورەییە پڕ پڕ دەبێ لەوانەی کە شایستەی ئەوەن کە بخرێنە دۆزەخ!!

ئەوە وادیارە کە ئێوە لەم باسە سەرسام دەبن و سەرتان سوڕ دەمێنێ!؟

دەسا لەلایەکی تریشەوە باس کراوە بۆمان، کە بەهەشت زۆر زۆر گەورەو پان و پۆڕو بەرینە، لەملا شیپانی دەرگاکانیەوە هەتا ئەولا شیپانەکەی چل ساڵ ڕێگەیە، دەی سا سوێندم بەزاتی خودا، ڕۆژێ دەبێ کە هەموو دەرگاکانی بەهەشت جمەیان دێ لەوانەی کە لێیانەوە دەچنە ژوورەوە بۆناو بەهەشتو، لەبەر قەرەباڵغی، دەروازەکانی بەهەشت جمەیان دێو مەردووم بە پاڵە پەستۆ دەچنە ژوورەوە.

با کەس بە خۆشیی و ناخۆشی جیهان نەنازێو دەسخەڕۆ نەبێ، ڕۆژێ بوو ئێمە حاڵمان وابوو، بە خۆمەوە حەوت کەس بووین، لەخزمەت پێغەمبەردا بووین (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی کە پێی بلێی خواردەمەنیو خۆراك نەمان بوو، گەڵای دارو درەختی ئەو بیابانە نەبێ، ئەوەندە گەڵا دارمان خواردبوو، لەتاو برسێتی، لالغاوەمان تەرەکی بوو، بوو بوو بە برینو زام!

ئەمەیش حاڵی پۆشتەو پەرداخیمان بوو، ڕووتو قووتو ڕەجاڵ بووین، عابەیەکم پەیداکرد، کردم بەدوو کەرتەوە، نیوەیم بۆ خۆم لەباتی دەرپێ کرد بە بەرکۆشو پێچام بەلای خواروومەوە، ئەو نیوەکەی تریشم دا بە سەعدی کوڕی مالیك ئەویش کردی بە بەرکۆشو پێچای بەخۆیەوە، لەجیاتی دەرپێ!

ئەوساکە ئەمە حاڵمان بوو، ئەوە گوزەرانمان بوو، ئەوە خواردنەکەمان بوو، ئەوەیش جلی شایی و شینمان بوو، ئەوەتانێ ئێستایش هەرکەسێ لە ئێمە دەبینی، یان میرو فەرمانڕەوای سەر شارێکە، یا پادشای سەر وڵاتێکە، ئەی خودایە! باییمان نەکەی و، پەنامان بدەی لەوە کە خۆمان لێ بگۆڕێو هەوا بکەینو لەدڵی خۆماندا خۆمان بەزل بزانینو لەلای تۆیش بچووكو بێ وەچو بێ بایەخ بین! (ئامین).

بیشزانن کە هەموو پەیامێکی پێغەمبەران، لەپاش خۆیان، لەپاش ماوەیێ بەرە بەرە کاڵ دەبنەوە، لە حاڵێکەوە دەگۆڕێن بۆ حاڵێکی تر، بەتایبەتی حاڵی فەرمانڕەواکانیان تەواو دەگۆڕێ تەنانەت لە ئەنجامدا دەوڵەتی ئیسلام دەبێ بە پادشایی‌و سەڵتەنەت‌و، رەفتاری بەرزی سەردەمی پێغەمبەرایەتی لەناو فەرمانڕەواو خاوەن دەسەڵاتەکاندا، بە حاڵ‌و بە ئاستەم شوێنەواری دەمێنێ!

دڵنیام کە ئێوە، ئەمەی من دەیڵێم، بەچاوی خۆتان لە فەرمانڕەواکانی پاش ئێمە دەیبینن، لەپاش ئەوە کە بە تەجرەبەو ئەزموون لە حاڵی ئێمەو لە حاڵی ئەوان، بەباشی حاڵی دەبن‌و بە بەراورد ئەمەتان بۆ دەردەکەوێ). {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٩٨ – خێرو بەهرەی برسێتی‌و سادەیی...}.

**روونکردنەوە:**

عوتبەی کوڕی غەزوانی موزەنی، لە هاوەڵە کۆچکارە پێشینەکانە، لەپێشا کۆچی کرد بۆ حەبەشە، لەپاشا لەگەڵ میقداددا کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئامادەی شەڕی بەدرو شەڕگاکانی پاش بەدر بووە، پێشەوا عومەر کردی بە سەرکردەی چەندین هەڵمەتی ئازادکردن، ئەو بناغەی شاری بەصرەی دانا، وڵاتی زۆری ئازادکرد، پیاوێکی قەدو باڵا بەرزی جوان بوو، موسلیم‌و خاوەن پەڕاوەکانی سونەن فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، نزیکەی پەنجاو حەوت ساڵ ژیاوە، خۆی لەخودا پاڕایەوە کە بمرێ وەخودا نزاکەی لێ گیرا کردو مرد (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

### ١٥٩٢) کەسوکارو ماڵ ئەگەر شوێن مردووش بکەون دەگەڕێنەوە، بەڵام کردەوەکەی لەگەڵی دەمێنێ. (٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

### بَابٌ: يَرْجِعُ عَنِ المَيِّتِ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عَمَلُهُ

٢٠٨٦- عَنْ أَنَسِ بْنَ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ -صلى الله عليه وسلم-: « يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاَثَةٌ فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى وَاحِدٌ يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ فَيَرْجِعُ

أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عَمَلُهُ ». {الحديث: ٧٣٥٠ = ٧٣٨٤ فم. بخاري. رقاق: ٦٥١٤. ترمذي. زهد: ٢٣٧٩. نسائي. جنائز: ١٩٣٦. تحفة: ٩٤٠}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سێ شت شوێن مردوو دەکەون‌و تاسەر لێواری گۆڕ لەگەڵی دەچن، بەڵام لەوێ دوانیان دەگەڕێنەوەو یەکێکیان لەگەڵی دەمێنێتەوە: کەسوکارەکەی‌و ماڵ‌و کردەوەی لەگەڵیا دەچن، بەڵام کەسوکارو ماڵەکەی دەگەڕێنەوە، تەنیا کردەوەکەی لەگەڵی دەمێنێ!). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٩، ژمارە: ١١٢٥} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٤٦١ + ریاض/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ١٠٤}.

## ١٥٩٣) تەماشای خوار خۆتانەوە بکەن. (٧٣٤٣ = ٧٣٨٨)

## بَابٌ: انظرُوا إلى مَنْ أسْفَلَ مِنْكُمْ

٢٠٨٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « انْظُرُوا إِلَى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَلاَ تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لاَ تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ ». قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ « عَلَيْكُمْ ». {الحديث: ٧٣٥٦ = ٧٣٩٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (تەماشای حاڵی لە خۆتان خوارتر بکەن، تەماشای لەخۆتان بەرەو ژورتر مەکەن، چونکە ئەگەر وانەکەن لەوانەیە ئەو نازو بەهرانەی کە بەپێی حاڵ، خودا داویانی پێتان، لەبەر چاوتان بکەون‌و بەکەمیان بزانن!).

گێڕانەوەی بوخاری ئاوایە: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە تەماشای حاڵ‌و ماڵی کەسێکی تری کرد، کە بە ماڵ‌و مناڵ‌و حاڵ‌و ڕەنگ‌و ڕوو لەخۆی باشتر بوو، با تەماشای حاڵی خوار خۆشیەوە بکا، نەبادا دڵ لەدڵ بداو نا سوپاس دەرچێ‌و سوپاسی بەهرەی خودا نەکاو خۆی بەهەرە خواروو بزانێ).

**روونکردنەوە:**

بەپێی ئەم فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەکی تر: موسوڵمان ئەمە بکا بە پێوەر:

١- بۆ کاری خێرو ئاییندارى تەماشای لای سەرووی خۆی بکاو، چاو لەو بکاو ئەو بکات بەسەر مەشقو هەوڵ بدا کە لەو بابەتەدا، وەك ئەو چاکەکاربێ، چونکە ئەمیش وەك ئەو هەوەجێی بەکاری چاکە هەیەو چاکە هەتا زۆربێ کەمە، ئەگەر بیگەیەنێتە ئەندازەى موسابەقەو مونافەسەو کێ بەرکێش زۆر باشەو سوننەتە وە بەوە ناگوترێ بەخیلیو حەسوودی، بەڵکوو ئەوە ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ:
{وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ – المطففين – ٨٣/٢٦}.

٢- بۆ ماڵو سامانو خاترو خۆتری جیهانیش، با تەماشای حاڵی خوار خۆی بکا، نەبادا تووشی نائومێدیو ناسوپاسیو حەسوودیو بەخیلی ببێ!!

٣- تەنانەت سوننەتە پیاو لەکاری چاکەدا، چاو لە ئافرەت بکا، هەروەها بە پێچەوانەوە، بەوە ناگوترێ تەشبُهو چاو لێکەری لە ژنان، یا چاولێکەری ژنان لەپیاوان کە لە شەرعو فەرموودەی پێغەمبەردا، نەفرەتو لەعنەت کراوە لەپیاوی سەر ژنانیو لەژنی کوڕانی.

## نوێژە بارانە

ئەمڕۆکە ٢٠١٠/١١/٢٩ زاینییە لەهەموو شارەکانی هەرێمی کوردستانی عێراقا، نوێژە بارانەیەکی زۆر ڕێكو پێكو جوان ئەنجام درا، بە ئومێدی بارینی باران، چونکە بارانو پەڵە زۆر دواکەوتووە! منیش دەمەوێ بەم چیرۆکەی خوارەوە بەشداری بکەم:

## خانەقای بیارەی شەریف

بیارە گوندێکی قەشەنگە، وا لەسەر سنووری عێراقو ئێران، وا لەناوچەیەکی شاخاویدا، لەبەر چڕی دارو درەختو باخو ڕەزو دێبەر، هەتا نەچیتە ناوی، هەستی پێ ناکەی، دەڵێیت ئەم شیعرانە لە وەسپو مەدحی ئەوێدا گوتراوە:

جَنَّــابٌ تَجْــرِي تَحْتَهَـــا الأَنْهَـــارْ
جِبَـــالٌ تَسْــرِي فَوْقَهَـــا الأَنْـــوَارُ
بَـــيْنَ ذِي وَتِـــى، حُقُــولُ الأَزْهَـــارْ
نِعْـــمَ المَـــوْطِنُ، وَنِعْمَـــتِ الـــدَّارْ

گوندی بیاره بەناوی خانەقای بیارەوە، هەروا بەناوی خوێندنگای بیارەوە ناوی دەرکردووە، بەڵکوو بیارە ناودارە بە ئەزهەری کوردستان، زیاتر لە دوو سەد ساڵە، بیارەو فێرگەی بیارە بووە بە مەڵبەندێکی رۆشنبیری ئیسلامی، لەم ماوەیەدا هەمیشە شێخی مورشیدی کامڵی لێ بووە، بەواتای وتە، خۆیان تەرخان کردووە بۆ خزمەتی دینو دنیای میللەتی خۆیان، وەك شێخی ضیاء الدینو شێخی علاءالدینو شێخی بهاءالدین (رەحمەتو رەزای خودایان لێ بێ). ئەم زاتانە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، رابەریی رۆحی جەماوەرێکی زۆریان کردووە، وە موریدو مەنسووبو عەلاقەمەندانێکی مولتەزیمی زۆریان بووە، بە تەواتوری مەعنەوی چەسپاوە، کەراماتی شەرعی لە شێخەکانو لە موریدەکانیان، ناو بەناو بینراوە، وە بەواتای وشە خانەقای بیارە لقێ بووە لە درەختی طووبای مەدینەی مونەوەرە، هەمیشە کۆمەڵێ سۆفیو موریدو سۆفیلکەو پیاوی لێبڕاو بۆ خودا لە خانەقادا سەرگەرمی زیکرو یادی خودا بوونو خەریکی شەو نوێژو قورئان خوێندنو خەتمە بوون، نموونەیێ بوون لە کۆمەڵەی سەکۆی صوففەی مزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە نزای باشیان بۆ خۆیانو نەتەوەی ئیسلام کردووە.

لەهەمووی گرنگتر زۆرینەی موریدانی شێخانی خانەقای بیارە، فەقێو مەلاو شاعیرانو مرۆڤی رۆشنبیرو زاناو دانایان بوون، لەبەرئەوە هەرگیزاو هەرگیز بیدعەتو بێ شەرعیو شەطەطو شەطحاتو شتی وا، لە بیارە نەبوون!

پیاوی وەك مەولەویو مەلا عەبدولقادری گەورەو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارەو مەلا باقری باڵەکی شانازییان بە بیارەوە کردووە. من بەچاوی خۆم دیومە شەوو رۆژ، چوار وەرزە، خانەقا لەبەر میوانو دێنی کاران،

وەك میوان خانە وابوو، کۆمەڵ کۆمەڵ میوان دەڕۆیشتنو، کۆمەڵ کۆمەڵ میوانی نوێ دەهاتن، سەیر لەوەدا بوو، میوان زۆر بوایەو کەم بوایە، وەك یەك جێو ڕێو نانو ئاو هەبوو، کاتێ میوان دەگەیشتە خانەقا، ئەمە بەرنامەکەی بوو:

١- لە خانەقا چەندە دەتوانێ ئامادەی نوێژی جەماعەتو خەتمەو ئەڵقەی زیکربێو لەخودا داوای خێری دینو دنیا بۆ خۆیوماڵو منداڵیو ئازیزانی بکات.

٢- زیارەتی مەحاسینی شەریف بکا، کە بریتییە لە چەند موویەکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وان لەناو شووشەیەکی قەپەتا، شووشەکە وا لەناو سوندوقێکی ئاسنی قایمی قفڵدراودا، سندوقەکەیش وا لەناو تاقێکی داخراودا، کە تاقەکە وا لەناو دیوارێکا، لە شوێنێکی وادایە کە لەدەرەوەی خەڵك بتوانن زیارەتی بکەن، جاران لەکاتی بێ بارانیدا مەحاسینی پیرۆزیان لەگەڵ بەیداخێکا دەهێناو بەیداخەکەیان لە حەوزەکەی بیارە هەڵدەکێشا، ئەوسا خێرو صەدەقەو نوێژە بارانەیان دەکرد، سُبْحَانَ اللهُ! زۆرینەی کات بەم بۆنەیەوە بارانی ڕەحمەت دەبارێ.

٣- مەبەستێکی تری میوان ئەوەبوو کە بەخزمەت شێخ بگاو دەستی زیارەت بکا، لە خزمەتیدا بەپێی بواری گونجاو دابنیشێو داوای دوعاو نزای خێری لێ بکا. شێخەکانیش هەتا بڵێی بێ هەواو هێمنو داناو زانا بوون، بەپێی ژیریو پلەی زانیاری خەڵکەکە ئاراستەو ڕابەریی باشیان دەکردن، هەرکەسێ بەپێی حاڵ، گفتوگۆیان لەگەڵ دەکردن، گەلێ جار لەبارەی ئادابی سولووکەوە قسەیان بۆ دەکردن، بە مژدەی خۆش دڵیان خۆش دەکردن، ئەوەی کە جێگەی سەرنج بوو، هەمیشە شێخ چاوی تەڕ بوو، دڵی پڕبوو لە گریان، بەزەوی تەواوی بەو خەڵکە پەرۆشەدا دەهاتەوە، زمان حاڵیان دەیفەرموو: (خودایە! تەریقمان نەکەیتەوە، هەموو شت بەدەستی خۆتە، ئێمە هیچمان بەدەست نییە، ئێمەیش تاکێکین لە تاکەکانی خانەقا).

لەڕاستیدا خەڵکەکە خۆیان ئەوەندە موسوڵمانێکی پاك بوون، جێگەکەیش ئەوەندە پاكو پیرۆز بوو، لەلایێ فێرگەی ئایینی، لەلایێ مەحاسینی شەریف،

لەلایێ کۆمەڵێ خوا ناسی پیاو چاك، لەبەرئەوە زۆرینەی کات پاڕانەوەو نزای خەڵکەکە گیرا دەبوو، نیازو مرازیان دەهاتە دی، ئەوەیش بوو بەجوانترین بەڵگەو ناوی جوان بۆ بیارەو خانەقای بیارە!

ئەمەی من عەرزتان دەکەم، سەبارەت بە بیارە، راسترین پێناسەو بەیانی واقیعی بیارەیە، وە ئەمەیش گەورەترین بەهرەو پیتو فەڕەو پێویست بەزیادە رەوی تر ناکا لەم بارەیەوە!

جا زۆرباش لە یادمە، شێخی عەلائەددین (رەحمەتی خودای لێ بێ) مابوو، ساڵێ لەبەهارا، بێ بارانییەکی سەخت بوو، لە زەوی کڕین گیاو دەغڵ وشك بوو، شێخی عەلائەددین دەعوەتی هەموو مەلاو فەقێی سلێمانیو هەڵەبجەو ئەو دەوروبەرەی کرد، کە تەشریف بەرن بۆ بیارە، نوێژە بارانە بکەنو ئەم ئایەتە حەفتا هەزار جار بخوێنن، هەموو جارێ بیخوێنن بەسەر بەردێکی بچووکداو بەردەکە فڕێ بدەنە ناو ئاوێکەوە، خوا حەزکا بارانمان بۆ دەبارێ. ئایەتەکە ئەمەیە:

{وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِن بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُ وَهُوَ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ – الشورى – ٤٢/٢٨}.

جا مەلاو فەقێیەکی زۆر لە بیارە کۆبوونەوە لە سەرووی بیارەوە نوێژە بارانەیان کرد، ئایەتەکەمان خوێند، نانی نیوەڕۆمان خوارد لەوێ، شێخ عەلائەدین شەش حەوت مەڕی داپێمان ئەوسا بەشی ژەمێکی کردین، لە نوێژی عەسردا شەستە باران هەڵی فڕاندین هەتا ناو خانەقا، وە بارانێکی زۆری واباری دنیای زیندوو کردەوەو بەهارەکەی تازە کردەوە! خودایە! بە بەرەکەتی ئەم کتێبە پیرۆزە، بارانی رەحمەتمان فریابخە (سوپاس بۆ خودا، بارانێکی سەقامگیر باری، ئێستا لەم چرکە ساتەدا بارانێکی خۆشە ٢٠١١/١/١٥).

ئەمەی من دەیڵێم یەك لە هەزارە
لە پیت و فەڕو بەهرەی بیارە
لە گەردی بەردی، دەڕێژم چاوم
بەشکم بینا با، هەتاکوو ماوم!!

فێرگای بیارە، هەمیشە نزیکەی (٧٠ - ٨٠) خوێندکاری لێ بوو، زۆرینەی مەلا باشەکانی سەراسەری کوردستان دەرچووی فێرگەی بیارەن!! ژیوارو بژێوی ئەم فەقێیانە لەسەر شێخی بیارە بوو، هەروا جێگەو ڕێگەو بژێوی ماموستاکانیان.

یادگارو یادەوەری زۆرم لەبارەی بیارەوە هەیە، شەوانی هەینی کە خەتمە دەکرا، لەبەرئەوەی عوتلەو مۆڵەتی فەقێیان بوو، فەقێش ئامادەی خەتمەی ناو خانەقا دەبوون، تەزبیحێکیان دەهێنا، بەگوش هۆنرابۆوە، لە گونیەیەکی خەت سووردا بوو، هەزار دەنك دەبوو، دەنکەکانی لە داری هەنجیر دروست کرابوون، هەر دەنکەی لە گوێزێ گەورەتر بوو، بە ئەڵقە دادەنیشتن، نزیکەی سەد کەس زیاتر، سەر خەتمەکە زیکرێکی دەست پێ دەکرد، هەرکەسێ لەبەردەمی خۆیەوە، بەرە بەرە، بەدەنکی تەزبیحەکە زیکرەکەی دەژمارد، تەزبیحەکە یەك چەرخەی بکردایە، خەتمەیەك بەزیادەوە تەواو دەبوو، ئەوەندە حەزم لەو دیمەنە بوو، کە گوش — واتە: بەن — ی تەزبیحەکە دەپچڕا، بەیەك دەنگ یادکارەکان دەیانگوت: تەزبیحەکە شەهیدبوو!).

ئیتر یەکسەر تەزبیحە پچڕاوەکەیان لادەبردو تەزبیحێکی تریان لە گونیەیەکی تردا دەهێنا!!

وام لێهاتبوو جاروبار فرسەتم دەست دەکەوت، بەدزییەوە، بە قەڵەم بڕێ، پەتی تەزبیحەکەم دەپچڕاند، دەبێ ئەوە بزانی کە کاتێ زیکر گەرم دەبوو، چراکە تەواو تەواو کز دەکرا!!

زۆرم حەز لە بینینی کەرامەت بوو، بەڵام هیچم نەدی، بە قسەی فەقێکانی هاوەڵم: هەرکەسێ لەناو خەتمەکەدا، کە چراکە کزدەکرێ، چاو هەڵبڕێ، چاوی کوێردەبێ، منیش بە خەیاڵی بینینی کەرامەت، لەناو خەتمەی شەوانی هەینیدا، چاوم زەق زەق دەکردەوە!

لەلای سەرووی بیارەوە جۆگەیەك هەبوو، دەیانگوت: ئەمبەری عێراقەو ئەوبەری ئێرانە، زۆرجار بەیەك باز لە جۆگەکە دەپەڕینەوە، جا لەشوێنانی تر،

وەك مەتەڵ، سوێندمان دەخوارد بۆ کەسانی تر، کەمن بەیەك باز لە عێراقەوە چوومەتە ئێران، ئەویش هەرچەندی دەکرد ئەم مەتەڵەی بۆ هەڵنەدەهێنراو بەدەستییەوە دادەما!!

## ١٥٩٤) خودای گەورە بەندەی پارێزگاری لەخوا ترسی داراو دەوڵەمەندی خۆشارەوەی خۆشدەوێ. (٧٣٤٣ - ٧٣٨٨)

## بَابٌ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ الْتَّقِيَّ الْغَنِيَّ الْغَفِيَّ

٢٠٨٨- عَنْ عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ سَعْدُ بْنُ أَبِى وَقَّاصٍ فِى إِبِلِهِ فَجَاءَهُ ابْنُهُ عُمَرُ فَلَمَّا رَآهُ سَعْدٌ قَالَ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ هَذَا الرَّاكِبِ فَنَزَلَ فَقَالَ لَهُ أَنَزَلْتَ فِى إِبِلِكَ وَغَنَمِكَ وَتَرَكْتَ النَّاسَ يَتَنَازَعُونَ الْمُلْكَ بَيْنَهُمْ فَضَرَبَ سَعْدٌ فِى صَدْرِهِ فَقَالَ اسْكُتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ التَّقِىَّ الْغَنِىَّ الْخَفِىَّ ».
{الحديث: ٧٣٥٨ = ٧٣٩٢ فم}:

عامیری کوڕی سەعد فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) لەناو وشترەکانیدا بوو، عومەری کوڕی بەسواری هات بۆلای، کاتێ سەعد چاوی بە عومەری کوڕی کەوت هەستی بە جۆرە توڕەییەك کرد، لەبەرئەوە فەرمووی: پەنا دەگرم بەخودا لە شەڕی ئەم سوارە کە عومەری کوڕی خۆمە! جا عومەر لە وڵاخەکەی دابەزیو هات بۆلای باوکیو پێی گوت: ئەمە تۆ خەریکی چیت، هاتوویت بۆناو رانە وشترو رانە مەڕو بزنەکانت، هاوڕێکانی تۆیش ئەوەتانێ لەسەر دەستەڵاتو پادشایەتی لەناو مەدینەدا شەڕو هەرایانە؟ دیارە کە ئەم گفتوگۆیە لەسەردەمی ئاژاوەو ئاشووبەکەدا بووە.

سەعدیش ماڵی بە سینگی عومەری کوڕیداو گوتی: بێدەنگبە، بەگوێی خۆم لە پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستم بیست دەیفەرموو: (خودا بەندەی لەخودا ترسی دەوڵەمەندی شاراوەی خۆشدەوێ). {ریاض/٢، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٥٩٧ — گۆشەگیری لەکاتی خراپبوونی}.

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لە دەوڵەمەند لەم فەرموودەیەدا، کەسێ بێ بەماڵ دارا بێ، دەروونی تێربێ، چاو برسی نەبێ، هەڵپە بۆ حەرام نەکا، مافی خوداو بەندەکانی خودا لە سامانەکەی بدا، دەنا دەوڵەمەندی لەخودا ترسی پارێزگار نابێ. مەبەست لە شاراوەیش ئەوەیە: کە گۆشەگیربێ‌و لەناو خەڵکا فشەو شانازی بە سامانەکەیەوە نەکاو بەهۆی ماڵەکەیەوە خۆی لێ بایی نەبێ‌و خۆی لێ نەگۆڕێ‌و بەماڵ بوغرا نەبێ.

**١٥٩٥) کەسێ کارێ بکاو کەسێکی تر بکا بەهاوبەشی خودا.** (٧٤٠٠ - ٧٤٠٥)

**بَابٌ: مَنْ أَشْرَكَ فِي عَمَلِهِ غَيْرَ اللهِ سُبْحَانَهُ**

٢٠٨٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِى غَيْرِى تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ ». {الحديث: ٧٤٠٠ = ٧٤٣٥ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست‌و ئازیزو نازدار (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی، لە فەرمودەیەکی قودسیدا: (خودای گەورەو بێ هاوتا دەفەرمووێ: من لە هەموو کەسێ زیاتر بێ نیازم بە هاوبەش‌و بێ هەوەجێ ترم بە شەریك، جا هەرکەسێ کارێ باش، یا پەرستشێ جوان بکاو کەسێ تر بکا بە هاوبەشی من لەو کارو کردەوەیدا، ئەوە بە خۆی‌و بە هاوبەشەکەیەوە تووڕی دەدەم، کارو کردەوەی وا لەلای من پەسەند نییە). {تاج/١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٩٣ — هەڕەشەکردن لە ریاکاری...}.

**١٥٩٦) هەرکەسێ بۆ ناوبانگ‌و شۆرەت چاکەو خوا پەرستی بکات، لە ڕۆژی دوا ڕۆژدا خودا بە پەندی دەکا.** (٧٤٠٠ – ٧٤٠٥)

**بَابٌ: مَنْ سَمَّعَ وَرَاءَى بِعَمَلِهِ**

٢٠٩٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ وَمَنْ رَاءَى رَاءَى اللَّهُ بِهِ ». {الحديث: ٧٤٠١ = ٧٤٣٦ فم. تجريد البخاري/٥، رقم: ٢٠٢٢ = ٦٤٩٩ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٥٦١٦}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لە خۆیو باوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بۆ ناوبانگو شۆرەت، چاکەو خودا پەرستی بکا، خودا لە جیهانا دەیکا بە پەندو، لە قیامەتیشا بێ پاداشی دەکاو تەریقی دەکاتەوە، وە هەر کەسێ بۆ ڕواڵەتو ریا بازی هەر کارێ بکا، خودا لە ڕۆژی قیامەتدا پەردەی لەروو هەڵ دەماڵێو ریا بازییەکەی ئاشکرا دەکا). {تاج/١، زنجیرە:١٢، ژمارە: ٩٢، لاپەڕە: ٦٥، چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەوانەی کە کاری چاکە دەکەنو ناوی جوانی پێ دەردەکەنو خەڵك لەسەر کردنی ئەو کارە چاکە وەسپیان دەکەن، وەك کەسێ مزگەوتێ دەکا، بیرێ وەقف دەکاو، مەردوم لەسەر ئەوکارە چاکە دەست خۆشییان لێ دەکەنو ڕەحمەتیان بۆ دەنێرنو ناوی جوانیان دەزرێنن، ئەمانە هیچی بەر نەهیی ئەم فەرموودەیە ناکەوێ، بەڵکوو وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ: ئەوە نۆبەرەی جوانی موژدەی موسوڵمانە).

**١٥٩٧) وادەبێ گوتیار بەهۆی یەك قسەوە دەخزێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.**

**(٧٤٠٦ - ٧٤٠٧)**

## بَابٌ: المتكلِّمُ بِالكَلِمَةِ يَهْوِى بِهَا فِي النَّارِ

٢٠٩١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) َنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ: « إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مَا يَتَبَيَّنُ مَا فِيهَا يَهْوِى بِهَا فِى النَّارِ أَبْعَدَ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ». {الحديث: ٧٤٠٦ = ٧٤٤١ فم. تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى/٥، رقم: ٢٠١٤ = ٦٤٧٧ فتح البارى. ترمذى. زهد: ٢٣١٤. تحفة الأشراف: ١٤٢٨٣}:

ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وادەبێ کە بەندەیێ قسەیێ دەکا، هۆی خۆشنوودیو ڕەزامەندیی خودایە، ئەوەندەیش دڵی ناداتێ، کەچی بەهۆی گوتنی ئەو قسەیەوە، چەندین پلەو پایە خودای گەورە بەرزی دەکاتەوە پێی، هەروەها ڕێ دەکەوێ کە بەندەیێ قسەیێ خراپ لە دەمی دەردەچێ، هۆی ڕقو تووڕەیو نارەزایی خودای گەورەیە، ئەوەندەیش دڵی پێ ناداو ناچێتە بنجو بناوانیو بەباشی لێی ورد نابێتەوە، هەتا بزانێ قسەکەی کوێ دەگرێتەوە، کەچی بەهۆی ئەو قسەیەوە دەخزێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٥٤، ژمارە: ١٥١٥ + ١٥١٦ + تاج/٥، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٥١٢٩ + تاج/٥، زنجیرە: ٢، ژمارە: ژ٥١٢٨ — پاراستنی زمان گەرەکە}.

### ١٥٩٨) کاری موسوڵمان گشتی هەر خێرە. (٧٤٠٠ - ٧٤٢٥)

### باب: المُؤمِنُ أمْرُهُ خَيْرٌ كُلُّهُ

٢٠٩٢- عَنْ صُهَيْبٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ ». {الحديث: ٧٤٢٥ = ٧٤٦٠ فم}:

صوهەیبی رومی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاری موسوڵمان جێگەی سەرسوڕمانە هەموو کارو فرمانێکی هەر مایەی خێرە بۆی، ئەمەیش هەربۆ موسوڵمان وایەو بەس، ئەگەر تووشی خێرو بێرێ بوو، سوپاسی خودای کرد، دەبێ بەمایەی خێر بۆی، خۆ ئەگەر تووشی زیانێ بوو، وە ئارامی لەسەر گرت، ئەوا هەر دەبێ بەمایەی خێر بۆی).

## ١٥٩٩) ئارامگرتن لەسەر پابەندبوون بە ئایینەوە لەکاتی دووچار بوونو گرفتاربوونو داستانی دەستەی خەندەکە ئاگرینەکان. (٧٤٣٦)

## بَابٌ: فِي الصَّبْرِ عَلَى الدِّينِ عِنْدَ الإِبْتِلاَءِ وَقِصَّةُ أَصْحَابِ الأُخْدُودِ

٢٠٩٣- عَنْ صُهَيْبٍ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ: « كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ وَكَانَ لَهُ سَاحِرٌ فَلَمَّا كَبِرَ قَالَ لِلْمَلِكِ إِنِّى قَدْ كَبِرْتُ فَابْعَثْ إِلَىَّ غُلاَمًا أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ. فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلاَمًا يُعَلِّمُهُ فَكَانَ فِى طَرِيقِهِ إِذَا سَلَكَ رَاهِبٌ فَقَعَدَ إِلَيْهِ وَسَمِعَ كَلاَمَهُ فَأَعْجَبَهُ فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَقَعَدَ إِلَيْهِ فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ فَقَالَ إِذَا خَشِيتَ السَّاحِرَ فَقُلْ حَبَسَنِى أَهْلِى. وَإِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ فَقُلْ حَبَسَنِى السَّاحِرُ. فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَتَى عَلَى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتِ النَّاسَ فَقَالَ الْيَوْمَ أَعْلَمُ آلسَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمِ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ فَأَخَذَ حَجَرًا فَقَالَ اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ السَّاحِرِ فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ حَتَّى يَمْضِىَ النَّاسُ. فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا وَمَضَى النَّاسُ فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ أَىْ بُنَىَّ أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّى. قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرَى وَإِنَّكَ سَتُبْتَلَى فَإِنِ ابْتُلِيتَ فَلاَ تَدُلَّ عَلَىَّ . وَكَانَ الْغُلاَمُ يُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَيُدَاوِى النَّاسَ مِنْ سَائِرِ الأَدْوَاءِ فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِىَ فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ فَقَالَ مَا هَا هُنَا لَكَ أَجْمَعُ إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِى فَقَالَ إِنِّى لاَ أَشْفِى أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِى اللَّهُ فَإِنْ أَنْتَ آمَنْتَ بِاللَّهِ دَعَوْتُ اللَّهَ فَشَفَاكَ. فَآمَنَ بِاللَّهِ فَشَفَاهُ اللَّهُ فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ قَالَ رَبِّى. قَالَ وَلَكَ رَبٌّ غَيْرِى قَالَ رَبِّى وَرَبُّكَ اللَّهُ. فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلاَمِ فَجِىءَ بِالْغُلاَمِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ أَىْ بُنَىَّ قَدْ بَلَغَ مِنْ سِحْرِكَ مَا تُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَتَفْعَلُ وَتَفْعَلُ . فَقَالَ إِنِّى لاَ أَشْفِى أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِى اللَّهُ. فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الرَّاهِبِ فَجِىءَ بِالرَّاهِبِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ. فَأَبَى فَدَعَا بِالْمِئْشَارِ فَوَضَعَ الْمِئْشَارَ فِى مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِىءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ. فَأَبَى فَوَضَعَ الْمِئْشَارَ فِى مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِىءَ بِالْغُلاَمِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ. فَأَبَى فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذُرْوَتَهُ فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلاَّ فَاطْرَحُوهُ فَذَهَبُوا بِهِ فَصَعِدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ. فَرَجَفَ

بِهِمُ الْجَبَلُ فَسَقَطُوا وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ قَالَ كَفَانِيهِمُ اللَّهُ. فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ اذْهَبُوا بِهِ فَاحْمِلُوهُ فِي قُرْقُورٍ فَتَوَسَّطُوا بِهِ الْبَحْرَ فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلاَّ فَاقْذِفُوهُ. فَذَهَبُوا بِهِ فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ. فَانْكَفَأَتْ بِهِمُ السَّفِينَةُ فَغَرِقُوا وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ قَالَ كَفَانِيهِمُ اللَّهُ. فَقَالَ لِلْمَلِكِ إِنَّكَ لَسْتَ بِقَاتِلِي حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ. قَالَ وَمَا هُوَ قَالَ تَجْمَعُ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَتَصْلُبُنِي عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ خُذْ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِي ثُمَّ ضَعِ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قُلْ بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلاَمِ. ثُمَّ ارْمِنِي فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ قَتَلْتَنِي. فَجَمَعَ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَصَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ أَخَذَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قَالَ بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلاَمِ. ثُمَّ رَمَاهُ فَوَقَعَ السَّهْمُ فِي صُدْغِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ فِي صُدْغِهِ فِي مَوْضِعِ السَّهْمِ فَمَاتَ فَقَالَ النَّاسُ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ. فَأُتِيَ الْمَلِكُ فَقِيلَ لَهُ أَرَأَيْتَ مَا كُنْتَ تَحْذَرُ قَدْ وَاللَّهِ نَزَلَ بِكَ حَذَرُكَ قَدْ آمَنَ النَّاسُ. فَأَمَرَ بِالأُخْدُودِ فِي أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَخُدَّتْ وَأَضْرَمَ النِّيرَانَ وَقَالَ مَنْ لَمْ يَرْجِعْ عَنْ دِينِهِ فَأَحْمُوهُ فِيهَا. أَوْ قِيلَ لَهُ اقْتَحِمْ. فَفَعَلُوا حَتَّى جَاءَتِ امْرَأَةٌ وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَتَقَاعَسَتْ أَنْ تَقَعَ فِيهَا فَقَالَ لَهَا الْغُلاَمُ يَا أُمَّهِ اصْبِرِي فَإِنَّكِ عَلَى الْحَقِّ ». {الحديث: ٧٤٣٦ = ٧٤٧١ فم}:

صوهەیبی رۆمی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پادشایێ لەپێشینان، جادووگەرێکی هەبوو، کاتێ پیر دەبێ بە پادشا دەڵێ: ئەوا من پیربووم‌و پەکم کەوتووە، کوڕێکی جەهێڵ بنێرە بۆلام، هەتا بەرە بەرە فێری زانستی جادووگەریی بکەم، ئەویش کوڕێکی بۆنارد، کە فێری جادووگەری بکا، چونکە جادوو بازی‌و جادووگەریی لەلای پاشاو فیرعەونە کۆنەکان، رۆڵێکی کاریگەری دەبینی، بۆ تەفرەدان‌و فریودانی گەل‌و نەتەوە، ئەو کوڕە گشت رۆژێ دەڕۆشت بۆلای جادوو بازەکە، وانەی جادوو بازی لەلا دەخوێند، رەبەن (راهیب = صۆفی = خواناس)ێکی لەڕێگادا بوو، لەلای دادەنیشت‌و گوێی لەقسەکانی دەگرت‌و قسەکانی زۆر بەدڵ بوو، جا سکاڵای ئەم حاڵەی لەلای خودا ناسەکە کرد. ئەویش تەگبیری بۆ کردو پێی گوت: لەمەولا

ئەگەر مەترسیت لە جادوو بازەکە هەبوو، ئەوا بڵێ: لەماڵەوە دوایان خستمو درەنگیان بەسەر هێنام، وە ئەگەر ترست لەماڵەوە هەبوو بڵێ: جادوو بازەکە دواى خستم!!

ئیتر هەتا ماوەیەك لەسەر ئەم حاڵە مایەوە، هەتا ڕۆژێ مارێکی حەفیانی بینی، ڕێگەى لە ڕێبوار بردبووە بەست. کوڕەکە گوتی: ئەمڕۆ تاقی دەکەمەوە، بابزانم کە ئایا جادووگەرەکە باشترە یان خوا ناسەکە، وە دەردەکەوێ کە ڕێگەى کامیان دروستو ڕاستە!

ئەوجا بەردێکی هەڵگرتو گوتی: خودایە! ئەگەر کاری خواناسەکەت خۆشتر دەوێ، لەکاری جادووگەرەکە، ئەوا بەم خڕکە بەردە ئەم دەعبایە بکوژە، هەتا ڕێگەکە بکرێتەوە بۆ ئەم خەڵکەو بڕۆن بەڕێگەى خۆیاندا، وە پەڵە بەردەکەى پیادا کێشاو مارەکەى کوشتو ڕێگەکە بەربوو، خەڵکەکە ڕۆشتن بە ڕێگەى خۆیانەوە، ئەنجا کوڕە فەقێکە چوو بۆلاى صۆفیلکەى مامۆستاىو باسەکەى بۆى گێڕایەوە، ئەویش پێی فەرموو: ئەى کوڕی خۆم! ئەمڕۆ تۆ لەمن باشترى، ئەوەتانێ لەسایەى خوداوە گەیشتیت بەم پایە بەرزە، بەڵام بزانە کە فەرمانی خودا وایە تۆ تاقی دەکرێیتەوەو تووشی دەردی سەری دەبی، جا ئەگەر دووچاری تاقیکردنەوە بوى، ڕاستی لەمن مەڵێو ناوی من مەهێنە. ئیتر ڕۆژ بەڕۆژ کوڕەکە کاری گەورەترى دەکرد، هەتا واى لێهات، بەفەرمانی خودا، کوێری سکوماى چاك دەکردەوەو بەڵەکی خۆش دەکردەوەو، دەرمانی هەموو دەردێکی تری دەکرد.

لەوسەردەمەدا وەزیری پاشا کوێر دەبێو ناوبانگی کوڕە فەقێ دەبیستێو بە دیارىو دەسەنەیەکی زۆرەوە دەچێ بۆلاىو پێی دەڵێ: ئەم هەموو دیاریانەم هێناوە بۆت، ئەگەر چاکم بکەیتەوە گشتی بۆ خۆت. ئەویش دەڵێ: من کەس چاك ناکەمەوە، هەر خوداى مەزن چارەو شیفا دەداو نەخۆش چاك دەکاتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەگەر موسوڵمان ببیتو باوەڕ بکەى بە خوداى گەورە، ئەوا منیش بۆت دەپاڕێمەوەو خودایش چاکت دەکاتەوە.

ئەوسا وەزیـری هاونشینی پاشا بـاوەڕ دەهێنـێو خـودا چاوی چاك دەكاتـەوە، ئەوجا وەك جاری جاران چوو لـە كۆڕو مەجلیسی پاشادا، دائەنیشـێ، پاشان پێـی دەڵێ: كێ چاوتی چاك كردەوە؟ دەڵێ: خودا، دەڵێ: بۆ تـۆ بێجگـە لـەمن خودایـەكی ترت هەیە؟ وەزیر گوتی: خودای منو خودای تۆ یەك كەسە، كەناوی یەزدانی پاكە، تۆیش عەبدو بەندەیەكی وەك من!

جا پاشا دەیگرێو هەر سزاو ئەشكەنجەی دەدا، هەتا راستی لە كوڕەكە دەدا، جا كوڕە فەقێكە دەهێنێ، پاشا پێی دەڵێ: ئەی كوڕم! چۆن جادووگـەرێكت لێ دەرچـوو! ئەوەتا كوێری سكماكو گول چاك دەكەیتـەوەو بەڵـەك خـۆش دەكەیتـەوەو ئەمـە دەكـەیتو ئـەوە دەكـەیت، بەڕاسـتی گەیشـتووی بـە پایەیـەكی بـەرز لـە زانسـتی جادووگەریدا.

كوڕەكەیش گوتی: مـن لەخۆمـەوە كـەس چـاك ناكەمـەوە، هـەر خـودای گـەورە هـەموو نـەخۆشو دەردەدارێ چـاك دەكاتـەوە، ئـەوەی كـە لەدەسـت مـن بێـت: ئەوەندەیە نزا لەخودا دەكەمو لێی دەپاڕێمەوە، جا پادشا ئەویشی گـرتو دەیخاتـە ژێـر ئـازارو ئەشـكەنجەو چـەرمە سـەریێ دەدا، هـەتا راسـتی لـە مامۆسـتا خواناسـە راهیبەكەی دەدا!

جا راهیبەكەشیان هێنا، پێی دەڵێن: واز لەم ئایینە بهێنە. ئەویش رازی نەبوو، جا پادشا فەرمان دەدا، بە شەقە مشار لە تەوقی سەریەوە دەیكەن بـەدوو لەتـەوە، كەرتەكانی یەكێكیان دەكەوێ بەم دیوداو ئەوی تریان دەكەوێ بەو دیودا!

ئینجا هاودەمەكەی پاشایان هێنـاو داوایـان لـەویش كـرد، كـە كـافرو بـێ بـاوەڕ ببێتەوە، بەڵام رازی نەبوو، كەبۆ لالوێچێ خوێن دینی بفرۆشێ، جا پاشا بەدەسـتی خۆی مشاری دانا لەسەر تەپڵی سەریو كردی بەدوو پارچەوەو پارچەكانی ئـەویش كەوتن بەم دیوو ئەو دیودا!

ئـەوجا كـوڕە فـەقێیان هێنـاو پێیـان گـوت: واز لـەدینی خـۆت بهێنـە، ئـەویش قـەبووڵی نـەكرد، جا پادشا كوڕەكـەی دایـە دەسـتی چـەند كەسـێ لـە دەسـتو پـای

خۆی‌و گوتی: بڕۆن بیبەن بۆسەر لووتکەی ئەو کێوە، ئەگەر لە ئایینەکەی خۆی پەشیمان بۆوە ئەوا باشە، ئەگینا لە لووتکەی شاخەکەوە بیخەنە خوارەوە، جا کاتێ دەیبەن‌و سەری دەخەنە سەر چیاکە، کوڕەکە لەخودا دەپاڕێتەوەو دەڵێ: خودایە! خۆت چۆن بەباشی دەزانی ئاوا ئەمانەم لەکۆڵ بکەرەوە، ئیتر کێوەکە دەکەوێتە لەرزە لەرزو هەموویان لە ماهی زەردەکە هەڵدەدێرێن‌و هەپروون هەپروون دەبن‌و دەمرن‌و، کوڕە فەقێ بەپێ دەگەڕێتەوە بۆلای پاشا، پاشا پێی دەڵێ: ها دیمانەت بەخێر! هاوڕێکانت کوان چییان بەسەر هات؟ دەڵێ: خودا بۆ خۆی چاری کردن‌و لەکۆڵمی خستن!

ئەمجار پادشا کوڕە دەداتە دەستی دەستەیەکی تر، لە یارانی خۆی‌و دەڵێ: لە کەشتییەکدا بیبەن هەتا دەیبەنە ناو نێرینەو ناوەڕاستی دەریا، لەوێ ئەگەر کافر بۆوەو پەشیمان بۆوە ئەوا باشە، دەنا تووڕی بدەنە ناو شەپۆلی دەریاکەوە، لەڕێ کوڕەکە دەڵێ: خودایە! خۆت چۆنی بەباش دەزانی ئاوا ئەم نامەردانەم لەکۆڵ بخەرەوە. ئیتر کەشتییەکە هەڵدەگەڕێتەوە هەموویان لە ئاوەکەدا دەخنکێن، تەنیا کوڕە فەقێ رزگاری دەبێ‌و رەپ‌و راست‌و قیت‌و قنج بەبێ بەلا دێتەوە بۆلای پاشا، پاشایش بە قینەوە پێی دەڵێ: ئەوە هاوڕێکانت کووان؟ دەڵێ: خودا چاری کردن‌و لەکۆڵمی خستن، ئەوجا کوڕەکە بە پادشا دەڵێ: ئەگەر دەتەوێ من بکوژیت ئەوا من چیت پێ دەڵێم ئەوە بکە، دەڵێ: ئادەی بڵێ، چی بکەم؟ دەڵێ: لە دەشتێکا هەموو خەڵکەکە گرد بکەرەوەو من بەلقی دارێکا هەڵبواسە، تیرێ لە تیردانەکەی خۆم دەربهێنەو لەناو ماڵی کەوانەکەدا دایبنێ‌و بڵێ: بەناوی یەزدانی خودای ئەم کوڕە، ئەنجا تیرەکە بهاوێژە بەرەو من، کاتێ ئەمەت کرد، ئەوسا من دەکوژیت.

جا پاشا کوڕەکە چی پێ گوت جێبەجێی کرد، ئینجا لەبەر چاوی جەماوەرەکە گوتی: بەناوی یەزدانی خودای ئەم کوڕە، ئینجا تیرەکەی تێ گرت‌و تیرەکە دای لە لاجانگی‌و کوڕەکە دەستی خۆی نایە سەر شوێنی تیرەکەو مرد!

ئیتر جەماوەرەکەو عەشاماتەکە، کاتێ ئەمەیان چاو پێکەوت، گوتیان: باوەڕو ئیمانمان بەخودای ئەم کوڕە هێنا، باوەڕو ئیمانمان بەخودای ئەم کوڕە هێنا، ئەوجا بە پادشایان گوت: ئەوەی کەتۆ لێی دەترسای، روویداو قەوماوە. ئەوەتا ئەو خەڵکە موسوڵمان بوون!

ئیتر پادشا فەرمانی دا خەندەکیان هەڵکەند، لەسەر دەرگای کۆڵانەکانو ئاگری گەورە گەورەیان تیا دەکردنەوەو فەرمانی دا: کە هەرکەسێ نەگەڕایەوە بۆسەر ئایینی پاشا بیخەنە ناو ئەو ئاگرە سوورەوە، جا ئەوانیش وایان کرد: تا ژنێ هات منداڵێکی ساوای پێ بوو، لە قەراخ چاڵە ئاگرەکە ئێستێکی کردو گەڕایەوە دواوە نەیویست بچێتە ناوی، بەڵام منداڵەکەی هاتە زمانو پێی گوت: دایە! بچۆرە ناویو ئارام بگرە لەبەر ئەم بارەداو ددان بەخۆتدا بگرە، چونکە تۆ لەسەر حەقو راستیت!). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٤٢٠٩ – سوورەتی بورووج}.

**روونکردنەوە:**

صوهەیبی کوڕی سەنانی کوڕی خالیدی موصڵی، پاشان رۆمی، پاشان مەککەیی، پاشانتر مەدینەیی، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، لە پێناوی خوداو پێغەمبەرو ئیسلاما، ئەشکەنجەو ئازاری زۆری چەشتووە، صوهەیب بەڕەگەز عەرەبە، بە منالی رۆم دیلی دەکەن، لەبەرئەوە زمانی ئەوان باشتر فێردەبێ، باوکی صوهەیب، یا مامەی، کاربەدەستی کیسرا دەبێ، لەسەر شاری (الأبلة) هەوارگەیان لەخاکی موصڵ بووە، سوپای رووم هێرش دەبەنە سەر ناوچەکە، صوهەیب دیل دەکەن، جا لەناو ئەواناو لەناو رۆما گەورە دەبێو پەروەردە دەبێ، جا لەبەرئەوە زمانی ئەوان باشتر فێردەبێو ناو دەردەکا بە صوهەیبی رۆمی!!

هەتا هۆزی کەلب دەیکڕنو دەیهێنن بۆ مەککە، لەوێ عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان دەیکڕێو ئازادی دەکا، لەگەڵیدا لە مەککە نیشتەجێ دەبێ، هەتا ئیبنو جەدعان دەمرێ، ئەوجا صوهەیب (رەزای خودای لێ بێ) کۆچ دەکا بۆ مەدینە، لە مانگی رەبیعی یەکەما لە قەباء، بەرلەوە بچێتە ناو مەدینەوە، بەخزمەتی پێغەمبەر

(دروودی خودای لەسەر بێ) دەگات، وە ئامادەی شەڕی بەدرو شەڕگاکانی تری پاش بەدریش لەخزمەت پێغەمبەردا دەبێ، لە ریزی لەشکری ئیسلاما.

واقیدی دەفەرموێ: صوهەیبو عەمماری کوڕی یاسیر، لەیەك رۆژدا موسوڵمان بوون، دەڵێن: صوهەیب دەفەرموێ: لەپێش ئەوەی کە پێغەمبەر ببێ بە پێغەمبەر من هەر هاوڕێی پێغەمبەر بووم.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ باوەڕی تەواوی بەخوداو بە رۆژی دوایی هەیە، با وەك چۆن منالّی خۆی خۆش دەوێ، ئاوا صوهەیبی خۆش بوێ!).

صوهەیب لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا لە مەدینە مردووە، سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کردووە، کوڕەکانی صوهەیب کە ئەمانەن: حەمزە، سەعد، صالح، صەفی، عباد، عوثمان، حەبیب، موحەممەد، هەموویان فەرموودەیان لە باوکیانەوە گێڕاوەتەوە (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

| ژمارە | ناوی خاوەن ژیانامە یا بابەت | ژمارەی فەرموودەکە |
|---|---|---|
| ٢٣٦ | زەینەبی بنت جەحش | ١٩٨٧ |
| ٢٣٧ | عەمری کوڕی ئەخطەب (أبو زید) | ١٩٩٥ |
| ٢٣٨ | ئەحنەفی کوڕی قەیس (أبُو بَحْر / تابعی) | ٢٠٠٥ |
| ٢٣٩ | المستورد القرشی = المستورد بن شدّاد | ٢٠٢٦ |
| ٢٤٠ | مووسای کوڕی عولەیی | ٢٠٢٦ |
| ٢٤١ | نافع بن عتبة | ٢٠٢٨ |
| ٢٤٢ | عوروەی کوڕی مەسعوودی ثەقەفی | ٢٠٥٢ |
| ٢٤٣ | ئیبنو صەییاد سکرتێری دەججال | ٢٠٥٢ |
| ٢٤٤ | فاطیمەی کچی قەیسی فەهرییە | ٢٠٥٤ |





| | | |
|---|---|---|
| ٢٤٥ | عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتووم | ٢٠٥٤ |
| ٢٤٦ | هیشامی کوڕی عامیری کوڕی ئومەییەی ئەنصاری | ٢٠٥٨ |
| ٢٤٧ | عامیری کوڕی ئومەییەی ئەنصاری | ٢٠٥٨ |
| ٢٤٨ | عەمری کوڕی عەوفی ئەنصاری | ٢٠٨٠ |
| ٢٤٩ | عوتبەی کوڕی غەزوان | ٢٠٨٥ |
| - | نوێژە بارانە لە بیارە | ٢٠٨٧ |
| ٢٥٠ | صوصەیبی رۆمی | ٢٠٩٣ |

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی گەورەیی قورئانی پیرۆز

## كتاب فضائل القرآن

بڕوانە: تەجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری/٤ زنجیرە/٦٩ لەژمارە: (١٧٢٢-٤٩٨١ فتح الباری) هەتا ژمارە: (١٧٤٢ تجرید = ٥٠٦٠ فتح الباری + ریاضی صالحین/٣ ز:١٨٠ ژمارە/٩٩١ هەتا زنجیرە/١٨٤ ژمارە/١٠٢٣ + تاجول ئوصول بەكوردی، بەرگی چوارەم، لاپەڕە/٣ چاپی چوارەم، زنجیرە/٧٦ لەژمارە (٣٥٩٠)ەوە هەتا لاپەڕە/٦٠٤، ژمارە/٤٢٣٨ هەتا زنجیرە/٩٢).

### ١٦٦٠- باسی گەورەیی سوورەتی فاتیحە، كە دادەنرێ بەدیباچەی قورئان (١٨٧٤-١٨٧٩)

### باب: في فاتحة الكتاب

٢٠٩٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) سَمِعَ نَقِيضًا مِنْ فَوْقِهِ فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ، لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ، فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ فَقَالَ هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ فَسَلَّمَ وَقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةُ الْكِتَابِ وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ لَمْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلاَّ أُعْطِيتَهُ. (الحديث/١٨٧٤ = ١٨٤٦ فم = ف.م = فتح الملهم شرح صحيح مسلم).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوكی) فەرمووی: جارێ جوبرائیل (دروودی خوای لەسەربێ) لەلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دانیشتبوو، لەوكاتەدا وەك دەرگابكرێتەوە، جیڕەیەكی لەژوور سەرەوە بیست، جوبرائیل (دروودی خوای لەسەربێ) سەری هەڵبڕی و فەرمووی: (ئەوە چركەی دەرگایەكی ئاسمان بوو، ئەوەتی هەیە نەكراوەتەوە، ئەمڕۆ نەبێ، فریشتەیەكی لێوە هاتە خوارەوە). جوبرائیل (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (ئەم فریشتەیەش ئەمڕۆ نەبێ قەت دانەبەزیوە بۆسەر زەوی، جا

فریشتەکە سلاوی کردو فەرمووی: ئەی موحەممەد! موژدەبێ لێت، خودا دووچرای زۆر ڕوناکی داوە بەتۆ، کەلەپێش تۆدا شتی وا نایابی بەهیچ پێغەمبەرێکی تر نەبەخشیوە، یەکێکیان سوورەتی فاتیحایە، کە دێباچەی قورئانە، ئەوی تریان ئاخرو ئۆخری کلکەی سوورەتی بەقەرەیە، کەئەم سێ ئایەتەن:

{لِّلَّه ما فِي السَّمَاواتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ، لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ} (سورة البقرة – الآيات ٢٨٤-٢٨٦).

ئەوجا فەرمووی: (هەرشتێ لەم دوو سوورەتە بخوێنیت پاداشی لەسەر وەردەگریت). (تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی چوارەم، زنجیرە/٨١ ژمارە/٣٦٣١ – باسی گەورەیی سوورەتی فاتیحەو....) + (ریاضی صالحین/٣ ز/١٨٠ ژ/١٠٢٢).

## ١٦٦١- باسی خوێندنی قورئانو سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمران (١٨٧١-١٨٧٣)

## باب: في قراءة القرآن وسورة البقرة وآل عمران

٢٠٩٥- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الباهلي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: « اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي لأَصْحَابِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعاً لأَصحابه، اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ فَإِنَّهُمَا يَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ يُحَاجَّانِ عَنْ أصحابِهِمَا». ثُمَّ قَالَ « اقْرَءُوا الْبَقَرَةَ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ وَلاَ يَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ». قال مُعاوية: بَلَغَنِي أَنَّ

البَطَلَةَ السحرة». (الحديث ١٨٧١ صحيح مسلم بشرح الإمام النووي ترقيم: الشيخ خليل مأمون شيحا = ١٨٤٣ فم = ف.م = فتح الملهم شرح صحيح مسلم).

ئەبو ئومامەی باهیلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: (قورئان بخوێنن، چونکە لەڕۆژی هەستانەوەدا، کەناوداره بەڕۆژی قیامەت قورئان تەشریف دەهێنێ، دەبێ بەتکاکار بۆ هاوڕێیانی خۆی، کە ئەوکەسانەن لەجیهانا ڕەفتو کاری پێ دەکەن، ئەم دوو سوورەتە درەخشانە بخوێنن، واتە: سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمران، کەناو بانگیان دەرکردووە بەزەهراوەین، واتە: دووچرای درەخشان، چونکە ئەو دوو سوورەتە لەڕۆژی ژینەوە (قیامەت)دا کەدێن لەدوو پەڵە هەور دەکەن، یا لەدوو سابات دەچن، یاوەك دوو پۆل مەلو ڕەوە باڵندەوان، کەلە حەوا ریز دەبەستنو باڵیان ڕەپ دەکەن، حاڵیان وایە لەسەر دۆستانو یارانی خۆیان دەکەنەوەو لەسەریان هەڵ دەدەنێ بەتایبەتی سوورەتی بەقەرە بخوێنن، چونکی بەڕاستی وەرگرتنو خوێندنی ئەم سوورەتە پیتو فەڕو بەرەکەتەو، لەکیس چوونی جێی داخۆ خەفەتە، سەرەڕای ئەوەیش جادوو بازانیش دەرەقەتی نایەنو، ئەوی لەبەری بێ، یابە نووسراوی هەڵی بگرێ، سیحرو جادوو کاری لێ ناکا). (تاج/٤ ز/٨١ ژ/٣٦٣٢) + (ریاض/٣ ز/١٨٠ ژ/٩٩١، ٩٩٢ — گەورەیی قورئانخوێندن).

## ١٦٦٢- باسی گەورەیی ئایەتەلکورسی (١٨٨٠-١٨٨٢)

## باب: فضل آية الكرسي

٢٠٩٦- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « يَا أَبَا الْمُنْذِرِ أَتَدْرِى أَىُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَعَكَ أَعْظَمُ ». قَالَ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: « يَا أَبَا الْمُنْذِرِ أَتَدْرِى أَىُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَعَكَ أَعْظَمُ؟». قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَىُّ الْقَيُّومُ. قَالَ: فَضَرَبَ فِى صَدْرِى وَقَالَ: « وَاللَّهِ لِيَهْنِكَ الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ ». (الحديث ١٨٨٢ صحيح مسلم بشرح الإمام النووي، ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا =

١٨٥٤ فم = ف.ن = فتح الملهم شرح صحيح مسلم. أبوداود. صلاة: ١٤٦٠. تحفة الأشراف: ٣٨).

ئوبەییەی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی پێم: ئەی باوکی مونذیر! ئایا دەزانی لەوقورئانەی کەلەبەرتە کام ئایەتەی گەورەترە؟ گوتم: خوداو پێغەمبەر باشتر دەزانن، فەرموویەوە: ئەی ئەبومونذیر! ئایا دەزانی لەو قورئانەی کەلەبەرتە کام ئایەتەی گەورەترە؟ گوتی: گوتم: ئایەتەلکورسی کەدەفەرموێ: {اللّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ} (سورة البقرة، الآية٢٥٥).

واتە: خودای ڕاستو دروست تەنیایەزدانی پاکە، خودایەکی زیندووی نەمرە، هەربووەو هەردەبێ، بێ سەرەتایەو بێ کۆتا، خودایەکی پایەدارو ڕاوەستاوو ڕاگری هەردوو جیهانەو، مایەی بوونو مانو مانەوەی هەموو شتێکە، خودایەکی بێ چوونەو دوورە لەنیشانەی دروستبوون (سیفەتی حوودووث). لەبەرئەوە نە وەنەوز دەیگرێو نەخەوی لێ دەکەوێ، بەکەمو زۆر فەرامۆشی بەسەردا نایێ، سەرو خوار، ئاسمانو زەوی، بەمانگو خۆرو کاکەشانەوە، هەمووی هی ئەوەو، موڵكو سامانی خۆیەتیو خۆی خاوەنیەتیو خۆی پاشای دەستبەرەڵایەتیو چی حەزکا لێی دەکاو کەس مافی ئەوەی نییە کە بڵێ لەل!.

کێ ڕادەی ئەوەی هەیە کەبەبێ مۆڵەتو فەرمانو ڕەزای خۆی کە بوێرێ تکا بکا لەلای ئەو پاشا بێ باكو بەسامو شکۆیە، بۆ کەسێکی تر، مەگەر بەفەرمانی خۆیو خۆی ڕێگە بدا؟! خودای گەورە هەمووشتێ دەزانێ، هیچی لێ گوم نابێ، دووریو نزیکیو ڕابووردو ئێستاو داهاتوو، هەمووی بۆ زانستی ئەو چون یەکە، ئاگای لەبەرودوای دروستکراوانی خۆیەتی، بەڵام دروستکراوان پەی بەهیچ شتێ لەزانستی خودا نابەن، مەگەر خودا خۆی خواستی لەسەر ئەوەبێ کەپەی بەوشتە

بەرن، تەختی بارەگای خوداوەندی ئەوەندە مەزنو گەورەو گوشادە، بەفەرەحی جێی هەموو ئاسمانەکانو زەوی تیا دەبێتەوە. واتە: ئەم بوونەوەرە سەرو خوارو دنیاو قیامەتی لەچاو عالەمی کورسیدا، کەجیهانێکی تایبەتەو هەرخودا خۆی دەزانێ چییەو چۆنە، وەکوو تنۆك بەدەریا وایە، ڕاگرتنو پاراستنی ئەم دوو جیهانی ئاسمانو زەوییە کەمترین ئەركو شەکەتیو گرانی ناخاتە سەرشانی گەورەیی خودا، لەڕاستی دا گەورەی بەڕاستی کەخاوەنی پایەبەرزی ڕاستەکی بێ، بەس خودایە، پایە بەرزیو گەورەیی دروستکراوانی هەمووی مەجازییەو بێ شانو بێ نیشانە).

ئوبەیی گوتی: کەمن وام گوت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستی دا بەسینگمداو فەرمووی: (ئافەریم بۆخۆت، بەخودا پێکات، کەواتە عیلمت پیرۆزبێو زانستت نۆش بێ، ئەی باوکی مونزیر!).

(تاجول ئوصول/٤ ز/٨٢ ژ/٣٦٣٥ — گەورەیی ئایەتەلکورسیو ...) + (ریاض/٣ ز/١٨٠ ژ/١٠١٩).

## ١٦٦٣- باسی گەورەیی کۆتاییەکانی سوورەتی بەقەرە (١٨٧٤ – ١٨٧٩)
## باب: في خَوَاتيم سورة البقرة

٢٠٩٧- عَنْ أَبِى مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « مَنْ قَرَأَ هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِى لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ ». (الحديث ١٨٧٧ شيحا = ١٨٤٩ فم . تجريد البخاري/٤ رقم/١٥٣٤ = ٤٠٠٨ فتح الباري أطرافه في/٥٠٠٨، ٥٠٠٩، ٥٠٤٠، ٥٠٥١. أبوداود. صلاة: ١٣٩٧. ترمذي. فضائل القرآن: ٢٨٨١. ابن ماجه. إقامة الصلاة:١٣٦٨. تحفة الأشراف: ١٠٠٠٠).

ئەبو مەسعوودی بەدری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بەشەو دوو ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی بەقەرە بخوێنێ،

ئەو شەوە ئەوەی بەسە). (ریاضي صالحين/٣ ز/١٨٣ ژ/١٠١٧) + (تاج/٤ ز/٨٢ ژ/٣٦٣٩ – گەورەیی ئایەتەلکورسیو ...).

**روونکردنەوە:**

١- ئەمە دوو ئایەتەکەیە:

{آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ، لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ} (سورة البقرة-٢- ٢٨٥-٢٨٦).

٢- تەفسیری ئەم دوو ئایەتەم بەکوردی لەکۆتایی تەفسیری سوورەتی بەقەرەدا، لە تاجول ئوصولْ دا نووسیوە: (تاج/٤ ز/٣ ژ/٣٧٥٣) بۆ کەسێ بفەرموێ بەهرەی لێ وەربگرێ، مایەی ڕەحمەتە بۆ هەمووماں.

٣- لەتاجول ئوصولْ دا دەفەرموێ لەشەرحەکەی دا لەباسی گەورەیی ئایەتەلکورسی دا (تاج/٤ ز/٣ ژ/٣٧٥٣).

أ- کەسێ کەلەماڵ دەردەچێ بیخوێنێ لەئامانو پەناو دەستەبەریی خودا دا دەبێ تادەگەڕێتەوە.

ب- لەهەرماڵێکا بخوێنرێ شەیاتینی تا (٣٠) سی ڕۆژ توخنی ئەو ماڵە ناکەون، جا دووبازیش، چ پیاو، چ ژن، تا چل شەو ناچنە ناو ئەو ماڵە. ئەی عەلی! فێری ماڵو منالْو خێزانو دەرو دراوسێی خۆتی بکە، ئایەت لەوە گەورەتر لەلای خوداوە دانەبەزیوە.

ج- هەرکەسێ لەپاش هەموو نوێژێ بیخوێنێ، هەرکەمرد، یەکسەر دەچێتە بەهەشت.

د- کەسێ بیخوێنێ کاتێ دەچێتە سەر نوێنی نوستن، خودای گەورە، ئەمن‌و ئاسایش‌و هێمنی دەدا بەخۆی‌و هاوسای‌و هاوسای هاوسای‌و چەن ماڵێکی تریش لەدەورو بەری.

هـ- قورئان فەرمایشتی خودایە، لەبەرئەوە سەرگوڵ‌و سەرگەورەو سەروەری هەموو قسەو فەرموودەیەکە، سەرگوڵی قورئانیش سوورەتی بەقەرەیە، سەرگوڵی سوورەتی بەقەرەیش ئایەتەلکورسییە!.

## ١٦٦٤- باسی گەورەیی سوورەتی کەهف (١٨٨٠-١٨٨٢)

## باب: فضل سورة الكهف

٢٠٩٨- عن أَبِى الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أن نبي الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ ». قَالَ أَبُو دَاوُدَ وَكَذَا قَالَ هِشَامٌ الدَّسْتَوَائِىُّ عَنْ قَتَادَةَ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ « مَنْ حَفِظَ مِنْ خَوَاتِيمِ سُورَةِ الْكَهْفِ ». وَقَالَ شُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ « مِنْ آخِرِ الْكَهْفِ ». (الحديث ١٨٨٠ شيحا = ١٨٥٢ فم).

ئەبودەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (هەرکەسێ دەئایەت لەسەرەتای سوورەتی کەهفەوە لەبەربکاو بەڕەوانی لەبەر بیخوێنێ، خودای گەورە لەئاژاوەی ججاڵ دەیپارێزێ). (تاج/٤ ز/٨٤ ژ/٣٦٤٣) + (ریاضی صالحین/٣ ز/١٨٠ ژ/١٠٢١).

## ١٦٦٥- باسی گەورەیی خوێندنی (قل هو الله أحد) (١٨٨٣-١٨٨٧)

## باب: فضل قراءة (قل هو الله أحد)

٢٠٩٩- عَنْ أَبِى الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِى لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ ». قَالُوا: وَكَيْفَ يَقْرَأُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ قَالَ « (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) يَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ ». (الحديث ١٨٨٣ شيحا = ١٨٥٥ فم).

ئەبودەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (کەستان دەتوانن کە سێ یەکی قورئان لەشەوێکا بخوێنن؟).

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەکوێ دەتوانێ بەشەوێ سێیەکی قورئـان دەور بکاتەوە!؟

فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): (دەبزانن سوورەتی (قل هو الله أحد) هاوتای سێیەکی قورئان دەکات). (تاج/٤ ز/٩٠ ژ/٣٦٦١ – ش/ت = تەجریدی بوخاری/٤ ژمارە/١٧٢٩ = ٥٠١٥ فتح الباری + ریاض/٣ ز/١٨٣ ژ/١٠١٠، ١٠١١، ١٠١٢).

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە، هاندانی موسوڵمانانە لەسەر گرنگیدان‌و بایەخدانی پتر بەلەبەر کردن‌و خوێندنی ئەم جۆرە سوورەت‌و ئایەتانە، بەڵام بەهیچ جۆرێ مەبەست ئەوە نییە کە هەرکەسێ سێ جار سوورەتی (قل هو الله أحد) بخوێنێ بەقەدخەتمەیەکی تەواوی قورئان خێری دەگات، چونکە ئەگەر وابێ کەس خەتمەی قورئانی نەدەکرد. بەندەی هەزار وای بۆدەچم، ئەم جۆرە موژدانە بۆ گشت کاتێ نییە، بەڵکوو بۆ هەندێ کاتی تایبەتە وەك:

١- کەسێ لەسەر نوێن ڕاکشاوە، دەیەوێ بەدەم قورئانخوێندنەوە خەوی لێبکەوێ، لەکاتی وادا، بەردەوام بێ لەسەر خوێندنی سوورەتی ئیخلاص.

٢- بۆ موسوڵمانی نەخوێندەوار، بۆکەسێ خەتمەی (قل هو الله) بکات، بۆکەسێ قورئانی لەبەر نەبێ‌و موصحەفی لەلانەبێ. (بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١ ژمارە/١٥٩ = ٢١٦ فتح الباری بڕگەی/٣).

٣- کەسانی تر قسەی زۆریان لەم بابەتە کردووە، بەڵام دوور نییە، کە ئەم بۆچوونانە گشتیان ڕاست بن، هەریەکەیان لەڕوویەکەوە.

٢١٠٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ ، وَكَانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاَتِهِ فَيَخْتِمُ بِـ( قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ) فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ « سَلُوهُ لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ؟» . فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا . فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) «

أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ ». (الحديث ١٨٨٧ شيحا = ١٨٥٩فم. تجريد البخاري/ ٥ رقم:٢١٢٥ = ٧٣٧٥ فتح الباري. راجع: رقم:١٧٢٨ تجريد = ٥٠١٣ فتح الباري).

عائيشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) جارێ پیاوێكی كرد بەسەركردەی لەشكرێكو ناردنی بۆغەزا، پیاوەكە گشت جارێ كە بەرنوێژیی بۆ هاوڕێكانی دەكرد، لەكۆتایی قورئانخوێندنی ناوبەرنوێژەكەی دا، سوورەتی (قل هو الله أحد)ی دەخوێند، كاتێ گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەوەیان گێڕایەوە بۆی.

فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ) لەوپیاوە بپرسن بۆچی وادەكا؟. كاتێ هاوەڵەكانی لێیان پرسی: بۆچی وادەكەی؟ گوتی: چونكە ئەم سوورەتی ئیخلاصە صیفەتی ڕەحمانەو نیشانەی خودای بەخشندەو میهرەبانە، لەبەرئەوە حەزدەكەم كەهەمیشە بیخوێنمو لەسەردەمم نەكەوێتە خوارەوە.

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دەپێی بڵێن خودایش ئەوی خۆش دەوێ!

(تاج/٤ ز/٩٠ ژ/٣٦٦٣ — گەورەیی (قل هو الله أحد) + (ریاضي صالحین/٣ ز/١٨٣ ژ/١٠١٣ — هاندان لەسەرچەند سوورەتێ).

## ١٦٦٦- باسی گەورەیی خوێندنی سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) (١٨٨٨-١٨٩٠)

## باب: فضل قراءة المعوذتين

٢١٠١- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَلَمْ تَرَ آيَاتٍ أُنْزِلَتِ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطُّ (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) وَ (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) ». (الحديث ١٨٨٨ شيحا = ١٨٦٠ فم = ف.م = فتح الملهم).

عوقبەی كوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی پێم: دەزانیت كەئەمشەو چەن ئایەتێكم بۆهاتوون، كە هەرگیز شتی وا

گەورەو نایاب نەبینراوە، کەئەم دوو سورەتەن. سورەتی (قل أعوذ برب الفلق) و (قل لأعوذ برب الناس). (تاج/٤ ز/٩١ ژ/٣٦٧٢) + (ریاض/٣ ز/١٨٠ ژ/١٠١٤).

## ١٦٦٧- کەسانێ کەخودای گەورە بەهۆی خزمەتی قورئانەوە، پلەی‌و پایەیان بەرزدەکاتەوە. (١٨٨٨-١٨٩٠)

## باب: من يرفع بالقرآن

٢١٠٢- عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الْحَارِثِ لَقِىَ عُمَرَ بِعُسْفَانَ وَكَانَ عُمَرُ يَسْتَعْمِلُهُ عَلَى مَكَّةَ فَقَالَ مَنِ اسْتَعْمَلْتَ عَلَى أَهْلِ الْوَادِى فَقَالَ ابْنَ أَبْزَى. قَالَ: وَمَنِ ابْنُ أَبْزَى؟ قَالَ مَوْلًى مِنْ مَوَالِينَا. قَالَ: فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهِمْ مَوْلًى؟ قَالَ: إِنَّهُ قَارِئٌ لِكِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَإِنَّهُ عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ. قَالَ عُمَرُ: أَمَا إِنَّ نَبِيَّكُمْ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ ». (الحديث ١٨٩٤ = ١٨٦٧ فم):

عامیری کوڕی واثیلە فەرمووی: نافیعی کوڕی عەبدولحاریث، لەعوسفان گەیشت بەعومەری کوڕی خەطاب، کە نافیع کارمەندی عومەر بوو، لەسەر شاری مەککە لەوکاتەدا، عومەر بەنافیعی فەرموو: ئەی نافیع لەجێی خۆت کێت داناوە بەسەرەکشاری مەککە، کاتێ هاتیت بۆئێرە؟

فەرمووی: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزام داناوە لەشوێنی خۆم، عومەر فەرمووی: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبزا کێیە وا من نایناسم؟ نافیع فەرمووی؟ دۆستێکی ئازاد کراوی بنەماڵەی ئێمەیە. عومەر فەرمووی: بەندەیەکی ئازاد کراوت کردووە بەسەرۆکشار، بەسەر دانیشتوانی مەککەوە، کەزوربەیان خانەدان‌و بنەماڵەی ناودارن، واتە: چۆن کۆنە بەندەیێ دەست دەدا بۆسەرۆکی شارەوانی شارێ، کەزوربەی خەڵکەکەی خانەدان‌و بەگزادەو پشتاو پشت ئازادو سەربەست بن؟

نافیع فەرمووی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان؟ من لەبەرئەم دوو ڕەوشتە باشە ئەو کۆنەبەندەیەم کردووە، بە سەرۆکی شاری مەککە، چونکە یەکەم

قورئـانخوێنێكی چـاكەو نامـەی خـودای گـەورەو سـەروەری بەباشـی خوێنـدووە، دووەمیش فەرائیززانێكی چاكەو زانستی كەلەپوور دابەشكردن بەجوانی دەزانێ.

عومەریش (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ) فەرمووی: دەی كارێ باشت كـردووە، چـونكە موحەممـەدی پێغەمبـەرمان (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: بـەبێگومان كـەخودای گـەورەو سـەروەر، كۆمـەڵانێ خـەڵك، بـەهۆی خزمـەتی ئـەم قورئانـەوە، كەنامـەی خودایە، پایەو پلەیان لەهـەردوو جیهـان دا بەرزدەكاتـەوە، وەهـەروەها پلـەو پایـەی كۆمـەڵانێ خـەڵكی تـر، بـەهۆی بێ خزمـەتی یـان بـۆ ئـەم قورئانـە نـزمو نـەوی دەكاتەوە؟. (ریاض/٣ ز/١٨٠ ژ/٩٩٦).

### ١٦٦٨- باسی گەورەیی فێركردنی قورئان (١٨٦٩-١٨٧٠)
### باب: فضل تعليم القرآن

٢١٠٣- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ خَرَجَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) وَنَحْنُ فِى الصُّفَّةِ فَقَالَ « أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَـى بُطْحَـانَ أَوْ إِلَـى الْعَقِيـقِ فَيَأْتِىَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ فِى غَيْرِ إِثْمٍ وَلاَ قَطْعِ رَحِمٍ؟». فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كُلُّنَا نُحِبُّ ذَلِكَ. قَالَ: « أَفَلاَ يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَعْلَمَ أَوْ يَقْرَأَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَـلَّ خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ وَثَلاَثٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثٍ وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِـنْ أَرْبَـعٍ وَمِـنْ أَعْـدَادِهِنَّ مِـنَ الإِبِلِ ». (الحديث ١٨٧٠ شيحا = ١٨٤٢ فم = فتح الملهم).

عوقبـەی كـوڕی عـامیر (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: ئێمـە لەصـوففە بـووین، كەسەكۆیێ بوو لەژێر ساباتێكا، لەمزگەوتەكەی مەدینـە بـوو، میوانخانـەی هـەژاران بوو.

پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) هـات بۆنـاومـان، فـەرمووی: كامتـان حەزدەكـەن كەهەموو رۆژێ بچن بۆشـیوی بـۆطحـان، یـا بـڕۆن بـۆ شـیوی عـەقیق، وەلـەوێ دوو وشتری مێنگەی دووگ قـەوی بهێننـەوە بۆخۆتـان، بـەبێ ئـەوەی كەبـەهۆی ئـەوەوە



تووشــی تاوانــێ بــبن لــەلای خــودا، یــا تووشــی دڵڕەنجانــدنی کەســوکارتان بــبن‌و پەیوەندیی خزمایەتی بپسێنن؟.

گوتمان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هەمووومان حەز لەدەستکەوتی واباش دەکـەین، کـێ بـێ حـەز لـەخێرو بێـری وانـەکات! فـەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): دەسـا هەریـەکێ لـەئێوە، هـەر ڕۆژێ بچـێت بـۆ مزگـەوت، لـەوێ دوو ئایـەت لـەقورئان فێربێ، کەنامەی خودای تەواناو مەزن‌و شکۆمەندە، ئەوە لەدوو وشتر باشترە بۆی! وەسێ ئایەت فێربێ لەسێ وشتر باشترە بۆی، هـەروا چوار ئایـەت لـە چوار وشـتر باشترە بۆی، ئیتر هـەروا بـژمێرە، زیـاتری فێربـوونی ئایـەت لـەزیاتری دەسـکەوتنی وشتر باشترە.

**ڕوونکردنەوە**:

١. صوففە سەکۆیەکی گەورە بـوو، لـەلای پشتی مزگەوتەکـەی پێغەمبـەرەوە بـوو، لەمەدینە لەسەرەتاوە جێگەی حەوانەوەی کۆچکارە هەژارەکان بوو کـەژمارەیان لەدەوری هەشتا کەس دا بوو، بەرە بـەرە بـوو بەمیوانخانـەی میوانـانی ئیسلام، کــەبێ ژن‌و مــاڵ‌و منــاڵ بــوون‌و ســەڵتەزەلام بــوون، ژمارەیــان جاربــەجارێ دەگەیشتە دووسەد کەس، گەلـێ جاریش دەچـوون بۆغـەزا، یـا پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) دەینـاردن بـەم لاو بـەولادا، هـەتا موسـوڵمانان فێـری قورئـان بکـەن، ژمارەیان کەم دەبۆوە.

٢. بوطحان ناوی شیوێکە لەمەدینە، لەبەرپانی‌و پۆڕی پێی دەڵێن بوطحان چونکە (بطح) واتە: پەلی‌و پانیو پۆڕیی.

٣. عەقیق شیوێکە سـێ میلـێ لەمەدینـەوە دوورە، جێگـە بـازاڕی فرۆشـتنی وشـتر بوو.



## ١٦٦٩- نموونەی کەسێ قورئان بخوێنێو کەسێ قورئان نەخوێنێ (١٨٥٧-١٨٦٠)
## باب: مثل من يقرأ القرآن ومن لا يقرؤه

٢١٠٤- عَنْ أَبِى مُوسَى الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِى يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الأُتْرُجَّةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِى لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ التَّمْرَةِ لاَ رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِى يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِى لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ ». (الحديث ١٨٥٧ شيحا=١٨٢٧ فم. تجريد البخاري/٤ رقم/١٧٤١=٥٠٥٩، ٥٠٢٠، ٥٤٢٧، ٧٥٦٠ فتح الباري. أبوداود.أدب: ٤٨٣٠. ترمذي. أمثال: ٢٨٦٥. نسائي. إيمان: ٥٠٥٣).

ئەبوومووسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: وێنەی ئەو موسوڵمانەی کەقورئان دەخوێنێو لەهەمان کاتا کاری پێدەکا وەك لیمۆ وایە، هەم بۆنی خۆشەو هەم تامی خۆشە، وێنەی ئەو موسوڵمانەی کە قورئان زۆر نەخوێنێ بەڵام کاری پێ بکا، وەك خورما وایە، هەرچەند بۆی نییە بەڵام تامی خۆشە، وێنەی پیاوی دوو ڕووی قورئانخوێن وەك ڕێحانە وایە، هەرچەند بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە! وێنەی دوو ڕووی قورئان نەخوێنیش وەك گووژاڵك وایە، بۆنی خۆشی نییەو تامیشی تاڵو ناخۆشە). (تاج/٤ ز/٧٦ ژ/٣٥٩٢ – گەورەیی قورئان) + (ریاضی الصالحین/٣ ز/١٨٠ ژ/٩٩٥).

**ڕوونکردنەوە:**

١. ئوتروجە میوەیەکە لەجۆری لیمۆیە، لەعەرەبی ڕەشۆکی دا پێی دەڵێن (الكبّاد).

٢. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوە، کە زەربولەئەل، بۆ تێگەیشتنی تەواو لەبابەتەکە کارێ پەسەندە، وە موسوڵمانان پایە بەرزو پایە نزمیان هەیە، وەهەڵگرانی قورئان خاوەنی پلەو پایەی بڵندن لەلای خودا.

## ١٦٧٠- پلەو پایەی کەسێ قورئانی ڕەوانەو کەسێ کەئەرك دەکێشێ بۆ ڕەوانکردنی (١٨٥٧-١٨٦٠)

## باب: في الماهر بالقرآن والذي يشتد عليه

٢١٠٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ وَالَّذِى يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ ». (الحديث ١٨٥٩ شيحا = ١٨٢٩ فم = فتح الملهم. تجريد البخاري/٤ رقم/١٧١٣ = ٤٩٣٧ فتح الباري ل/٥١١. أبوداود. صلا/١٤٥٤. ترمذي. فضائل القرآن:٢٩٠٤ ابن ماجه. أدب: ٣٧٧٩ تحفة الأشراف: ١٦١٠٢).

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوادا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرمویَ: نموونەی ئەو قورئانخوێنەی کە بەڕەوانی قورئانی لەبەرەو کارو ڕەفتاری پێ دەکا، لەپایەی ئەو فریشتە ڕێزدارو فروستادەو چاکە خوازانەدایە، کەلەجیهانی بالآو عالەمی مەلەکووتدا، سەرپەرشتی قورئان دەکەنو پەیامەکانی خودا دەهێنن بۆ خەڵکانو خودا لەم دووئایەتەدا باسیانی کردووە کەدەفەرمویَ: {بِأَيْدِي سَفَرَةٍ، كِرَامٍ بَرَرَةٍ} (سورە عبس، ١٥-١٦).

واتە: ئەم قورئانە لەجیهانی بالآدا، وا لەدەستی کۆمەڵێ فریشتەی فروستادەی ڕێزداردا، کە فەرمانبەرو چاکە خوازنو زۆر بەڕێزو قەدرەوە سەرپەرشتی دەکەنو ئەمینداری خودان لەسەر سرووشو لەکاتو ساتی دیاریکراودا، نامەکانی خودا دەبەن بۆ پێغەمبەران).

ئەوجا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: وە ئەوکەسەشی کە خەریکە دەیخوێنێو بەگران بۆی لەبەردەکرێو لەکاتی خوێندنو دەورکردنەوەی دا، زمانی پێوەی تەتەڵە دەکا، ئەم جۆرە کەسەیش لەباتی یەك پاداش دووپاداشیان بۆ هەیە. (تاج/٤ ز/٧٦ ل/٥ چ/٤ ژ/٣٥٩١ + ریاض/٣ ژ/١٨٠ ژ/٩٩٤ چ/٢).

## ١٦٧١- لەكاتی خوێندنی قورئان دا فریشتەی ڕەحمەت دادەبارێن (١٨٥٣-١٨٥٦)

## باب: تنزل السكينة لقراءة القرآن

٢١٠٦- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ وَعِنْدَهُ فَرَسٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ فَجَعَلَتْ تَدُورُ وَتَدْنُو وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ مِنْهَا فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ « تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرآنِ ».

(الحديث ١٨٥٣ شيحا=١٨٢٣ فم = فتح الملهم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ ل/١٢٢ رقم/١٤٣٩=٣٦١٤، ٤٨٣٩، ٥٠١١. تحفة الأشراف/١٨٣٦).

بەرائی كوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ، كە ئوسەیدی كوڕی حوضەیر دەبێ، سوورەتی كەهف دەخوێنێ، لەوكاتەدا ماینەكەی لەلایا بەدوو گوریس بەسرا بۆوە، لەكاتی قورئان خوێندنەكەدا پەڵەهەورێ دەدا بەسەریداو، دەیگرێتە ناوو دەست دەكا بەگڕخواردن بەدەوری داو لێی نزیك دەبێتەوە، ماینەكەشی كەئەمە دەبینێ سڵی لێ دەكاو خۆش خۆش هەڵ دەسڵەمێتەوە. جا بۆبەیانی هاتە خزمەتی پێغەمبەر، ئەمەی گێڕایەوە بۆی، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوە ئارامیو فریشتەی ئاسایش بوون، لەبەر خاتری قورئانەكە داباریون، هەتا ئارامیو دڵنیایی پەخشەوە بكەن!. (تاج/٤ ز/٨٠ ژ/٣٦٢٨ + ریاضي صالحين/٣ ز/١٨٠ ژ/٩٩٨ ل/٤٣ چ/٢) + (تجريد/٤ ژ/١٤٣٩ = ٣٦١٤).

**ڕوونكردنەوە:**

بەپێی ڕاڤەنامە (شەرحە)كان، ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. مرۆڤی موسوڵمان دروستە فریشتە ببینێ. (بڕوانە: تاج/٣ ز/٦٠ ژ/٢٩٧٧، ٢٩٧٨ - باسی پزیشكایەتی..).

٢. گەورەیی دەوركردنەوەی قورئانو خوێندنی.

٣. لەكاتی خوێندنی قورئان دا، بەم بۆنە پیرۆزەیەوە فریشتە دادەبارنو گوێ دەگرن لەقورئانەكەو ئاسایشو ڕەحمەتو دڵنیایی پەخشەوە دەكەنو پیتو فەڕدەبارێ. (بڕ: تەجرید/١ ژمارە/١٥٩ = ٢١٦ فتح الباری، لاپەڕە/١٧٢ چ/١).

٤. گوێگرتن لەقورئان سوننەتە.

٥. فریشتە چەند جۆرێکیان هەیە، وەك سەکینەو فریشتەی ڕەحمەتو فریشتەی سزاو فریشتەی سرووشو نیگاو... تاد.

٢١٠٧- عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أُسَيْدَ بْنَ حُضَيْرٍ بَيْنَمَا هُوَ لَيْلَةً يَقْرَأُ فِي مِرْبَدِهِ إِذْ جَالَتْ فَرَسُهُ فَقَرَأَ ثُمَّ جَالَتْ أُخْرَى فَقَرَأَ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا قَالَ أُسَيْدٌ: فَخَشِيتُ أَنْ تَطَأَ يَحْيَى فَقُمْتُ إِلَيْهَا فَإِذَا مِثْلُ الظُّلَّةِ فَوْقَ رَأْسِي فِيهَا أَمْثَالُ السُّرُجِ عَرَجَتْ فِي الْجَوِّ حَتَّى مَا أَرَاهَا - قَالَ -: فَغَدَوْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَيْنَمَا أَنَا الْبَارِحَةَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ أَقْرَأُ فِي مِرْبَدِي إِذْ جَالَتْ فَرَسِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « اقْرَإِ ابْنَ حُضَيْرٍ ». قَالَ فَقَرَأْتُ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « اقْرَإِ ابْنَ حُضَيْرٍ ». قَالَ: فَقَرَأْتُ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « اقْرَإِ ابْنَ حُضَيْرٍ ». قَالَ: فَانْصَرَفْتُ. وَكَانَ يَحْيَى قَرِيبًا مِنْهَا خَشِيتُ أَنْ تَطَأَهُ فَرَأَيْتُ مِثْلَ الظُّلَّةِ فِيهَا أَمْثَالُ السُّرُجِ عَرَجَتْ فِي الْجَوِّ حَتَّى مَا أَرَاهَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « تِلْكَ الْمَلاَئِكَةُ كَانَتْ تَسْتَمِعُ لَكَ وَلَوْ قَرَأْتَ لأَصْبَحَتْ يَرَاهَا النَّاسُ مَا تَسْتَتِرُ مِنْهُمْ ». (الحديث١٨٥٦ شيحا = ١٨٢٦ فم = فتح الملهم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري/٤ رقم:١٧٣١ = ٥٠١٨. تحفة الأشراف/٤١٠٠).

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئوسەیدی کوڕی حوضەیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێکیان شەوبوو، لەمشتاخ (مربد)ی خورماکەما، سوورەتی بەقەرەم دەخوێند، ئەسپەکەم لەلاما، بەدوو گوریسی درێژ بەسترابۆوە، لەپڕێکا ئەسپەکەم ڕاچەنیو هەڵ سڵەمییەوە، ئیتر منیش کەمێ بێ دەنگ بووم، ئەسپەکەیش بێ دەنگ بوو، وە داسەکنا، کەمن دەستم کردەوە بەقورئان خوێندن، دیسان ئەسپەکە ڕاچەڵەکییەوە، کەمن بێ دەنگ بوومەوەو هەستم هەڵگرت، دیسان ئەسپەکەیش هێمن بوویەوە، هەتا چەند جارێ ئەم کارە دووبارە بوویەوە، ئیتر دەستم لەقورئانخوێندنەکەم هەڵگرت.

ئوسەید فەرمووی: یەحیای کوڕیشم مناڵ بوو، لەماینەکەوە نزیك بوو، ترسام ئەگەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بێ، ئەسپەکە کوڕەکەم بشێلێ، لەبەرئەوە یەحیام ڕاکێشاو دوورم خستەوە لەئەسپەکەوە، کەسەرم هەڵبڕی واشتێ وەك کاژە هەور لەڕاسەرم وا بەئاسمانەوە، هەرتەماشمکرد هەتا دوورکەوتەوەو لەبەرچاوم ون بوو، کاژە هەورەکە کەبەڕاسەرمەوە بوو دەجووڵاو دەخولایەوە، چراگەلێکی درەخشانی تیادا بوو، برێتی بوون لەگیانگەلێکی نوورانی ناسكو رووناك، بەرەبەرە بەرزەوە بوون بۆ حەوا، تانەمان لەبەرچاو!

فەرمووی: جا بۆبەیانی چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ئەم داستانەم عەرزیکرد. ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم شەو، لەجەرگەی شەودا لەناوجێگە خەرمانی خورماکەم دا، قورئانم دەخوێند، کەچی لەنکاودا ئەسپەکەم ڕاچەڵەکی. خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی کوڕی حوضەیر! دەبوو بتخوێندبایە. منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! مەترسی ئەوەم هەبوو، کە ئەسپەکە یەحیای کوڕم بشێلێ، چونکە لەنزیکیەوە بوو، لەبەرئەوە چووم بەلای یەحیاوە، دیسان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی کوڕی حوضەیر! دەبوو بتخوێندبایە، هەتا لەپیتو فەڕی دابەزینی فریشتەی ڕەحمەت زیاتر بەشدار بوویتایە!.

جا چەند جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چەند جارێ وەهای فەرموو، منیش هەروەها وەڵامم دایەوە، هەتا دواجار عەرزیمکرد، ئەی پێغەمبەری خودا! بۆیە دەستم لەقورئان خوێندنەکەم هەلگرت، چونکە چووم بەلای یەحیای کوڕمەوە. مەبادا ببێ بەژێر پێی ئەسپەکەوە، چونکە زۆر نزیك بوو لێیەوە، جالەو کاتەدا چراخانێکم لەناو کاژە هەورێکا بینی، بەحەواوە بوو، بەرە بەرە بەرزەوە بوو بۆئاسمان، هەتا تەواو دوورکەوتەوەو لەبەر چاوم نەما. جا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا دەزانی ئەوەچی بوو؟ گوتم: نەء، فەرمووی: ئەوانە فریشتە بوون، بۆ گوێگرتن لەقورئانخوێندنەکەی تۆ نزیکبوونەتەوە، گوێیان لەدەنگە

خۆشەکەی تۆ گرتووە، ئەگەر تۆ بەردەوام بوویتایە لەسەر قورئانخوێندنەکەت، بەیانی بەبێ پەردە خەڵکان، بەچاوی خۆیان تەماشای ئەو پۆلە فریشتەیان دەکرد، لەسەرئەو حاڵەتەی کە گوێیان لەدەنگی تۆ گرتبوو، وەخۆیان لەوان نەدەشاردەوە!. (تاج/٤ ز/٨٠ ژ/٣٦٢٨ + ریاض اَلصالحین/٣ ل/٤٣ ژ/٩٩٨ ج/٢ + تجرید/٤ ژمارە/١٤٣٩ = ٣٦١٤، ٤٨٣٩، ٥٠١١).

**ڕوونکردنەوە:**

**یەکەم:** ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. ئوسەید دەنگی زۆر خۆشبووە، هاوەڵی پێغەمبەر بووە.
٢. لەناو یارانی پێغەمبەردا، کەرامات رووی داوە، بڕوانە: ئەم شوێنانە: تەجریدی بوخاری، ژمارە/٣٠، ٤٩، ٦٦، ٧٥، ٨٣، ٨٩، ٩٧، ١١٧، ٢٨٥، ٣٤٩، ٤٣٤، ٤١٩).
٣. موسوڵمانی خواناس فریشتە دەبینێ: (بڕ: ژمارە/١٤٤٤ تەجرید) + (بڕوانە: ژمارە/٢١٠٦ لەپێشەوە).
٤. ئاژەڵو وڵاخو وەڵس فریشتە دەبینن. (بڕ: ژمارە/١٥٠٧ تەجرید) لەگێڕانەوەیەکی بوخاری دا: (وَإِلَى جانِبِهِ حِصَانٌ) دیارە کە حیصان ئەسپی رەسەنی چاکە.
٥. قورئانخوێندن بەدەنگی خۆش، لەگەڵ صەلاحو تەقوادا، رێخۆشکەرە بۆ خێرو بێرو پیتو فەڕی زۆر، وەك دابارینی سەکینەو دیتنی فریشتەو رۆشنبوونەوەی دڵو دەروونو چاوو گەیشتن بەپایەی ویلایەتی شەرعی. (بڕ: ١٤٩٢ تەجریدی بوخاری بەکوردی).
٦. لەفەرموودەی ساخ دا، کۆمەڵێ بەڵگەی رۆشنو فەرموودەی ساخ هەیە، ئەم جۆرە بابەتە دەسەلمێنێ، بێجگە لە مرۆڤ و فریشتەو جنۆکەو پەریو شەیاتینی، شتگەلی تریش هەستیان هەیە، قسەدەکەن، لەشت تێدەگەن، دەڕۆن، تەسبیحات دەکەن، وەك تەسبیحاتی خۆراكو دارو بەردو قسەکردنی ئاژەڵو

تێگەیشتنیان لەزۆرشت، تەنانەت گریانو پێکەنینیشیان لێ ڕوودەدات. (بڕ: تـاج/٣ ز/١٠٧ ژ/٣١٨١ + ز/١٠٩ ژ/٣١٨٣، ٣١٨٤ + تـاج/٣ ز/١١٠ ژ/٣١٨٥ + تجریـدی بوخاری/٤ ژ/١٦٩٧ = ٤٨٤٨، ٤٨٥٠، ١٤٤٩ فتح الباری + ١٦٩٨ = ٤٨٤٨، ٤٨٤٩ + پوختـەی صـەحیحی موسـلیم، ژمـارە/١٥٢٨ = ٥٨٩٨ صـحیح مسـلم بشـرح النـووی + ژمارە/١٥٣٨ = ٧٤٣٧ شرح النـووی + ژمـارە/١٥٤٢ = ٥٦٦٩ شـرح النـووی + پوختـەی صـەحیحی موسـلیم، ژمـارە/١٦٢٤ = ٦١٣٣ شـرح النـووی + ژمـارە:١٦٣٤ = ٦١٥٤ + ژمارە/١٦٤٦ = ٦١٩٨ ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم بشرح الإمام النووی + ١٦٦٨ = ٦٢٥٤ + ژمارە/١٦٧٦ = ٦٢٦٥ + ١٦٩٧ = ٦٣٠٥ شرح النووی).

**دووەم:** ئوسەیدی کوڕی حوضەیر (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لەگەورە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ). باوکی ئوسەید (واتە: حوضەیر) پیاوێکی سوارچاك بوو، سەرۆکی هۆزی ئەوس بوو، بەموسوڵمانی مردووە، لەڕۆژی هەرای بوغـاث دا، خۆی سەرۆکی هۆزەکـەی بوو، بۆ هەواڵ سەبارەت بەڕۆژی بوغـاث بڕوانە: تەجریـدی بوخـاری بـەرگی چـوارەم، ژمـارە/١٤٨١ = ٣٧٧٧، ٣٨٤٦، ٣٩٣٠ فـتح البـاری + تـاج/٣ ز/٩٢، ٩٣، ٩٤ لەژمارە (٣١٣٧)وە هەتا ژمارە (٣١٤٢).

ئوسـەید یەکێکـە لەموسـڵمانە هـەرە پێشـینەکان، لەشـەوی پـەیمانی بەیعەتولعەقەبـەی دووەم دا، یـەکێك بـوو لەنەقیبـەکان، لەسەردەسـتی موصـعەبی کوڕی عومەیردا ئیسلام بوو، لەکاتی بەستنی پەیمانی برایـەتی دا، پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) داینا بەبرای زەیدی کوڕی حاریثە.

لەڕۆژی هەرای ئوحـددا، کـە موسوڵمانان پشتی پێغەمبـەریان چۆڵ کـرد، ئـەو لەخزمەتی دا مایەوەو خۆگربوو، وە حەوت برینـی لـەو شـەڕەدا لـێ کـرا، ئەوەنـدە ئازاو نەبەرد بوو، کۆمەڵێ فەرموودەی هەیە لەصەحیح دا.

ئوسەید پیاوێکی ژیـری هۆشمەنـدی کامڵی خـاوەن ڕاو بۆچوون بـوو، پیـاوێکی زۆر دەنگ خۆش بوو، لەشەودا بـەدەنگێکی خـۆش لەشـەو نوێـژدا قورئـانێکی زۆری بەدەنگی بەرز دەخوێند، جاری وا دەبوو، سوورەتی بەقـەرەی بەتـەواوی دەخوێنـد،

بەپێی ئەم فەرموودەیە فریشتە دەهاتنە خزمەتیو گوێیان لەدەنگە خۆشەکەی دەگرت، لەکاتی قورئانخوێندن دا.

لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا عومەردا، حەزرەتی ئوسەید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمانی حەقی بەجێهێناو مەرگ بوو بەمیوانیو بەمردنی خودا مرد، لەمانگی کوڵە مانگ دا لەساڵی بیستی کۆچی دا، ئیمامی عومەر نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

بەفەرمانی ئیمامی عومەر، دوو ڕیز لەنەوەی بەنی ئەشهەل، کە ئوسەید لەوبەرە بابە بوو، هەڵیان گرت هەتا گۆڕستانی بەقیعو لەوێ بەخاکیان سپارد، ڕاسپێری بۆ عومەر نوسیبوو، عومەر تەماشای ڕاسپێرینامەکەی کرد، چوار هەزار لیرەی زێڕ قەرزار بوو، ڕەزە خورمای لەمەدینە هەبوو، عومەر فرۆشتنیو قەرزەکەی سەری دایەوە لێی، دەڵێن: ئیمامی عومەر خۆیشی چووەتە ژێر تەرمەکەی، کاتێ دەیبەن بۆگۆڕستان.

لەریاض صالحین دا، دەفەرموێ:

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عەببادی کوڕی بیشر (ڕەزای خوایان لێ بێ) شەوێ لەخزمەت پێغەمبەردا دەبن، هەتا شەو درەنگ دەبێ، کەلە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەردەچنو بەرەوماڵ دەگەڕێنەوە، هەرکەسەیان سەرودار دەستیان بەدەستەوە دەبێ، ئیتر بەفەرمانی خودا، لەڕێگا داردەستی یەکێکیان دەبێ بەچراو ڕۆشنایی یان بۆدەکاو، لەبەر شەوقەکەی دەڕۆن هەتا ڕێگەیان لەیەکتر جیا دەبێتەوە، ئەوجا داردەستی ئەوی تریان دەبێ بەچراو، ڕۆشنایی دەکا بۆی ئیتر هەریەکەیان لەبەرشەوقی داردەستی خۆی دەڕا، هەتا دەگاتەوە ماڵی خۆی. ئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) گێڕاویەتەوە. (ریاض/٣ ز:٢٥٣ ژ/١٥٠٨) + (تاج/٣ ز/١ ژ/٣٢٢٥) + (تاج/٣ ز/٤٦ ژ/٣٤٧٠).

سێیەم: بۆئەوەی کەبەباشی بزانین کەخەواریقو کەرامات لەناو هاوەڵانی پێغەمبەردا، چەندە زۆر بووە، بەپێچەوانەی ئەو قسەلۆکەوە کە گوایە کەرامەت،

لەناو یاران‌و هاوڕێیانی پێغەمبەردا کەم بووە، بەم مەبەستە ئاماژە دەکەین بۆئەم شوێنانە:

تەجریدی بوخاری بەرگی یەکەم: ژمارە/٤٣، ٨٩، ٩٠، ١٢٦، ١٥٩، ١٦٣، ٢٢٠، ٢٤٠، ٢٦٩، ٢٧١، ٢٨٥، ٣١٥، ٤٦٨، ٤٧٩، ٥٥٤، ٥٧٧، ٥٧٩. بەرگی دووەم: ژمارە/٦٠٩، ٦١٧، ٦٣٨، ٦٥٤، ٦٦٣، ٧٢١، ٧٥٠، ٧٥٥، ٧٨٨، ٩٣١. بەرگی سێیەم: ژمارە/١٠٤٧، ١٠٦٣، ١١١١، ١١٧٣، ١٢٠٠، ١٢٠٦، ١٣٥٠، ١٤٤٤، ١٤٧٣، ١٥١٣.

## ١٦٧٢- حەسوودی (بەواتا خۆزگە) لەدووشتا پەسەندە (١٨٩١-١٨٩٥)
## باب: لا حسد إلاَّ في اثنتين

٢١٠٨- عن سالم عن أبيه (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: « لاَ حَسَدَ إلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ ، فَهْوَ يقوم به آنَاءَ اللَّيْلِ وآنا النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فهو يُنْفِقُهُ فِي آنَاءَ اللَّيْلِ وآنا النَّهَارِ. (الحديث ١٨٩١ = ١٨٦٣ فم تجريد البخاري/٤ رقم/١٧٣٢ = ٥٠٢٦، ٧٢٣٢، ٧٥٢٨. ترمذي. بر وصلة: ١٩٣٦. ابن ماجه: زهد: ٤٢٠٩ تحفة الأشراف/٦٨١٥).

سالم فەرمووی: باوکم عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: حەسودی‌و بەخیلی (بەواتا خۆزگە پێبردن) بەکەس دروست نییە، بەم دووکەسە نەبێ: یەکەم: پیاوێ خودا فێری قورئانی کردبێ‌و ئەم خەڵاتە مەزنەی پێ بەخشیبێ، ئەویش درێغی لێ نەکاو بەشەو و بەرۆژ پێی هەڵدەستێ‌و کارو ڕەفتی پێ دەکاو دەوری دەکاتەوەو لەنوێژو شەو نوێژ دا دەیخوێنێ.

دووەم: بەپیاوێ کە خودا ماڵی ڕەحمەتی پێ ببەخشێ، ئەویش درێغی لێ نەکاو، بەڕاست‌و بەچەپا، بەشەوو بەڕۆژ خێرو چاکەی لێ بکا. (ریاض صالحین/٢ ز/٦٤ ژ/٥٧٢ + تاج/١ ز/١٥ ژ/١١٤ چ/٤) + (ریاض/٣ ز/١٨٠ ژ/٩٩٧) + (تجرید/١ ژ/٦٥ = ٧٣).

**ڕوونكردنەوە**:

١- وشەی (پیاو)و وشەی (فێركردن)و هەروەها وشەی (ماڵ) ئەم وشانە لەم جۆرە شوێنانەدا بۆقەیدنین، بەڵكوو بۆ نمونەن، چونكە ئەگەر قەیدو مەرج بن، دەبێ بڕیاری خۆزگە پێخواستن، هەربەپیاو دروست بێ‌و هەربۆ ماڵیش دروست بێ، بەڵام چونكە قەیدنین، خۆزگە بەژنی قورئانپەروەریش، چ لەلایەنی ژنەوە، چ لەلایەنی پیاوەوە دروستەو ڕەوایەو كارێكی پەسەندیشە، هەروەها ئەگەر كەسێ خۆزگە بەئیمامی بوخاری، یا بەئیمامی موسلیم بخوازێ، لەو ڕووەوە كە خزمەتێكی گەورەی سوننەتی پێغەمبەریانكردووە جێگەی خۆیەتی، وەهەر وەها كەسێ خۆزگە بەموسوڵمانێ بخوازێ لەسەرئەوە كە مرۆڤێكی دڵ ئالوودەی مزگەوتە، یاشەو نوێژێكی جوان دەكا، یا ڕۆژووگرێكی باشە، یا هاوسایەكی پاك‌و پیرۆزە، یادووكاندارێكی حەقانی‌و حەلاڵخوازو مامەڵە خۆشە، یا مەلایەكی چاكە، كارێ پەسەندە.

بەڵام ئەوەندە هەیە: (هەمیشە نموونە باسكراوەكان، هەمیشە لەپێشی پێشەوەن لەوباسەدا، كەواتە: خۆزگە بەقورئانخوێنی باش، سەرگوڵی ئەم بابەتەیە، هەروەك خۆزگە خواستن بەپیاوی خواپێداوی سەخی نموونەی باڵای ئەم بابەتەیە). (تاج/١ ز/١٢ ژ/٩١ – ئادەمیزاد لەسەر نیازی باشی...) + (ریاض الصالحین/٣ ز/١٨٠ ژ/٩٩٨).

## ١٦٧٣- فەرمانكردن بەسەرپەرشتی قورئان‌و دەوركردنەوەی بەزۆریی (١٨٣٤-١٨٤١)

## باب: الأمر بتعاهد القرآن بكثرة التلاوة

٢١٠٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ الإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ ». (الحديث ١٨٣٦ = ١٨٠٦ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم/١٧٣٤ = ٥٠٣١ فتح الباري).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نموونەی قورئانخوێن، وەك نموونەی خاوەن وشتری مەڕبەندکراو وایە، چۆن ئەو ئەگەر سەرەوکاری وشترەکەی بکا، ئەوا وشترەکەی بۆ دەمێنێ، بەلام ئەگەر بەرەڵای بکا، ئەوا وشترەکە بەلەسەدەبێو لەدەستی دەردەچێ، قورئانیش هەروەها، ئەگەر خاوەنەکەی خەریکی بێو چاودێری بکا، ئەوا لەبەری دەمێنێ بەڕەوانی، دەنا بەربەرە لەبیری دەچێتەوەو لەبەری نامێنێ). (ریاض الصالحین/٣ ز/١٨١ ژ/١٠٠٣) + (تاج/٤ ز/٧٧ ژ/٣٦٠٧).

٢١١٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « بِئْسَ مَا لأَحَدِهِمْ يَقُولَ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ بَلْ هو نُسِّيَ ، اسْتَذْكِرُوا الْقُرآنَ فلهو أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ بِعُقُلِهَا ». (الحديث ١٨٣٨ = ١٨٠٨ فم. تجريد البخاري/٤ رقم/١٧٣٥ = ٥٠٣٩، فتح الباري. ترمذي قرءات: ٢٩٤٢. نسائي. إفتتاح: ٩٤٢. تحفة الأشراف/٩٢٩٥).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: چەندە خراپو ناشیرینە بۆ ئادەمیزاد کەبڵێ: مـن ئەو ئایەتە، یا ئەو سوورەتەم لەبیر چۆتەوە، بەڵکوو ئەوەچارەنووسی خودایی لە بیری بردۆتەوە، کەوابوو بابڵێ: فیسارە ئایەتم، یا فیسارە سوورەتم، لەبیر براوەتەوە!.

دەی هەمیشە دەوری قورئان بکەنەوەو بیکەن بەوێردی سەرزمانتانو پیشەی هەمیشەتان، ئەگینا چۆن وشترو ماڵات کەلەپەت بەربوون، ئەگەر چاودێری نەکرێن، بەرە بەرە کێویو بەلەسە دەبنو ئیتر زەوت ناکرێن، قورئانیش ئاوا، بگرە خێرا تریش لەسینگی قورئان خوێنەکان نائاشنا دەبێ، ئەگەر بێتو سەرو مڕ دەوری نەکرێتەوە. (تاج/٤ ز/٧٧ ژ/٣٦٠٩) + (ریاض/٣ ز/١٨٠ ژ/١٠٠٣).

## ١٦٧٤- قورئانخوێندن بەدەنگی خۆش (١٨٤٢-١٨٥٢)
## باب: تحسين الصوت بقراءة القرآن

٢١١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: « مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيّ حَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ ». (الحديث ١٨٤٤ = ١٨١٤ فم. بخاري. توحيد: ٧٥٤٤، أبوداود. صلاة: ١٤٧٢ تحفة/١٤٩٩٧).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خودا لەهیچ شتێ ئاوا بەحوسنی ڕەزا گوێ ناگرێ، وەك گوێ دەگرێ لەپێغەمبەرێکی دەنگخۆش، کەبەئاوازی خۆش‌و بەمەقامی جوان، قورئان بخوێنێ‌و بەشەوقەوە دەنگی لێ هەڵبڕێ). (ریاض صالحين/٣ ز/١٨٢ ژ/١٠٠٤ + تاج/٤ ز/٧٨ ژ/٣٦١٧).

٢١١٢- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأَبِي مُوسَى: « لَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ الْبَارِحَةَ لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ ». (الحديث ١٨٤٩ شيحا = ١٨١٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية/المجلد الرابع الرقم: ١٧٣٨ = ٥٠٤٨ فتح الباري. تحفة الأشراف/٩١٠١).

ئەبوبوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی پێم: ئەی ئەبو موسا! خۆزگە ئەمشەو ئاگات لەمن دەبوو، کەتۆ بەو دەنگە خۆشەت قورئانت دەخوێند، چۆن بەدڵ‌و بەداو گوێم لێت گرتبوو! شادمان دەبوی ئەی ئەبوموسا! بەڕاستی خودای گەورە، دەنگ‌و ئاوازێکی خۆشی پێ داویت، دەڵێیت دەنگ‌و ئاوازە خۆشەکەی داوود پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەربێ). (ریاض صالحين/٣ ز/١٨٢ ژ/١٠٠٥ + تاج/٣ ز/٦٣ ژ/٣٥٣١ + تاج/٤ ز/٧٨ ژ/٣٦١٥).

**ڕوونکردنەوە**:

ئـەبوداود نـاوی حـاریثـی کـوڕی ئەبومووسـای ئەشـعەرییە، باوکیشـی نـاوی عەبدوڵلای کوڕی قەیسە (بڕوانە: ژمارە٢١) هەنـدێ دەفـەرموون: نـاوی عـامیر بـوو، هەندێ دەفەرموون: ناوی ئەبو بوردە بوو، واتە: نـاوو کەسـناو (کونیـە)ەکـەی یـەك بـووە. یـەکێ بـوو لەفـەقێو شـاگردە کـانی ئەبومووسـای بـاوکی، گێڕانـەوەی زۆرە، هاوتەمەنی عوروەی کوڕی زوبەیرە، گێڕانەوەی لێیەوە ئەنجام داوە.

پیـاوێکی ڕاسـتگۆی متمانـە پێکـراو بـوو، لـەپیاوانی شـەش پـەڕاوە ناودارەکـانی فەرموودەیـە کـە ١- بوخـاری ٢- موسـلیم ٣- ئـەبوداوود ٤- تـرمـذی ٥- نسـائی ٦- ئیبنوماجە.

قـازی کووفـە بـوو، تەمـەنی درێـژ بـوو، کاتـێ ئەبومووسـای بـاوکی مـیری سـەر بەصـرە بـوو، لەسـەردەمی عومـەردا، ئـەبو بـوردە لـەدایك بـوو. لەتەمـەنی هەشـتاو هەنـدا، لەساڵی سەدو چواری کۆچی دا مـردووە. العجلی دەفـەرموێ: لـەپاش مـەرگی قـازی شـورەیح ئـەبوبوردە بـوو بـەقازی کووفـە، نووسـەرەکەی سـەعیدی کـوڕی جوبەیر بوو.

## ١٦٧٥- خوێندنی قورئان بەسۆزو ئاوازەوە (١٨٤٢-١٨٥٢)

## باب: الترجیع في قراءة القرآن

٢١١٣- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ قَالَ سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيَّ يَقُولُ: قَـرَأَ النَّبِـيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَامَ الْفَتْحِ فِى مَسِيرٍ لَهُ سُورَةَ الْفَتْحِ عَلَى رَاحِلَتِهِ فَرَجَّعَ فِى قِرَاءَتِهِ. قَالَ مُعَاوِيَةُ: لَوْلاَ أَنِّى أَخَافُ أَنْ يَجْتَمِعَ عَلَيَّ النَّاسُ لَحَكَيْتُ لَكُمْ قِرَاءَتَـهُ. (الحديث ١٨٥٠ = ١٨٢٠ فـم. تجريـد/٤ رقـم: ١٥٨٦ = ٤٢٨١، ٤٨٣٥، ٥٠٣٤، ٧٥٤٠ تحفـة الأشراف/٩٦٦٦).

موعاوییەی کوڕی قورە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە عەبـدوڵلای کـوڕی موغەففـەلی ئـەل-مـوزەنی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفـەرموو لـەڕۆژی ئـازادکردنی مەککـەدا، پێغەمبـەرم بینـی بـەڕێوە، بەسـواری وشـترە مێنگەکـەی خـۆی، سـوورەتی فـەتحی

دەخوێنــد، لــەکاتی خوێندنەکــەدا، بــەدەم ڕۆیشــتنەوە، دەنگــی خــۆیی بەســۆزو بەئاوازەوە دەلەرانەوە، بەتێرو تەسەلی گۆی بەپیتەکان دەکرد.

موعاوییەی کوڕی قوررە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دەتسرم خەڵك کەڵەکەم لێ بکەن، ئەگینا ئێستا بەجوانی، لاسایی شێوەی قورئانخوێندنەکەی عەبدوڵلای کوڕی موغەففەلم بۆدەکردنــەوە وەك چــۆن ئــەو لاســایی شــێوەی دەنــگ لەرانەوەکــەی پێغەمبــــەری دەکــــردەوە. (تـــاج/٤ ز/٧٨ ژ/٣٦١٦ — ئـــاداب‌و دەســـــتوورەکانی قورئانخوێندن‌و دەورکردنەوەی).

### ١٦٧٦- لەشەودا خوێندنی قورئان بەدەنگی بەرزو گوێ لێگرتنی (١٨٣٤-١٨٤١)
### باب: الجهر بالقراءة بالليل والإستماع لها

٢١١٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ: « يَرْحَمُهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً كُنْتُ أَسْقَطْتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا ». (الحديث ١٨٣٤ = ١٨٠٤ فم. تجريد البخاري/٣ رقم: ١١٢٠ = ٢٦٥٥، ٥٠٣٧، ٥٠٣٨، ٥٠٤٢، ٦٣٣٥، ٥٠٣٨. أبوداود. صلاة: ١٣٣١ تحفة الأشراف: ١٦٨٠٧).

عائیشەی هاوسەری پێغەمبــەر (دروودی خــودا لەســەر پێغەمبــەرو ڕەزای خــودا لەهــەموو هــاوەڵ‌و هاوســەرانی بــێ) فــەرمووی: شــەوێ پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەربێ) لــەماڵی مــن بــوو، خــەریکی شــەونوێژ بــوو، پیــاوێکیش لــەناو مزگــەوتا، شــەونوێژی دەکــردو قورئــانی تیــادا دەخوێنــد پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەربێ) گــوێی لــەدەنگی قورئانخوێندنەکەی بوو، لەمنی پرسی: ئەی عائیشە! ئەمــە دەنگــی عــەببادی کــوڕی بیشرە؟ گوتم: بەڵێ، ئەوە دەنگی ئــەوە، فــەرمووی: ڕەحمــەتی خــودای لــێ بــێ، ئــەم پیــاوە فیســارە ئایــەتی لەفیســارە ســوورەت یــاد خســتمەوە، کەئــەو ئایەتــەم لــەیاد برابۆوە!. (تاج/٤ ز/٧٧ ژ/٣٦١٠).

## ١٦٧٧- قورئان بەحەوت شێوە خوێندنەوەی جوان هاتۆتە خوارەوە (١٨٩٦-١٩٠٤)

## باب: أنزل القرآن على سبعة أحرف

٢١١٥- عن عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ - رضى الله عنه - قال: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَؤُهَا ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - أَقْرَأَنِيهَا ، وَكِدْتُ أَنْ أَعْجَلَ عَلَيْهِ ، ثُمَّ أَمْهَلْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ ، ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ فَجِئْتُ بِهِ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - فَقُلْتُ: يا رسول الله إِنِّى سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ سورة الفرقان عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَأْتَنِيهَا ، فَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم -: « أَرْسِلْهُ، اقرأ » . فقرأ القراءة التي سمعته يقرأ، فَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم -: « هَكَذَا أُنْزِلَتْ » . ثُمَّ قَالَ لِى: « اقْرَأْ » . فَقَرَأْتُ، فَقَالَ: « هَكَذَا أُنْزِلَتْ . إِنَّ هذا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ». (الحديث ١٨٩٦ = ١٨٦٩ فم. تجريد/٤ رقم/١٧٢٤ = ٤٩٩٢، ٢٤١٩، ٥٠٤١، ٦٩٣٦، ٧٥٥٠. أبوداود. الصلاة. ١٤٧٥. ترمذي. قرءات: ٢٩٤٣. نسائي. إفتتاح: ٩٣٥. تحفة الأشراف: ١٠٥٩١، ١٠٦٤٢).

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ بەسەرینی پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەربێ) لەمزگەوت، گوێم لەهیشامی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزام بوو، لەنوێژ دا سوورەتی فورقانی دەخوێند، شێوەی خوێندنەکەی ئەو جیابوو لەگەڵ شێوەی خوێندنەکەی من، منیش قورئانەکەم لەلای پێغەمبەر خۆی خوێندبوو، لەبەرئەوە دڵنیابووم لەڕەوانی شێوە زاری خۆم، جا خەریکبووم هەر لەناو نوێژەکەی دا پەلاماری بدەم، کە بۆوا دەخوێنێ، بەڵام مۆڵەتیم دا هەتا سڵاوی نوێژەکەیی دایەوە، ئەوسا توند یەخەیم گرتو بەرۆکی پۆشاکەکەیم لوول دا بەملیەوەو بەو شێوەیە بەڕاکێشان بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتم: قوربان! ئەمە سوورەتی فورقانی دەخوێند، بەشێوەیێ دەیخوێنێ جیایە لەگەڵ ئەوەدا کەمن لەلای تۆ خوێندوومە! وە بەقسەی خۆشی بێ دەڵێ گوایە ئەم سوورەتەی لەسەر ئەم شێوازە لەلای تۆ خوێندووەو تۆ پێیت ڕەوانکردووە! فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): تۆجارێ یەخەی بەردە، ئەی هیشام! ئادەی بخوێنە.

جا ئەویش لەسەرئەو شێوەیەی کەمن گوێم لێی بوو خوێندنی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (ئاوەهایش هاتۆتە خوارەوە). ئینجا بەمنیشی فەرموو: ئادەی تۆیش ئەی عومەر! بخوێنە. منیش لەسەر شێوەکەی خۆم کەلەپێغەمبەرم وەرگرتبوو خوێندم، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ) ئاوەهایش لەسەرئەم شێوەزارەیش هاتۆتە خوارەوە، ئەمەیش قەیدی نییە، چونکە ئەم قورئانە بەحەوت شێوەو شێوازو لکەزار هاتۆتە خوارەوە بۆمن، جائێوە بەکام شێوە خوێندنێ بەئاسانی بۆتان دەخوێنرێ، بەوشێوەیە بیخوێنن! (تاج/٤ ز/٩٣ ژ/٣٦٨١ + تەجریدی بوخاری= مختصر صحيح بوخاری = پوختەی صەحیحی بوخاری بەکوردی، بەرگی سێیەم، ژمارە/١٠٠١، ٣٢١٩، ٤٩٩١ — فتح الباری).

## ١٦٧٨- پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەلای هەندێ لەیارانی خۆی دەرسی قورئانی خوێندووە

## باب: قراءة النبي (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) القرآن على غيره (١٨٦١-١٨٦٣)

٢١١٦- عَنْ أَنسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ النَّبِىُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأُبَىّ بن كعب: « إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِى أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ ( لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا ) » . قَالَ وَسَمَّانِى قَالَ « نَعَمْ » فَبَكَى . (الحديث ١٨٦٢ = ١٨٣٣ فـم. تجريد البخاري/٤ رقم: ١٤٩٣ = ٣٨٠٩، ٤٩٥٩، ٤٩٦٠، ٤٩٦١، تحفة الأشراف: ١٢٤٧).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە ئوبەییەی کوڕی کەعبی فەرموو: (خودای گەورەو سەروەر فەرمانی پێ کردووم کە سوورەتی {لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا} کە ناسراوە بە سوورەتی ئەلبەیینە، لەلای تۆ بەدەرس بخوێنم!.

ئوبەیی فەرمووی: بەناوی خۆم ناوی هێنام بۆتو خودا پێی فەرمووی: ئەی موحەممەد سوورەتی {لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا} لەلای ئوبەییە بخوێنە؟!

فەرمووی: بەڵێ، ئەنەس فەرمووی: جا لەخۆشیانا ئوبەییە دەستی کرد بەگریان. (تاج/٤ ز/٧٩ ژ/٣٦٢٧).

**روونکردنەوە:**

١ - لەڕاڤەنا مەکانا، بەتایبەتی نەوەوی‌و عەللامەی عەینی، دەفەرموون: بەپێی دەقی ئەم فەرموودەیە، ئوبەیی تەنیا کەسێ بووە، لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە شانازی ئەوەی پێ بڕاوە کە پێغەمبەر دەرسی قورئانی لەلا خوێندووە.

٢ - هەروا ڕاڤەکاران دەفەرموون: مەبەستی پێغەمبەر لەم کارە ئەوە بووە، کە ببێ بەپێشەواو سەرمەشقی جوان لەم بوارەدا، بۆ هاوەڵ‌و یارەکانی هەتا نیشانیان بدا بە کردەوە، کە دەرسی قورئانخوێندن‌و فێربوونی زانست لەخزمەتی مامۆستای زانادا کارێ پەسەندو جوانەو، نابێ کەس نکووڵی لێ بکاو بڵێ من لەوە گەورەترم کە دەرس لەلای ئەم‌و ئەو بخوێنم.

٣ - پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەرسی قورئانی هەموو لەلای جوبرائیل خوێندووە، بەتایبەتی لەمانگی ڕەمەزاندا، دوو بەدوو موراجەعەو دەوری قورئانیان دەکردەوە، هەتا پێغەمبەر بەجوانی قورئانەکە ڕەوان بکا، بەتەجویدەوەو بەهەموو قیرائەتەکانیەوە.

٤ - ئوبەیی مامۆستایەکی قورئانخوێنی گەورە بوو، وەسەرچاوەیەکە لەسەرچاوەکانی تیلاوەتی قورئان لەناو نەتەوەی ئیسلام دا بۆ ژیاننامەی ئوبەیی بڕوانە ژمارە (٢٤٢) کەلەپێشەوە رابورد.

٥ - گەلێ لەمامۆستا بەڕێزەکان، لەبەر چەندین هۆی لەباری جیاجیا دەرس‌و وانەیان لەلای فەقێکانی خۆیان خوێندووە، دەڵێن: مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی کە یەکێك بووە لەمەلا گەورەکانی کوردستان، کە گۆڕەکەی لەمزگەوتی گەورەی پێنجوێنە، کە من خۆم چوومەتە سەر گۆڕەکەی، کە پەراوێزی گرنگی لەسەر گەلەنبەوی ئاداب‌و گەلەنبەوی بورهان‌و زۆر پەڕاوی ترهەیە، دەڵێن: ئەم مامۆستا مەزنە لەکاتی پیری دا گەلێ شتی لەیاد نامێنێ،

تەنانــەت زۆر لــەو پــەراوێزە گرانانــەی کەلەســەر کتێبــەکان نوســیبووی مەعناکەیانی نەدەزانی، سەر لەنوێ لەفەقێو شاگردەکانی خۆیی دەپرسییەوە.

لەجــەنابی خوالێخۆشــبوو مامۆســتا مــەلا عەبــدوڵلای چوڕوســتانیم بیســت دەیفــەرموو (هــەزار ڕەحمــەت لــەوو لەمامۆســتای ئیبنولقــەرەداغیو مامۆســتای پێنجوێنی بێ) لەسەرە مەرگ دا، فەقێکانی مەلای پێنجوێنی دەبیـنن کـە مامۆسـتا رووی گەشو نوورانیو خۆشـە، بەپێچـەوانەی کـاتی ژیـانی، کـە هەمیشـە خـەمبارو خەفـەتبار بـووە، کەلـەم بارەیـەوە پرسـیاری لــێ دەکـەن، لەوەڵامـدا دەفـەرمووێ: لەئاثارا هاتووە کەعەبدی سوفیان، کەیەکێکە لەپێکوڕەکانی جەجاڵ، مەلایەکی زۆر زیـرەكو بلیمەتـە، نـاوی خـۆیو نـاوی بـاوکی وەك نـاوی مـنو نـاوی بـاوکم وایـە، لەخۆرهەڵاتەوە پەیدا دەبێ، لەئاخری تەمەنی دا خودا سەری لـێ دەشـوێنێو دەبـێ بەپێشڕەوی کۆمەڵەی جەجاڵ، جا ئێستا لەم کاتی گیانەڵاو سـەرەمەرگەدا، مـوژدەی ئەوەم پێ دراوە کە سـوپاس بۆخـودا لەسـەر ئیمـان دەمـرمو ئـەوە لەمنـەوە دوورەو دڵنیا بووم کەمن ئەو مەلا عەبدوڕەحمانە چارە ڕەشەنیم، جا بۆیە کاتی خـۆی ئـاوا پەسـتو خـەمباربوومو ئێسـتا ئـاوا دڵشـادو شـادمانم (ذیکـری صـالحین ڕەحمـەتی واپێ).

هـەروا جـەنابی مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵلای چوڕوسـتانی گێڕایـەوە بۆئێمـەی فەقێکانی، فەرمووی: جارێ کۆمەڵێ فەقێ بـاش بـووین، لەخزمـەتی مامۆسـتا شـێخ عومــەری قــەرەداخی دا دەرسمــان دەخوێنــد، شــوێنەکە زۆر ســەختو گــران بــوو پــەراوێزی مــەلای پێنجـوێنی بەســەرەوە بــوو، نــاو بــەناو مامۆســتا شــێخ عومــەر ڕەخنەی توندی لەپەراوێزەکانی مامۆستا مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی دەگرت.

مامۆســتا مــەلا عەبــدوڵلا کــە خــۆی موجــازی شــێخی ئیبنولقــەرەداغی بــوو، فەرمووی: ئەم مـەلا حەمەمینـە شـێتەیش کـە ئێسـتا لـە خانـەقا دەژی لـەوێ بـوو، لەکۆڕەکەدا دانیشتبوو، روویکردە مامۆستا شێخ عومەرو پێی فـەرموو: قوربـان! تـۆ ئێستا زمانت تەڕو پاراوەو مەلا عەبدوڕەحمان بارێ خـاکی لەسـەر دڵ بـارە، بـەخوا

ئەگەر ئێستا مەلا عەبدوڕەحمان لەدەرگای خانەقاوە دەردەکەوت، تۆ لەترسا دەسنوێژەکەت دەشکا!.

بەخزمەت زۆر لەمەلاو زاناو پیاوچاکان گەیشتووم، بەڵام کەسم نەدیوە کە وەك مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای چوڕستانی راستگۆو زمانپاك بێ، هەموو سیفاتی راوی صەحیحین لەو مامۆستا بەڕێزە خواناسەدا هەبوو (هەزار ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێ).

### ١٦٧٩- پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) قورئان بەسەر کۆمەڵێ نوێنەری جنۆکەدا دەخوێنێ (١٠٠٥-١٠١٠)

### باب: قراءة النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) القرآن على الجن

٢١١٧- عَنْ عَامِرٍ (هو الشعبي) قَالَ: سَأَلْتُ عَلْقَمَةَ هَلْ كَانَ ابْنُ مَسْعُودٍ شَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- لَيْلَةَ الْجِنِّ؟ قَالَ فَقَالَ عَلْقَمَةُ أَنَا سَأَلْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ فَقُلْتُ: هَلْ شَهِدَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- لَيْلَةَ الْجِنِّ؟ قَالَ: لاَ وَلَكِنَّا كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- ذَاتَ لَيْلَةٍ فَفَقَدْنَاهُ فَالْتَمَسْنَاهُ فِى الأَوْدِيَةِ وَالشِّعَابِ فَقُلْنَا اسْتُطِيرَ أَوِ اغْتِيلَ - قَالَ - فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ فَلَمَّا أَصْبَحْنَا إِذَا هُوَ جَاءٍ مِنْ قِبَلِ حِرَاءٍ - قَالَ — فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَدْنَاكَ فَطَلَبْنَاكَ فَلَمْ نَجِدْكَ فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ. فَقَالَ: « أَتَانِى دَاعِى الْجِنِّ فَذَهَبْتُ مَعَهُ فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ ». قَالَ: فَانْطَلَقَ بِنَا فَأَرَانَا آثَارَهُمْ وَآثَارَ نِيرَانِهِمْ وَسَأَلُوهُ الزَّادَ فَقَالَ: « لَكُمْ كُلُّ عَظْمٍ ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ يَقَعُ فِى أَيْدِيكُمْ أَوْفَرَ مَا يَكُونُ لَحْمًا وَكُلُّ بَعَرَةٍ عَلَفٌ لِدَوَابِّكُمْ ». فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « فَلاَ تَسْتَنْجُوا بِهِمَا فَإِنَّهُمَا طَعَامُ إِخْوَانِكُمْ ». (الحديث ١٠٠٦ = ٩٩٩فم).

عامیر واتە (شەعبی) (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەعەلقەمەم پرسی ئایا ئەوشەوەی کە جنۆکەکان بەخزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گەیشتن، ئیبنو مەسعوودی لەگەڵا بوو یان نا؟ عەلقەمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆخۆم لەئیبنو مەسعوودم پرسی: ئایا کەسێ لەئێوەی یارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەشەوی

جنۆكـەكان دا لەگـەڵ پێغەمبـەردا ئامـادە بـوون؟ فـەرمووی: نـەء، بـەڵام ئێمـە شەوێكیان لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، ئەوەندەمانزانی لێمان ون بـوو، ئێمـەیش كەوتینـە گـەڕان بـۆی‌و ناوشـیوو دۆڵـەكانی دەوربـەرمانی بـۆ گـەڕاین، بـەڵام نـەمان دۆزییەوە، لەناو خۆمـان دا گوتمَان: ئـەرێ چی لێهـات، جنۆكـە نەیفڕانـدبێ، یـا بـە دزییەوە نەكوژرابێ؟

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: جا ئەوشـەوە هـەر لەئێمـە بـڕوا، ئەوەنـدە پەرۆشـی پێغەمبـەر بـووین، شـەوی وا نـاخۆش‌و خـراپ كـەس نەیـدیوە؟ كاتـێ بـەیانی بـوو، تەشریفی لەلای حیرائەوە هاتەوە.

ئیبنـو مەسـعوود فـەرمووی: عـەرزیمانكرد: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەمشەو گومبوویت لێمان، گەلـێ گەڕاین بـۆت نـەمان دۆزیتـەوە، زۆر پەرۆشـبووین بۆت، شەوی واناخۆش كەس نەیبینێ!

خۆشەویسـت (دروودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: نوێنـەری جنۆكـە هـات بـۆلام، بـانگی كردم بۆلای خۆیان، منیش لەگەڵیا چووم، لەوێ قورئانم بۆ خوێندن!.

ئیبنو مەسـعوود فـەرمووی: جـا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) ئێمـەی بـرد لەگـەڵ خۆی، شوێنەواری جنۆكەكان‌و شوێنەواری ئاگرەكانیانی پێ نیشانداین.

شــەعبی فــەرمووی: هەرئــەو شــەوە جنۆكــەكان داوای خــۆراك‌و توێشــوویان لەپێغەمبەر كرد: كەچی حەڵاڵە بۆمان؟.

پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) پێیان دەفەرموێ: هـەموو ئێسـكێ كـەهی ئاژەڵـێ بـێ، بەپێی شەرع‌و یاسا نامەی خودا سەربڕابێ‌و لەكاتی سـەربڕین دا نـاوی خـودای لـێ هێنرابێ، كاتێ بكەوێتە دەستی ئێوە، ئەوە تێشوو و خۆراكی ئێوەبێ، لەهەمان كاتـا گۆشـتی زۆر تەواویشـی پێـوە بـێ، ئەمـە بـۆ خـۆراك بۆخۆتـان، بـۆ ئـاڵفی وڵاخ‌و ئاژەڵەكانیشتان گشت پشقل‌و تەپاڵەو تەرسێ ببێ بەئاڵف‌و ئالیك بۆیان، تازەببنەوە وەك پێش خواردنیان!

شەعبی فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پاشان دەفەرموێ: دەی بە تەپاڵەو پشقڵو تەرس‌و ئێسقان تارات مەگرن‌و خۆتانیان پێ پاك مەكەنەوە، چونكە ئەوانە خۆراكی جنۆكەكانی براتانن‌و ئاڵفی وڵاخو ئاژەڵەكانیانن!. (تاج/١ ز/٢٥ ژ/٢٠٤، ٢٠٣ — تاراتگرتن + تاج/٤ ز/٥٥ ژ/٤١٨٩ — سورەتی جین + تاج/٤ ز/١٠ ژ/٤٢٩٥ — پاشەكی + ژمارە:٤٢٩٦ تاكۆتایی زنجیرەكە). (بڕوانە: ژمارە:٢١٧٢ لەدواوە).

٢١١٨- عَنْ مَعْنٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِى قَالَ سَأَلْتُ مَسْرُوقًا مَنْ آذَنَ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِالْجِنِّ لَيْلَةَ اسْتَمَعُوا الْقُرْآنَ فَقَالَ حَدَّثَنِى أَبُوكَ - يَعْنِى ابْنَ مَسْعُودٍ - أَنَّهُ آذَنَتْهُ بِهِمْ شَجَرَةٌ. (الحديپ ١٠١١ = ١٠٠٢ فم. تجريد البخارى/٤ رقم/١٥٠٧ = ٣٨٥٩ فتح البارى. تحفه الأشراف/٩٥٧٢).

مەعنی كوڕی عەبدوڕەحمانی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودی (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەعەبدوڕەحمانی باوكم بیست دەیفەرموو: لەمەسرووقم پرسی: ئەو شەوەی كە نوێنەری جنۆكەكان گوێ لەقورئانەكە دەگرن كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەیخوێنێ، ئەو شەوە كێ پێغەمبەر ئاگادرا دەكاتەوە لەوە؟ مەسرووق فەرمووی: باوكت (واتە: ئیبنو مەسعوود) فەرمووی پێم: درەختێ جنۆكەكان ئاشكرا دەكا لەپێغەمبەر، دار سەمورەیێ عەرزی دەكا، كە كۆمەڵێ جنۆكە گوێیان لەقورئانەكە گرت. (تاج/٤ ز/٢٩ ژ/٤٠٩٦، ٤٠٩٧ — سوورەتی ئەحقاف).

## ١٦٨٠- پێغەمبەر گوێ دەگرێ لەقورئانخوێندنی كەسێكی تر (١٨٦٤-١٨٦٨)
## باب: إستماع النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) القرآن من غيره

٢١١٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِى رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « اقْرَأْ عَلَىَّ الْقُرْآنَ» . قال: فَقُلْتُ: يا رسول الله آقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: « إِنِّى أشتهي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِى » . فَقَرَأْتُ النِّسَاءِ حَتَّى إذا بَلَغْتُ ( فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاَءِ شَهِيدًا ) رفعت رأسي. أو غمزني رجل

إلى جَنْبِي، فرفعت رأسي، فرأيتُ دموعه تَسيلُ. (الحديث/١٨٦٤ = ١٨٣٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم/١٦٥٢ = ٤٥٨٦، ٥٠٤٩، ٥٠٥٠، ٥٠٥٥، ٥٠٥٦. أبوداود. علم/٣٦٦٨. ترمذي. تفسير: ٣٠٢٤. تحفة/٩٤٠٢).

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی پێم: هەندێ قورئانم بۆ بخوێنە. گوتم: قوربان! قورئان بۆ تۆهاتووەو من بۆتی بخوێنم؟! فەرمووی: حەزدەکەم کەسێکی تر بیخوێنێو گوێی لێ بگرم. منیش سوورەتی نیسائم بۆی خوێند، هەتا گەیشتمە سەر ئەم ئایەتە: {فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيدًا} (سورة النساء- ٤/٤١).

واتە: جا ئەبێ حاڵی ئەو کافرە بێبڕوایانە لەڕۆژی زینەوەدا چۆن بێ، لەوکاتەدا کەلەهەموو گەلێ، لەهەموو نەتەوەیێ، شایەتی دەهێنین، کەشایەتی بدا لەسەر بێدینیو بێ بڕوایی‌و نامەردیی ئەوان، وە تۆیش ئەی موحەممەد! دەهێنین بۆ شایەتی دان لەسەریان، وە بۆشایەتی دان بۆیان.

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: ئیتر کە گەیشتمە ئێرە، خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی پێم: ئیتر بەسە. فەرمووی: کەسەرم هەڵبڕی، یا فەرمووی: پیاوێ لە تەنیشتمەوە بوو، تێوەی ژەندم، کەسەرم هەڵبڕی، تەماشام کرد: هۆن هۆن ئەسر بەچاوەکانی خۆشەویست دا (دروودی خوای لەسەربێ) دەهاتە خوارەوە. (تاج/٤ ز/٧٩ ژ/٣٦٢٩) + (ریاض/٢ ز/٥٤ ژ/٤٤٦).

٢١٢٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ بِحِمْصَ فَقَالَ لِي بَعْضُ الْقَوْمِ اقْرَأْ عَلَيْنَا. فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمْ سُورَةَ يُوسُفَ (عليه السلام) - قَالَ – فَقَالَ: رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ وَاللَّهِ مَا هَكَذَا أُنْزِلَتْ. قَالَ: قُلْتُ: وَيْحَكَ وَاللَّهِ لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ لِي: « أَحْسَنْتَ ». فَبَيْنَمَا أَنَا أُكَلِّمُهُ إِذْ وَجَدْتُ مِنْهُ رِيحَ الْخَمْرِ قَالَ فَقُلْتُ: أَتَشْرَبُ الْخَمْرَ وَتُكَذِّبُ بِالْكِتَابِ؟ لاَ تَبْرَحُ حَتَّى أَجْلِدَكَ - قَالَ -: فَجَلَدْتُهُ الْحَدَّ. (الحديث ١٨٦٧ = ١٨٣٩ فم = ف.م = فتح الملهم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري/٤ رقم:١٧٢٧ = ٥٠٠١ تحفة الأشراف: ٩٤٢٣).

عەلقەمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەشاری حومس بووین، کەوا لەشام خەڵکەکە بەئیبنو مەسعوودیان گوت: هەندێ قورئانمان بۆ بخوێنە، ئیبنو مەسعوود سوورەتی یووسفی خوێند. پیاوێ گوتی: بەخودا ئەم سوورەتە بەم شێوەیە نەهاتۆتە خوارەوە! ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەم سوورەتەم لەخزمەتی پێغەمبەر خۆی دا خوێند، لەسەر ئەم شێوەیەی کە ئێستا خوێندم، فەرمووی پێم: ئافەرین بۆخۆت، زۆر بەجوانی دەیخوێنی!.

ئیبنو مەسعوود، لەکاتی گوفتوگۆ لەگەڵ کابرادا، سەرنجی دا کەکابرا بۆنی مەی و بادەی لێ دێ، جا پێی گوت: تۆ لەلایەکەوە بەنەزانی دەم لەنامەی خودای گەورە دەکوتی و لافی مامۆستایی لەنامەی خودادا لێ دەدەی، لە لایەکی تریشەوە ڕەفتارت بەپێچەوانەی گوتارتە، چونکە ئەوەتا ئارەقت خواردۆتەوە، ئەمە چەنی بەچەنە؟ جا پاش ئەوەی کە کابرای ڕەخنەگر، ددانی بەوەدانا کە بادەی نۆشیوە، ئیبنو مەسعوود داری حەددی ئارەقخواردنەوەی لێ دا.

## ١٦٨١- هەڕەشە لەجیاوازیی لەخوێندنی قورئان دا (٦٧١٧-٦٧٢٥)

## باب: الزَّجر عَنْ الإختلاف في القرآن

٢١٢١- عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: هَجَّرْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَوْمًا - قَالَ -: فَسَمِعَ أَصْوَاتَ رَجُلَيْنِ اخْتَلَفَا فِى آيَةٍ فَخَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يُعْرَفُ فِى وَجْهِهِ الْغَضَبُ فَقَالَ: « إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِاخْتِلاَفِهِمْ فِى الْكِتَابِ ». (الحديث ٦٧١٨ = ٦٧٣٢ فم. تجريد/٤ رقم/١٧٤٢ = ٥٠٦٠، ٥٠٦١. تحفة الأشراف/٨٨٣٩).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: بەیانی زوو، ڕۆژێ چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەژوورەوە بوو، گوێی لەدوو پیاو بوو، سەبارەت بەئایەتێکی قورئان بوو بەکێشەو بەرەیان، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هاتە دەرەوە بۆلامان، بە ڕوویا دیار بوو کە بەهۆی دووبەرەکی ئەو دوو پیاوەوە

تووڕەبــوو، فــەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): نەتــەوەکانی پــێش ئێــوە بــەهۆی نــاکۆکیو دووبەرەکیانەوە لەنامە ئاسمانییەکانیانا لەناو چوون!. (تاج/٤ ز/٧٨ ژ/٣٦١٩).

٢١٢٢- عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ البجلي (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قـال: قـال رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُـوا عَنْـهُ ». (الحـديث ٦٧٢٠ = ٦٧٣٤ فـم. تجريـد/٤ رقـم:١٧٤٢ = ٥٠٦٠، ٥٠٦١. تحفـة الأشراف: ٣٢٦١).

جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵای ئەلبەجەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: ئەوەنـدە قورئـان بخوێنن، کە دڵتـان لەسـەریەتی، بـەڵام کـەبێ تاقـەت بـوونو دڵتـان لـەلای خوێندنەکـەتان نـەما، یـا قورئانخوێندنەکـەتان سەری کێشا بۆ نـاکۆکیو دوو بـەرەکیو شـتی تـری وا، ئـیتر هەڵسنو لەوکاتـەدا واز لـەقورئان خوێنـدن بهێـننو ئـەو کـۆڕو کۆمەڵـەی کـەوابێ، چۆڵی بکـەنو بـەجێی بهێڵن!. (تاج/٤ ز/٧٨ ژ/٣٦١٩).

**ڕوونکردنەوە:**

## ذیکری صالحین ڕەحمەتی واپێ

مامۆسـتا مـەلا مەجیـدی مزگـەوتی سـەلاحەددین کەلـەوێ ئیمـامو پێشـنوێژ خوێنبوو، پیاوێکی تا بڵێی خاوەن تەقواو راسـتگۆ بـوو، وتـار خـوێنێکی جوان بـوو، فەرمووی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ): کۆمـەڵێ فـەقێی هاوتەمـەن بووین، ڕۆژێ چووین بۆنـاو ڕەزێ بـۆ تـرێ خـواردن، چارەنووسـی خـودایی وابـوو، کـوڕێکی لاوی مامۆسـتا مـەلا عارفی چنگنیانیمان لەگەڵا بـوو، ئـەویش فـەقێ بـوو، لەتەمـەنی گوڵ دا بـوو، هـەم بەشێوەو هەم بەڕەفتار یووسفی دووەم بوو بۆخۆی، فەرمووی: لەناو باخەکەدا ئـەو لاوە نـازدارە مـارێ پێـوەی دا، پـەتۆی پـێ نـەبردو یەکسـەر کوشـتی، ئـیتر ئێمـەیش بەدارە تەرمێ بەسـەر شـان بردمانـەوە بـۆ گوندەکـەی خۆیـان، کە گەیشتینە جێ، خـەڵکی گوندەکـە هـەموو هـاتن بـەپیر تەرمەکـەوەو بردمـان بـۆ مزگـەوت، کاتـێ گەیشتینە مزگەوت لەحەوشەکەدا، لەقەراخ حەوزەکەدا تەرمەکەمان دانا، مامۆسـتا

مەلا عارف لەژوورەوە لەمیحرابەکەدا، لەپاش نوێژی عەصر، وەك یاسای هەموو ڕۆژێکی دانیشتبوو، بەشە قورئانی ئەو پاش عەصرەی دەخوێند، مامۆستا مەلا مەجید فەرمووی: منو مامۆستایێ لەتەمەنی مامۆستا مەلا عارف دا، چووین بۆ خزمەتی بەهێمنیو بەژیرانە عەرزمان کرد: قوربان! قەدەرێ قەوماوە، خەڵکەکە چاوەڕوانی جەنابت دەکەن بفەرموو کە بچینە دەرەوە.

مامۆستا مەلا عارف، لەسەر خۆ بەشێنەیی فەرمووی: دەزانم کە کوڕەکەم مردووە، بۆیە ئێوە ئاوا پەشۆکاوو پەرۆشو شڵەژاون، بەڵام بەخودا هەتا حیزبی ئەم پاش عەصرەم لەقورئانخوێندنەکەم تەواو نەکەم نایەم بۆ سەر تەرمەکەی. ئیتر دەستی کردەوە بەقورئانخوێندنەکەی هەتا تەواویکرد، ئەوجا فەرمووی: دەی ئەمجا بابچین.

مامۆستا مەلا مەجید فەرمووی: ئیتر مامۆستا مەلا عارف بەدەستی خۆی، کوڕەکەی شۆردو بەدەستی خۆی کفنی کردو خۆی نوێژی لەسەر کردو چووشە ژێر تەرمەکەی کەبردیان بۆ گۆڕستانو خۆی تەڵقینەکەی خوێند!!

مامۆستا مەلا مەجید فەرمووی: لەژیانما داستانو ڕووداوی زۆرم دیوە، بەڵام هەرگیز شتی وەك ئەو هەڵوێستەی مامۆستا مەلا عارف، وا پڕشکۆو سامو شکۆمەندیم نەیدوە.

ئەم چیرۆکی مامۆستا مەلا عارفو کوڕەکەی، مامۆستا مەلا مەجید بەو بۆنەیەوە گێڕایەوە بۆم کاتێ کاوەی کوڕم شەهید بوو، من زۆر پەرۆشو شڵەژابووم. (ڕەحمەتی خودا لەهەموو لایەکمان بێ. ئامین ٢٠١١/٢/٢).



# نامەی تەفسیر - كتاب التفسير

بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی چوارەم، لەژمارە: ١٦٣٠ وە هەتا ژمارە: ١٧٢١ لەژمارە: ٤٤٧٤ وەهەتا ژمارە: ٤٩٧٧ فتح الباری + تاجول ئوصول/٤ زنجیرە: ١ هەتا زنجیرە: ٩٢ لەژمارە/٣٦٨٦ هەتا ژمارە ٤٢٣٨.

**١٦٨٢- سەبارەت بەفەرمایشتی خودای گەورە {وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ}**

**باب: في قوله تعالى: {وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ}**

**٢١٢٣**- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « قِيلَ لِبَنِى إِسْرَائِيلَ ( ادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ يُغْفَرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ) فَبَدَّلُوا، فَدَخَلُوا الباب يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ ، وَقَالُوا: حَبَّةٌ فِى شَعَرَةٍ » . (الحديث ٧٤٣٩ = ٧٤٧٥ فم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري/٤ رقم: ١٦٣٣ = ٣٤٠٣، ٤٤٧٩، ٤٦٤١. تحفة الأشراف: ١٤٦٩٧).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێو سەرو ماڵو حاڵو مناڵو باوكو دایكو هەستو نەست هەمووی بەقوربانی گەردی بەرپێی سەردانیكەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: گوترا بەنەوەی ئیسرائیل {وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ يُغْفَرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ} (البقرة/٢-٥٨):

واتە: كاتێ نەوەی ئیسرائیل لەمووسایان داواكرد، كە لەباتی گەزۆو گۆشتی شولاقە، بەروبوومی زەوییان دەرخوارد بدات خودا فەرمانی پێ كردن كە بچنە ناو شارێ، لەكاتی چوونە ژوورەوەدا كوڕنووش بۆ خودا ببەنو بڵێن: خودایە لەگوناهەكانمان ببورەو گوناهەكانمان لێ هەڵوەرێنە، ئەگەر وابكەن لەتاوانەكانتان خۆش دەبم.

کەچی ئەوان بەپێچەوانەوە، لەباتی ئەوەی بەملکەچی‌و کوڕنووشەوە بچنە ژوورەوە، بە قنگە خشکێ چوونە ژوورەوەو لە باتی ئەوەی کەبڵێن: (حیططە: خودایە! گوناهەکانمان لێ هەڵوەرێنە) زمانیان گۆڕی‌و گوتیان (حیططە، حەببە في شەعەرە، کەلەسەر فەرمایشتی عەللامەی عەینی، ئەمە قسەیەکی بێ واتایە.

**١٦٨٣- سەبارەت بەفەرمایشتی خودای گەورە {وَلَيْسَ الْبِرُّ .....}**
**باب: في قوله تعالى {وَلَيْسَ الْبِرُّ...}**

٢١٢٤- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ يَقُولُ: كَانَتِ الأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَرَجَعُوا لَمْ يَدْخُلُوا الْبُيُوتَ إِلاَّ مِنْ ظُهُورِهَا - قَالَ - فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَدَخَلَ مِنْ بَابِهِ فَقِيلَ لَهُ فِي ذَلِكَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ( لَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا ). (الحديث ٧٤٦٥ رقم الحديث في شرح الإمام النووي لصحيح مسلم، حَسْبَ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٥٠١ فم. بخاري. تفسير: ١٨٠٣، ٤٥١٢. تحفة الأشراف: ١٨٧٤).

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: لەبەرائم بیست دەیفەرموو: جاران یاریدەدەران (الأنصار) کە حەجیان دەکردو دەگەڕانەوە، لەقنگەبانەوە دەلاقەیەکیان دەکردە خانووەکەیان‌و لەوکوونەوە لەپشتەوە دەچوونە ماڵەوە، هەتا جارێ پیاوێ، لە یاریدەدەران لەحەج دەگەڕێتەوەو لەدەرگاوە دەچێتەوە ماڵەوەی، ئەوانیش سەرزەنشتی دەکەن‌و دەڵێن بۆچی واتکرد؟، جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوْا الْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا} (البقرة- ٢/١٨٩)

واتە: چاکەو کردەوەی باش ئەوە نییە کە هاتنەوە بۆماڵەوە لەقنگە بانەوەو لەپشتی خانووەوە بچنە ژوورەوە، بەڵکوو چاکە ئەوەیە کەپیاو لەخودای گەورە بترسێ‌و پارێز لەنافەرمانی ئەو بکا، لەدەرگای ئاسایی ماڵەکانتانەوە بچنە ژوورەوەو هاموشۆبکەن‌و بۆ هەموو مەبەستێ لەدەرگاو ڕێگەی ئاسایی خۆیانەوە بڕۆن.

## ١٦٨٤- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە {رَبِّ أرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى}

## باب: في قوله تعالى: {رَبِّ أرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى}

بڕوانە ژمارە: ١٦٠٨، فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە، لەنامەی (الفضائل)دا رابورد.

## ١٦٨٥- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە {وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أنفُسِكُمْ أوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ} (٣٢٥-٣٢٧)

## باب: في قوله تعالى: {وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أنفُسِكُمْ أوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ}

٢١٢٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) (لِلَّهِ مَا فِى السَّمَوَاتِ وَمَا فِى الأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِى أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ) قَالَ: فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) ثُمَّ بَرَكُوا عَلَى الرُّكَبِ فَقَالُوا: أَىْ رَسُولَ اللَّهِ كُلِّفْنَا مِنَ الأَعْمَالِ مَا نُطِيقُ الصَّلاَةُ وَالصِّيَامُ وَالْجِهَادُ وَالصَّدَقَةُ، وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْكَ هَذِهِ الآيَةُ وَلاَ نُطِيقُهَا. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « أَتُرِيدُونَ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ مِنْ قَبْلِكُمْ: سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا، بَلْ قُولُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ». قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ). فَلَمَّا اقْتَرَأَهَا الْقَوْمُ ذَلَّتْ بِهَا أَلْسِنَتُهُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِى إِثْرِهَا: (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ) فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ نَسَخَهَا اللَّهُ تَعَالَى فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا) قَالَ نَعَمْ (رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا) قَالَ نَعَمْ (رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ ) قَالَ نَعَمْ (وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلاَنَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ) قَالَ نَعَمْ. (الحديث ٣٢٥ = ٣٤١فم. بخاري. تفسير: ٤٥٤٥. تحفة الأشراف: ١٤٠١٤)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أنفُسِكُمْ أوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ} (البقرة-٢/٢٨٤):

واتــە: هەرچــی وا لــەئاسمانو زەوی دا، هــەمووی هــی خودایــەو موڵــكو دروسـتكراوی خۆیـەتی، وەهەرچـی والـەناو دڵو دەرونتانـا، چ ئاشـكرای بكـەنو چ بیشـارنەوە، خـودا لـەڕۆژی ژیانـەوەدا، موحاسـەبەی ئـەوەتان دەكـاو پێتـانی دەور دەكاتەوە، ئەوسا بەئارەزوی خۆیەتی: هەركەسێ خواستی لەسـەری بێ چاو پۆشـی لێ دەكا، هەركەسێ خواستی لەسەر بێ، ئەشكەنجەی دەدا، چونكە خـودا دەسـەڵاتی بەسەر هەموو شتێكا دەشكێ.

فـەرمووی: كەئەمـە هاتـە خـوارەوە، یـارانی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) تـەواو سـەخڵەت بـوون، چـوون بـۆ خزمـەتیو بـە چـۆك دا هـاتنو عـەرزیانكرد ئـەی ڕەوانـەكراوی خـودا! ئـەی پێغەمبـەری ئـازیز! هـەتا ئێسـتا خـودای گـەورە ئـەو ئەركانـەی داوە بەسـەرماناو، ئـەم كردارانـەی كـردووە بەئـەركی سەرشـانمان، وەك نوێژو ڕۆژوو و خەباتو زەكات. وە بۆ ئەمانە ئێمە سـەرمان پێـوە نـەبووە، لاریمـان نەبووە، چونكە تەوانای ئەوانەمان بووە، وە لە ووزەمانا بووە، بـەڵام ئـەوەتانێ ئـەم ئایەتـەت بۆهـاتووە، بەڕاسـتی توانـای ئەمـەمان نییـە! چـونكە زۆر لـەو خـەیاڵو دڵەڕاوكێیانەی كە بەدڵمانا ڕادەبوورن بەدەستی خۆمان نییە!

ئەویش (دروودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: هـەی هـەی! وادیـارە كـە ئێـوەیش دەتانـەوێ كەوەك میللەتی جوولەكە، كە خاوەنی تەوراتن، وە وەك میللەتی نەصارا كەخاوەنی ئینجیلن، وادیارە كەئێوەیش وەك ئەم دوو گەلە، كەلەپێش ئێوەوە بوون، دەتانـەوێ وەك ئەوان بڵێن: {سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا} (البقرة – ٢/٩٣)

واتە: كەچی ئەوان لەپاش ئەوە خودا فەرمانی پێكردن كـە فەرمانەكەی خـودا بەجێ بهێننو بەگوێی بكەن، گوتیان: خودایـە! فەرمانەكـەتمان وەرگـرتو بـەگوێی خۆمان گوێمان لـێ بوو، بەڵام بەگوێت ناكەین. واتە: بەكوردیو كورتی: گوێم لێتـە بـەڵام بـەگوێت ناكـەم. حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: نەكـەن شـتی وابكـەن، بەڵكوو بڵێن:

{سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ} (البقرة-٢/٢٨٥)

ئەوانیش تەسلیم بوونو بەدەم ئەمەیان گوتو بەدڵ قەبووڵیانکرد، کەئەمە واتاو ڕاڤەکەیەتی،: واتە: پێغەمبەری خۆشەویست ئیمانو باوەڕی هەیە بەو نامەیە کە پەروەردگاری لەلایەنی خۆیەوە بۆی ناردووە، کە قورئانی پیرۆزە، هەروەها موسوڵمانەکانیش باوەڕو ئیمانیان بەو نامە پیرۆزە هەیە، هەموویان باوەڕیان هێناوە بەخوداو بەفریشتەکانیو بەنامەو پەڕاوەکانیو بەپێغەمبەرەکانی، کەخۆی ناردوویانی، بۆتەمیو ئامۆژگاری هۆشیاران، گشتیان دەڵێن: ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوانی هیچ یەکێ لەپێغەمبەرەکانی خودادا، لەوەدا کەیەك بەیەك بەپێغەمبەری خودایان دەزانین، هەروا دەڵێن: ئەی خودای پەروەردگار! فەرمانەکانی تۆمان بیست، بەهۆی موحەممەدی پێغەمبەرمانەوە، گەردن کەچ بووین بۆ ئەو فەرمانانەو، داوای ئەوە دەکەین لەتۆ کە بەکەرەمو بەخششتی خۆت چاوپۆشی بکەی لەتاوانەکانمان، ئەگەر داوای چاو پۆشی لەتۆنەکەین ئەی لەکێی بکەین! لەپاشە ڕۆژدا لەقیامەت دا، مەصیرو سەرئەنجاممان هەربۆلای تۆیەو، بەبێ دەسەڵاتیو بەدەستەوسانی، دەوڵەمەندو گەدامان دێینەوە بەردەستی خۆت. جاکە ئەمەیان بەجێ هێنا، خودا بڕیارو حوکمی ئەو ئایەتەی سڕییەوەو لایبردو، ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە.

{لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ} (سورة البقرة-٢/٢٨٦).

واتە: خودا ئەرکێکی وانادا بەسەرشانی کەسێکا کەشانی هەڵی نەگرێو داوایێ لەیەکێ ناکا کە لەتاقەتیا نەبێ، ئەوەی چاکە بکا دەبێ بەچەکی دەستیو سوودی چاکەکەی هەربۆخۆیەتی، هەروا ئەوەی خراپەبکا دەبێ بەملۆزمی گیانیو زیانی خراپەکەی هەربۆ خۆیەتی.

ئـەی موسـوڵمانینە! ئێـوەیش وەك یـاران بکـەن‌و کـردارو گفتـاری ئـەوان بکـەن بەسەر مەشق‌و پەیڕەو بۆخۆتان، ئەونزاو پاڕانەوەی ئەوان کردیان ئێـوەش بیکـەن، ئەوان کەئەرکی لەوزە بەدەر (تەکلیفی مالا یوطاق) یان لەسەر هـەلگیرا، لەسوپاسـی خودادا لەسەر پاڕانەوەکەی خۆیان رۆیشـتن‌و گوتیـان: ئـەی خودایـە! ئەگـەر هـەنێ لەئـەرکی سەرشـانی خۆمـان لـەبیر چـوو، یـا بەهەڵـە کردمـان، تۆڵێمـان مـەگرەو لەسەرئەوە سزاو ئازارمان مەدە، ئەی پەروەرودگاری ئێمـە! بـاری قـورس مەهاوێـژە سەرشـانمان وەکـوو خـۆ کوشـتن بـۆگیرا بـوونی پەشـیمانی‌و بڕینـی پارچـە بـەرگێ کـەپیس بووبـێ، وەك ئـەوبارە قورسـەت دابـوو بەسەرشـانی گـەلی جوولەکـەدا، کەلـەپێش ئێمـەدا بـوون، ئـەی پـەروەردگاری ئێمـە! هـەروا دەردو بـەلاو ئـاژاوەو ئاشوبێکی وامان بەسەردا مەدە کە لەبارمانا نەبێ، شوێنەواری تاوان‌و گوناهەکانمان کوێر کەرەوەو ئازارمان مەدە، وەعیبو نەنگمان بپۆشەو کردەوەی باشمان دەربخـە، وە بـەلوتف‌و کـەرەمی خـۆت ڕەحممـان پـێ بکـەو نـازو بـەهرەو ڕەحمـەت بڕێـژە بەسـەرمان دا، هـەرتۆی سـەرداری ئێمـەو جگـە لـەتۆ، پشـت‌و پـەنای ترمـان نییـە، سـەرەڕای ئەمانـەیش یارمـەتیمان بـدە بـۆ خـەبات‌و تێکۆشـان‌و زاڵمـان بکـە بەسـەر کۆمەڵەی کافرو بێ بڕواکانا، یاران کاتێ ئەم دووعایانـەیان دەکـرد، خـودای گـەورەو مەزن لەم چوارشوێنەدا دەیفەرموو بەڵێ باشە نزاو پاڕانەوەکەتان قەبووڵ دەکەم:

یەکەم: لەپاش وشەی: {إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا}

دووەم: لەپاش وشەی: { عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا}

سێیەم: لەپاش وشەی: { مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ}

چوارەم: لەپاش وشەی:{ فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ}

(تاج/٤ ز/٣ ژ/٣٧٥٣ — ئەوەی لەبارەی سوورەتی بەقەرەوە هاتووە).

## سوورەتی ئالی عیمران (سورة آل عمران)

### ١٦٨٦- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە: {هُوَ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ} (٦٧١٧-٦٧٢٥)

### باب: في قوله تعالى: {هُوَ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ}

٢١٢٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ تَلاَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (هُوَ الَّذِى أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِى الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُولُو الأَلْبَابِ) قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللَّهُ فَاحْذَرُوهُمْ ». (الحديث ٦٧١٧ شيحا = ٦٧٣١ فم. تجريد البخاري/٤ رقم/١٦٤٣ = ٤٥٤٧. أبوداود. سنة/٤٥٩٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٢٩٩٣. تحفة الأشراف: ١٧٤٦٠).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوەو لەپاشا فەرمووی: کاتێ ئەو کەسانەت دی، کەشوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون، کەچەن واتایێ هەڵ دەگرن، کەپێیان دەگوترێ: ئایەتە موتەشابیهەکانو ڕواڵەتی ئەو ئایەتانە دەکەن بەبەهانەو مەهانەو چاوو ڕاوی لەمەردووم پێ دەکەنو خەڵکی پێ لەخشتە دەبەن، ئەی گوێدار! ئەی کەسێ کەئەم فەرموودەیەی منت پێ دەگات! بزانە کەئەوانە ئەوکەسانەن، کەخودا ناوی بردوونو دەربارەیان لەقورئانا فەرموویەتی: {فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ ...}.

واتە: دەغەز لەدڵەکان لەدووی ئایەتە چەند واتا هەڵگرەکان دەگەڕێنو بەشوێن ئەو ئایەتانەدا دەگەڕێن کەلەیەك دەچنو مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن، بەنیازی ئەوەی کە ئاژاوەو ئاشووب بەرپابکەنو بەکەیفی خۆیان واتایان لێ بدەنەوە.

جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جا کەواتە ئەی گەلی ئیسلام! خۆتانیان لێ بپارێزنو مەترسیتان لێیان هەبێ! (تاج/٤ ز/٤ ژ/٣٧٥٤ — سوورەتی ئالی عیمران).

## ١٦٨٧- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە {لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ} (٦٩٥٥-٦٩٧٥)

**باب: في قوله تعالى: {لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ}**

٢١٢٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رِجَالاً مِنَ الْمُنَافِقِينَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانُوا إِذَا خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِلَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ وَفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَإِذَا قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) اعْتَذَرُوا إِلَيْهِ وَحَلَفُوا وَأَحَبُّوا أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَنَزَلَتْ (لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنَ الْعَذَابِ). (الحديث ٦٩٦٤=٦٩٨٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم: ١٦٤٧ = ٤٥٦٧ فتح الباري):

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆی دا (دروودی خوای لەسەربێ) چەند پیاوێ هەبوون، ناپاك (منافق)بوون، كاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەچوو بۆغەزا، ئەوان بەفێڵو فەرەج خۆیان دەدزییەوە لەماڵەوە دەمانەوەو، نەدەچوون بۆ ئەو غەزایە، بەپێچەوانەی حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەربێ) وە بۆ دژایەتی ئەو، بەم هەڵوێستە ناپاكەیان كەیفخۆش دەبوون، كاتێكیش كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەهاتەوە لەغەزاكە، دەچوونە خزمەتیو بەهانەو مەهانەی درۆیان دەهێنایەوەو، سوێندیان دەخواردو كەیفیان بەوە دەهات، كە بەبەلاش لەسەر شتێ كەنەیانكردووە سوپاسو ستایشو تاریف بكرێن!

ئیتر بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی كە دەفەرموێ: {لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ} (سورة آل عمران-٣-١٨٨).

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! وەتۆیش ئەی موسوڵمانی بەرێز! وامەزانە ئەوانە كەوا دڵشادو شادمانن بەكردەوەی ناشیرینی خۆیانو حەزدەكەن كەلەسەرشتێكی باش، كە بەدرۆ دەڵێن: ئەو شتە باشەمان كردووە، بەلام لەڕاستی دا ئەو ئیشەیان نەكردووە، حەزدەكەن كەلەسەر ئەو شتە باشە، بەهۆی ئەو

درۆیانەوە، بەبەلاش، سوپاس و تاریف بکرێن، قەت وامەزانە کەئەوانەو وێنەی ئەوانە، بەم ساختەکاریەو بەم فرتو فێڵە، لەدەست تۆڵەو سزاو قاری خودای گەورە قوتار دەبنو، لەپەنایەکا ئاسوودەو سەرفراز دەبنو ئۆقرەو ستار دەگرن، قەت شتی وا نییە، بەڵکوو بۆ ئەوانەو بۆ وێنەی ئەوانە، هەیە سزای بەسوێو ئازاری ئێش بەناو پەڕەی دڵگەیێنەر! (تاج/٤ ز/٤ ژ/٣٧٩٠).

٢١٢٨- عن حُمَيْدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَنَّ مَرْوَانَ قَالَ: اذْهَبْ يَا رَافِعُ - لِبَوَّابِهِ - إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْ: لَئِنْ كَانَ كُلُّ امْرِئٍ مِنَّا فَرِحَ بِمَا أَتَى وَأَحَبَّ أَنْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ مُعَذَّبًا لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا لَكُمْ وَلِهَذِهِ الآيَةِ؟ إِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ. ثُمَّ تَلاَ ابْنُ عَبَّاسٍ: (وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ) هَذِهِ الآيَةَ وَتَلاَ ابْنُ عَبَّاسٍ: (لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا) وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: سَأَلَهُمُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ شَيْءٍ فَكَتَمُوهُ إِيَّاهُ وَأَخْبَرُوهُ بِغَيْرِهِ فَخَرَجُوا قَدْ أَرَوْهُ أَنْ قَدْ أَخْبَرُوهُ بِمَا سَأَلَهُمْ عَنْهُ وَاسْتَحْمَدُوا بِذَلِكَ إِلَيْهِ وَفَرِحُوا بِمَا أَتَوْا مِنْ كِتْمَانِهِمْ إِيَّاهُ مَا سَأَلَهُمْ عَنْهُ. (الحديث ٦٩٦٥ شيحا = ٦٩٨٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم: ١٦٤٨ شيحا = ٤٥٦٨ فتح الباري. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٠١٤. تحفة الأشراف: ٥٤١٤).

حەمیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ کە مەروانی کوڕی حەکەم سەرداری سەرشاری مەدینە بوو، بەدەرکەوانەکەی خۆی، کەناوی رافیع بوو، گوت: ئەی رافیع! ئادەی بڕۆ بۆلای ئیبنو عەبباس، پێی بڵێ: خۆ ئەگەر هەموو کەسێ سزاو ئازار بدرێت لەسەر ئەوە کەشادمان بێ بەوەی کەدەستی دەکەوێو حەز بکات کەبەخۆڕایی سوپاس بکرێ لەسەر شتێ کەخۆی نەیکردبێ خۆئەگەر ئەمە وابێ، ئەوا کەسمان لەقیامەت دا رزگارمان نابێو، هەموومان سەرجەم سزاو ئازار دەدرێین، چونکە کێ هەیە مەگەر بەدەگمەن، کەماڵو منداڵو ئایەو مایەو پایەو وەسپی راستو درۆی پێ خۆش نەبێ؟

جاكاتێ كەرافیع ئەم پەیامەی مەڕوانی بەئیبنو عەباس ڕاگەیاند، ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) لەوەڵام دا فەرمووی: ئێوە چیتانە بەسەر ئەم باسەوە؟ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەشانی خاوەن نامەكان دا، جارێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جوولەكەكانی بانگ كردو پرسیاری شتێكی لێیانكرد، ئەوان شتەكەیان شاردەوەو حەشاری وەڵامە ڕاستەكەیان داو، بەپێچەوانەی ئەوەوە شتێكی تریان پێ گوت، ئەنجا وایان نیشانی حەزرەت دەدا، كە وەڵامی پرسیارەكەی ئەویان بەڕاستی داوەتەوەو كەوابێ دەبێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) سوپاسو ستایشیان بكات، وەشادمانو دڵشادبوون بەوەی كەڕاستیەكەیان شاردبۆوەو كەتمی حەقیقەتەكەیان كردووە، ئەوجا ئیبنو عەباس ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە، ئایەتی:

{وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ} (سورة آل عمران-٣/١٨٧)

واتە: ئەوسا خودا پەیمانو بەڵێنی لەوكەسانە وەرگرت كەخاوەن نامەی ئاسمانین، كەبەمەردومی ڕابگەیەننو حەشاری نەدەن، پەیمانی لەزاناكانیان وەرگرت كە بەباشی مەبەستو مانای ئەونامەی خودایە ڕووناك بكەنەوە بۆ هەموو كەسێ وەلەكەسی نەشارنەوە. وە ئیبنو عەباس ئەم ئایەتەیشی خوێندەوە:

{لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ} (سورة آل عمران-٣/١٨٨). (تاج/٤ ز/٤ ژ/٣٧٩١ — سوورەتی ئالی عیمران — ژمارە/٢١٢٧).

## سوورەتی نیساء (سوره النساء)

### ١٦٨٨- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە {وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى} وە فەرمایشتی {وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ} (٧٤٣٩-٧٤٧٩)

**باب: في قوله تعالى: {وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى} وقوله: {وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ}**

٢١٢٩- عن عُرْوَةَ بن الزبير: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى {وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَى

وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ}. فَقَالَتْ يَا ابْنَ أُخْتِى هِىَ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِى حَجْرِ وَلِيِّهَا تُشَارِكُهُ فِى مَالِهِ ، فَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا ، فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِى صَدَاقِهَا ، فَيُعْطِيهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ وَيَبْلُغُوا بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنَ الصَّدَاقِ ، وَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ . قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ هَذِهِ الآيَةِ بَيْنَهُنَّ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ( وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى النِّسَاءِ ) إِلَى قَوْلِهِ ( وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ ) وَالَّذِى ذَكَرَ اللَّهُ أَنَّهُ يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِى الْكِتَابِ الآيَةُ الأُولَى الَّتِى قَالَ اللهُ فِيهَا ( وَإِنْ خِفْتُمْ أَنْ لاَ تُقْسِطُوا فِى الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ ) قَالَتْ عَائِشَةُ وَقَوْلُ اللَّهِ فِى الآيَةِ الأُخْرَى ( وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ ) يَعْنِى هِىَ رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ لِيَتِيمَتِهِ الَّتِى تَكُونُ فِى حَجْرِهِ ، حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ وَالْجَمَالِ ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا رَغِبُوا فِى مَالِهَا وَجَمَالِهَا مِنْ يَتَامَى النِّسَاءِ إِلاَّ بِالْقِسْطِ مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ . (الحديث ٧٤٤٤ شييحا = ٧٤٨٠ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم: ١٦٤٩ = ٤٥٧٤، ٢٤٩٤، ٢٧٦٣، ٤٥٧٣، ٤٥٧٤، ٤٦٠٠، ٥٠٦٤، ٥٠٩٢، ٥٠٩٨، ٥١٢٨، ٥١٣١، ٥١٤٠، ٦٩٦٥).

عوروەی کوڕی زوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم لەعائیشەی پوورم کرد: لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە، کە دەفەرموێ: {وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ} (سورة النساء-٤/٣).

واتە: ئەگەر ترستان لەوە هەبوو کە عەداڵەتو دادپەروەری نەکەن لەگەڵ ئەوکچە هەتیوانەدا، کەوان لەژێر چاودێری ئێوەدا، ئەگەر بێتو مارەیان بکەن بۆخۆتان، ئەگەر ئەم مەترسییەتان هەبوو، ئەوا بچن ژنی تر مارەبکەن بۆخۆتان کەبەدڵتان بێو هەتا توشی ناهەقیو نادادی نەبن بەهۆیانەوە، وە واز لەوکچە هەتیوانە بهێنن باتوشی ناهەقیو نادادی نەبن.

وە دەتوانن ژنێ، یان دوو ژن، یان سێ ژن، یان چوار ژن، بەپێی یاسانامەی خودا بۆخۆتان بهێنن، بەمەرجێ (کە بەمەرجی سەرەکی دادەنرێت) کە بتوانن عەداڵەتو دادپەروەریی بەجێ بهێنن لەنێوانیان دا.

عوروه فەرمووی: پورم عائیشه فەرمووی: ئەی خوشکەزای خۆم! ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەشانی کچانی بێ باوك دا کەلەلای هەقداریان بن، واتە: لەلای ئامۆزاو کوڕانی ئامۆزایان بن، وە ئەو هەقدارە بچێ لەبەرسامانو ماڵی کچەکە، یالەبەر جوانییەکەی مارەی بکات لەخۆی، بەلآم ئەوەندەی کەباوبێ لەناو کۆمەڵا، ئەوەندە مارەیی پێ نادا، جا خودا نەهی لێ کردن لەکردنی شتی وا ناهەق، مەگەر بەمەرجێ کەناهەقییان لێنەکەنو وەك ژنانی تر مارەییو مافیان بۆ دابنێن، ئەوە دەبێ، دەنا خودا فەرموویەتی پێیان کە بڕۆن لەژنانی تر بەدڵی خۆتان بهێننو وازبهێنن لەوان.

عوروه فەرمووی: عائیشه فەرمووی: خەڵکەکە لەپاش هاتنی ئەم ئایەتە، داوای فەتوایان لەپێغەمبەر کرد، کەبۆیان روون بکاتەوە، خودا لەوەڵام دا ئەم ئایەتەی تری نارد، {وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاء قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاء اللَّاتِي لاَ تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ} (سورة النساء-٤/١٢٧).

واتە: داوای فەتواو روونکردنەوەی بڕیارەکانت لێ دەکەن، سەبارەت بەژنان، تۆ ئەی پێغەمبەر! لەوەڵامیانا بڵێ: خودا فەتواتان بۆ دەداو، هەروەها ئەو ئایەتانەی کە دەخوێنرێنەوە لەقورئانا فەتواتان بۆدەدەن، کەبەیانی حاڵی ژنە بێ باوکەکان دەکەن، کە ئەو مافەی بڕیار دراوە بۆیانو لەیاسانامەی خوادا نووسراوە بۆیان، پێیان نادەن، وەلەهەمان کاتا بەپێی بەرژەوەندی خۆتان حەزدەکەن کەمارەیان بکەن لە خۆتان، یاحەزدەکەن کەمارەیان نەکەن لەخۆتانو نەیشهێڵن کە بۆخۆیان شووبکەن!

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەبەست لەم ڕستەیە کەلەم ئایەتەی پێشەوەدا دەفەرموێ: {يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ} تایەتی یەکەمی ئەم پرسیارو وەڵامەی منو تۆ بوو کە خودا تیایدا دەفەرموێ: {وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء}.

هەروا عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەر ڕوونکردنەوەکەی خۆی ڕۆیشتو فەرمووی: ئەوەیش کەخودای گەورە لەئایەتەکەی تردا دەفەرموێ: {وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ} کەبەشێکە لەئایەتی وەڵامی داوای فەتواو پرسیارەکەیان مەبەست لەم ڕستەیە ئەمەیە:

ئەگەر کەسێ لەئێوە، کچێکی هەتیوی خۆی، لەچاودێری ئەودابوو، چونکە ئامۆزای بوو، وەماڵی کەم بوو، وە جوانیش نەبوو، ئەوا حەزناکا کە مارەی بکا بۆخۆی، بەڵام ئەگەر کچە هەتیوەکەیان، کەوا لەژێر چاودێرییان دا ماڵو سامانو جوانی هەبوو، ئەوا لەبەر بەرژەوەندی خۆیان مارەیان دەکەن بۆخۆیانو مافی تەواوی خۆیانیان پێ نادەن، جا خودا ڕێگەی شتی وایان پێ نادا، مەگەر پابەندبن بەیاسای دادپەروەرییەوە). (تاج/٤ ز/٥ ژ/٣٧٩٤ — سوورەتی نیساء).

**١٦٨٩- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە {وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ}** (٧٤٣٩ – ٧٤٧٩)

**باب: في قوله تعالى: {وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ}**

٢١٣٠- عَن عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ ( وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ ) قَالَتْ: أُنْزِلَتْ فِي وَالِي الْيَتِيمِ الَّذِي يُقُومُ عَلَيْهِ ، وَيُصْلِحُهُ إِذَا كَانَ محتاجاً أَنْ يأكُلَ مِنْهُ. (الحديث ٧٤٤٩ شيحا = ٧٤٨٥ فم. بخاري. وصايا: ٢٧٦٥. تحفة الأشراف: ١٧٠٨٦)

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە: {وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ} (النساء-٤/٦)

واتە: هەرکەسێ لەئێوە دەوڵەمەندبێ، باخۆی دووربگرێ لەماڵی ئەو هەتیوانە، بەڵام ئەگەر کەسێ ئاتاجو نەدارابوو، بالەو ماڵە بخوات بەپێی باوی جوانی ناو کۆمەڵگا).

عائیشە فەرمووی: ئەم ئایەتە سەبارەت بەسەرپەرشتیاری سەرماڵو سامانی هەتیو دابەزیوە، کە سەرپەرشتی سامانەکەی دەکاو بەخێوی دەکاو بەرهەمی

دەهێنێ، ئەگەر ئەم سەرپەرشتیارە ئاتاج بوو ئەوە دروستە کە بەقەی خزمەتی ماڵەکە، بەپێی شەرع لێی بخوات دەنا نا). (تاج/٢ ز/١٤ ژ/٢٠٠٣ + تاج/٤ ز/٥ ژ/٣٧٩٥).

## ١٦٩٠- لەبارەی فەرمایشتی خوداوە: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ}

## (٦٩٥٥-٦٩٧٥) باب: في قوله تعالى: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ}

٢١٣١- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خرج إِلَى أُحُدٍ ، فَرَجَعَ نَاسٌ مِمَّنْ خَرَجَ مَعَهُ ، فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيهِمْ فِرْقَتَيْنِ ، قال بعضهم: نقتلهم، وقال بعضهم: لا، فَنَزَلَتْ ( فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ). (الحديث ٦٩٦٢ شيحا = ٦٩٨٦ فم. بخاري. فضائل المدينة. ١٨٨٤، ٤٠٥٠، ٤٥٨٩، فتح الباري).

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەرو یارانی لەمەدینەوە دەرکەوتن‌و بەرەو چیای ئوحود کەوتنە ڕێ، بۆ غەزا، لەڕێگە کۆمەڵێ لەوانەی کەلەسوپاکەی پێغەمبەردا بوون، بەسەرۆکایەتی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، گەڕانەوەو نەیانویست کەلەو غەزایەدا بەشداریی بکەن، کە گەڕانەوە هاوەڵەکانی حەزرەت بوون بەدوو تاقمەوە، تاقمێکیان گوتیان: کە گەڕاینەوە لەم غەزایە دەیانکوژین، تاقمەکەی تریشیان گوتیان: نایانکوژین. جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ} (النساء-٤/٨٨).

واتە: لەبەرچی لەبارەی ئەم ناپاك‌و مونافقانەوە بوون بە دوو دەستەوە: دەستەیەکتان دەڵێن: ئەوانە ناپاك‌و ناموسوڵمانن، لەبەرئەوە دەیانکوژین، دەستەیەکتان دەڵێن: ئەوانە موسوڵمانن، نایانکوژین، بۆچی هەمووتان بەیەك دەنگ ناڵێن: ئەمانە نا موسوڵمانن، چونکە ناپاك‌و مونافیقن.

**١٦٩١- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە: {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا}**
(٧٤٣٩-٧٤٧٩) **باب: في قوله تعالى: {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا}**

٢١٣٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَقِيَ نَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلاً فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. فَأَخَذُوهُ فَقَتَلُوهُ، وَأَخَذُوا تِلْكَ الْغُنَيْمَةَ، فَنَزَلَتْ: (وَلاَ تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا) وَقَرَأَهَا ابْنُ عَبَّاسٍ (السَّلاَمَ). (الحديث ٧٤٦١ شيحا = ٧٤٩٦ فم. ف.م = فتح الملهم شرح صحيح مسلم. بخاري. تفسير: ٤٧٦٢. نسائي. تحريم الدم: ٤٠١٢. تحفة الأشراف: ٥٥٩٩).

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەشانی ئەم ئایەتەدا، خەڵکی کووفە قسەیان جیا جیا بوو، منیش سواربووم چووم بۆلای ئیبنو عەبباس، کەلەم بارەیەوە لێیم پرسی، فەرمووی: ئەم ئایەتە {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا} دواشتە کەلەم بارەیەوە هاتە خوارەوە، وە هیچیش هەڵی نەوەشاندۆتەوەو حوکمو بڕیارەکەی وەك خۆی ماوە).

گفتەی ئەبوداوود، کەلەباسی فیتنەدا ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە ئاوایە:

کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی کەلەسوورەتی فورقان دایە، کەدەفەرموێ: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا} (سورة الفرقان- ٢٥/٦٨).

بەندەباشەکانی خودای میهرەبان ڕەوشتێکی بەرزی تریشیان هەیە کە ئەوەیە: بەس خودای گەورەو مەزن دەپەرستن‌و داوای هەمووشتێ هەر لەخودا دەکەن، وەکەسێ کە خودا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردبێ ناکوژن، مەگەر لەبەرهۆیەکی ڕەوای هەق بەپێی شەرع، وەلەهەمان کاتا داوێنپیسی ناکەن‌و، داوێنپاك‌و رووپاك‌و رووسورن، کاتێ کەئەم ئایەتە هات، هاوبەش پەیداکەرەکانی مەککە گوتیان: ئێمە ئەم تاوانانەمان هەموو کردووە، کەواتە ئیسلام بوونمان چی سوودی هەیە بۆئێمە، جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا} (سورة الفرقان-٢٥/٧٠).

کەواتای وایە: هەرکەسێ یەکێ لەم تاوانانە بکا، دەگا بەتۆڵەی سەختی تاوانی خۆی، مەگەر ئەوکەسە نەبێ کە لەپاشکردنی ئەم گوناهانە تەوبە بکاو وازیان لێ بهێنێو موسوڵمان ببێو چڵکی کوفر بەنووری ئیسلام بشۆرێو دەست بکا بەکردنی کردەوەی باشو کردارو ڕەفتاری خۆی باش بکا، ئەوە ئەمانە خودای مەزن گوناهەکانیان دەپۆشێو خراپەکانیان بۆدەکا بەچاکەو خودای میهرەبانو گەورە هەمیشە میهرەبانو تاوان بەخش بووەو هەروایش دەبێو دەرگای ڕەحمەتی لەئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەروازە!.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەی ئەم ئایەتەیە بۆ شەرحی حاڵی ئەمانە بوو، هەتا ڕێگەی ئیسلامبوونیان بۆخۆش بکا، بەلام ئەو ئایەتەی کەلە سوورەتی نیساء دایە، کەدەفەرموێ:

{وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا} (سورة النساء-٤/٩٣).

واتە: هەرکەسێ موسوڵمانێ بەناڕەوا، بەقەستی بکوژێ، ئەوە پاداشی ئەو بکوژە سزای دۆزەخە، هەتا هەتایە لەوسزا سەختەدا دەمێنێتەوە، سەرەڕای ئەوەیشە خودا رقو قاری لێ دەگرێو پەیتا پەیتا نەفرەتو نەفرینی لێ دەکاو هەتا بێت دوورتری دەخاتەوە لەمیهرو سۆزی خۆی، وەبەدەستی خۆی سزایەکی پڕئێشو ئازاری بۆ ئامادەکردووە.

بەلام ئەم ئایەتە جیایە لەوەی پێشوو، ئەمە بۆ کەسێکی وایە کەلەپاش ئەوە شارەزای یاسانامەی ئیسلام ببێ، بچێ بەئارەزوو، بەقەستی، بەناڕەوا، موسوڵمانێ بکوژێ، دەی ئەم بکوژە بەلای منەوە، سزای ئاگری دۆزەخە، تەوبەو پەشیمانی بۆ نییە، راوی (قسە گێڕەوە) دەڵێ: بەلام کەئەم قسەیەم باس کرد بۆ موجاهیدو پێم گوت کە ئیبنو عەبباس ڕای وایەو دەڵێ بکوژ تەوبەی بۆنییە، موجاهید فەرمووی:

(هەركەسێ لەهەرتاوانێ تەوبە بکا تەوبەی گیرایە!). (تاج/٤ ز/٥ ژ/٣٨١ – سوورەتی نیساء).

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی موجاهید موفەسیرێکی گەورەی ناسراوە، یەکێکە لەشاگردە ناودارەکانی ئیبنو عەبباس، ناوی تەواوی (موجاهیدی کوڕی جەبری المكيّ المقرئ) لەساڵی بیستو یەکی کۆچی دا، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا لەدایك بووە، گێڕانەوەی لەهاوەڵانی زۆرەوە هەیە، وەك عائیشەو ئوم سەلەمەو جووەیرییەو ئەبو هورەیرەو جابری کوڕی عەبدوڵلاو هەرچوار عەبدوڵلاکانو هاوەڵانی تریش، هەروا کۆمەڵێ لەتابیعینیش گێڕانەوە لەموجاهیدەوە ئەنجام دەدەن، وەك عەطاءو عیکریمەو قەتادەو ئەعمەشو خەڵکێکی زۆری تریش، لەپیاوان (رِجال)ی شەش پەڕاوەکەیە، کە ناسراون بە بوخاریو موسلیمو ئەبوداودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجە.

زاناترین کەس بوو بەتەفسیری قورئانی پیرۆز لەسەردەمی خۆی دا، فەضلی کوڕی مەیمون دەفەرموێ: لە موجاهیدم بیست دەیفەرموو: (٣٠) سیی جار دەوری قورئانم کردۆتەوە بۆ ئیبنو عەبباس، هەتا بەجوانی ڕەوانی بکەمو واتاکەی بەباشی بزانم. سەلەمەی کوڕی کەهیل دەفەرموێ: کەسم نەدیوە وەك ئەم سێ کەسە، کەزانستو عیلمەکەیان ساخ لەبەر ڕەزای خودابێ. عەطاءو طاوسو موجاهید.

کەئەم سێ کەسە لەشاگردو فەقێ باشەکانی ئیبنو عەبباس بوون، ئەعمەش دەیفەرموو: موجاهید دەیفەرموو، ئەگەر فێری قیرائەتی ئیبنو مەسعوود ببومایە، پێویستم بەوە نەبوو، کە پرسیار لەئیبنو عەبباس بکەم، لەبارەی زۆر لەمەعنای ئایەتەکانی قورئان!.

موجاهید خۆی دەفەرموێ: سێ جار سەراسەر قورئانم دەورکردەوە بۆ ئیبنو عەبباس، ئەویش گوێی لێ دەگرتم، لەسەر هەموو ئایەتێ دەوەستام پرسیاری

ئەوەم لێ دەکرد، کەبەچی بۆنەیەکەوە هاتووەو دابەزیوە، وە ئایەتەکە چۆنەو چییە. ئیبراهیمی کوڕی موهاجیر دەفەرموێ: موجاهید دەیفەرموو: گەلێ جار کاتێ ئیبنو عومەر سواری ولاخەکەی دەبوو، من ئاوزەنگیەکەیم دەگرت بۆی!

قەتادە دەیفەرموو: باشترین کەس لەپێشینانە تەفسیر زانەکان کەمابێ موجاهیدە.

موجاهید زانایەکی گەورەی شەرعزان بوو، زۆر بەتەقوا بوو، زۆر خوا پەرست بوو. نەتەوەی ئیسلام بەکۆی دەنگ موجاهید بەپێشەوای خۆیان دادەنێن‌و فەرمایشت‌و ڕاوبۆچوونەکانی جێگەی متمانەیانەو بەلگەسازییان پێ دەکەن.

ڕاجیایی لەسالی کۆچی دوایی دا هەیە. ئیبنو حیببان دەفەرموێ: سالی سەدو دوو، یا سەدو سێی کۆچی، لەمەککە، لەتەمەنی هەشتاو سێ سالی دا کۆچی دوایی دەکاو بەبەهەشتی بەرین شاد دەبێ خوای لێ خۆش بێ.

**١٦٩٢- لەبارەی فەرمایشتی خوای گەورە: {وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ}**

(٧٤٣٩ - ٧٤٧٩) **باب: في قوله تعالى: {وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ}**

٢١٣٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ لَقِيَ نَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلاً فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ فَقَالَ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. فَأَخَذُوهُ فَقَتَلُوهُ وَأَخَذُوا تِلْكَ الْغُنَيْمَةَ فَنَزَلَتْ (وَلاَ تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا) وَقَرَأَهَا ابْنُ عَبَّاسٍ السَّلاَمَ. (الحديث ٧٤٦٤ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧٥٠٠ فم = ف.م. = فتح الملهم لشرح صحيح الإمام مسلم. بخاري. تفسير: ٤٥٩١. أبوداود. الحروف والقراءات: ٢٩٧٤).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی بەنی سەلەمەیی، ڕانەمەڕێکی خۆیی پێ دەبێ، لەلای دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەرەوە ڕادەبووری (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەیارانی بێ) پیاوەکە سلاویان لێ دەکا، کەچی یارەکانی پێغەمبەر لەناو خۆیانا دەلێن: ئەم سلاوەی بۆیەکا لێ کردین، تا خۆی پێ ڕزگار بکا لەئێمە. جا هەل دەستن بۆی‌و دەیکوژن‌و ڕانەکەی دەبەن‌و دەیهێنن بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ).

جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا} (سورة النساء-٤/٩٤).

واتە: ئەی موسوڵمانینە! کاتێ سەفەردەکەن‌و دەچن بۆ خەباتگێڕان ئاگاتان لەخۆتان بێ‌و، بچنە بنج‌و بنەوانی کاروبارو، ئەوسا بڕیار بدەن، نەکا بەهەڵەو ناهەق تووشی بێ دادی‌و ناڕەوایی ببن، وەمەڵێن بەوکەسە بەسڵاوی ئیسلام سڵاوتان لێ دەکا. تۆ موسوڵمان نیت، مەگەر بەلگەیەکی ڕۆشن بەدەستتانەوە بێ کە موسوڵمان نییە. وشەی (السلام) لەم جێگەیەدا، بەسێ شێوە دەخوێنرێتەوە بە(سەلەم)و بە (سەلام)و بە (سیلم). یەکەم: (سەلەم) قیرائەتی نافیع‌و ئیبنو عامیرو حەمزەیە، دووەم: (سەلام) قیرائەتی خاوەن قیرائەتەکانی ترە، سێیەم: (سیلم) قیرائەتی عاصمی کوڕی ئەبو نەجوودە ریوایەتکراوە، ئیبنو عەبباس بەقیرائەتی (السّلام) دەیخوێندەوە کە قیرائەتی دووەمە.

## ١٦٩٣- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە: {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا} (٧٤٣٩ - ٧٤٧٩)

## باب: في قوله تعالى: {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا}

٢١٣٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) في قولـه عـز وجـل: ( وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا ) قَالَتِ: نزلت في المرأة تكون عند الرَّجُلُ فلعله أن لا يستكثر منها وَتَكُونُ له صحبة وولد فتكره أن يفارقها فتقول له: أنت في حل من شأني. (الحديث ٧٤٥٣ شيحا = ٧٤٨٩ فم. بخاري. مظالم. ٢٤٥٠، ٢٦٩٤، ٤٦٠١، ٥٢٠٦. أبوداود. نكاح: ٢١٣٥، نسائي. السنن الكبرى: ٦/٣٢٩. تحفة الأشراف: ١٧٠٥٨، ١٧٠٥٩).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەبارەی ئەم ئایەتەوە {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا} (النساء-٤/١٢٨) واتە: یەزدانی مەزن لەقورئانی پیرۆزدا، لەسوورەتی نیساء دا، لە ئایەتی سەدو بیست‌و هەشت دا دەفەرموێ: ئەگەر ژنێ دەترسا لەوە کەمێردەکەی لێی بێزاربێ‌و بەرە بەرە بەتەواوی دوور بکەوێتەوە لێی، وەیا خود حەزی لەو نەماوەو حەزی لەژنێکی تر کردووە، وەیا خود لەبەر هەر هۆیەکی تر

دوورنییه، که مێردەکەی دەستی لەدەستی ببێتەوە، ئەوە لەم کاتانەدا گوناهیان ناگا ئەگەر لەناو خۆیانا بسازێن‌و رێبکەون‌و صوڵح بکەن، چونکه صوڵح‌و رێکەوتن هەمیشه هەر خێر بووەو هەر خێریش دەبێ.

جا عائیشه لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە وەك ئەوە پیاوێ ژنێکی هەبێ، خۆی تێ نەگەیەنێ‌و بیەوێ تەلاقی بداو، ژنێکی تر بهێنێ، ژنەکەیش تەمەنێ لەگەڵ مێردەکەی دا ژیاوەو منالی لێی هەیە، لەبەرئەوە حەز ناکا لێی جیابێتەوەو پێی دەڵێ: بمهێڵەو بەرەڵام مەکەو بۆخۆت ژنێکی تر بهێنەو بۆ ئازووقەو خەرجی‌و نۆرەکاری شەویش گەردنت ئازادبێ، مەبەست ئەمەیە کەخودای گەورە لە قورئانا دەفەرموێ: {فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا} (سورة النساء-٤/١٢٨). (تاج/٢ ز/٥٢ ژ/٢١٨٠ — دروستە ژن دەست لە مافی خۆی هەڵبگرێ).

## سوورەتی مائیده = سوره المائدة

### ١٦٩٤- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُم}
### (٧٤٣٩-٧٤٧٩) باب: في قوله تعالى: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُم}

٢١٣٥- عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ إِلَى عُمَرَ فَقَالَ لَهُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ ، آيَةٌ فِى كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا لَوْ عَلَيْنَا نَزَلَتْ مَعْشَرَ الْيَهُودِ لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيدًا . قَالَ: وأَىُّ آيَةٍ؟ قَالَ: ( الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا ) . فَقَالَ عُمَر: إني لأَعْلَمُ اليومَ الّذي نَزَلَتْ فيه وَالْمَكَانَ الَّذِى نَزَلَتْ فِيهِ نَزَلَتْ عَلَى رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِعَرَفَاتَ فِي يَوْمَ جُمُعَةٍ. (الحديث ٧٤٤٣ شيحا = ٧٤٧٩ فم. تجريد البخاري/١ رقم/٤٢ = ٤٥، ٤٤٠٧، ٤٦٠٦، ٧٢٦٨. ترمذي. تفسير القرآن. ٣٠٤٣. نسائي. مناسك: ٣٠٠٢. تحفة/١٠٤٦٨).

طاریقی کوڕی شەهاب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی جوولەکە هات بۆلای پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئایەتێ

لەقورئانەکەتاندا هەیە، دەوری دەکەنەوە، ئەگەر ئەو ئایەتە بۆ ئێمە بهاتبایە کە کۆمەڵی جوولەکەین، رۆژی هاتنی ئەو ئایەتەمان هەموو ساڵێ دەکرد بەجەژن ئیمامی عومەر فەرمووی: کام ئایەتەیە؟ گوتی: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلَامَ دِينًا} (سورة المائدة-٥/٣).

واتە: ئەمڕۆ من دەستووری ئایینی ئێوەم تەواو کرد بۆتانو نازو بەهرەو نیعمەتی خۆمم رژاند بەسەرتانا، وەئایینی پیرۆزی ئیسلامم هەڵبژارد بۆتانو کردم بەئاینتان.

عومەریش فەرمووی: دەی ئێمەیش زۆر بەباشی دەزانین کەئەو رۆژەو ئەو شوێنەو ئەو حاڵو بارو دۆخەی کەئەم ئایەتەی تیا هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەی بوو، وە چۆن بوو، رۆژ رۆژی هەینی بوو، کات کاتی جەژنی قوربان بوو، شوێن سەرکێوی عەرەفەبوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەوێ ڕاوەستا بوو، سەرگەرمی ئەنجامدانی حەجی ماڵاوایی بوو!. (تاج/١ ز/٤ ژ/٣٠ – باسی گەورەیی ئایین).

**روونکردنەوە:**

یەکەم: واتە: ئێمەیش کە گەلی ئیسلامین، لەچەندین لاوە ئەو رۆژەمان کردووە بەجەژن، کەئەم ئایەتەی تیا هاتۆتە خوارەوە:

١- هەموو رۆژی هەینییەك جەژنی موسوڵمانانە.

٢- گەورەترین جەژنی موسوڵمانان جەژنی قوربانەو رۆژی عەرەفەیە.

٣- گەورەترین ئاهەنگو کۆبوونەوەو بەرزکردنەوەی دروشمی خودا لەچیای عەرەفە ئەنجام دەدرێ لەکاتی حەجا.

دووەم: ئەم فەرموودەیە باشترین بەڵگەیە لەسەرئەوە: کە زانایانی ئیسلامو فەرمانڕەوا دادپەروەرەکانی موسوڵمانان بەپێی ئەم فەرموودەیە دەتوانن: کە هەر رۆژێ، یا هەر شوێنێ، رووداوێکی گرنگی وای تیادا رووبدات، کە ببێ بەهۆی

بەهرەی گەورەو یادگاری جوانو سەرمەشقی باش، بۆ گەلی ئیسلامو ببێ بەمایەی شانازییو سەربەرزیی موسوڵمانان، دروستە کە ئەو ڕۆژە بکرێ بەجەژنو هەموو ساڵێ یادی بکرێتەوە.

لەڕاستی دا ئەو قسەیەی کە دەڵێ: هەرشتێ پێغەمبەر نەیکردبێ، یاڕای لەسەری نەبوو بێ، بیدعەتەو نادروستو ناڕەوایە.

لەڕاستی دا ئەم قسەیە کۆسپێکی گەورەیە، لەبەردەم گەشەکردنو پێشخستنی ڕەوڕەوەی بەرەو پێشچوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، چونکە بەم قسەیە بێ دەبێ:

١- دەرگای ئیجتیهاد داخرێ، دیارو ئاشکرایە کە زیاتر لەنیوەی بڕیارەکانی شەرع، بە ئیجتیهادی زاناکان چەسپاونو بوون بەبەشێ لەیاسانامەی خودا، تەنانەت لەبەشی پەرستشو خودا پەرستی دا.

٢- لەم ڕۆژگارەدا دەبینین، زۆرینەی دروشمو نموونەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام گەشەیان پێ کراوە، گۆڕانکارییان تیا کراوە، ناچاری خۆی سەپاندووەو بەهۆیەوە زاناکان کارەگرانەکانیان ئاسانکردووە، بابەتە بەرتەسکەکانیان پانو پۆڕو بەرین کردووە. تەماشای حەج بکە:

١- ئایا ئێستا تەوافی بەیتو سەعیی بەینی سەفاو مەڕوەو ڕەجمی شەیتانو وەستان لەکێوی عەرەفە وەك سەردەمی پێغەمبەر خۆی ماوە، یا گەشەیەکی گەورەی پێ کراوە، ئایا مزگەوتی مەسجیدولحەرامو مزگەوتەکەی پێغەمبەر وەك سەردەمی پێغەمبەرماون یان گەورە کراونو لەهەر چوارلاوە، لەخاکێ کەلەسەردەمی پێغەمبەردا، یا بازاڕبوون، یامال بوون، خراوەتە سەریانو ئێستا بوون بەبەشێ لەیەکێ لەدوو مزگەوتەکە.

٢- ئایا نوێژی تەراویح وەك سەردەمی پێغەمبەر دەکرێ، هەموو ڕەمەزانێ دوو سێ شەوی بەجەماعەت لەمزگەوت دەکرێو بەس؟

## سوورەتی ئەنعام = سورة الأنعام

### ١٦٩٥- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە: {الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ} (٧٤٣٩ – ٧٤٧٩)

### باب: في قوله تعالى: {الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ}

٢١٣٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا نَزَلَتِ ( الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ ) شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّنَا لاَ يَظْلِمُ نَفْسَهُ فَقَالَ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لَيْسَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لاِبْنِهِ ( يَا بُنَيَّ لاَ تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ) . (الحديث ٣٢٣ شيحا = ٣٣٩ فم. تجريد البخاري بالكوردي/١ رقم: ٣٠ = ٣٢، ٣٣٦٠، ٣٤٢٨، ٣٤٢٩، ٤٦٢٩، ٤٧٧٦، ٦٩١٨، ٦٩٣٧):

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ} (الأنعام-٦/٨٢)

کەئەمە ڕاڤەو واتاکەیەتی: موسوڵمانی ڕاستو دروست بەپێی دەستوورەکانی ئایین، ئەو بڕوادارانەن کە باوەڕێکی ساخی ڕەسای بێ گەردو باشیان هەیە بەخودای خۆیانو بەهەموو پێغەمبەرانی پێش چەرخی خۆیانو بەپێغەمبەری سەردەمی خۆیان، باوەڕێکی پەتی وا کەتێکەڵی ستەمو زۆرو ستەم نەبێ، ئەوانە ئاسایشو ئارامیو هێمنیو دڵنیایی دادەبارێ بەسەریانا، خۆشیان شارەزای ڕێگەی راستنو خواست مرازو نیازیان هاتۆتە دی.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەفەرموێ: کاتێ کەئەم ئایەتە، کەئەمە واتاکەی بوو، هات بۆ پێغەمبەر، بوو بەهۆی سەخڵەتیو نیگەرانی بوون بۆ یارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ)و مەترسی ئەوەیان لێ نیشت کەبەر بەهرەی ئاسایشو ئارامیو دڵنیاییو شارەزا بوون لەڕێگەی ڕاست نەکەون، بۆیە گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ کێ بێ لەئێمە کە زۆرو ستەمو ناهەقی لەخودی خۆی نەکردبێ؟ کەواتە: ئەم موژدەیە بەئێمە چی؟ بەڵکوو بەپێچەوانەوە ئەمە

هەڕەشەیە لەئێمە، چونکە هەموو کەسێ لەئێمە، کەم و زۆر، بەشی خۆمان ستەممانکردووە؟

ئەویش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: مەبەست ئەوەنییە کە ئێوە تێی گەیشتوون، بەڵکوو مەبەست لەو زوڵم و زۆرو ستەمەیە کەلەم ئایەتەدا باسکراوە، شیرك و هاوبەش دانانە بۆ خوداو، لەو چەشنە زوڵم و ستەمەیە کە لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی خۆیی دەکرد کە توخنی نەکەوێ، کە قورئان دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (سورة لقمان-٣١/١٣).

واتە: ڕۆڵەی خۆشەویستم! ئەی کوڕی شیرینم! هەرگیز نەکەی هەڵەی وا گەورە بکەی، کە هاوبەش و هاوەڵ و هاوڕێ بۆخودا بڕیار بدەی، چونکی زوڵم و زۆرو ستەم و ناهەقی پیشەی ملهووڕو خودا نەناسەکانە، هاوبەش دانانیش بۆ خودا گەورەترین زوڵم و زۆرو ستەمە.

## ١٦٩٦- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: ﴿لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ﴾ (٧٤٣٩-٧٤٧٩)

## باب: في قوله تعالى: ﴿لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ﴾

٢١٣٧- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « ثَلاَثٌ إِذَا خَرَجْنَ لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِى إِيمَانِهَا خَيْرًا): طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَالدَّجَّالُ وَدَابَّةُ الأَرْضِ ». (الحديث ٣٩٦ شيحا = ٤١٠فم).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم سێ شتانە کاتێ کەڕوویان دا ئیتر ئەو ڕۆژگارەیە کەخودای گەورەو سەروەر لەم ئایەتەدا ڕوونی کردۆتەوە کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ (سورة الأنعام-٦/١٥٨).

واتــه: لــەو رۆژەدا کەئــەو بــازە نیشــانەی هەڵســانی رۆژی قیامــەت دێــت، باوەڕهێنــانو موســوڵمانبوونی ئەوکەســانە ســوودی نییــە کــە لــەوەپێش ئیمــانو باوەڕیان نەهێنابێ، بەڵام لەوەپێش ئەگەر کەسێ تـەنیا بـاوەڕی رووتـی هێنابـێ، بـا هـیچ کردەوەیـەکی چاکەیشی نـەبێ، ئـەوە ئـەو باوەڕهێنانـەی لـەو رۆژەدا سوودی دەبێ بۆی، وەلێ ئیمانو کـردەوەی چاکە کەلـەپاش هـاتنی ئـەو رۆژە رووبـدەن داد ناخۆنو سوودیان نییە بۆ کەسێ کە لەپێش دا، ناموسـوڵمان بووبـێ. ئەمـە ئەوسـێ شتەیە، کـە پێغەمبـەر فەرموویـەتی هـەرکاتێ روویـان دا ئـیتر باوەڕهێنـان سـوودی نییە:

١- هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاواوە.

٢- سەرهەڵدانی جەجاڵ. (بڕ: ژمارە/٢٠٤١ هەتا ٢٠٥٧).

٣- دەرچوونی دابەتولئەرض (بڕ: ٢٠٣٧). (تاج/٤ ز:٧ ژ:٣٨٦٥).

٢١٣٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ يَوْمًا « أَتَدْرُونَ أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ الشَّمْسُ؟». قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: « إِنَّ هَذِهِ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً وَلاَ تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا: ارْتَفِعِي ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا ثُمَّ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً وَلاَ تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا ارْتَفِعِي ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا ثُمَّ تَجْرِي لاَ يَسْتَنْكِرُ النَّاسُ مِنْهَا شَيْئًا حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا ذَاكَ تَحْتَ الْعَرْشِ فَيُقَالُ لَهَا: ارْتَفِعِي أَصْبِحِي طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِكِ تَحْتَ الْعَرْشِ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِهَا ». فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « أَتَدْرُونَ مَتَى ذَاكُمْ؟» ذَاكَ حِينَ «لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا ». (الحديث ٣٩٧ شيحا = ٤١١ فم. تجريد البخاري/٣ رقم: ١٢٩١ = ٣١٩٩، ٤٨٠٢، ٤٨٠٣، ٧٤٢٤، ٧٤٣٣. أبوداود. الحروف والقراءات: ٤٠٠٢. ترمذي. فتن: ٢١٨٦. تحفة الأشراف: ١١٩٩٤).

ئەبو ذەڕ (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی ئاوابوونی خۆردا، ڕۆژێ لەمزگەوت لەخزمەتی خۆشەویست دا بووین، فەرمووی پێمان: ئایا دەزانن کەئەم خۆرە بۆکوێ دەچێو لەکوێ ئاوا دەبێ؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان دەزانن. فەرمووی: ئەم خۆرە هەروا دەڕواتو هەموو ڕۆژێ ئەمە ئیشیەتی دەچێت لەژێر عەرشا کوڕنووشو نووچ دەباو، داوا لەخودا دەکاتەوە: کە دیسانەوە ڕێگای پێ بداتەوە تا لەشوێنی ئاسایی ڕۆژانەی خۆیەوە هەڵبێتەوە، هەر لەکوڕنووش دا دەبێ هەتا خودا ڕێگەی پێ دەداو پێی دەفەرموێ: بەرزەوە بە لەکوڕنووشو لەجێگەی ئاسایی خۆتەوە هەڵبێرەوە، ئیتر وەك جاری جاران لەشوێنی خۆیەوە هەڵدێتەوە، جا بەردەوام ڕۆژانە ئەمە ئیشیەتی، وە خەڵك شتێکی نائاسایی لێ نابینن، هەتا ڕۆژێ خۆر دەچێ وەك جاری جارانی لەژێر بارەگا (عەرش)دا، لەئارامگاکەی خۆی دا، کوڕنووش دەباو، داوای مۆڵەت دەکا کەوەك جاران لەشوێنی خۆیەوە هەڵبێتەوە، خودا ڕێگەی پێ نادات‌و دەفەرموێ پێی: بەرزەوەبە لەژێر بارەگاوە بەسەر شوێپی خۆتا ڕێك بگەڕێرەوە دواوە، لەو شوێنەوە هەڵبێ کە لێی ئاوا بووی، ئیتر خۆر لەخۆرئاواوە هەڵدێ خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا دەزانن کەئەمە کەی دەبێ؟ هەرخۆی وەڵامی خۆی دایەوەو فەرمووی: ئەمە ئەو کاتەیە، کە خودا لەقورئانا، لەبارەیەوە دەفەرموێ: { لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا } (سورة الأنعام-٦/١٥٨). ← (ژ: ٢١٣٧). (تاج/٤ ز/٧ ژ/٣٨٦٤) + (تاج/٤ ز/١٩ ژ/٤٠٦٠ + ژمارە: ٢١٦٠ کە لەزنجیرە/١٧١٧ دا دێت).

## سوورەتی ئەعراف = سورة الأعراف

### ١٦٩٧- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: { خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ }

### باب: في قوله تعالى: { خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ }

٢١٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ فَتَقُولُ: مَنْ يُعِيرُنِي تِطْوَافًا تَجْعَلُهُ عَلَى فَرْجِهَا وَتَقُولُ:

الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ فَمَا بَدَا مِنْهُ فَلاَ أُحِلُّهُ

فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ). (الحديث ٧٤٦٧ شيحا = ٧٥٠٣فم):

ئيبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو بابی بێ) فەرمووی: جاران ئافرەت بەڕووتی تەوافی بەیتیان دەکرد، چونکە نەدەبوو بەجلەکانی خۆیەوە تەواف بکا، لەبەر ئەوەی گوناهی پێیەوە کردووە، جا یا دەبوو دەستێ بەرگی تەواف لەقورەیش بەکرێ بگرێ، یا بەڕووتی هەڵ دەسووڕا بەگردی کابەداو دەیگوت: کێ دەستێ جلکی تەوافم بەخواستەمەنی دەداتێ، جا جلەکەی دەدا بەسەر شەرمگای داو دەیگوت بەدەنگی بەرز:

الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ
فَمَا بَدَا مِنْهُ فَلاَ أُحِلُّهُ

واتە:
ئەمڕۆ لەجەستەم هەرچی دەرکەوێ، ئیتر
حەلاڵی ناکەم بۆکەسێ جارێکی تر

**بەپەخشانیش واتە:**

ئەمڕۆکە بمەوێو نەمەوێ، لەشم بازێکی یاهەمووی دەردەکەوێ، جا ئەوەی لەلەشم ئەمڕۆ دەرکەوێ، ئیتر بۆکەسێ حەلاڵی ناکەم جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هات:

{خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ} (سورة الأعراف-٧/٣١).

واتە: ئەی نەوەی ئادەم! بەرگی پاكو خاوێنی جوان لەبەربکەن بۆ داپۆشینی شەرمگاتان، بەتایبەتی کاتێ دەچن بۆ مزگەوت، چی بۆ تەواف بچن، وەچی بۆ نوێژبێ یا پەرستش).

**١٦٩٨- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە {وَنُودُواْ أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ}** (٧٠٦١-٧٠٩٢)

**باب: في قوله تعالى: {وَنُودُواْ أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ}**

٢١٤٠- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَأَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ « يُنَادِي مُنَادٍ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلاَ تَسْقَمُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلاَ تَمُوتُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلاَ تَهْرَمُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلاَ تَبْتَئِسُوا أَبَدًا ». فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَنُودُوا أَنْ تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ). (الحديث ٧٠٨٦ شيحا = ٧١١٣فم.)

ئەبو سەعیدی خودریو ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویان: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەبەهەشتا جارچی جاڕدەدا، ئەی دانیشتوانی بەهەشت! خەڵاتی خودای گەورەیە بۆ ئێوە هەتا هەتایە ساخلەم دەبنو لەشتان ساخ دەبێو قەت نەخۆش ناکەون، موژدە بێ لێتان کەهەتا هەتایە بەشادیو خۆشی دەژینو قەت نامرن، وەهەتا هەتایە جەهێڵ دەبن قەت پیر نابن، وەهەتا هەتایە لەخۆشیو نازو نیعمەتا دەبنو قەت هەژارو کەساس ناکەون، ئەمە ئەوەیە کەخودای گەورە فەرموویەتی: {وَنُودُواْ أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ} (الأعراف-٧/٤٣).

واتە: فریشتەی بەهەشت بانگی بەهەشتییەکان دەکەن: ئەوا ئەم بەهەشتی بەرینە بوو بەماڵی هەتا هەتاییتان، بەهۆی کردەوە باشەکانتانەوە، وەك ماڵە میراتی بوو بەهی ئێوە. (تاج/٤ ز/٨ ژ/٣٨٦٨ — سوورەتی ئەعراف). (بڕوانە: ژمارە: ٢١٤٩ کەلەزنجیرە/١٧٠٥ دا دێت).

## سوورەتی ئەنفال = سورة الأنفال

**١٦٩٩- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ}** (٦٩٩٠-٦٩٩٥) **باب: في قوله تعالى: {وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ}**

٢١٤١- عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: ( اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ) فَنَزَلَتْ ( وَمَا

كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ * وَمَا لَهُمْ أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ) الآيَةَ . (الحديث ٦٩٩٥ شيحا = ٧٠٢٠ فم. بخاري. تفسير: ٤٦٤٨، ٤٦٤٩. تحفة الأشراف: ٩٧٩).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوجەهل گوتی: خودایە! ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو هەقەو نامەی تۆیە، ئەوا ئێمە باوەڕمان پێی نییەو قەبووڵمان نییە، دەی لەتۆڵەی ئەو بێباوەڕییەدا بەردەبارانمان بکەو بەردببارێنە بەسەرمانا، یا سزایەکی زۆر سەختمان بۆ بنێرە، چونکە ئێمە پەسەندی ناکەین، وەڵێمان روونە کەئەمە لەلایەنی تۆوە نییە، بۆیە وا ئەم دووعاو نزای شەڕە لەخۆمان دەکەین.

فەرمووی: کە ئەبوجەهل و کۆمەڵە پیسەکەی، ئەم نامە قوڵییەیان کرد، خودای گەورەو سەروەر ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاء أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ، وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمُ اللّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُواْ أَوْلِيَاءهُ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ} (سورة الأنفال-٨/٣٢-٣٤).

واتە: ئەونامەردانە دەڵێن: خودایە! ئەگەر موحەممەد پێغەمبەری تۆیەو ئەم قورئانە ڕاستەو فەرموودەی تۆیە، ئەوا لەئاسمانەوە بەردە بارانمان بکەو تازووە بنەبڕمان بکە، بەهەر سزاو تۆڵەیەکی سەخت کە تۆ بۆمان بنێری پێی قایلین، بەڵام ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! تۆ مایەی ڕەحمەتو خێرو خۆشی بۆعالەم، لەبەر ئەوە خوداشتی واناکاو هەتا تۆ ماویو تۆ لەناویانابیت، بەپیتو فەڕو بەرەکەتی وجوودی تۆوە خودا سزایان نادات، هەروەها لەبەرئەوەیش سزاو عەزابیان نادا، چونکە لەکاتی تەوافو هەڵسووڕان، بەدەوری کابەدا، کەماڵی خودایەو خانەی میهرەبانەو جێگەی ئەمنو ئاسایشو هێمنییە، لەخودا دەپاڕێنەوە داوای لێ خۆشبوونی لێ دەکەن، دەنا ئەگەر لەفەڕو بەرەکەتی تۆو

لــەپیتو فــەڕی دووعــای ئیســتیغفارەوە نــەبێ، ئــەم نەگبەتانــە چــی چــاکەو پیاوەتیــەکیان هەیــە کەلەبــەر ئــەوە خــودا ســزایان نــەدا، بەپێچــەوانەوە نــەك هەرچــاکەیان نییــە بــەڵکوو خراپەشــیان زۆرەو بــەپێی ســەگە، ئــەوەتانێ ســەرەڕای کوفرو فرە خوایی، ڕێگەی هاموشۆو تەوافی تۆو موسوڵمانان قەدەغە دەکەن لەوە: کە بەسەربەستی لەناو مەسجیدولحەراما پەرستشی خۆتان بکەن، لەگەڵ ئەوەشا کەئەمانە ئەو حەقەیان نییە، چونکە خۆ ئەوان خاوەن کارو کاربەدەستی کەعبە نــین، چــونکە سەرپەرشــتیارو کاربەدەســتانی ئــەو خانــە پــیرۆزە دەشــێ لــەخودا ترسەکان بن‌و ئەوانیش زۆر لەخودای گەورە دوورن! بەڵام دڵنیابە ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! کە زوربەی ئەوانە سەرکەشی‌و لاساریی کوێری کردوون‌و ئەم زانستە جوانە نازانن. (ڕێك وەك ملهوڕەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە). (تاج/٤ ز/٩، ژ/٣٨٨٣ — سوورەتی ئەنفال).

**ڕوونکردنەوە**:

پوختەی ڕاڤەی ئەم ئایەتە ئاوایە:

١- بێبــاوەڕانی مەککــە، بەســەرۆکایەتی ئەبوجــەهل‌و نــەضــری کــوڕی حــاریــث، تەحەددای پێغەمبەریان کردو گوتیان: خودایە یادینی ئێمە، یا دینــی موحەممــەد، ئەگەر دینی موحەممەد راستە ئێمە پێی رازی نــین‌و بەچــی سزامان دەدەیت پێــی ڕازین.

٢- خودای گەورە بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە:

أ- دینی موحەممەد ڕاستەو لەمنەوە هاتووە بۆی.

ب- ئێــوە شــایانی ســزاو تۆڵــەی ســەختن، چــونکە ئــایینی راســتو دروســتی مــن قەبووڵ ناکەن‌و بەرپەرچی دەدەنەوە.

ج- ئێوە شایستەی سزای سەختن چونکە پێغەمبەری من‌و پەیڕەوانی لەتــەوافی خانــەی خــوداو پەرســتش لــەناویا قەدەغــە دەکــەن، بــێ ئــەوە کــە ئێــوە مــافی ئــەو

قەدەغەکردنەتان هەبێ، چونکە ئێوە خاوەنانی کاروباری کەعبە نین، بەڵکوو خاوەنانی کاروباری کەعبە ئەوانەن، کەلەخودا دەترسن، پارێز لەگوناە دەکەن بەڵام ئێوە تا بینە قاقاتان نوقمە لەگوناەو تاوانا.

٣- بەڵام هۆی ئەوە کە خودا سزایان ناداو نزا شەڕەکەیان کەلەخۆیانی دەکەن گیراناکا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دوو هۆکارە:

أ- لەبەرئەوەی کە تۆ لەناویانـدای لەبەرەکەتی بوونی تۆوە، سزادانابارێ بەسەریانا، چونکە تۆ (رَحْمَةً لِلْعَالمِينِ)ی ئەی موحەممەدا!

ب- لەبەرئەوەیش سزانادرێن، چونکە لەکاتی تەوافا بەدەوری کەعبەدا لەخودا دەپاڕێنەوەو داوای لێبووردنی لێ دەکەن.

واتە: ئەگەر بەهۆی ئەم دوو هۆکارەوە نەبێ ئەوان شایانی سزای سەختن، بەڵام بەهۆی ئەم دووشتەوە سزانادرێن!.

## سوورەتی بەرائە = سورة بَرَاءَة

### ١٧٠٠- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە {وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ}

### باب: في قوله تعالى: {وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ}

فيه حديث إبن عمر، وقد تقدم في فضائل عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) (← رقم:١٦٣٦)

بڕوانە ژمارە (←١٦٣٦) کە لەپێشەوە لەباسی گەورەیی عومەری کوڕی خەتاب دا ڕابورد.

### ١٧٠١- لەبارەی سوورەتی (بەرائە)و (ئەنفال)و (حەشر)ەوە (٧٤٣٩-٧٤٧٤)

### باب: في سورة براءة والأنفال والحشر

٢١٤٢- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ سُورَةُ التَّوْبَةِ؟ قَالَ: آلتَّوْبَةِ قَالَ: بَلْ هِيَ الْفَاضِحَةُ، مَا زَالَتْ تَنْزِلُ وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ. حَتَّى ظَنُّوا أَنْ لاَ يَبْقَى مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ ذُكِرَ فِيهَا.

قَالَ: قُلْتُ: سُورَةُ الأَنْفَالِ؟ قَالَ: تِلْكَ سُورَةُ بَدْرٍ. قَالَ: قُلْتُ فَالْحَشْرُ؟ قَالَ: نَزَلَتْ فِى بَنِى النَّضِيرِ. (الحديث ٧٤٧٤ = ٧٥١٠فم. بخاري. تفسير: ٤٦٤٥، ٤٨٨٢، ٤٨٨٣، ٤٠٢٩، تحفة الأشراف: ٥٤٥٤).

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم بەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباس کە ئامۆزای پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەئیبنو عەبباس بێ) هۆی هاتنی سوورەتی تەوبە چی بوو؟ فەرمووی: سوورەتی تەوبەی چی؟! بۆ ناڵێی سوورەتی ئابڕو بردنو ڕیسوا کردنی ناپاكو مونافقەكان! لەكاتی خۆی دا هەموو جارێ كە ئایەتەكانی ئەم سوورەتە دەهاتنە خوارەوەو كۆمەڵ كۆمەڵ ناپاكەكانیان كەشف دەكردو دەیانفەرموو: هەندێكیان حاڵیان ئەمەیەو هەندێكی تریان حاڵیان ئەوەیەو واوایە، ناپاكەكان زەندەقیان دەچوو، لەدڵەوە دەیانگوت: وابڕوات كەسمان لێ دەرناكا، یەك بەیەكمان، هەموومان كەشف دەكاو پەردەی نیفاق لەڕوومان لادەباو ڕیسوامان دەكا.

گوتم: ئەی هۆی هاتنی سوورەتی ئەنفال چی بوو؟ فەرمووی: لەبارەی جەنگی بەدرەوە هاتە خوارەوە. گوتم: ئەی سوورەتی حەشر؟ فەرمووی: لەبارەی جوولەكەكانی هۆزی بەنی نەضیرەوە هاتە خوارەوە. (تاج/٤ ز/٤٢ ژ/٤١٥٦ — سوورەتی حەشر).

## سوورەتی هوود = سورة هود

### ١٧٠٢- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە {إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ} (٦٩٣٢-٦٩٣٨)

### باب: في قوله تعالى: {إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ}

٢١٤٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى عَالَجْتُ امْرَأَةً فِى أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَإِنِّى أَصَبْتُ مِنْهَا مَا دُونَ أَنْ أَمَسَّهَا فَأَنَا هَذَا فَاقْضِ فِىَّ بِمَا شِئْتَ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ سَتَرَكَ اللَّهُ، لَوْ سَتَرْتَ نَفْسَكَ - قَالَ - فَلَمْ يَرُدَّ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَيْئًا فَقَامَ الرَّجُلُ فَانْطَلَقَ فَأَتْبَعَهُ النَّبِىُّ

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَجُلاً دَعَاهُ وَتَلاَ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةَ (أَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ ) فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ هَذَا لَهُ خَاصَّةً؟ قَالَ: « بَلْ لِلنَّاسِ كَافَّةً ». (الحديث ٦٩٣٥ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٦٩٥٩ فم = ف.م = ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري/١ رقم:٣١١=٥٢٦، ٤٦٨٣ ترقيم فتح الباري. أبوداود. حدود: ٤٤٦٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٣١١٢. تحفة الأشراف/٩١٦٢).

عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود، كە ناسراوە بە ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ ماچێ لە ئافرەتێ دەسەنێ، لەپاشان هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەوپەڕی مەدینەوە، ڕامبوارد لەگەڵ ژنێ، هەموو شتێكم لەگەڵ دا كرد، وەك ماچو مۆچو دەستكردنە مل، تەنیا زینام لەگەڵ دا نەكرد، جا ئەوە تام لەبەردەستی تۆدا، ملكەچم بۆ فەرمانی خودا، سەبارەت بەم تاوانەی خۆم، بڕیارت چییە لەبارەی منەوە سەبارەت بەم گوناهەم ملكەچم بۆی؟!

عومەری كوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خودا بۆ یپۆشیویت، خۆزیا خۆشت پەردەی خودات لەسەر خۆت لانەبردبایەو خۆتت بپۆشیبایە!

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هیچ وەڵامی نەدایەوە، هەتا كابرا هەڵسا ڕۆیشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پیاوێكی نارد بەشوێنی دا، بانگی كردەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: {وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ} (سورة هود-١١/١١٤).

واتە: هەموو شەوو ڕۆژێ پێنج نوێژە فەرزەكان لەكاتی دیاریكراوی خۆیانا، بەڕێكوپێكی بكەن، دڵنیابن كەئەم نوێژانە لەكردەوە هەرەباشەكانی ئێوەن، بەڕاستی كارێكی فرەجوانو شیرینن، بزانن كەیاساسەكی دامەزراوی خودایە، كە

هەمیشە كردەوەی باش‌و كاری چاكەو ڕەفتاری جوان، كردەوەی خراپ‌و تاوان لادەبەن‌و گوناه دەسڕنەوە.

پیاوێكیش لەكوڕەكە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بەتایبەتی هەر بۆ ئەم وایە؟.

فەرمووی: (نەء، هەر بۆ ئەم وانییە، بەڵكوو ئەم بڕیارە، كە چاكە خراپە لادەبات، بۆ گشت ئۆمەتەكەمە، بۆ هەموویان هەروایە!). (تاج/١ ز/٤٢ ژ/٣٣٠).

**ڕوونكردنەوە:** ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- گوناەو كردەوەی خراپە، ئەگەر خودا پۆشی بۆكەسێ، چاری ئەوەیە كەلێی دووربكەوێتەوەو تەوبەی لێ بكاو بۆكەس باسی نەكاو پەردەی خودا لەسەر خۆی هەڵ نەداتەوە.

٢- كارەباشەكان دەبن بەكەفارەت‌و داپۆشەر بۆ كردەوە خراپەكان، لەبەرئەوە بەندە هەتا دەتوانێ لەكردەوەی چاكە كۆتایی نەكا، كردەوەی چاكە بابەتێكی بەروالایە، هەموو جۆرە چاكەیەك دەگرێتەوە، لەباوەڕ، لەنوێژ، لەحەج‌و عەمرە، لەخێرو زەكات‌و ڕۆژوو، لەچاكە لەگەڵ دایك‌و باوك‌و منداڵ‌و ژن‌و كەسوكار، لەغەزاو تێكۆشان، لەفێربوونی زانست.

## سوورەتی سوبحانە = سورة سُبْحَانَ

### ١٧٠٣- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ} (٦٩٩٠-٦٩٩٥)

### باب: في قوله تعالى: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ}

٢١٤٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِى مَعَ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- فِى حَرْثٍ وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى عَسِيبٍ إِذْ مَرَّ بِنَفَرٍ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ. فَقَالُوا: مَا رَابَكُمْ إِلَيْهِ لاَ يَسْتَقْبِلُكُمْ بِشَىْءٍ تَكْرَهُونَهُ؟. فَقَالُوا: سَلُوهُ، فَقَامَ إِلَيْهِ بَعْضُهُمْ فَسَأَلَهُ عَنِ الرُّوحِ، قَالَ: فَأَسْكَتَ النَّبِىُّ -صلى الله عليه وسلم- فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ شَيْئًا، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ، قَالَ: فَقُمْتُ مَكَانِى، فَلَمَّا نَزَلَ الْوَحْىُ قَالَ: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً). (الحديث ٦٩٩٠ = ٧٠١٥

فم. تجريد البخاري/١ رقم: ١٠٣ = ١٢٥، ٤٧٢١، ٧٢٩٧، ٧٤٥٦، ٧٤٦٢ فتح الباري للعسقلاني شرح صحيح البخاري. ترمذي. تفسير القرآن. ٣١٤١. تحفة الأشراف: ٩٤١٦).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، کە ناسراوە بە ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمەدینە لەخزمەتی خۆشەویست دا بووم (درودی خوای لەسەربێ) لەناو باخە خورمایەکا دەڕۆیشتین، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پەلکەدار خورمایەکی پێ بوو، لەکاتی ڕۆیشتن دا، خۆی دەدا بەسەری دا، لەلای دەستەیێ جوولەکەوە ڕابورد، بازێکیان گوتیان: بۆ پرسیارێ لە موحەممەد نەکەین، بازێکی تریان گوتیان: پرسیاری لێ مەکەن، نەبادا وەلامەکەیتان بەدڵ نەبێ، لەپاش دا گوتیان: ئەی باوکی قاسم! قسەی ڕۆحمان بۆبکە، ڕۆح (کەگیانی گیانلەبەرە) چییە؟

جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تاوێ ڕاوەستاو ڕاما، ئەوجا سەری بەرز کردەوە، زانیم کە ئەوە سرووشی بۆهات، ئەوجا فەرمووی: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً} (سورة الإسراء-١٧/٨٥).

واتە: پرسیارت لێ دەکەن لەحەقیقەتو ڕاستینەی ڕۆح، لەکونهوماهییەتو چییەتی ئەو شتە کەپێی دەڵێن گیان، کە گیاندار بەبوونی ئەوشتە گیاندارەو زیندووەو بەنەبوونی ئەو شتە بێ گیانەو مردووە، لەوەلامیانا بڵێ: ڕۆح لەوشتانەیە کە بەهۆی فەرمانی خوداوە پەیدا دەبێ، ئێوە نایزانن‌و تێی ناگەن، لەسنووری هۆش‌و فامی ئێوە بەدەرە، لەمەیش سەرتان سووڕنەمێنێ، چونکە ئەوەی ئێوە دەیزانن لەچاو ئەوەی کەخودا دەیزانێ زۆر زۆر کەمە). (تاج/٤ ز/١٨ ژ/٣٩٦٩ چ/٤).

**١٧٠٤- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ}** (٧٤٣٩ - ٧٤٧٩)

**باب: في قوله تعالى: {أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ}**

١٢٤٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود: (أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ) قَالَ كَانَ نَفَرٌ مِنَ الإِنْسِ يَعْبُدُونَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ فَأَسْلَمَ النَّفَرُ مِنَ الْجِنِّ. وَاسْتَمْسَكَ الإِنْسُ

بِعِبَادَتِهِمْ فَنَزَلَتْ (أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ). (الحديث ٧٤٧١ = ٧٥٠٧فم. بخاري. تفسير: ٤٧١٤، ٤٧١٥).

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود، کەناسراوە بە ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چەن کەسێ لەکۆمەڵەی ئادەمیزاد، چەند کەسێکیان دەپەرست لەکۆمەڵەی جنۆکە، جا جنۆکەکانیان بۆخۆیان ئیسلامبوون، کەچی مرۆڤەکان هەر یەخەی ئایینە پووچەکەی خۆیانیان بەرنەدەدا، جا بەم بۆنەیەوە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا} (سورة الإسراء-١٧/٥٧)

واتە: ئەوانەی ئەوان بەندەییان بۆدەکەن ئیسلام بوون‌و خۆیان منەیی هۆکارێ دەکەن‌و مشووری شتێ دەخۆن کەلە خوداوە نزیکیان بکاتەوە، کامیان کە بەبیری خەڵکی کە زیاتر لە خوداوە نزیکترە لەهەموویان زیاتر دەگەڕێ بەشوێن شتێ ببێ بەمایەی ڕەزای خوداو ئومێدی ڕەحمەتی خودای لێ بکرێ، کەواتە: ئەوەی نزیک نەبێ دەبێ حاڵی چۆن بێ، ئەوان بەهیوای ڕەحمەتی خودان‌و لەسزاو ئێش‌و ئازارو زەحمەتی ئەو زاتە بێ باکە دەترسن، کەواتە چۆن هەڵەی وا گەورە دەکەن خۆیان بکەن بەخوا درۆینە! هەڤیشیانە کەلە مەکرو عەزابی خودا ئەمین نەبن، چونکە بەڕاستی ئەوەی هۆش‌و گۆشی هەبێ لەسزای خودای تۆ دەترسێ.

## ١٧٠٥- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا}

## (١٠٠٠-١٠٠٢) باب: في قوله تعالى: {وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا}

٢١٤٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ ( وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً) قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُتَوَارٍ بِمَكَّةَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ فَإِذَا سَمِعَ ذَلِكَ الْمُشْرِكُونَ سَبُّوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ وَمَنْ جَاءَ بِهِ فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ) فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ قِرَاءَتَكَ (وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا) عَنْ أَصْحَابِكَ أَسْمِعْهُمُ الْقُرْآنَ وَلاَ

تَجْهَرْ ذَلِكَ الْجَهْرَ وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً يَقُولُ بَيْنَ الْجَهْرِ وَالْمُخَافَتَةِ. (الحديث ١٠٠٠ شيحا = ٩٩٣ فم = فتح الملهم شرح صحيح مسلم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم: ١٦٧٢ = ٤٧٢٢، ٧٤٩٠، ٧٥٢٥، ٧٥٤٧ فتح الباري شرح صحيح البخاري. ترمذي. تفسير القرآن: ٣١٤٥، ٣١٤٦. نسائي. إفتتاح: ١٠١٠، ١٠١١. تحفة الأشراف: ٥٤٥١).

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، کەناسراوە بەئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) لەبارەی ڕاڤەی ئەم ئایەتەوە لێیان پرسی، کەدەفەرموێ: {وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً} (سورة الإسراء-١٧/١١٠).

کەواتای وایە: لەقورئانخوێندنی ناو نوێژ دا، نەزۆر دەنگ بەرز بکەرەوەو نەزۆریش نزم، لەو نێوانەدا ڕێگەیەکی ناوەندی هەڵبژێرە.

ئیبنو عەبباسیش لەوەڵامی پرسیارەکەدا فەرمووی: ئەم ئایەتە لەکاتێکی وادا دابەزی، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەمەککە لەترسی ناموسوڵمانە هاوبەشپەیداکەرەکان خۆی دەشاردەوەو، خۆی دەرنەدەخست، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو کەبەرنوێژی بۆ هاوڕێکانی دەکرد، لەکاتی قورئانخوێندن دا دەنگی بەرزدەکردەوە، جاکاتێ کە ناموسوڵمانە بتپەرستەکان دەنگیان دەبیست، جنێویان دەدا بەقورئانو بەو کەسەش کەناردوویەتیو بەوکەسەیش کەهێناویەتی بۆسەرزەوی (واتە: جمێنیان بەخوداو قورئانو پێغەمبەرو جوبرائیل)دەدا.

ئیتر خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی بەپێغەمبەری خۆی: {وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ} واتە: بەدەنگی بەرز لەناو نوێژدا قورئان مەخوێنە، تا کافرەکان نەیبیستنو جنێو نەدەن بەقورئان، {وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا} وە ئەوەندەیش دەنگ نزم مەکەرەوە کە هاوڕێکانت نەیبیستنو سەریان لێ تێك بچێ، ئەوەندە دەنگ هەڵبڕە کەهاوەڵانت گوێیان لێت بێتو گوێیان لەقورئانخوێندنەکەی تۆبێو بەس {وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً} بەڵکوو بەدەنگێ بیخوێنە کەلەناوەندی ئەم دووپایەدا بێ، نەزۆر بەرزو نەزۆر نزم. (تاج/٤ ز/١٨ ژ/٣٩٧٣ — سوورەتی ئیسراء).

٢١٤٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) في قوله تعالى: ( وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا ) قالَتْ: أُنْزِلَتْ هذه فِي الدُّعَاءِ . (الحديث ١٠٠١ شيحا = ٩٩٤ فم = فتح الملهم).

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵانو لەگشت هاوسەرەکانی) فەرمووی: ئەم ئایەتە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنێتی نزاو پاڕانەوە هاتووە، کە دەفەرموێ: {وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا} (سورة الإسراء-١٧/١١٠).

## سوورەتی کەهف = سُورةُ الكهف

### ١٧٠٦- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە {فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا} (٦٩٧٦-٦٩٨٤)

٢١٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ « إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ اقْرَءُوا ( فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ) ». (الحديث ٦٩٧٦ شيحا = ٧٠٠٠ فم. تجريد البخاري باكوردي/٤ رقم:١٦٧٣ = ٤٧٢٩. تحفة الأشراف/١٣٨٧٧).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەرۆژی قیامەت دا، پیاوی زل زل، قەڵەو قەڵەو دەهێنن، لەلای خودا سەنگی باڵی مێشوولەیەك قورس نینو بەقەد تۆسقاڵێ دەگەرو قەدرو رێزیان بۆ دانانرێ. (ئەم ئایەتە بخوێنن بۆ پشتیوانی ئەم باسە کە دەفەرموێ: {فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا} (سورة الكهف-١٨/١٠٥).

واتە: لەرۆژی ژینەوەدا، نرخو بایەخو دەگەرو رێز بۆ ئەو سەر لێشێواوە ڕەنجە ڕۆیانە بەقەد تۆسقاڵێ دانانێین! (تاج/٤ ز/١ ژ/٣٩٧٩ — سوورەتی کەهف چ/٤).

## سوورەتی مەریەم = سُورةُ مريم

### ١٧٠٧- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ}

### (٧٠٩٣ – ٧١٢٥) باب: في قوله تعالى: {وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ}

٢١٤٩- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الخدري قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: « يُجَاءُ بِالْمَوْتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُ كَبْشٌ أَمْلَحُ - زَادَ أَبُو كُرَيْبٍ - فَيُوقَفُ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، (وَاتَّفَقَا فِى بَاقِى الْحَدِيثِ) فَيُقَالُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ وَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، قَالَ: ثُمَّ وَيُقَالُ: يَا أَهْلَ النَّارِ هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ قَالَ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ وَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، قَالَ: فَيُؤْمَرُ بِهِ فَيُذْبَحُ، قَالَ: ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ ». قَالَ: ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-: (وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ الأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ) وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى الدُّنْيَا. (الحديث ٧١١٠ شيحا = ٧١٣٧ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ چاپی یەکەم رقم: ١٦٧٤ = ٤٧٣٠ فتح الباري. ترمذي. تفسير القرآن: ٣١٥٦، تحفة الأشراف: ٤٠٠٢).

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەڕۆژی زیندووبوونەوەدا مردن دەهێنن، لەشێوەی بەرانێکی تەودا، دەیهێنن لەسەر شوورەکەی نێوانی بەهەشتو دۆزەخ، کەپێی دەگوترێ: ئەعراف، ڕایدەگرن، ئەوجا جارچی جاڕ هەڵدەداو بەدەنگی بەرز بانگەواز دەکا: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەی بەهەشتییەکان! گوێ بگرن، ئەوانیش گوێ قوڵاخ دەکەنو دەنوارن، جارچییەکە دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسن؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەوە مردنە، هەرکەسەشیان لەجێگەی خۆیەوە بەباشی چاوی لەبەرانەکەیە، کە نمایشی مردن دەکا، ئەنجا جارچییەکە بانگ دەکا، ئەی دانیشتوانی دۆزەخ! ئەی دۆزەخییەکان! گوێ بگرن، ئەوانیش هەموو گوێ قوڵاخ دەکەنو دەنوارن بۆی، جارچییەکە دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسن؟ دەڵێن: ئا، ئەوە مردنە، هەرکەسەیشیان لەشوێنی خۆیەوە بەباشی چاوی لەبەرانەکەیە، کە نموونەیە بۆ مردن.

جا یەحیای کوڕی زەکەریا (سڵاوو دروودی خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) بەرانەکە پاڵ دەخاو سەری دەبڕێ لەبەرچاویان. ئەوجا جارکێش بانگەواز هەڵ دەدا. ئەی خەڵکی بەهەشت خۆشی لەئێوە، مژدەتان لێ بێ، ئیتر مردن نەما، هەتا هەتایە لەبەهەشتا بەخێرو خۆشیو بە شادیو کامەرانی دەژین!

وەئەی دۆزەخنشینەکان! قوربەبانی چاوتان، دەرگای ئومێدتان لێ داخرا، ئیتر مردنیش نەما، کە بەمردن ڕزگارتان بێ لەئێشو ئازاری دۆزەخ، هەتا هەتایە ئەمە شوێنتانە!.

جا خۆشەویست (دروودی خودای گەورەی لەسەربێو سەروماڵو منداڵو دایكو باوكو کەسوکارو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکارانی ئارامگای پیرۆزی بێت) خوێندیەوە:

{وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ } (سورة مريم-١٩/٣٩).

واتە: وە ئەو کافرانە بترسێنەو هەڕەشەی ئەو ڕۆژەیان لێ بکە، کە ڕۆژی داخو خەفەتو ئاهو هەناسەی سەرد هەڵکێشانە، لەو دەمە ناسكو لەو هەلۆیستە ئاڵۆزو شلۆقەدا، کە کار لەکار دەتەرازێو ئێشو بڕیار هەموو دەبڕێتەوەو، خەڵکی دۆزەخ لەخەڵکی بەهەشت جوێ دەکرێنەوە، بەڵام ئەم بێ بڕوا بێ گوێیانە، ئێستا وان لەحاڵەتی کاسیو بێ ئاگاییو نەفامی داو، گاڵتەیان بەقسەی هەقی ڕەهبەران دێتو، لەبارو دۆخی ئەو ڕۆژە سەختو دیژوارە تێ ناگەن، کەسێ قسەی خێریان بۆبکا، ئەوان بەشێتی دەزانن، لەبەرئەم سەر لێشێواوییە بەچاوی دوژمن سەیری ئامۆژگاری دڵسۆزو ناصیحی ئەمین دەکەن!. (وەك: لەزەتپەرستەکانی کوردستانی ئەمڕۆ).

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوانەی کەئێستا وان لەم حاڵەتی بێ ئاگاییو نەفامییەدا ئەوانەن کە بۆدنیا مردوونو دنیا پەرستن. (تاج/٤ ز/٢ ژ/٣٩٨٤ ج/٤) + (بڕوانە: ژمارە: ٢١٤٠ کەلەزنجیرە: ١٦٩٨ دا ڕابورد).

## ١٧٠٨- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {أفَرأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا}
## (٦٩٩٠-٦٩٩٥) باب: في قوله تعالى: {أفَرأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا}

٢١٥٠- عَنْ خَبَّابٍ قَالَ: كَانَ لِى عَلَى الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ دَيْنٌ فَأَتَيْتُه أَتَقَاضَاهُ فَقَالَ لِى: لَنْ أَقْضِيَكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: إِنِّى لَنْ أَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ. قَالَ: وَإِنِّى لَمَبْعُوثٌ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ؟! فَسَوْفَ أَقْضِيكَ إِذَا رَجَعْتُ إِلَى مَالٍ وَوَلَدٍ!. قَالَ وَكِيعٌ: كَذَا قَالَ الأَعْمَشُ قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ( أَفَرَأَيْتَ الَّذِى كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لأُوتَيَنَّ مَالاً وَوَلَدًا ) إِلَى قَوْلِهِ (وَيَأْتِينَا فَرْدًا). (الحديث ٦٩٩٣ = ٧٠١٨ فم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري/٤ رقم: ٩٤٩=٢٠٩١، ٢٢٧٥، ٢٤٢٥، ٤٧٣٢، ٤٧٣٣، ٤٧٣٤، ٤٧٣٥. تحفة الأشراف: ٣٥٢٠).

خەبابی کوڕی ئەرەتت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی نەفامی دا، لەمەککە ئاسنگەر بووم، شمشێرێکم بۆ عاصی کوڕی وائیلی ئەلسەهمی بەقەرز دروست کرد، دوایی چووم داوای هەقدەستەکەیم لێی کرد، پێی گوتم: ناتدەمێ هەتا لەموحەممەد هەڵنەگەڕێیتەوە منیش گوتم پێی: بەخودا قەت لە ئایینی موحەممەد هەڵناگەڕێمەوە، نەبەزیندوویی‌و نەبەمردوویی‌و نەئەوکاتەیش کەخودا تۆ دەمرێنێ‌و لەپاشا لەقیامەت دا زیندووت دەکاتەوە!

عاص گوتی: بۆشتی وا هەیە، گوایە کەمن لەپاش مردن زیندوو بکرێمەوە؟ کەوا بوو ئێستا وازم لێبهێنە هەتا دەمرم‌و زیندوو دەبمەوە، ئەگەر ئەمە وابێ‌و ڕاست بێ، ئەوکاتەیش ماڵ‌و منداڵم دەبێ، جا ئەو حەلە وەرەوە قەرزەکەت دەدەمەوە! جابەم بۆنەیەوە ئەمە دابەزی:

{أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ، أَاطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا ، كَلَّا سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُ مِنَ الْعَذَابِ مَدًّا ، وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا} (سورة مريم-١٩/٧٧-٨٠).

دەبێ حاڵی شڕی ئەو کابرایە چۆن بێ، کە گاڵتەی بەقەبرو قیامەت دێ‌و، بەتەوسەوەو بەتەڵفیسییەوە بەموسوڵمانان دەڵێ: من لەقیامەتیشا ماڵ‌و منداڵم

دەبێ، ئەگەر مافێ، قەرزێ، هەقێکتان لەسەر من هەیە، پەلەم لێ مەکەن، لەوێ دەتاندەمەوە!.

دیارە کەئەم کابرایە غەیبزان نییەو، ئەوەندەیش پیاوێکی پاكو پیرۆزنییە، کەبەڵێنو پەیمانی وای لەخودای میهرەبان وەرگرتبێ، کەواتە با گاڵتەی بەئاییتی ئێمە کردبێ، رۆژێ دەبێ لەدیوانی خوادا خۆی بەتاوانباری دەبینێتەوەو بەبێ ماڵو منالّ داماوو کەساسو بێ کەس دێتەوە بەردەستی خۆمان، فریشتە نووسەرەکانی ئێمە ئەم قسانەی هەموو دەنووسن، کەدەبن بەمایەی سزای زۆر تر، وەماڵو منالّەکەی هەموو لێ دەسەنینەوەو بەتاقو تەنیا، بەسەڵتە زەلامی دێت بۆ دیوانی دادگایی خودایی). (تاج/٤ ز/٢ ژ/٣٩٨٨ – سوورەتی مەریەم ج/٤ = چاپی چوارەم).

## سوورەتی ئەنبیاء = سورة الأنبياء

### ١٧٠٩- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە {كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ} (٧١٢٦-٧١٣١)

### باب: في قوله عز وجل: {كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ}

٢١٥١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهما) قَالَ قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِمَوْعِظَةٍ فَقَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً - ثُمَّ قَالَ - ( كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ - ثُمَّ قَالَ - أَلاَ وَإِنَّ أَوَّلَ الْخَلاَئِقِ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ (عليه السلام)، أَلاَ وَإِنَّهُ يُجَاءُ بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ ، فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُصَيْحَابِي!. فَيُقَالُ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ . فَأَقُولُ كَمَا قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ: {وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ. إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ} فَيُقَالُ لِي: إِنَّهُمْ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ » . (الحديث ٧١٣٠ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٣١٥٦ ترقيم فم = ف.ن = فتح الملهم بشرح صحيح الإمام

مسلم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري/المجلد الرابع الرقم: ١٣٤٣ = ٣٣٤٩، ٣٤٤٧، ٤٦٢٥، ٤٦٢٦، ٤٧٤٠، ٦٥٢٤، ٦٥٢٥، ٦٥٢٦. ترمذي. صفة القيامة: ٢٤٢٣. نسائي. جنائز: ٢٠٨١. تحفة الأشراف/٥٦٢٢).

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەربێ) **لەدوانێکا پەندو ئامۆژگارییەکی شیرینی کردین، فەرمووی: ئەی خەڵکە! ئەی مرۆڤینە! ئەی کۆمەڵەی ئادەمیزادینە! دڵنیابن لەوە کە ئێوە لەقیامەت دا، لەپاش مردنی جیهان، زیندوو دەکرێنەوەو، بەپێخاوسی بەرووتو قووتیو بەسوننەتنەکراوی حەشر دەکرێنو کۆدەکرێنەوەو دەبرێن بۆ مەیدانی مەحشەرو لێپرسینەوە، بۆلای خودای گەورە).**

**ئەوجا خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەربێ) **ئەم ئایەتەی بۆ پشتیوانی ئەم مەبەستە خوێندەوە:** {كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ} (سورة الأنبياء-٢١/١٠٤)

**واتە: خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: لەرۆژی ژیانەوەدا، وەك چۆن خودای گەورە لەسەرەتاوە، مرۆڤی دروست کردووە، کەلەسکی دایکی دەکەوێتە خوارەوە، رووتو قووتو خەتەنە نەکراوەو، بێماڵو بێ پارەو پوولە، ئاوەهایش بەبێ کەمو زیاد، لەسەر هەمان شێوەو حاڵی رووتوقووتیو پێخاوسیو سوننەتنەکراوی خودا سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە!.**

**ئینجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: بزانن! رۆژی ژینەوە یەکەم کەسێ کە پۆشتە دەکرێتەوەو بەرگی لەبەر دەکرێتەوە ئیبراهیمە، هۆشیاربن! کە چەن پیاوێ لەگەڵی ئیسلامی من دەهێننو، بەرەولای چەپ، بەرەو ناو ئاگری دۆزەخ بەکێشیان دەکەن، ئەوانە لەتاقمەی ئەم ئایەتەن کەدەفەرموێ:** {وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ} (سورة الواقعة-٥٦/٤١)

**خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: کاتێ بە بەرچاومەوە ئەوانە بەکێش دەکرێن بەرەو دۆزەخ، بەسەرسامی دەڵێم: ئەی پەروەردگارم! خۆ ئەمانە لەکن**

خۆیان هاوڕێی من بوون، ئەوە بۆ كوێیان دەبەن؟ دەفەرموێ: ئـەی موحەممـەد! تـۆ ئاگات لـێ نییە، كەئەمانـە لـەپاش مـەرگی تـۆ چـی فەرتەنەیـەكیان بـەرپاكرد بـوو، ئەوجا منیش وەك بەندەی فرەباش، عیسای كوڕی مەریـەم دەڵێم: {وَكُنـتُ عَلَـيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَـوَفَّيْتَنِي كُنـتَ أَنـتَ الرَّقِيـبَ عَلَـيْهِمْ وَأَنـتَ عَلَـى كُـلِّ شَـيْءٍ شَهِيدٌ} (سورة المائدة-٥/١١٧).

عیسای كوڕی مەریەم، لەڕۆژی ژینەوەدا، وەڵامی پەروەردگاری خـۆی دەداتـەوە، كەلێی دەپرسێ ئەی عیسا! ئایا تۆ كاتێ پێغەمبەر بووی بەو خەڵكەت گوتـووە: كـە منو دایكیشم بكەن بەخوداو وەك خودا مـنو دایكـم بپەرسـتن؟ عیسا لەسـەر ئـەم شـێوەیە وەڵامـی ئـەم پرسـیارەی پـەروەردگار دەداتـەوە: پـەروەردگار! مـن هـەتا لـەناویانا بـووم ئاگـاداریم دەكـردنو چاودێریم دەكـردن، نـەم دەهێشـت كەشـتی وا نابەجێ بكەن، بەڵام كاتێ تۆ منت بردەوە بۆلای خۆت ئیتر تـۆ خـۆت چاودێربووی بەسەریانەوە، هەروەك خۆت چاودێری بەسەر هەموو شتێكی ترەوە، خـۆت دەزانـی ئەی خودایە! كەشانیان چی هەڵ دەگرێ، ئەگەر سزایان دەدەی ئەوا دیارە سزاواری ئەوەنو موڵك موڵكی خۆتە، چی لـێ دەكەیت ڕەوایە، كـەس هـەقی قسـەو ڕەخنـەی بۆنییە، خۆ ئەگـەر بـەمیهرەبانی خۆشـت لێیـان دەبووریـت، ئـەوا گـەورەیی خۆتـە، بەڕاستی تۆ ئەی خودایە! دڵنیـام كەتـەواناو لێـزانو دانـاو زانـاو كاردروسـتی، كـاری نابەجێو هەڵە لەتۆوە دوورە.

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جـا منـیش وەك عیسـا دەڵـێم: خودایـە! من هـەتا لـەناویانا بـووم چـاودێریم كـردوون، لـەپاش مـەرگم خـۆت ئاگـات لێیانـە، سزایان دەدەی كەیفی خۆتە، لێیان خۆش دەبی، فەرمان فەرمانی تۆیە.

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەپاش ئەم پرسیارو وەڵامە، دەفـەرموێ پێم: ئەی موحەممەد! ئەمانە هەر لەگەڵ تۆ مردیتو لێیـان جیابوویتـەوە، پاشـەو پـاش لـەئایین هەڵگەڕانـەوەو پـاش گـەز بوونـەوە! (تـاج/٤ ز/٦ ژ/٣٨٥١ — سـوورەتی مائیدە) + (ریاض/١ ز/١٦ ژ/١٦٥ + ریاض/٢ ز/٥١ ژ/٤٢٥).

## سوورەتی حەج = سورة الحج

### ١٧١٠- لەبارەی فەرموودەی خودای گەورەوە: {هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ} (٧٤٣٩-٧٤٧٩)

### باب: في قوله تعالى: {هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ}

٢١٥٢- عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ يُقْسِمُ قَسَمًا إِنَّ (هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ) إِنَّهَا نَزَلَتْ فِي الَّذِينَ بَرَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ حَمْزَةُ وَعَلِيٌّ وَعُبَيْدَةُ بْنُ الْحَارِثِ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ ابْنَا رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ. (الحديث ٧٤٧٨ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٥١٤ ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. بخاري. مغازي. ٣٩٦٦، ٣٩٦٩، ٤٩٦٨، ٤٧٤٣. ابن ماجه. جهاد. ٢٨٣٥. تحفة الأشراف: ١١٩٧٤).

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە، دەیکەین بە ڕاڤەو ڕوونکردنەوە بۆ ئێرە:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەڕۆژی ژینەوەدا، من یەکەم کەس دەبم، کەلەبەردەمی خودای گەورەو میهرەبان بەچۆکا دێم‌و سکاڵای حاڵی خۆم دەکەم لەدەست ناحەزەکانی خۆم.

قەیسی کوڕی عوباد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: لەئەبو زەڕم بیست دەیفەرموو (ڕەزای خوای لێ بێ): سوێندی دەخوارد لەسەرئەوە کەئەم ئایەتە: {هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ} (الحج/١٩/٢٢) لەشانی ئەم دوو دەستەیەدا هاتە خوارێ، کە لەڕۆژی غەزای بەدردا چوونە مەیدان بۆیەکتری، دەستەی موسوڵمانەکان، عەلی‌و حەمزەو عوبەیدە بوون، دەستەی بێباوەڕەکانیش شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو وەلیدی کوڕی عوتبە بوون. (تاج/٤ ز/٥ ژ/٣٩٩٨- سوورەتی حەج). ئەم فەرموودەیە دواهەمین فەرموودەیە لەصەحیحی موسلیم.

## سوورەتی نوور = سورة النور

### ١٧١١- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ} (٦٩٥١-٦٩٥٣)

### باب: في قوله تعالى: {إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ}

٢١٥٣- عَنِ الزُّهْرِيِّ أَخْبَرَنِى سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ وَعَلْقَمَةُ بْنِ وَقَّاصٍ وَعُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا فَبَرَّأَهَا اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكُلُّهُمْ حَدَّثَنِى طَائِفَةً مِنْ حَدِيثِهَا وَبَعْضُهُمْ كَانَ أَوْعَى لِحَدِيثِهَا مِنْ بَعْضٍ وَأَثْبَتَ اقْتِصَاصًا وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمُ الْحَدِيثَ الَّذِى حَدَّثَنِى وَبَعْضُ حَدِيثِهِمْ يُصَدِّقُ بَعْضًا ذَكَرُوا أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَعَهُ - قَالَتْ عَائِشَةُ - فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِى غَزْوَةٍ غَزَاهَا فَخَرَجَ فِيهَا سَهْمِى فَخَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَذَلِكَ بَعْدَ مَا أُنْزِلَ الْحِجَابُ فَأَنَا أُحْمَلُ فِى هَوْدَجِى وَأُنْزَلُ فِيهِ مَسِيرَنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ غَزْوِهِ وَقَفَلَ وَدَنَوْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ فَلَمَّا قَضَيْتُ مِنْ شَأْنِى أَقْبَلْتُ إِلَى الرَّحْلِ فَلَمَسْتُ صَدْرِى فَإِذَا عِقْدِى مِنْ جَزْعِ ظَفَارِ قَدِ انْقَطَعَ فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِى فَحَبَسَنِى ابْتِغَاؤُهُ وَأَقْبَلَ الرَّهْطُ الَّذِينَ كَانُوا يَرْحَلُونَ لِى فَحَمَلُوا هَوْدَجِى فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِىَ الَّذِى كُنْتُ أَرْكَبُ وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنِّى فِيهِ - قَالَتْ - وَكَانَتِ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا لَمْ يُهَبَّلْنَ وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ إِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ الْقَوْمُ ثِقَلَ الْهَوْدَجِ حِينَ رَحَلُوهُ وَرَفَعُوهُ وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وَسَارُوا وَوَجَدْتُ عِقْدِى بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ فَجِئْتُ مَنَازِلَهُمْ وَلَيْسَ بِهَا دَاعٍ وَلاَ مُجِيبٌ فَتَيَمَّمْتُ مَنْزِلِى الَّذِى كُنْتُ فِيهِ وَظَنَنْتُ أَنَّ الْقَوْمَ سَيَفْقِدُونِى فَيَرْجِعُونَ إِلَىَّ فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ فِى مَنْزِلِى غَلَبَتْنِى عَيْنِى فَنِمْتُ وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ السُّلَمِىُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِىُّ قَدْ عَرَّسَ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ فَادَّلَجَ فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِى فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَأَتَانِى فَعَرَفَنِى حِينَ رَآنِى وَقَدْ كَانَ يَرَانِى قَبْلَ أَنْ يُضْرَبَ الْحِجَابُ عَلَىَّ فَاسْتَيْقَظْتُ

بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ عَرَفَنِى فَخَمَّرْتُ وَجْهِى بِجِلْبَابِى وَوَاللَّهِ مَا يُكَلِّمُنِى كَلِمَةً وَلاَ سَمِعْتُ مِنْهُ كَلِمَةً غَيْرَ اسْتِرْجَاعِهِ حَتَّى أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ فَوَطِئَ عَلَى يَدِهَا فَرَكِبْتُهَا فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِى الرَّاحِلَةَ حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُوغِرِينَ فِى نَحْرِ الظَّهِيرَةِ فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ فِى شَأْنِى وَكَانَ الَّذِى تَوَلَّى كِبْرَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَىِّ ابْنُ سَلُولَ فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ حِينَ قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ شَهْرًا وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ فِى قَوْلِ أَهْلِ الإِفْكِ وَلاَ أَشْعُرُ بِشَىْءٍ مِنْ ذَلِكَ وَهُوَ يَرِيبُنِى فِى وَجَعِى أَنِّى لاَ أَعْرِفُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اللُّطْفَ الَّذِى كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَشْتَكِى إِنَّمَا يَدْخُلُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُولُ « كَيْفَ تِيكُمْ ». فَذَاكَ يَرِيبُنِى وَلاَ أَشْعُرُ بِالشَّرِّ حَتَّى خَرَجْتُ بَعْدَ مَا نَقِهْتُ وَخَرَجَتْ مَعِى أُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ وَهُوَ مُتَبَرَّزُنَا وَلاَ نَخْرُجُ إِلاَّ لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيبًا مِنْ بُيُوتِنَا وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الأُوَلِ فِى التَّنَزُّهِ وَكُنَّا نَتَأَذَّى بِالْكُنُفِ أَنْ نَتَّخِذَهَا عِنْدَ بُيُوتِنَا فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ وَهِىَ بِنْتُ أَبِى رُهْمِ بْنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ وَأُمُّهَا ابْنَةُ صَخْرِ بْنِ عَامِرٍ خَالَةُ أَبِى بَكْرٍ الصِّدِّيقِ وَابْنُهَا مِسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ بْنِ عَبَّادِ بْنِ الْمُطَّلِبِ فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَبِنْتُ أَبِى رُهْمٍ قِبَلَ بَيْتِى حِينَ فَرَغْنَا مِنْ شَأْنِنَا فَعَثَرَتْ أُمُّ مِسْطَحٍ فِى مِرْطِهَا فَقَالَتْ تَعِسَ مِسْطَحٌ. فَقُلْتُ لَهَا بِئْسَ مَا قُلْتِ أَتَسُبِّينَ رَجُلاً قَدْ شَهِدَ بَدْرًا. قَالَتْ أَىْ هَنْتَاهُ أَوَلَمْ تَسْمَعِى؟ مَا قَالَ قُلْتُ وَمَاذَا قَالَ: قَالَتْ: فَأَخْبَرَتْنِى بِقَوْلِ أَهْلِ الإِفْكِ فَازْدَدْتُ مَرَضًا إِلَى مَرَضِى فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِى فَدَخَلَ عَلَىَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ: « كَيْفَ تِيكُمْ ». قُلْتُ أَتَأْذَنُ لِى أَنْ آتِىَ أَبَوَىَّ؟ قَالَتْ: وَأَنَا حِينَئِذٍ أُرِيدُ أَنْ أَتَيَقَّنَ الْخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا. فَأَذِنَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجِئْتُ أَبَوَىَّ فَقُلْتُ لأُمِّى: يَا أُمَّتَاهْ مَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ؟ فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّةُ هَوِّنِى عَلَيْكِ فَوَاللَّهِ لَقَلَّمَا كَانَتِ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةٌ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا وَلَهَا ضَرَائِرُ إِلاَّ كَثَّرْنَ عَلَيْهَا - قَالَتْ - قُلْتُ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَقَدْ تَحَدَّثَ النَّاسُ بِهَذَا؟! قَالَتْ: فَبَكَيْتُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لاَ يَرْقَأُ لِى دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ ثُمَّ أَصْبَحْتُ أَبْكِى وَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِىَّ بْنَ أَبِى طَالِبٍ وَأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رضي الله عنهما) حِينَ اسْتَلْبَثَ الْوَحْىُ يَسْتَشِيرُهُمَا فِى فِرَاقِ أَهْلِهِ - قَالَتْ - فَأَمَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ فَأَشَارَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِالَّذِى يَعْلَمُ

مِنْ بَرَاءَةِ أَهْلِهِ وَبِالَّذِى يَعْلَمُ فِى نَفْسِهِ لَهُمْ مِنَ الْوُدِّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هُمْ أَهْلُكَ وَلاَ نَعْلَمُ إِلاَّ خَيْرًا. وَأَمَّا عَلِىُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ (رضي الله عنه) فَقَالَ: لَمْ يُضَيِّقِ اللَّهُ عَلَيْكَ وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ وَإِنْ تَسْأَلِ الْجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ - قَالَتْ - فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَرِيرَةَ فَقَالَ « أَىْ بَرِيرَةُ هَلْ رَأَيْتِ مِنْ شَىْءٍ يَرِيبُكِ مِنْ عَائِشَةَ؟». قَالَتْ لَهُ بَرِيرَةُ: وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنْ رَأَيْتُ عَلَيْهَا أَمْرًا قَطُّ أَغْمِصُهُ عَلَيْهَا أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ تَنَامُ عَنْ عَجِينِ أَهْلِهَا فَتَأْتِى الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ - قَالَتْ - فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمِنْبَرِ فَاسْتَعْذَرَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَىِّ ابْنِ سَلُولَ - قَالَتْ - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: « يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ مَنْ يَعْذِرُنِى مِنْ رَجُلٍ قَدْ بَلَغَنِي أَذَاهُ فِى أَهْلِ بَيْتِى فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِى إِلاَّ خَيْرًا وَلَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلاً مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلاَّ خَيْرًا وَمَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِى إِلاَّ مَعِى؟». فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ الأَنْصَارِىُّ فَقَالَ: أَنَا أَعْذِرُكَ مِنْهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ كَانَ مِنَ الأَوْسِ ضَرَبْنَا عُنُقَهُ وَإِنْ كَانَ مِنْ إِخْوَانِنَا الْخَزْرَجِ أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا أَمْرَكَ - قَالَتْ - فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ وَهُوَ سَيِّدُ الْخَزْرَجِ وَكَانَ رَجُلاً صَالِحًا وَلَكِنِ اجْتَهَلَتْهُ الْحَمِيَّةُ فَقَالَ لِسَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّهِ لاَ تَقْتُلُهُ وَلاَ تَقْدِرُ عَلَى قَتْلِهِ. فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَهُوَ ابْنُ عَمِّ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فَقَالَ لِسَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّهِ لَنَقْتُلَنَّهُ فَإِنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنِ الْمُنَافِقِينَ فَثَارَ الْحَيَّانِ الأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا أَنْ يَقْتَتِلُوا وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخَفِّضُهُمْ حَتَّى سَكَتُوا وَسَكَتَ - قَالَتْ - وَبَكَيْتُ يَوْمِى ذَلِكَ لاَ يَرْقَأُ لِى دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ ثُمَّ بَكَيْتُ لَيْلَتِى الْمُقْبِلَةَ لاَ يَرْقَأُ لِى دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ وَأَبَوَاىَ يَظُنَّانِ أَنَّ الْبُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِى فَبَيْنَمَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِى وَأَنَا أَبْكِى اسْتَأْذَنَتْ عَلَىَّ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَأَذِنْتُ لَهَا فَجَلَسَتْ تَبْكِى - قَالَتْ - فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمَ ثُمَّ جَلَسَ - قَالَتْ - وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِى مُنْذُ قِيلَ لِى مَا قِيلَ وَقَدْ لَبِثَ شَهْرًا لاَ يُوحَى إِلَيْهِ فِى شَأْنِى بِشَىْءٍ - قَالَتْ - فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ جَلَسَ ثُمَّ قَالَ: « أَمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِى عَنْكِ كَذَا وَكَذَا فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِى

اللَّهَ وَتُوبِى إِلَيْهِ فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبٍ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ ». قَالَتْ فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَقَالَتَهُ قَلَصَ دَمْعِى حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً فَقُلْتُ لأَبِى أَجِبْ عَنِّى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِيمَا قَالَ. فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِى مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقُلْتُ لأُمِّى: أَجِيبِى عَنِّى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَتْ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِى مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقُلْتُ وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لاَ أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنَ الْقُرْآنِ إِنِّى وَاللَّهِ لَقَدْ عَرَفْتُ أَنَّكُمْ قَدْ سَمِعْتُمْ بِهَذَا حَتَّى اسْتَقَرَّ فِى نُفُوسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ فَإِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّى بَرِيئَةٌ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّى بَرِيئَةٌ لاَ تُصَدِّقُونِى بِذَلِكَ وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّى بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُونَنِى وَإِنِّى وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لِى وَلَكُمْ مَثَلاً إِلاَّ كَمَا قَالَ أَبُو يُوسُفَ: (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ). قَالَتْ ثُمَّ تَحَوَّلْتُ فَاضْطَجَعْتُ عَلَى فِرَاشِى - قَالَتْ - وَأَنَا وَاللَّهِ حِينَئِذٍ أَعْلَمُ أَنِّى بَرِيئَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ عَزَ وَجلَّ مُبَرِّئِى بِبَرَاءَتِى وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنْ يُنْزَلَ فِى شَأْنِى وَحْىٌ يُتْلَى وَلَشَأْنِى كَانَ أَحْقَرَ فِى نَفْسِى مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ عَزَّ وَجلَّ فِىَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى وَلَكِنِّى كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِى اللَّهُ بِهَا قَالَتْ: فَوَاللَّهِ مَا رَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَجْلِسَهُ وَلاَ خَرَجَ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ أَحَدٌ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجلَّ عَلَى نَبِيِّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ عِنْدَ الْوَحْىِ حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنَ الْعَرَقِ فِى الْيَوْمِ الشَّاتِي مِنْ ثِقَلِ الْقَوْلِ الَّذِى أُنْزِلَ عَلَيْهِ - قَالَتْ - فَلَمَّا سُرِّىَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ يَضْحَكُ فَكَانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قَالَ: « أَبْشِرِى يَا عَائِشَةُ أَمَّا اللَّهُ فَقَدْ بَرَّأَكِ ». فَقَالَتْ لِى أُمِّى قُومِى إِلَيْهِ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ وَلاَ أَحْمَدُ إِلاَّ اللَّهَ هُوَ الَّذِى أَنْزَلَ بَرَاءَتِى - قَالَتْ - فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجلَّ {إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ} عَشْرَ آيَاتٍ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجلَّ هَؤُلاَءِ الآيَاتِ بَرَاءَتِى - قَالَتْ - فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ وَفَقْرِهِ وَاللَّهِ لاَ أُنْفِقُ عَلَيْهِ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ الَّذِى قَالَ لِعَائِشَةَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجلَّ (وَلاَ يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُولِى الْقُرْبَى ) إِلَى قَوْلِهِ (أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ) قَالَ حِبَّانُ بْنُ

مُوسَى قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ هَذِهِ أَرْجَى آيَةٍ فِى كِتَابِ اللَّهِ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللَّهِ إِنِّى لأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِى. فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ النَّفَقَةَ الَّتِى كَانَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ وَقَالَ لاَ أَنْزِعُهَا مِنْهُ أَبَدًا. قَالَتْ عَائِشَةُ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) سَأَلَ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ أَمْرِى: « مَا عَلِمْتِ أَوْ مَا رَأَيْتِ؟». فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحْمِى سَمْعِى وَبَصَرِى وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ إِلاَّ خَيْرًا. قَالَتْ عَائِشَةُ: وَهِىَ الَّتِى كَانَتْ تُسَامِينِى مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَعَصَمَهَا اللَّهُ بِالْوَرَعِ وَطَفِقَتْ أُخْتُهَا حَمْنَةُ بِنْتُ جَحْشٍ تُحَارِبُ لَهَا فَهَلَكَتْ فِيمَنْ هَلَكَ. قَالَ الزُّهْرِىُّ فَهَذَا مَا انْتَهَى إِلَيْنَا مِنْ أَمْرِ هَؤُلاَءِ الرَّهْطِ. (الحديث ٦٩٥١ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٦٩٧٥ فم = ف.م. = فتح الملهم. تجريد البخاري بالكوردي/٣ رقم: ١١٢١ = ٢٦٦١، ٢٦٣٧، ٢٦٨٨، ٢٨٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٥٠، ٤٧٤٩، ٤٧٥٧، ٥٢١٢، ٦٦٦٢، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٣٧٠، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥ + ژمارە:١١٠٧ = تجريد. تحفة الأشراف: ١٦١٢٦).

ئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم کۆمەڵە لەعائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە (دروودی خودا لەپێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) ئەم داستانەیان گێڕایەوە بۆم، کەباسی ئەو بوختانە گەورەیە دەکا، کە بۆعائیشە کرا، وەخودای گەورە بەئایەتی قورئان پاکانەی بۆ عائیشە کردو پاکیو پاکیزەیی ئەوی لەشتی وا ناشایستە ڕاگەیاند، ئەمانە گشتیان کۆمەڵێ لەقسەکانی عائیشەیان گێڕایەوە بۆم، بازێ لەم کۆمەڵەیە باشتر قسەکانی عائیشەیان ڕەوان بوو، وە زیاتر شارەزاییان لێی هەبوو، وەمن بەش بەحاڵی خۆم زۆر بەباشی لەفەرموودەی یەك بەیەکی ئەوان، کەبەمنیان دەفەرموو لەم بارەیەوە، زۆر بەباشی لەوەحاڵی بوومو ڕەوانم کرد، قسەکانی ئەوان سەبارەت بەم بابەتە، لەناو خۆیانا تەبابوونو بەڵگەی ڕاستیی یەکتری بوون، جا ئەم کۆمەڵەیە کەئەم زاتانە بوون: سەعیدی کوڕی موسەییەبو عوروەی کوڕی زوبەیرو عەلقەمەی کوڕی وەققاصو عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوود

بوون، فەرموویان: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەمموو هاوسەرو هاوەڵانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو: کاتێ دەڕۆیشت بۆ سەفەرێ، لەنێوانی خێزانەکانی دا تیروپشکی دەکرد، ئیتر بەناوی هەرکامێکیانەوە پشك دەربچوایە ئەو ژنەیی لەگەڵ خۆی دا دەبرد بۆ ئەو سەفەرە، وە لەسەر ئەم یاسایە جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پشکی خست لەنێوانمان دا، دەیویست بچێ بۆ غەزای بەنی موصطەلەق، وا ڕێکەوت پشك بەناوی منەوە دەرچوو، وەمن لەخزمەتی دا چووم بۆ ئەوغەزایە، ئەم سەفەرەیش پاش ئەوە بوو کە ئایەتی حیجابو حیجابگرتنەوەو پەچەپۆشی ژنان هاتبووە خوارەوە، دەربارەی هاوسەرەکانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لەبەرئەوە من بەبەرگی حیجابەوە لەناو کەژاوەیەکا هەڵیان دەگرتمو دەیانخستمە سەرپشتی وشترەکەمو هەر بەکەژاوەکەیشەوە لەوشترەکە دایان دەگرتم، ڕۆیشتین هەتا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لەغەزاکەی لێ بۆوەو، گەڕایەوەو گەیشتینە نزیکی مەدینە. لەوێدا لەشەودا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری دا کە بکەونە ڕێو بەرەو مەدینە بجمێن، منیش لەوکاتەدا کە خەڵکەکە خەریکی بارکردن بوون، هەستام چووم بۆسەراوو دوورکەوتمەوە لەقەرەباڵغی سوپاکە، کاتێ سەراوەکەم تەواو کردو دەستم بەئاو گەیاند، هاتمەوە بۆلای شوێنەکەی خۆم، تەماشام کرد گەردانەیەکی بەردەشەوەی ظەفارم هەبوو، پسا بوو، پچڕابۆوە، وەچەند دانەیەکی لێ داکەوتبوو، منیش بەڕێگەکەی خۆما گەڕامەوەو گەڕام بۆ ملەوێنکەکەم، جا ئەم گەڕانو خەریکبوونەم درەنگی بەسەرهێناو لەگەژاوەکەم بێ ئاگابووم، تەمەز ئەوانەی کەخزمەتی ئێمەیان دەکردو، وشترەکەیان بۆم کۆپان دەکرد، هاتوون کەژاوەکەی منیان بەخاڵی هەلگرتووەو ناویانەتە سەرپشتی وشترەکەم، بەبیری خۆیان وایانزانیوە کەمن وام لەناویدا، فەرمووی: ئەو سەردەمەیش ژنان هێشتا سووکەڵە بوونو قەڵەوو گۆشتنو قورس نەبوو بوون، چونکە خواردنیان کەم بوو، بەقەد بەرکۆڵێ دەبوو نەدەبوو، سەرەڕای ئەوەیشە من خۆیشم ئەو حەلە هێشتا

کچۆڵە بـووم‌و کەنیشـکێکی منالکـار بـووم‌و تـەواو سـووکەڵە بـووم، ئـیتر لەبەرئـەم هۆیانەو، دیارە چارەنووسی خودایی وابووە، کاتێ پیاوەکان کـەژاوە خاڵییەکـەی مـن هەڵدەگرن‌و دەینێن لەوشـترەکەی ژێـرمن هەسـت بەسـووکی‌و چۆڵییەکەی ناکـەن‌و یەکسـەر وشـترەکە هەڵدەسـێنن‌و دەڕۆن، کاتـێ ملەوانەکـەمم بەتـەواویی دۆزییـەوە رۆیشتمەوە بۆ شوێن هەواری سوپاکە، تەماشام کرد کەسی لـێ نەماوە، ئیتر رۆیشتم بۆسـەر شوێنەپێشـووەکەی خـۆم‌و بەناچـاری لـەوێ دانیشـتم، بـەهیوای ئـەوە کـە هاوڕێکـانم درەنـگ یـا زوو ئاگـادار دەبـن لەوەکـە مـن لـە کەژاوەکـەدا نـیم‌و هەڵـەی خۆیان بۆدەردەکەوێ کە کەژاوەکە بەتاڵەو من لەبەر هەر هۆیـەك بـێ گـوم بـووم‌و دەگەڕێنەوە بەشوێنما.

کەمێ مامەوە لەوشوێنەداو خەوم پیاکەوت، کە چاوم کـردەوە صـەفوانی کـوڕی موعەططەلی سولەمی ذەکوانی کەلەپاش سوپاکەوە بوو هات، صەفوان لەبەرە بەیانا سەر خەوێ دەشکێنێ‌و لەپاشا شەو لـەناو شـەو دەگـرێ بەدەمـەوەو دەکەوێتـە ڕێ‌و لەدەمی بەیان دا گەیشتە لای من، صەفوان عادەتی وادەبێ هەموو جارێ لەسوپاکە دوا دەکەوێ تادەڕۆن ئەوجا بەسەر شوێنەواری سـوپاکەدا تـێ دەپـەڕێ ئەگـەر شـتێ لەسوپاکە دا کەوتبێ هەڵی دەگرێتەوەو شوێنیان دەکەوێ، کە نزیك دەبێتەوە لەمن لەدوورەوە ڕەشاییی‌و تارمایی مرۆڤێکی نوستوو دەبینێ، کـە دێتـە پێشـەوەو دەگاتـە سـەرم، تەماشـام دەکـا دەمناسـێتەوە، چـونکە لـەپێش ئـەوەدا کەپەچـەو چارشـێو گرتنەوە دابێ‌و بەرگی حیجاب بـەپێی یاسـای ئیسـلام پەیـدا ببـێ، ئـەو منـی دەدی. کەدەمناسێتەوە دەست دەکا بەگوتنی: (إنا لله وإنـا إليـه راجعـون) وەك بـاوە لـەکاتی ڕووداوێکـی نـاخۆش دا ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە دەگـوترێ، ئـیتر لـەدەنگی ئـەم وشـەیە خەبەرم بۆوە، کەچاوم کردەوە صەفوان دەیگوت: (إنا لله وإنا اليه راجعون). ئیتر من خۆم یەکسەر داپۆشی‌و گورج چارشێوەکەی خۆمم دا بەڕووی خۆم دا، بەزاتی خـودا یەك وشە چییە قسەی تری لەگەڵدا نەکردم، جگە لەو ئایەتە زیاترم لێی نەبیست، ئەوەنەبێ کە کێشای بەدەستی وشترەکەی داو بیخی داو، منیش بەبێ یاریـدەی ئـەو

کەباڵم بگرێ، یا قاچم هەڵبڕێ، سواری وشترەکە بووم، جا کەوتەڕێو جڵەوی وشترەکەی بۆ ڕادەکێشامو، هەتا لەسەر ئەم حاڵەتە گەیشتینەوە بەسوپاکە، کەلەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا بۆ وچان لایان دابوو، جا ئیتر سەبارەت بەمن تیاچوو ئەوەی کە تیاچوو، وەك دەڵێن: باوێلکە بایەکی بەسە، داخ لەدڵەکانیش ئەمەیان بەهەلزانیو بەنیازی ئابڕۆ بردنی حەزرەتو تانەدان لەخانەوادەی پاكو مەردو داوێنپاکی، ویستیان خەنجەرە کوڵو کولەکەی خۆیان تامشتووە رزیوەکەی بدەن لەکۆڵەی ئیسلام، بۆیەکا سەرۆکی ناپاکەکان عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی، کەپێشی دەگوترێ: عەبدوڵلای کوڕی سەلوول، چونکە دایکی ناوی سەلوولە، ئەو سەرچۆپی گۆبەنی هەلاتو بوختانە زلەکەی دەکێشاو، خۆش خۆش ئاگری ئاژاوەکەی بەدەستەچیلە خۆش دەکرد، کاتێ گەیشتینەوە مەدینەی نازدار واڕێکەوت من یەك مانگی ڕەبەق نەخۆش کەوتم ئیتر لەبەر ئازاری خۆم ئاگام لەو خەڵکە نەبوو، کەلەناو خۆیانا باسی ئەو بوختانە دەکەن، کەدەستەی هەلاتبازەکان هەڵیان بەستبوو بۆمن، وەکردبوویان بەبنێشتە خۆشەی خۆیان، سەرەڕای ئێشو ئازاری نەخۆشینەکەشم من لەکراسی خۆما پاك بووم، هیچ ئاگام لەم کەینو بەینە نەبوو، بەلاّم لەوە دوو دڵ بووم کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەو نەخۆشینەم دا، وەك نەخۆشینی جارانم نازی نەدەگرتمو ئەو میهرەبانییەی جارانی لەگەڵمانەما بوو.

جار جار دەهاتە بەردەرگای هۆدەکەمو سلاّوی لێ دەکردینو دەیفەرموو بەدایکم کە بۆچاودێری لەلام بوو: نەخۆشەکەتان چۆنە؟ ئیتر دەڕۆیشت، بەس لەمە دوو دڵ بووم، بەلاّم هەستم بەشتی خراپ نەدەکرد، هەتا ڕۆژێ پاش ئەوەی تۆزێ بووژامەوەو کەمێ چاکەوە بووم، لەگەڵ دایکی میسطەح دا، کە پوورزای باوکم بوو، چوومە دەرەوە بۆ مەناصیع، کە جێگەی سەراومان بوو، شەواو شەونەبوایە دەرنەدەچووین، ئەوکاتە هێشتا ئاودەستمان لەنزیك ماڵەکانمانەوە دروست نەکردبوو، لەسەر عادەتی عەرەبە پێشینەکان لەچۆڵەوانی سەراومان

دەکرد، چونکی ئەوسا ئاودەستی لای ماڵ ئازاری دەداین! بەبۆنی ناخۆش. جا کاتێ سەراوەکەمان تەواو کردو گەڕاینەوە بۆماڵەوە، دایکی میسطەح لەڕێگە قاچی لەعەباکەی گیراو پێی هەڵکەوتو نزایەکی خراپی لە میسطەحی کوڕی کردو گوتی: میسطەح سەرنگرێ بێو لەناوبچێ؟ ئەم دایکی میسطەحە ناوی سەلما بوو، کچی ئەبو ڕەهمی کوڕی موططەلیبی کوڕی عەبدولمەناف بوو، دایکی سەلمایش کچی صەخری کوڕی عامیر بوو، پووری هەقی ئەبوبەکری صەدیق بوو، میسطەحی کوڕی سەلمایش کوڕی ئوثاثەی کوڕی عەببادی کوڕی موططەلیب بوو. کەواتە: میسطەح پورزازای ئەبوبەکری صەدیقە. کەدایکی میسطەح ئەو دووعای شەڕەی لە میسطەحی کوڕی کرد، پێیم گوت: بۆنزای شەڕی لێ دەکەی؟ میسطەح لەبەشدارانی جەنگی بەدرەو پیاوی باشە، قسەی خراپ هەڵناگرێ؟ ئەویش گوتی: ئەی هینە! ئەی گێلە! تۆنازانی ئەوچی گوتووە؟ گوتم: بۆچی؟ چی گوتووە؟ جا بەدوورو درێژی باسی داستانی بوختانەکەی بۆگێڕامەوە ئیتر نەخۆشینەکەم لێ زیندوو بوەوە، بارم گرانتر بوو، کە چوومەوە بۆماڵەوە کاتێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) هاتەوە بۆلامو وەك جاران سڵاوی کردو فەرمووی: ئەوەکەتان چۆنە؟ واتە: نەخۆشەکەتان چۆنە؟ عەرزیم کرد: ڕێگەم دەدەی کە بڕۆمەوە بۆلای باوكو دایکم؟ عائیشە دەیفەرموو: مەبەستم ئەوەبوو کەئەم دەنگو باسە لەلای ئەوان روون بکەمەوەو بچمە بنجو بنەوانی، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) ڕێگەی ئەوەی پێم داو، منیش ڕۆیشتمەوە بۆلای باوكو دایکم. جا عەرزی دایکمم کرد: دایکە! ئەو قسانە چین، خەڵکی دەیانکەن؟ ئەویش گوتی: کچەکەم لەسەرەخۆبەو گوێی پێ مەدە، پەتی درۆ کورتە، زوو دەردەکەوێ، بەخودا بەدەگمەن ڕێ دەکەوێ کەژنێ شۆخو شەنگو جوانبێو لەلای مێردەکەی نازدارو خۆشەویست بێو هەوێباریش بێ، وەك حاڵی حازری ئێستای تۆ، بەڵام لەپلارو توانجو زمانو دەمی هەوێکانو کەسانی سەربەهەوێکانی، رزگاری ببێو قسەی زۆری بۆ هەڵنەبەستن. منیش گوتم:

سوبحانەڵلا لەم سەیرە! ئایا شتی وا ڕێی تێ دەچێ، کە ئەوخەڵکە ئەوەندە دەربەستی ڕەزای خوداو پێغەمبەر نەبن و قسەی وانارەوا بکەن؟!

ئیتر شەوکردی و من کردم، ئەو شەوە تا شەبەقی دا هەرگریام و فرمێسکم وشك نەبۆوەو خەونە چووە چاوم، وەهەتا سبەینێ سەرو مڕ هەردەگریام!

جا لەبەر ئەوەی کەلەوکاتەدا سرووش نەدەهات بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەم لایەنەوە نیگا درەنگ هات بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ). حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) عەلی کوڕی ئەبوتالیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کرد. وە بۆ جیابوونەوە لەهاوسەری خۆی کەمنم، ڕاوێژی پێیانکرد، ئوسامە (ڕەزای خوای لێ بێ) زۆر بەجوانی ئەوەی کەدەیزانی لەپاکی و پاکیزەیی و مەردایەتی خێزانەکەی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) بەیانی کرد، بەهۆی ئەو دۆستی و دڵسۆزییەی کەلەناو دەروون و ناخی دڵی خۆی دا هەستی پێ دەکرد بەرابەر بەخێزانەکانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودای گەورە لەهەموو هاوەڵەکان و لەسەر گشت هاوسەرەکانی بێ) جالەم ڕوانگەیەوە ئوسامەی کوڕی زەید فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! خێزانێ خێزانی تۆبێ خراپ نابێ و هەر قابیل بەخۆتەو، دڵت چەکەرە نەکاو، ئێمە بەش بەحاڵی خۆمان ئەوەی باش نەبێ لێمان نەدیوە.

بەڵام عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: قوربان! خۆ خودا دەرووی ژنهێنانی لێ نەبەستوویت و ژنی تریش زۆرن لەدنیادا، ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە نەبێ لەم قسەیە مەبەستم ئەوەبێ خوانەخواستە من دڵم لەئاستی ڕەوشتی بەرزی عائیشە گەردی گرتبێ، یا حەزم لەوەبێ کەتۆ دەستبەرداری ببیت، نەء، مەبەستم ئەوەیە کە تۆ بەهەرحاڵێ خۆت بەباشی دەزانی کە فەرامۆشیت بۆبێ، دەنا ئەگەر حەز دەکەی کە بەباشی لەحاڵەکە حاڵی ببی ئەوامنیش لەتۆ باشتری لێ نازانم، بۆ ئەمە ئەگەر پرسیار لەبەریرە بکەی کە کەنیزیەتی و لەگەڵی هەڵس و کەوت دەکا، ئەو قسەی ڕاستت بۆدەکا، دەڵێ: جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) بەریرەی بانگ کردو فەرمووی: ئەی بەریرە! هیچت لەعائیشە دیوە جێگەی گومان بێ؟ بەریرە گوتی

پێی: سوێندم بەوکەسەی تۆی بەڕاستی ناردووەو کردوویتی بەپێغەمبەری ڕاستو درووست هیچی وام لێی نەدیوە کە خوانەخواستە مایەی سووکی بێ بۆ پایەو شانو شوێنو جێگەی ئەو، تەنیا ئەوە نەبێ کە کەنیشکێکی منالکارە هێشتا هەڵسوکەوتی لەمنالٚ دەکا، چونکە جارو بار کە هەویر دەشێلێ بەسەر هەویرەکەوە خەوی لێ دەکەوێ، گەلێ جار ئاژەڵی ناومالٚ دێن هەویرەکەی دەخۆن!

جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە تۆزێ دڵی ئارام بوو، هەر ئەو ڕۆژە ڕۆیشت بۆ مزگەوتو تەشریفی ڕۆیشتە سەر دوانگەو سکاڵای حاڵی کرد لەدەست سەرۆکی ناپەکەکان کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوولەو فەرمووی: ئەی گەلی موسوڵمانینە! کێ هەقم دەداتێو یارمەتیم دەداو لەسەرم دەکاتەوە، ئەگەر بچم بەگژ ئەم پیاوە ناپیاوەدا، کە شەرمو شکۆ لەخودا ناکاو بەخوتو خۆڕایی، ئازار بەخۆمو خێزانم دەگەیەنێو بووە بە دڕکی مەمو زین لێمان، دەسا بەزاتی خودا من بەش بەحاڵی خۆم کە پێغەمبەری خودامو لەقسەی ڕاستو لەشایەتی هەق بەموو لانادەم، شایەتی دەدەم بۆ خێزانی خۆم ئەوەی باشەو چاکە نەبێ لەو خێزانی خۆمە نەمدیوە، هەروەها ئەوپیاوەیش کەبە خراپە ناوی دەبەن لەویش ئەوەی باش نەبێ نەمدیوەو لەگەڵ خۆمانەبێ سەری بەماڵی مندا نەکردووە.

جا سەعدی کوڕی موعاذی ئەنصاری، کە سەرۆکی خێڵی ئەوس بوو، مەردانە هەستاو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من یارمەتیت دەدەمو هەقت پێ دەدەمو لەسەر تۆ دەچم بەگژیدا، ئەگەر ئەو نامەردە گێرەشوێنە لەهۆزی ئەوسە کەخۆم سەرۆکیانم، ئەوا بەس تۆ فەرمان بفەرموو هەتا بدەم لەگەردنی، خۆ ئەگەر لەبرا خەزرەجییەکانمانە، ئەوە هەرچیمان لەبارەیەوە فەرمان پێ بفەرمووی جێ بەجێی دەکەین!

کەچی لەوێدا سەعدی کوڕی عوبادەی سەرۆکی خێڵی خەزرەج راستەوە بوو، بەرپەرچی سەعدی کوڕی موعاذی دایەوەو گوتی: درۆت کرد! بەزاتی خودا نایکوژیو ناتوانی بیکوژی! عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەوەبەر سەعد پیاوێکی

فرەباش بوو، بەڵام لەوکاتەدا دەمارو تەنگە گرتبووی، کۆنە قینێ کەلەنێوانی هۆزی ئەوس‌و لەنێوانی هۆزی خەزرەجدا هەبوو، هێشتا کاریگەری مابوو، جاروبار کێشەی لەنێوانی ئەم دوو هۆزەدا دروست دەکرد، گەرچی لەپیت‌و فەڕی ئیسلامەوە ئەوکێشە کۆنە تەواو کز بوو بوو.جا لەوێدا ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ڕاستەوە بوو، کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاذ بوو، گوتی بەسەعدی کوڕی عوبادە: تۆ درۆ دەکەی! سا بەگەورەیی خودا دەیکوژین، بەڕاستی تۆ لەناپاك‌و مونافیقانی، ئەوەتانێ بەئاشکرا لەسەر ئەوان دەکەیتەوەو پاسی ناپاکان دەکەی، چۆن موسوڵمان پشتی پێغەمبەر بەردەداو پشتی دژەکەی دەگرێ، تۆ چاو بکەرەوە ئەی موسوڵمانی خودا! دەزانی قسەکەت کوێ دەگرێتەوە؟!

جا لەوێدا هەردوو هۆزی ئەوس‌و خەزرەج شڵەژان‌و ووروژان‌و نزیك بوو کە بقەومێ‌و بچنەوە بەگژی یەکتر‌داو پەلاماری یەکتری بدەن، وەك سەردەمی نەزانی، حەزرەتیش هەر لەسەر مینبەرەکە ڕاوەستاو لەوێوە بەفەرمایشتی شیرین خەریك بوو هێدی دەکردنەوە، هەتا بەرە بەرە خاوی کردنەوەو بێ دەنگ‌و ئارام بوون‌و، خۆشی خامۆش‌و ئارام بوو!

عائیشە (سەد هەزار هەزار جار ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کە خودا کردوویەتی بەهۆی ئەم ئایەت‌و فەرمایشتە شیرین‌و بەسوودانە، کە بەزمانی پیرۆزی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە فەرمووی: ئەو ڕۆژەیش کەئەم هەرایە رووی دا، دیسانەوە سەرو مڕ گریام‌و خەونە چووە چاوم‌و، فرمێسکم وشك نەکردەوە، وەباوك‌و دایکم هەربەلامەوە بوون، وەمن دووشەوو ڕۆژێ هەردەگریام، تەنانەت باوك‌و دایکم لەدڵسۆزی خۆیان بۆمن، لەو باوەڕەدا بوون، کەمن لەبەر گریان سوێم دەبێتەوەو گریان جگەرم لەت لەت دەکا، جا لەوکاتەدا کەباوك‌و دایکم لەلام دانیشتبوون‌و من لەسەر ئەو حاڵە هەردەگریام، ژنێکی ئەنصاری مۆڵەتی خواست کەبێ بۆ لام، منیش ڕێگەم پێی دا، ئەویش هات دانیشت لەگەڵماو دەستی کرد بەگریان!

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەم کاتەدا کەلەسەر ئەم بارو دۆخە بووین، تەماشام کرد پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هاتەماڵەوە بۆلامان‌و سڵاوی کردو دانیشت، لەو ڕۆژەوە کەئەو قسانە دەربارەی من کرابوون، ئەوە یەکەم جار بوو کەلەلام دابنیشێ، ئەوا بوو بوو بەمانگێکی ڕەبەقیش کەلەم بارەیەوە سرووش‌و نیگای بۆ نەهاتبوو، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لەپاش دانیشتن شایەتمانی هێناو فەرمووی: لەپاش سوپاس‌و ستایشی خودا، ئەی عائیشە! دەربارەی تۆ هەندێ قسەی ناشایستەم بیستۆتەوە، ئەگەر تۆ پاك بی‌و لەوانە دووربی، ئەوا خودا بەزوویی پاکیی تۆ ئاشکرا دەکات، ئەگەر قەرەی گوناهێکیش کەوتبووی ئەوا ژێوان بەرەوە لێی‌و تەوبەی لێ بکەو داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە، دڵنیابە لەوە کە خودا بەسۆزو میهرەبانە لەگەڵ بەندەی خۆی دا، هەرکاتێ بەندەیێ گوناهێ بکاو تەوبەی لێ بکا، وەپێ لەگوناهی خۆی بنێ، ئیتر خودای گەورە تەوبەو پەشیمانی لێ گیرا دەکا.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمایشتەکەی خۆی تەواو کرد، فرمێسك لەچاوما قەتیس ماو وشك بوو، هەستم بەتنۆکێ ئەشك نەکرد، چونکی خەم‌و خەفەت‌و پەژارە کەزۆری هێنا، دەرگای فرمێسك دەبەستێ! ئەوکاتە دڵ لەباتی چاو تك تك خوێنی لێ دەتکێ!

جا بەباوکم گوت: باوە! تۆ لەباتی من وەڵامی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بدەرەوە بۆ ئەم قسەیە کەدەیفەرمووێ، باوکم فەرمووی: بەخودا نازانم وەڵامی چی بدەمەوە، جا گوتم بەدایکم: دەی دایکە! تۆ وەڵامی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) بدەرەوە، ئەویش فەرمووی: نازانم چی عەرزی حەزرەت بکەم.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من ئەوکاتە کەنیشکێ منالکار بووم‌و زۆریشم لەقورئان نەخوێندبوو، لەبەرئەوەو لەبەر پەرێشانی دڵی خۆم، ناوی حەزرەتی یەعقووبی باوکی حەزرەتی یوسفم لەبیر چووبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا خودای گەورە سەری خستم کە بەگوساخی‌و زمانپاراوی وەڵامی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) بدەمەوە.

بۆیەکا گوتم: بەخودا من باش باش دەزانم کەئێوە ئەوەندە ئەم قسەو باسە چووە بەگوێچکەتانا، لەدڵتانا چەسپیوەو باوەڕتان پێ کردووە، جائەگەر من پێشتان بڵێم: من پاكو بەریو بێ ئاگاو بێ گەردم لەم بوختانە، ئێوە باوەڕم پێ ناکەن، هەرچەند خودا بەوبانی سەرەوە بۆخۆی دەزانێو باش باش ئاگادارەکە من لەگوڵ پاکترمو لەمناڵی ساوابێتاوانترم، بەلام ئەگەر بەدرۆپێبنیم لەکردنی کارێ کە نەمکردووە، ئەوا ئێوە باوەڕم پێ دەکەن، بەلام سەبووریم بەوەدێ کەخودا بۆخۆی ئاگادارەو دەزانێ کەمن وەك دەنکی تەرزە پاکمو بێ گەردم، سوێندم بەخودای بانی سەر لەم هەلۆێستە ناسکەدا، کە جەنگەی خەمو خەفەتو پەژارەیەو، خورپەم لی کەوتووە، لەتاو هێرشی بوختانو، شالاوی ناهەق، سوێندم بەخودا لەئاوا هەلۆێستێکا، باشترین داستانێ کە بیکەم بەسەر مەشقو کە بشێو دەست بدا بۆ سەرمەشق بۆمنو، بۆبەیانی حالی منو حالی ئێوە، فەرمایشتەکەی باوکی حەزرەتی یوسفە، کە کوڕەکانی پیلانیان لەیوسفی برایان کردو، بەدرۆ پاکانەیان بۆ باوکیان کردو گوتیان: کوڕەکەت گورگ خواردویەتیو سەرەڕای ئەوەیش ئەوان تانەی ئەوەیان لەباوکیان دەدا، کە گوایە ئێمە قسەی ڕاستت بۆدەکەینو تۆلەبەر ئەوەی کەدڵت پیسە لەئێمە بڕوامان پێ ناکەی، ئەویش لەم بارودۆخە ئالۆزەدا، کە لەدوولاوە جەرگی داخ کرابوو، وەك ئەم حالەی ئێستای من، کاری خۆی سپارد بەخوداو فەرمووی: {فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ} ( سورة يوسف-١٢/١٨).

واتە: بەشو باری من سەبرو ئارامێکی جوانە، لەبەر باری خودای گەورەدا، هەر خودایە داوای یارمەتی لێ دەکرێو دەتوانێ کەسەبووری دڵم بداو توانای پێ بدا بۆ هەلگرتنی ئەم بارە قورسەی کەئێوە دەیڵێن.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیتر لەو شوێنە هەستامو ڕۆیشتمەوە بۆ سەر نوێنەکەی خۆمو لەسەری پاڵکەوتمەوە!

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من هەرئەوکاتە، سوێندم بەخودا، زۆرباش دەمزانی من پاکم‌و، دەمزانی کەخودای گەورە پاکی‌و پاکیزەیی من ڕادەگەیەنێ، زوو یا درەنگ ئەو تۆمەتە ناهەقە بەدرۆ دەخاتەوە، من ئەمەم بەباشی دەزانی، بەڵام بەخودا زەینم بۆئەوە نەدەچوو کە خودا ئایەتی قورئان لەشانی مندا بنێرێتە خوارەوەو ئەو ئایەتانە، لەناو قورئانی پیرزدا بمێنن‌و هەتا هەتایە ئەو ئایەتانە دەور بکرێنەوە لەهەموو لایێ!

بەڵام هیوام وابوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەخەودا خەوێ ببینێ‌و حاڵی بکرێ کەمن بەدوورم لەشتی وا ناشایستە. فەرمووی: جا سوێندم بەخودا ئیتر هەر لەوێدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەشوێنی خۆی نەبزووت، وەکەسیش لەدانیشتوانی ناو کۆڕەکە لەماڵ دەرنەچوو، هەتا (نیگا=سرووش=وەحی) هاتەخوارەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەك هەموو جارێ، حاڵەت‌و بارودۆخی هاتنی سرووش دایگرت، وەك هەمووجارێ کە سرووشی بۆدەهات، ئەمجارەیش ئاوا قورسی بارودۆخی هاتنی سرووش دایگرت، وەك تایەکی گران‌و جەستەی پیرۆزی نیشتە سەرئارەق، تەنانەت دڵۆپی ئارەق دانە دانە وەك گۆی مرواری بەروخساری پیرۆزو جەستەی نازاداریدا، بەرودوا دڵۆپ دڵۆپ دەهاتە خوارێ، ئەوەیش لەبەر زەبرو قورسی وەحی‌و سرووشەکە، لەگەڵ ئەوەیش دا کەئێمە ئەو حەلە لەهەرەتی سەرمای زستان دا بووین‌و ڕۆژەکەشی ڕۆژێکی تۆفی تووشی ساردی سەخت بوو.

لەگێڕانەوەیەکی ئیبنوئیسحاق دا: عائیشە فەرمووی: ئالەم بارودۆخە ناسکەدا من بەش بەحاڵی خۆم هیچ باکم نەبوو، چونکە من لەکراسی خۆما پاك‌و بێتاوان بووم، هەق دەمزانی کەخودا زۆرو ناهەقیم لێ ناکاو، هاتنی وەحی بۆ رووسووری من دەبێ‌و لەدژم نابێ، بەڵام باوك‌و دایکم، هەتا سرووشەکە هات‌و پێغەمبەر فەرامۆشی بۆهات‌و موژدەی پاکی‌و رووسووری‌و داوێنپاکی منی ڕاگەیاند، ئالەو ماوەیەدا، باوك‌و دایکم لەترسی ئەوە مەبادا خوانەخواستە، ئەوەی کە

بوختانچییەکان دەیڵێن راست دەرچێ، لەوماوەیەدا وەختە بوو دڵیان بتەقێو گیانیان دەرچێ؟

جا کاتێ پێغەمبەر (دروودو صەلاتو سەلامو ڕەحمەتو سۆزو میهرەبانی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێو سەرو ماڵو ڕۆحو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکارانی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرامۆشی بۆهاتو سرووشەکەی وەرگرتو هاتەوە سەربارو دۆخی ئاسایی خۆی، لەپێش هەموو شتێکا، لەخۆشییانا پێکەنیو فەرمووی: ئەی عائیشە! موژدەبێ لێت، ئەوا خودای گەورەو سەروەر دەری خست کە تۆپاكو داوێنپاكو دووری لەوتاوانە.

جا دایکم فەرمووی: ئەی عائیشە! هەڵسە بچۆ بۆلای حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) لەخزمەتیا دانیشە، لەخۆشی ئەم موژدە خۆشەیە، منیش گوتم: بەخودا ناچم بۆلایو سوپاسی خودا نەبێ سوپاسی کەس ناکەم، کە بەمیهرەبانیو گەورەیی خۆی، ئالای رووسووریو سەربەرزیی بۆمن هەڵکرد. ئیتر خودای گەورەو سەروەر ئەم دە ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ....... هەتا ....... وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ} (سورة النـور-٢٤/١١-٢٠).

واتە: ئەوکەسانەی کەئەو هەلاتە هەرە گەورەیەیان هەڵبەست تاقمەیێ بوون لەخۆتان، بەڵام ئیشی خودا پڕە لەدانایيو نهێنی خودایی، کەواتە بەهەڵەدامەچنو گومان مەبەن کەئەم درۆو بوختانە شەڕ بوو بۆئێوەو زیان لەقەڵای قایمی ئیسلام دەدا، بەڵکوو خودا کردی بەمایەی خێرو خۆشی بۆئێوەو بۆ هەموو گەلی ئیسلام، لە لایەکەوە بوو بە داپۆشەرو پەردەو کەففارەتی گوناەو، لەلایەکەوە بوو بەهۆی هاتنی هەژدەئایەتی پیرۆزی قورئان، کەشتی وا خێرو نرخی قەت تەواو نابێ، ئەو هەلاتبازانەیش هەرکەسەیان بەپێی بەشداریی خۆیان، لەدروستکردنی ئەم تاوانە

دەستهەڵبەستەدا، سزای ڕەوای تاوانی خۆیان وەردەگرن، بەتایبەتی عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول کە کێشی تاوانەکەی هاویشتە سەرشانی خۆی!

ئەی موسوڵمانینە! دەبوو هەرلەسەرەتاوە کەئەم هەلاتە ناهەموارەتان بیست، گورج پیاوو ژنتان بتانگوتبایە: درۆیێ کە لەکێشا نەبێ، ئەقڵ نایگرێ، ئەم بوختانە گەورەیە، کەبە حەرەمی پێغەمبەری خودا کراوە، ئێمە کەموسوڵمانین باوەڕمان وایە کە خودا بێڕێزی ناهێنێ بەشانی موحەممەدداو، ئابڕووو نامووسی خۆیو خانەوادەیو کەسوکاری لەهەموو گەردو لکەو نەنگێ دەپارێزێ.

کەواتە: ئەمە درۆیەکی ئاشکرایە، ئەو درۆ هەڵبەستانە کواشایەتییان، کوا بەڵگەو نیشانیان، ئەگە ڕاست دەکەنو درۆناکەنو درۆزن نین، با چوار شایەتیان لەسەرداواکەیان ڕاست بکردایەتەوە، یا ڕاست بکەنەوە، جا مادەم شایەتیان نییە، دیارە مەبەستیان گێرەشێوێنییەو، مەبەستیان رووخاندنی قەڵای قایمی ئیسلامە، وەخوا بۆخۆی باش دەزانێ کەئەوانە درۆدەکەنو ئەوانە بەدرۆزن لەقەڵەم دراون، لەفەزڵو سایەی خواوە بوو، کە بەسۆزو ڕەحمەتی بێ پایانی خۆی لەجیهانو ئەو جیهانا ئێوەی پاراست، دەنا لەتۆڵەی ئەم وتی وتییەدا، کەسەرتان تێ کرد بوو، دەمتان تێژەندبوو، سزایەکی گەلێ گەورە چزەی لێ هەڵدەستاندن! بەتایبەتی لەگەرمەی ئەوکاتەدا کەئەم درۆیەتان کردبوو بەبنێشتە خۆشەی بن ددانتان، واتان دەزانی کەئەمە شتێکی سووكو ئاسانو ئاساییە، گەستنی نامووسی موسوڵمانانو زامارکردنی هەستو دڵو دەروونیانو نامووسیان هەروا بەدەم خۆشە، بەلام شتی وا لەیاسای خودادا بە تاوانێکی گەلێ گەورە دادەنرێ، دەبوو هەرلەیەکمجارەوە باوەڕتان پێ نەکردایەو بەدرۆتان بخستبایەتەوەو بتانگوتبایە: خوانەکا کە ئێمە قسەی وا ناڕەوا بەسەرزمانمانا بێ، سوبحانەڵڵا لەم درۆعەنتیکەیە، دەڵێی شاخو گوێی هەیە، ئەوەندە هەلاتێکی زلو گەورەیە، بەڕاستی درۆی شاخدار هەروا دەبێ، بوختانی رووتی بێ بەڵگەو نیشانو شایەت هەروا دەبێ!

خودا لەڕووی سۆزو میهرەبانیو جەرگسۆزییەوە تەمێو ئامۆژتان دەکا: کە جارێکی تر هەڵەی وانەکەنەوەو، هەتا هەتایەو بڕای بڕای نەبن بەکۆمەکی، بۆ بەکرێگیراوانی شەیتان، بۆ بڵاو کردنەوەی تۆوی ئاژاوە نانەوە بەناو گەلی ئیسلاما، ئەگەر ئێوە بەڕاستی خاوەنی ئیمانو باوەڕی ساخن.

خودا هەمیشە وەك مامۆستایەکی میهرەبانی دڵسۆز گوێ لەدەورو وانەو دەرستان دەگرێو، بەنەزاکەت هەڵەتان بۆڕاست دەکاتەوە، یاساو نیشانەو ئایەتو حوکمی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، چونکە خودا دانایە بەحاڵو زانایە لەکاری خۆیدا، دەزانێ شانی بەندەی خۆی چی هەڵدەگرێ.

کەسانێ کە حەزدەکەن قاوی ناشیرین دابکەوێو ئابڕووی موسوڵمانان بەخوتو خۆڕایی لەکەدار بکەنو بەدرۆو بەڕاست شەنو کەوی باسو خواسی ناشیرین بکەن، لەهەر دوو جیهانا سزای خۆیان وەردەگرن، خودا خۆی هەمووشتێ بەباشی دەزانێ، بەڵام ئێوە گەلێ شت هەیە لەخۆتانەوە نایزانن، مەگەر کەسێ فێرتانی بکا، قسەی پوختو پاڵفتەی فەرمایشت ئەمەیە: لەسایەی فەزڵو ڕەحمەتی خوداوەو، لەبەر خاتری بوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەناوتانا، لەبەر ئەمانە ئەمجارە لەم قووڕتو سەخڵەتییە رزگارتان بوو، وەخودا لەوانە خۆش بوو کەلەبەر ساویلکەییو کەمتەرخەمی، ئەم دەنگوباسە پیسەیان دەماو دەم دەقۆستەوە، دەنا کەستان لەسزای سەختی ئەم تاوانە قوتارتان نەدەبوو.

کاتێ خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە بۆ دەربڕینی پاکیو بێتاوانیی من، باوکم ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا، چونکە مەستەح ئەوەی بەعائیشەی کچم گوتووە، ئیتر نابێ کە هیچ خەرجو مەسرەفێکی بۆبکەم، بۆیە وایگوت چونکە لەوەبەر مووچانەی بەمەستەح دەدا، لەبەرئەوە، کەهەم خزمی بوو، هەم هەژار بوو، تاخودای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە: {وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ

اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} (سورة النور-٢٤/٢٢)

واتە: با خاوەنی پایەی ئایینیو خاوەن مایەی جیهانی ئێوە، بەهۆی ئەم رووداوە ناخۆشەوە، لەخێرکردنو پیاوەتی کردن، دڵیان سارد نەبێتەوە، سوێند خواردنو شتی وانەکەن بەمەهانە بۆئەوەی مووچەو بەراتی خزمو خوێشو هەژارانو ئەوانەی لەمەککەوە لەبەر ڕەزای خودا، کۆچیان کردووە بۆ مەدینە، باپیاو باشانی ئێوە بەهۆی ئەم جۆرە مەهانەیەوە مووچەو بەراتی ئەوکەسانە نەبڕن کەناو هێنران، لەناو خۆتانا بەحەوصەڵەو نەرمونیان بن، چاوپۆشیتان هەبێ، لێبووردنتان هەبێ، نابێ لەسەر هەموو شتێ دەست بدەنە شیرو تیر لەیەکتری ساوین، گەلێ شت هەیە لەسەرەوە تاڵە، لەژێرەوە شیرینە، ئێوەیێ کەئەوەندە رق ئەستووربن، نەتانەوێ لەکەسێ خۆش ببن، کەهەڵەیەکتان لەگەڵ دەکا، ئیتر بەچ روویەکەوە لەخودا داوادەکەن کە لە تاوانەکانتان خۆش ببێ، دەی باش باش بزانن کەخودا هەم تاوانپۆشەو هەم بەڕەحمو میهرەبانە، کەواتە: ئێوەیش ڕەفتارتان ڕەفتاری ڕەحمان بێ، دووربن لە هەنگاوەکانی شەیتان، کە پەخشەوەکردنی رقو کینەو دەغەزو دوژمنایەتییە لەناوتان دا.

جا ئەبوبەکر (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەخۆیو لەمناڵیو لەباوکیو لەهاوسەری) فەرمووی: بەڵێ، بەخودا حەزدەکەم کەخودا لە گوناهم خۆش بێ. ئیتر ئەو خەرجیو مەسرەفەی دەیکرد بۆ میستەح گەڕاندیەوە بۆیو فەرمووی: بەخودا ئیتر ئەم خەرجیو مەسرەفەی هەتا سەر، پێ دەدەمو قەت نایبڕم!

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ مەسەلەکەی من، پرسیاری لەزەینەبی کچی جەحشیش کرد، فەرمووی: ئەی زەینەب! چی لێ دەزانیت؟ یا چیت دیوە لە عائیشە؟ زەینەب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا! من بەگوێی خۆم هیچی خراپم لەبارەی ئەم ئافرەتەوە

نەبیستووە، وە بەچاوی خۆم هیچی ناشیرینم لــێ نــەدیوە، ئـیتر لەخۆمـەوە درۆی چی بکەم، کەواتە گوێو چاوی خۆم لەدرۆو بوختانو ئاگری دۆزەخ دەپارێزم!

من خێرو چاکە نـەبێ، هیچی تـرم لەعائیشە نـەدیوە!عائیشە (دروودی خـودا لەمێردی بێو ڕەزاو ڕەحمەتو سەڵاوی خـودا لـەخۆیو بـاوکیو دایکـیو خوشـکیو برایو باپیری بێ) فەرمووی: لەناو هاوسـەرەکانی پێغەمبـەردا (دروودی خوای لەسەربێ) هـەر زەینـەب هەبوو کەهاوتای من بکـاو وەك مـن لـەلای پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) نـازو خاتری هەبێو بەجوانیی خۆی لەلای پێغەمبەر بنازێو، شان لەشانی من بدا، بەڵام خودا هەقە، بەهۆی دینداریی‌و لەخودا ترسیی خۆیەوە خوداپاراستیو باشی گوتو خراپـی نـەگوتو قسـەی هـەقی کـرد، بـەڵام حەمنـەی خوشـکی وەك ئـاگری بنکـا، لەخۆیەوە لەسەر زەینەبی خوشکی، شەڕی بەمن دەگێڕاو، ئاگری ئاژاوەکـەی خـۆش دەکرد، تا لەسەر حیسابی من پایەو پلەی زەینەبی خوشـکی بەرزبکاتـەوە، ئـەوەبوو ئـەویش (واتــە: حەمنــە) تیاچـوو، لەگـەڵ ئەوانــەدا کەتیاچـوون، وەداری حــەددی بوختانیــان لــێ درا لەگـەڵ چـەند کەسـێکی تـردا. (تـاج/٤ ژ/٧ ژ/٤٠٠٨ — سـوورەتی نوور، چاپی چوارەم).

٢١٥٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً كَانَ يُتَّهَمُ بِأُمِّ وَلَدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لِعَلِـيٍّ « اذْهَـبْ فَاضْـرِبْ عُنُقَـهُ ». فَأَتَاهُ عَلِيٌّ فَإِذَا هُوَ فِي رَكِيٍّ يَتَبَرَّدُ فِيهَا فَقَالَ لَهُ عَلِيٌّ اخْرُجْ. فَنَاوَلَهُ يَدَهُ فَأَخْرَجَهُ فَـإِذَا هُـوَ مَجْبُوبٌ لَيْسَ لَهُ ذَكَرٌ فَكَفَّ عَلِيٌّ عَنْهُ ثُمَّ أَتَـى النَّبِـيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَقَـالَ يَـا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ لَمَجْبُوبٌ مَا لَهُ ذَكَرٌ. (الحـديث ٦٩٥٤ تـرقيم الشـيخ خليـل مـأمون شـيحا لصحيح مسـلم بشـرح الإمـام النـووي = ٦٩٧٨ تـرقيم فـتح الملهم شـرح صحيح الإمـام مسلم).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەبوو قیبطی بوو، لەگـەڵ مارییەی قیبطـی دا، کـە دایکـی ئیبراهیمـی کوڕی پێغەمبـەر بـوو، لەبەرئـەوەی کـە هەردووکیان خەڵکی یەك وڵات بوون جاروبار قسەیان بەیەکـەوە دەکـرد، ئەمـەبوو،

بەهۆی ئەوە کە گومانی خراپییان پێ ببرێ، کە گوایە بەدزییەوە دەستیان تێکەڵکردبێ، کاتێ ئەم باسو خواسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی بەئیمامی عەلی: بچۆ بدە لەگەردنی ئەو کابرایە. عەلی چوو کە بیکوژێ، تەماشایکرد، کە کابرا والەناو بیرێکی ئاودارادا، خەریکە خۆی فێنك دەکاتەوە، عەلی فەرمووی پێی: وەرە دەرەوە، ئەویش دەستی عەلی گرتو عەلی لەبیرەکە بەڕووتو قووتی هەڵیکێشایە دەرەوە تەماشای کرد چووکی لەبنا خشتکراوەو ئەندامی نێریی نەماوەو کێری نییە، لەبەرئەوە عەلی وازی لێهێناو نەیکوشتو لەپاشا هاتەوە بۆلای پێغەمبەرو پێی فەرموو: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! کابراکە لەبنا چووکی بڕاوەو خشت کراوە، بێ کێرە لەبەرئەوە نەمکوشت، چونکە دەرکەوت کەئەم قاوەیەی داکەوتووە بوختیانەو درۆی پەتییە!

**١٧١٢- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ}**

**(٧٤٣٩-٧٤٧٩) باب: في قوله تعالى: {وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ}**

٢١٥٥- عَنْ جَابِرٍ أن جارية لعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيّ بْنُ سَلُولَ يقال لها مسيكة وأخرى يقال لها أميمة فكان يكرهُهُمَا على الزنا، فشكتا ذلك الى النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فأنزل الله تعالى: (وَلاَ تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا) إلى قوله: (غَفُورٌ رَحِيمٌ). (الحديث ٧٤٦٨ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح النووي = ٧٥٠٤ فم. = ف.م. = حسب ترقيم فتح الملهم لشرح صحيح مسلم).

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوادا لەخۆیو باوکی بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، کەناسراوە بە عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول، چونکە دایکی ناوی سەلوول بوو، ئەم نارمەردە دوو کەنیزەکی هەبوو، ناویان موسەیکەو ئومەیمە بوو، دەچوو بەزۆر دەیدان بەکرێ بۆ ئیشی خراپو بەپارە داوێنپیسی پێیان دەکرد، جا ئەم دوو کەنیزە ستەمبارانە چوون لەلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سکاڵای حاڵیان کرد، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە دووژنی

موسوڵمانین‌و ئەم بەدڕەوشتەیش بۆ پووڵ‌و پارە بەزۆری زۆرداری زەلاممان دەکاتە پاڵ!

جا بەم بۆنەوە ئەم ئایەتە دابەزی:

{وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ } (سورة النـور-٢٤/٣٣)

واتە: شەرم‌و شکۆ لەخودا بکەن‌و ڕێزی بەندەو دروستکراوانی خودای گەورە بگرن‌و، بۆ ڕێتوپیت‌و پڕووپیتی جیهانی بێ بەقاو بۆ ڕابواردنی چەند ڕۆژێ، خودا لەخۆتان مەڕەنجێنن‌و ژیانی نەبراوەی بەهەشت لەکیس خۆتان مەدەن، کەواتە: ئەو کەنیزانەتان کە حەزیان لەمەردی‌و ڕووسووری‌و سەربەرزییەو، بەدەمی خۆیان هاواردەکەن: یامردن بەمەردی، یا ژیان بەسەربەرزی!

ئەم جۆرە ئافرەتە ژێر دەستانە، کە حاڵیان وایە، زیاتر شایانی ئەوەن کە ناهەقیان لێ نەکرێ‌و قەدرو ڕێزی ئەو مەردایەتییەیان ڕا بگیرێ، بەزۆری زۆرداریی ئیشی خراپیان پێ مەکەن‌و مەیانکەن بەماشەو مەقاش‌و پەیژە بۆ وەدەستهێنانی ئارەزووبازیی خۆتان، وەکەسێ لەخودا نەترسێ‌و بەزۆری زۆرداری ئیشی خراپ‌و داوێنپیسی بەژنی مەردبکا، چ کەنزیبێ، چ ژنی سەربەستی ئازادبێ، ئەوە خودا پاشایەکی بەدادو هەقانییە، ئەرکی نەتوانراو نادا بەسەرکەسا، داوای کارێ لەکەسێ ناکا کەلەوزەیدا نەبێ، لەبەرئەوە چاوپۆشی لەوجۆرە ژنە ستەمبارانە دەکاو، بەڕەحمەت‌و میهرەبانی خۆشی هەقی ئەم داماوییەیشی بۆدەکاتەوە!. (تاج/٤ ز/٧ ژ/٤٠١١ چ/٤).

## سوورەتی فورقان = سُورَةُ الفُرْقَان

### ١٧١٣- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ}

### (٣١٧-٣١٨) باب: في قوله تعالى: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ}

٢١٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ كَانُوا قَدْ قَتَلُوا وَأَكْثَرُوا وَزَنَوْا وَأَكْثَرُوا ، ثُمَّ أَتَوْا مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالُوا: إِنَّ الَّذِي تَقُولُ

وَتَدْعُو إِلَيْهِ لَحسَنٌ وَلَوْ تُخْبِرُنَا أَنَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَّارَةً . فَنَزَلَتْ: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا} وَنَزَلَ ( قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ ) الآيَةَ. (الحديث ٣١٨ = ٣٣٤ فم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري المجلد الرابع الرقم: ١٦٨٨ = ٤٨١٠ فتح الباري شرح صحيح البخاري).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ لەبتپەرستەکان، خەڵکێکی زۆریان بەناهەق کوشتبوو، وەزیناو داوێنپیسی زۆریان کردبوو، جا بەپێی خۆیان هاتنە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتیان: ئەی موحەممەد! ئەمەی تۆ دەیلێیت و خەڵك بانگ دەکەی بۆسەری، شتێکی زۆر جوان و شیرینەو لێی جوانترو باشتر نییە، بەڵام خۆت دەزانی کە ئێمە حاڵەکەمان ئاوایە: تاوانێکی زۆرمان تێ گوشیوە، پیاوی زۆرمان کوشتووە، داوێنپیسیمانکردووە، جا ئایا ئەم کردەوە خراپانەی کە ئێمە کردومانن، کەفارەت و برێتی و پاکبوونەوەیان بۆهەیە، ئەگەر ئێمە موسڵمان بووین یانا؟!

جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا} (سورة الفرقان- ٢٥/٦٨).

واتە: بەندە باشەکانی خودای گەورەو میهرەبان، ڕەوشێکی بەرزی تریشیان هەیە، کەئەوەیە، بەس خودای گەورەو مەزن دەپەرستن و داوای هەمووشتێ هەر لەخودا دەکەن، وەکەسێ کەخودا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردبێ نایکوژن، مەگەر لەبەرهۆیەکی ڕەوای هەق، بەپێی یاسانامەی خودا، وەلەهەمان کاتا داوێنپیسی و شەڕواڵپیسی ناکەن و داوێنپاك و روو سوورن).

کاتێ کەئەم ئایەتە هات هاوبەشپەیداکەر (موشریك)ەکانی مەککە گوتیان: ئێمە ئەم تاوانانەمان هەموو کردووە، کەواتە ئیسلامبوونمان چی سودێکی هەیە؟

جا خودا ئەم ئایەتەی نارد: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا} (سورة الزمر-٣٩/٥٣).

واتە: ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بفەرموو بەبەندەکانی من لەسەر زمانی من: ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەوکەسانەی کەستەمو تاوانێکی زۆرتان کردووەو، باری دوارۆژی خۆتان قورسو گرانو دیشوار کردووە، نائومێد مەبن لەڕەحمەتی خودا، ئەگەر ئێوە بە ڕاستی ڕوو لەخوداکەنو خۆتان فڕێ بدەنە بەرقاپی ئەو پادشا گەورەو میهرەبانە، دڵنیابن، کە لێتان خۆش دەبێ، چونکە خودا ئەگەر ئارەزوو بکا لەهەموو گوناهێ خۆش دەبێ، کەسێ نییە کەباڵا دەستی بێو ڕێگەی ئەوەی لێ بگرێ. (تاج/٤ ز/٢٢ ژ/٤٠٧١).

## سوورەتی ألم تنزیل السجده = سُورَةُ ألم تنزيل السجدة

### ١٧١٤- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ} (٧٠٦١-٧٠٩٢)

٢١٥٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « قَالَ اللَّهُ أَعْدَدْتُ لِعِبَادِى الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنَ رَأَتْ ، وَلاَ أُذُنَ سَمِعَتْ ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ ذُخْراً، بَلْهَ مَا أَطْلَعَكُمُ اللهُ عليه. ثُمَّ قَرَأَ: ( فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِىَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ ) . (الحديث ٧٠٦٥ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧٠٩٠ حسب ترقيم فتح الملهم لشرح صحيح مسلم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم: ١٦٧٩ = ٤٧٧٩، ٤٧٨٠، ٣٢٤٤، ٧٤٩٨، تحفة الأشراف/١٢٥٠٩).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەفەرموودەیەکی پیرۆزین دا، دەفەرموێ: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەو بەهرەو نازو نیعمەتو خۆشیو شادییە، کە خۆم ئامادەم کردووەو، هەڵم گرتووە بەتایبەتی بۆ بەندە باشو خاسەکانی خۆم، ئەوەندە باشو نایابن، نەباچاو بینراوانو نەبە گوێ بیسراونو، نەبەدڵی کەس دا هاتوونو نەبەخەیاڵی دا

ڕابووردوون، سەرەڕای ئەم گشتە نازو بەهرەو خۆشیو موژدانەی کە خۆتان ئاگاداریانن و لەقورئانو فەرموودەو سوننەتدا باسکراون بۆتان.

ئەنجا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ پشتیوانی ئەم فەرمایشتەی خودا: {فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ} (سورة السجدة-٣٢/١٧).

واتە: کەس پەی نابات بەو هەمکە خێرو خۆشییە، کە چاوو دڵی خاوەنەکانیان ڕۆشن دەکەنەوە، کە بۆچاکانو خواناسان ئامادەکراون، لەپاداشتی کردەوەی باشی خۆیان دا. (تاج/٤ ز/١٥ ژ/٤٠٣٣).

**١٧١٥- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ}** (٦٩٩٧-٧٠٠١)

**باب: في قوله تعالى: {وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ}**

٢١٥٨- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رضي الله عنه) فِى قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الأَكْبَرِ) قَالَ: مَصَائِبُ الدُّنْيَا، وَالرُّومُ، وَالْبَطْشَةُ، أَوِ الدُّخَانُ. شُعْبَةُ الشَّاكُّ فِى الْبَطْشَةِ أَوِ الدُّخَانِ. (الحديث ٧٠٠١ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٠٢٦ حسب ترقيم فتح الملهم شرح صحيح مسلم).

ئوبەیی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) سەبارەت بەفەرمایشتی خودای گەورە: {وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ} (السجدة-٣٢/٢١).

واتە: ئێمە لەم ژیانەدا بەم بێباوەڕانە جۆرەها ئێشو ئازاریان پێ دەچێژین، وەك قاتوقڕیو تاڵو سوێریو نەخۆشیو هەژاریو شتی زۆری لەم بابەتانە کەئەمانە لەچاو سزای گەورەی ڕۆژی دوا ڕۆژدا سووکەڵەو ئاسانن، بەهیوای ئەوە کە ئەمانە لەبیرو باوەڕی نابارو کردەوەی ناهەمواری خۆیان بگەڕێنەوەو دەسبەرداربنن.

ئوبەیی سەبارەت بەم ئایەتە فەرمووی: (العّذَابُ الأدْنَى) کەلەم ئایەتەدا باسکراوە، کە بەواتا سزای سووکەڵەو ئاسانە، بریتییە لەناخۆشیو قورتو وەیو ناکامیی

جیهان، لەگەڵ ئایەتی ڕۆمو دەست لێ وەشاندنەکەی ڕۆژی غەزای بەردرا، کە قورئان پێی دەڵێ: (البَطْشَةُ الكُبْرى) لەگەڵ داستانەکەی ئایەتی دوخان دا، کە دەفەرموێ: {فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ} (سورة الدخان/ ١٠).

وشـــــەی قورئـــــانی هـــــەموو ســـــەرگوڵن
وێنـــــەي شـــــاگوڵی بـــــەرزي سەرچـــــڵن!
هـــــەر وشـــــەیەکی بەحرێکـــــە بۆخـــــۆی
یـــــا گوڵزارێکـــــە، زۆر بـــــەڕەنگ و بـــــۆي
وشـــــەی پڕواتـــــا، ناســـــک و نـــــازدار
بوونەکـــــە ڕەســـــتەی ڕِســـــتەي خـــــۆش لـــــەزار
وەک ســـــەجدە و ئـــــەحزاب، ســـــەبەءو فـــــاطـــــیر
صـــــافات و صـــــاد و، زومـــــەرو غـــــافیر
لەگوێـــــدا خـــــاوەن ئـــــاوازەي خۆشـــــن
دڵبـــــزوێن و، هەســـــت خرۆشـــــن
هـــــۆش دەلاوێـــــنن، چـــــاودەکەن ڕۆشـــــن
بـــــۆ هـــــەر پێـــــنج هەســـــتە، میســـــکي بۆنخۆشـــــن

## سوورەتی ئەحزاب = سورة الأحزاب

### ١٧١٦- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ} (٧٤٣٩ – ٧٤٧٩)

### باب: في قوله تعالى: {إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ}

٢١٥٩- عَنْ عَائِشَةَ رضى الله عنها: في قوله تعالى: ( إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ الأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ القُلُوبُ الحَنَاجِرَ) قَالَتْ: كَانَ ذَاكَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ . (الحديث ٧٤٥٢ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧٤٨٨ فم. = ف.م. = فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. بخاري. مغازي: ٤١٠٣).

عائیشە هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەپێغەمبەرو ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی لەبارەی ئایەتی: {إِذْ جَاؤُوكُم

مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا} (سورة الأحزاب-٣٣/١٠).

واتـه: يـادى ئـەو رۆژە سـەختو ديـژوارە بكەنـەوە، كەلەشـكرى دوژمـن، لەبێباوەڕانى مەككەو لەجوولەكەكانى مەدينـەو لـەخێڵو هۆزەكـانى دەوروبـەرتان، لەهەر چوارلاوە، لەخۆر هەڵاتو لەخۆر ئاواوە، لەسەرو خـوارەوە، گەلەكۆمـەكيان لـێ كـردنو هێرشـيان هێنـا بۆسـەرتانو، لـەناو شـارى مەدينـەدا ئابلۆقـەيان دانو گەمارۆيەكى قايميان دان، تەنانەت هەلۆێست وا ئالۆز بوو، لەسامو بيمى ئـەو رۆژە چاوان ئەبلەق دەبوونو، دڵان دەلەرزينو گيـان گـەيبووە گـەروو و سـەر لێـو، يـادى ئـەوە بكەنـەوە كـە ئالـەم كـاتو سـاتە درێـژوارەدا، ئـا لـەم كـاتو سـاتى تەنگانـەو سەخڵەتييەدا، كە چەندين گومانو بۆچوونى جياجيا لەلاتان دروست بوو، كەسـانێ دەيـانگوت: قەڵاچـۆمان دەكـەنو كـەسمان لـێ دەرناچـێ، كەسـانێ دەيـانگوت: ئەمـە ئـەزموونو تـاقى كردنـەوەى خودايـە، كەسـانێ دەيـانگوت سـەركەوتن بـۆ سـوپاى ئيسلامە، يادى ئەوە بكەنـەوە كـە ئالـەم كاتـە ناسكەدا، خـودا هـات بەهاوارتانـەوەو ئێوەى سەرخستو لەشكرى دوژمنى تێك شكاندو نازو بەهرەو نيعمەتى بـێ پايـانى خۆى ڕژاند بەسەرتانا.

عائيشـە (ڕەزاى خـواى لـێ بـێ) فـەرمووى: ئـەم داسـتانە باسـى داسـتانى غـەزاى رۆژى خەندەقە.

## سوورەتى ياسين = سورة يس

### ١٧١٧- لەبارەى فەرمايشتى خوداى گەورەوە {وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا} (٣٩٤-٤٠٠)

### باب: في قوله تعالى: {وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا}

٢١٦٠- عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى ( وَالشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ) قَالَ « مُسْتَقَرُّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ » .

(الحديث ٤٠٠ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النَّوَوِيّ

= ٤١٤ حسب ترقيم فم = ف.م = فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخاري بالكردي = الترجمة الكردية، المجلد الثالث الرقم: ١٢٩١ = ٣١٩٩، ٤٨٠٢، ٤٨٠٣، ٧٤٢٤، ٧٤٣٢. أبوداود. الحروف والقرءات: ٤٠٠٢. ترمذي. فتن: ٢١٨٦. تحفة الأشراف: ١١٩٩٤).

ئەم فەرموودەیە لەتەجریدی بوخاریدا ئاوایە، دیکەین بە ڕاڤە بۆ ئەم گێڕانەوەی ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودا لەئیمامی بوخاریو لەئیمامی موسلیم بێ).

ئەبو ذەڕڕی غیفاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی ئاوابوونی خۆردا، لەمزگەوت لەخزمەتی خۆشەویست دا بووم، فەرمووی: ئەی ئەبو ذەڕڕ! ئایا دەزانی کە ئەم خۆرە بۆ کوێ دەچێو لەکوێ ئاوا دەبێ؟

گوتم: خوداو پێغەمبەری خودا باشتر دەزانن، من نازانم، فەرمووی: ئەم خۆرە هەروا دەڕواتو هەموو ڕۆژێ ئەمە ئیشیەتی، دەچێت لەژێر تەختو بارەگا (عەرش)دا کوڕنووشو نووچ دەباو، داوا لەخودا دەکاتەوە، کە دیسانەوە ڕێگای پێ بداتەوەو مۆڵەتی بدات، هەتا لەشوێنی ئاسایی ڕۆژانەی خۆیەوە هەڵبێتەوە، ئیتر هەر لەکوڕنووش دا دەبێ هەتا خودا مۆڵەتی دەداو ڕێگەی پێ دەداو، سەر لەنوێ وەك جاری جاران لەشوێنی خۆیەوە هەڵدێتەوە.

ئەوجا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەڵام هاکا ئەو ڕۆژەهات کە خۆر دەچێ وەك جاران کوڕنووش دەباو لێی قەبووڵ ناکرێو داوای مۆڵەت دەکا، کە وەك جاری جاران لەشوێنی خۆیەوە، لەخۆرهەڵاتەوە هەڵبێتەوە، بەڵام خودا ڕێگەی ئەوەی پێ ناداو پێی دەفەرموێ: بەسەر شۆپی خۆتاڕێك بگەڕێرەوە دواوە، لەوشوێنەوە هەڵبێ کەلێی ئاوابووی، ئیتر خۆر لەخۆرئاواوە هەڵدێ، مەبەست ئەمەیە لەو ئایەتەی قورئان کەدەفەرموێ: {وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ} (سورة يس-٣٦/٣٨).

واتە: گۆی خۆر ئەم یاسای هاتوچۆی خۆیە کەئێستا هەیە، هەموو رۆژێ بەرێکو پێکی بەردەوام دەبێو، دێو دەچێو، لەخۆر هەڵاتەوە هەڵدێو، لەخۆرئاواوە ئاوا دەبێ، هەتا ئەو دەمەی کەبۆی دیاریکراوە. (تاج/٢ ز/١٠٥ ژ/١٥٨٤ + تاج/٤ ز/١٩ ژ/٤٠٦٠ – سوورەتی یاسین + ژمارە/٢١٣٨ کە لەزنجیرە/١٦٩٦ دا لەپێشەوە رابورد).

## سورەتی زومەر = سوره الزُّمَرْ

### ١٧١٨- لەبارەی فەرموودەی خودای گەورەوە: {وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ} (٦٩٧٦ – ٦٩٨٤)

### باب: في قوله تعالى: {وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ}

٢١٦١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) قَالَ: جَاءَ حَبْرٌ إِلَى النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَوْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُمْسِكُ السَّمَوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْجِبَالَ وَالشَّجَرَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَسَائِرَ الْخَلْقِ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَهُزُّهُنَّ فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْمَلِكُ. فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- تَعَجُّبًا مِمَّا قَالَ الْحَبْرُ تَصْدِيقًا لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ: (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ). (الحديث ٦٩٧٧ حسب ترقيم الشيخ مأمون شيحا = ٧٠٠١ حسب ترقيم فتح الملهم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية/٤ رقم: ١٦٨٩ = ٤٨١١، ٧٤١٤، ٧٤١٥، ٧٤٥١، ٧٥١٣).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یەکێ لەزانا گەورەکانی جوولەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی: ئەی موحەممەد! یا گوتی: ئەی باوکی قاسم! لە تەوراتی ئێمەدا هەیە: کەخودای گەورە لەرۆژی قیامەت دا، ئاسمانەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێو زەوییەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێو چیاو دارو درەخت دادەنێ لەسەر پەنجەیێو، ئاوو خاك دادەنێ لەسەر پەنجەیێو، هەموو دروستکراوەکانی تریش دادەنێ لەسەر پەنجەیێ. واتە: بوونەوەر سەرو خواری، بەدەستی توانایی خۆی، وەك تۆپێ دەگرێو، ئەوجا بۆ نواندنی

جەبرەو شانو شكۆیو بەیانی یەكتایی خۆیو بێ نموودیو دەستەوسانی پادشاو قڕاڵەكانی جیهان، ڕایاندەوەشێنێو دووجار دەفەرموێ: پادشای تاكو تەنیا هەر خۆمم، پادشاكانی سەر زەمینو ناو جیهان كوانو لەكوێن؟ با بێنە مەیدان.

ئیبنو نەسعوود فەرمووی: پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) بۆ پشتیوانی ئەم قسەی مالوومە كەو بۆ سەر سوڕمان لێی پێكەنیو ئەوجا ئەمەی خوێندەوە:

{وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ} (سورة الزمر-٣٩/٦٧).

واتە: شانو شكۆی خودا گەلێ گەورەو مەزنە، ئەو كافرە دڵو چاو كۆرانە، وەك پێویست بێو شیاوی ڕێزی بارەگای خوداوەندی بێ، ئاوا قەدرو ڕێزی نازانن، دڵمردوو چووزانێ سۆزو ئەشق چییە؟ میثالو نموونەیێ بۆ ئەوەی كە ئێوە لەگەورەییو دەسەڵاتی خودا تێ بگەن، ئەمەیە: ئەم زەوییە هەمووی، یەك مووی كەم نەبێ، لەگەڵ هەموو ئاسمانەكانا، وەك گۆیێ، وەك هەڵماتێ، وایە لەناو چنگی خودادا، خودا پاكو بێ گەردو گەلێ گەورەیەو بەدوورە لەم لاژگە لاژگی بتپەرستانە، كە بڕیاری هاوەڵو كوڕو كچو هاوسەر بۆ خودا دەدەن. (تاج/٤ ز/٢٢ ژ/٤٠٧٣، ٤٠٧٤، ٤٠٧٤م).

## سوورەتی حامیمی سەجدە = سورة حم السجدة

### ١٧١٩ لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ} الآية: (٦٩٥٥ – ٦٩٧٥)

### باب: في قوله تعالى: {وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ} الآية

٢١٦٢- عَنْ ابن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ: قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ أَوْ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ، قليل فقْهُ قُلُوبِهِمْ، كثير شَحْمُ بُطُونِهِمْ فَقَالَ أَحَدُهُمْ أَتَرَوْنَ أَنَّ اللَّهَ يَسْمَعُ مَا نَقُولُ؟ وقَالَ الآخَرُ يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا وَلاَ يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا وَقَالَ الآخَرُ: إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا . فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ( وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلاَ أَبْصَارُكُمْ وَلاَ جُلُودُكُمْ ) الآيَةَ . (الحديث ٦٩٦٠ حسب ترقيم

الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح الإمام مسلم بشرح النووي = ٦٩٨٤ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. بخاري. تفسير: ٤٨١٦، ٤٨١٧، ٧٥٢١. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٤٨ تحفة الأشراف: ٩٣٣٥).

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود کەناسراوه بە ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەلای بەیتا، دوو قوڕەیشیو یەك ثەقەفی، یا دوو ثەقەفیو یەك قوڕەیشی کۆدەبنەوە، بە لەش قەبەو قەڵەوو فیلەتەن، بەدڵو هۆشو گۆش کەودەنو نادان، یەکێکیان دەڵێ: ئایا ئێوە لەو باوەڕەدان، کە خودا گوێی لێیە کە ئێمە چی دەڵێین؟ یەکێکی تریان دەڵێ: ئەگەر بەدەنگی بەرز قسەبکەین دەیبیستێ، بەڵام ئەگەر بەپەنهانی قسەبکەین نایبیستێ! ئەوی تریشیان دەڵێ: ئەگەر بەدەنگی بەرز قسە بکەین گوێی لێ بێ، بەپەنهانیش قسەبکەین هەر گوێی لێ دەبێ! جا خودای گەورەو مەزن ئەمەی نارد:

{وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ} (سورة فصلت-٤١/٢٢).

## سوورەتی دوخان = سورة الدخان

### ١٧٢٠- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە {فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ} (٦٩٩٧-٧٠٠١)

### باب: في قوله تعالى: {فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ}

٢١٦٣- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ جُلُوسًا وَهُوَ مُضْطَجِعٌ بَيْنَنَا فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّ قَاصًّا عِنْدَ أَبْوَابِ كِنْدَةَ يَقُصُّ وَيَزْعُمُ أَنَّ آيَةَ الدُّخَانِ تَجِيءُ فَتَأْخُذُ بِأَنْفَاسِ الْكُفَّارِ وَيَأْخُذُ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ كَهَيْئَةِ الزُّكَامِ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ وَجَلَسَ وَهُوَ غَضْبَانُ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا اللَّهَ مَنْ عَلِمَ مِنْكُمْ شَيْئًا فَلْيَقُلْ بِمَا يَعْلَمُ وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ فَإِنَّهُ أَعْلَمُ لأَحَدِكُمْ أَنْ يَقُولَ لِمَا لاَ يَعْلَمُ اللَّهُ أَعْلَمُ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ لِنَبِيِّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) (قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ) إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لَمَّا رَأَى مِنَ النَّاسِ إِدْبَارًا فَقَالَ « اللَّهُمَّ سَبْعٌ كَسَبْعِ يُوسُفَ ».

قَالَ فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى أَكَلُوا الْجُلُودَ وَالْمَيْتَةَ مِنَ الْجُوعِ وَيَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ أَحَدُهُمْ فَيَرَى كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّكَ جِئْتَ تَأْمُرُ بِطَاعَةِ اللَّهِ وَبِصِلَةِ الرَّحِمِ وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللَّهَ لَهُمْ - قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ) إِلَى قَوْلِهِ (إِنَّكُمْ عَائِدُونَ ). قَالَ: أَفَيُكْشَفُ عَذَابُ الآخِرَةِ؟! (يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ) فَالْبَطْشَةُ يَوْمَ بَدْرٍ وَقَدْ مَضَتْ آيَةُ الدُّخَانِ وَالْبَطْشَةُ وَاللِّزَامُ وَآيَةُ الرُّومِ. (الحديث ٦٩٩٧ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧٠٢٢ حسب ترقيم فتح الملهم شرح صحيح مسلم. تجريد البخاري بالكوردي/١. رقم: ٥١٨ = ١٠٠٧، ١٠٢٠، ٤٦٩٣، ٤٧٦٧، ٤٧٧٤، ٤٨٠٩، ٤٨٢٠، ٤٨٢١، ٤٨٢٢، ٤٨٢٣، ٤٨٢٤، ٤٨٢٥. ترمذي. تفسير القرآ: ٣٢٥٤. تحفة الأشراف: ٩٥٧٤).

مەسرووق (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت حەزرەتی ئیبنو مەسعوود دا دانیشتبووین، ئەو لەنێوانمانا ڕاکشا بوو، پیاوێ هات بۆلای گوتی: ئەی باوکی ئەورەحمان! ئامۆژگاریخوێنێ لەدەروازەی کیندە، کە دەرگایەکە لەدەرگاکانی شاری کووفە، وەعظو ئامۆژگاری دەخوێنێ، دەڵێ گوایە: نیشانە گەورەکەی دووکەڵەکە، کەلەم ئایەتەدا باسکراوە {يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ} دەڵێ: ئەم نیشانەی دووکەڵە هێشتا نەهاتووە، لەمەو دوا دێ، کاتێ دێ بەری هەناسەی ناموسوڵمان دەگرێو پشووی لێ دەبڕێ وەك سەرخۆشی لێ دەکا، دووکەڵ لەکونە لووتیو گوێچەکەیو کۆمی دەردەچێ، بۆ موسوڵمانیش وەك هەڵامەتێ بگرێ وایە. مەسرووق فەرمووی: جا ئیبنو مەسعوود توڕەبوو لەم قسەیەو هەڵسا ڕێك دانیشتو فەرمووی: ئەی موسوڵمانەکان! ئەی خەڵکینە! لەخودا بترسن، لەخۆتانەوە، بەبێ بەڵگەی ڕۆشن، شت بەدەم خوداو پێغەمبەرەوە بڵاو مەکەنەوە، هەرکەسێ لەئێوە کەشتێ دەزانێ، بابیڵێو بەخەڵکی تری ڕابگەیەنێ بەجوانی، بەڵام ئەگەر کەسێ شتێکی نەدەزانی باشەرم نەکاو بڵێ نایزانم، خوا بۆخۆی دەیزانێ، چونکە نیشانەی زانایی‌و دانایی کەسێ لەئێوە ئەوەیە: شتێ کەخۆی

نایزانێ بڵێ: خوا ئەیزانێ. (تاج/٤ ز/٢١ ژ/٤٠٦٩ – سوورەتی ص). ئیبنو مەسعوود فەرمووی: ئەوەتا خودای گەورە لەم ئایەتەدا بەوە فەرمانمان پێ دەکاو دەفەرموێ: {قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ } (سورة ص-٣٨/٨٦)

واتە: ئەی خۆشەویست! ئەی موحەممەد! بفەرموو: داوای کرێو مزوشتی واتان لێ ناکەم، لەباتی ڕاگەیاندنی قوڕئانو پەیامی ئیسلام بەئێوە، لەهەمان کاتا من لەو جۆرە کەسانە نیم، شتێ کە نەیزانم، بەزۆر بڵێم دەیزانم!

ئیبنو مەسعوود فەرمووی: قسەی ڕاستو دروست سەبارەت بەم دووکەڵەی کەلەم ئایەتەدا باسکراوە، ئەمەیە کە من ڕوونی دەکەمەوە بۆتان: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کاتێ ڕوانی کە قوڕیشو خەڵکی مەککە مل نادەنو درەنگ ئیسلام دەبن، نزای شەڕی لێ کردنو فەرمووی: خودایە! تۆ لەجیاتی من چاری ئەم لەخودا یاخییانە بکەو بەحەوت ساڵ قاتوقڕی یاریدەم بدە بەسەریانا، کەوەك حەوت ساڵە گرانییەکەی کاتی یووسف پێغەمبەر وابێ. ئیتر نزاکەی پێغەمبەریان لێ گیرابوو، وە تووشی وشکە ساڵیو گرانیو قاتوقڕییەکی وەها بوون هەرمەپرسە، قڕی خستە هەموو شتێکیان، تەنانەت لەبرسانا کەوڵو پێستەو مردارو کەلاکی گەنیویان دەخوارد. وەلەبەر بێ هێزیو برسێتی، مرۆڤ چاوی ڕێشکەو پێشکەی دەکرد، بەڕەنگێکی وا کەتەماشای ئاسمانی دەکرد، لەبرسانا لەبەرچاوی تەمو دووکەڵی دەکرد.

هەتا ئەبوسوفیان، کە ئەوکاتە سەرۆکی بتپەرستەکانی مەککە بوو هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گوتی: ئەی موحەممەد! خۆتتۆ لەلای خۆت، فەرمان دەکەی بەفەرمانبەریو تاعەتی خوداو، هەروا بەخزم دۆستیو پەیوەندی خزمایەتی، کەچی بەپێچەوانەوە، وا بەهۆی نزای شەڕی تۆوە، زۆرکەس لەهۆزی تۆ لەبرسانا فەوتانو لەناو چوون، دەی ئەمەت لەچیو ئەوەت لەچی، کەواتە تازووە بۆیان بپاڕێرەوە کەخودا بارانیان بۆ ببارێنێ.

جا خودای گەورە بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ، إِنَّا كَاشِفُو الْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَائِدُونَ} (الدُّخان-٤٤/١٠-١٥)

واتە: جا تۆ چاوەنواڕی ئەو رۆژەیە بکە، کەلەبەر وشکە ساڵیو بێ بارانی، تەمو مژو تەپوتۆزێکی ڕەشی بەدڕەزا، لەچەشنی دووکەڵ، رووی ئاسمان دادەگرێ، مەردوم دەگرێتە ناوو دایان دەپۆشێ، لەتاوانا دەڵێن: ئەمە سزایەکی خودایی ئاشکرایە، بەئێش‌و بەسوێ یە، ئەی خودای ئێمە! ئەگەر ئەم سزایەمان لەسەر لابەری، ئەوا باوەڕدەهێنین بەموحەممەدی پێغەمبەری تۆ، بەڵام دڵنیابن کاتێ ئەم سزایە هات بۆیان، دیسان باوەڕ ناهێنن، ئەگەر بیشی هێنن سوودی نابێ بۆیان، چونکە ئەوان بەو هەموو بەڵگەو موعجیزە گەورانەی کە موحەممەد بۆیهێنان، لەبارو دۆخێکی ئاساییدا، بەوانە باوەڕیان نەهێناو بەڵکوو دەیانگوت: لاوێکی بیانی ئەم قسانەی فێردەکاو ئەم قورئان‌و دینە قسەی خۆی نییەو خەڵکی تر فێری دەکەن، یا دەیانگوت: موحەممەد شێت بووە، دەنا چۆن قسەی وادەکا، دەی لەبارو دۆخی ئاسایی دا ئەمە قسەیان بێ‌و باوەڕ نەهێنن دەبێ لەبارودۆخی پەرێشانی‌و شپرزەیی دا چی بڵێن‌و چۆن موسوڵمان ببن؟

ئەی موحەممەد! بەپیت‌و فەڕی نزای تۆوە، کەلەخودا داواتکرد کە وشکە ساڵییەکەیان لەسەر لابەرین، کەمێ ئەم سزایەیان لەسەر لادەبەین، وە ئێوە ئەی بێ باوەڕینە! بەبێگومان دەگەڕێنەوە بۆسەر کوفرو بێباوەڕییەکەتان.

مەسرووق فەرمووی: جا ئیبنو مەسعوود لەپاش ئەم روونکردنەوەیە، فەرمووی: کەواتە ئەم سزای دووکەڵە ئەمەیە کەمن روونم کردەوە کەلەسەردەمی پێغەمبەر خۆی دا بووەو هاتووەو رۆیشتووەو تەواو بووە، نەك وەك ئەمەی ئەم ئامۆژگاری خوێنە دەیلێ، کە سزایەك بێ لەسزاکانی قیامەت، چونکە سزای قیامەت کەهات لاناچێ‌و ناڕواو تەواو نابێ.

ئەوجا ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەبەست لە {الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى} لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: {يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنتَقِمُونَ} (سورە

الـدخان-٤٤/١٦). کـه خـودا هەڕەشـەی پـێ دەکـا لەناموسـوڵمانەکان، ئـەو هەڵمەتـە گەورەیـە بـوو کـە لـەڕۆژی غـەزای بـەدردا رووی دا، کـە خـودا زەبـرو زەنگێکـی وا نوانـدو، گـورزێکی جـەرگبڕی وەهـای وەشـاند لەناموسـوڵمانەکان، پێـی تـەمێ خواردبوون!

ئـەوجا ئیبنومەسـعوود فـەرمووی: دیـارە کـە ئەلبـەطشـەتولکوبراو گـورزە جەرگبڕەکەیش، وەك مەسـەلەی دووخـانو تـەمو مـژوو و دوو کەڵەکـەو، مەسـەلەی (اللزام) کەلـەم ئایەتـەدا ئامـاژەی بـۆ کـراوە، کەدەفـەرموێ: {فَسَـوْفَ يَكُـونُ لِزَامًـا} (سوره الفرقان/٧٧).

هەروا داستانی شەڕی ڕوومو فورس کەلەم ئایەتەدا دەفـەرموێ: {غُلِبَـتِ الـرُّومُ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْـدِ غَلَـبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ} (سـورة الـروم/٢-٣) دیـارە کـە ئـەم کۆمەڵەشتانە، کە هەریەکەیان لەشوێنێکا، لە قورئانا ئاماژەیان پێکـراوە، هـەموویان لەمەو پێش روویان داوەو تەواو بوونو چاوەڕوان نـاکرێن!. (تـاج/٤ ز/١٣ ژ/٣٩٢٩ – سورەی یوسف) + (تەجریدی بوخاری/٤ ژمارە/١٦٧٨ = ٤٧٧٤ فتح الباری).

٢١٦٤- عن عَبْدُ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: خَمْسٌ قَـدْ مَضَـيْنَ الـدُّخَانُ وَاللِّزَامُ وَالرُّومُ وَالْبَطْشَةُ وَالْقَمَرُ. (الحديث ٦٩٩٩ حسب ترقيم الشيخ خليـل مـأمون شـيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧٠٢٤ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. بخاري. تفسير: ٤٧٦٧، ٤٨٢٠، ٤٨٢٥. تحفة الأشراف: ٩٥٧٦).

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەم پێنـج شـتە لەمـەوپێش روویان داوەو کەس چاوەڕوانی ڕوودانیان نـەکات (بڕوانـە فـەرموودەی ژمـارە: ٢١٦٣ کەوا لەپێش ئەم ژمارەیەوە):

١- دووکەڵەکـە، کـە لەسـوورەتی دوخـان دا، لەئایەتـەکانی (١٠-١١-١٢-١٣-١٤-١٥-١٦)دا باسکراوە. {فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ}.

٢- هەروا (اللزام) کە لەئایەتی (٧٧)ی سـوورەتی فورقـان دا باسـیکراوە: {فَسَـوْفَ يَكُونُ لِزَامًا}.

٣- شەڕی ڕۆمو فارسەکان، کە لەسەرەتای سوورەتی روم دا باسیکراوە: {غُلِبَتِ الرُّومُ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ}.

٤- بەطشەی کوبرا، کە لەئایەتی (١٦)ی سوورەتی دوخان دا باسیکراوە. {يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى}.

٥- لەتبوونی مانگ، کە لەسەرەتای سوورەتی قەمەردا باسی کراوە بەئایەتی: {اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ} (القمر/١).

(بڕوانە: ژمارە/١٥٣٨، ١٥٣٩ کەلەپێشەوە رابوردن).

## سوورەتی فتح = سوره الفتح

### ١٧٢١- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُم} (٤٦٥٦)

### باب: في قوله تعالى: {وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُم}

٢١٦٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ ثَمَانِينَ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ هَبَطُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ جَبَلِ التَّنْعِيمِ مُتَسَلِّحِينَ يُرِيدُونَ غِرَّةَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَأَصْحَابِهِ فَأَخَذَهُمْ سَلَمًا فَاسْتَحْيَاهُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ). (الحديث ٤٦٥٦ = ٤٦٤٤ فم).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە حودەیبیە، هەشتا زەلامی پڕچەك، لەکاتی کردنی نوێژی بەیانی دا، لەچیای تەنعیمەوە داباریین بەسەر پێغەمبەرو یارانی دا، دەیانویست کەلەناکاو بیانکوژن، بەڵام هەموویان بەبێ شەڕو شۆڕ بەگرتن گیرانو بەیدەستو یەخسیر کران، لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەموویانی ئازادکرد، جا خودای گەورە بۆ تۆمارکردنی ئەم داستانە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: {وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا} (سورة الفتح-٤٨/٢٤).

واتە: خودا ئەو میهرەبانەیە، کە لەنزیکی شاری مەککەدا، دەستی کافرەکانی گرتو نەیهێشت کەدەست درێژی لەئێوە بکەن، وەپاش ئەوەی کە ئێوەی زاڵ کرد

بەسەر ئەوانا، دەستی ئێوەیشی گرت و نەیهێشت کەئێوەیش ئازاری ئەوان بدەن، ئەوە بوو ئازادتان کردن، وە ئەم پیاوەتییەی ئێوەیە بوو بەهەوێنی ئەو ڕێکەوتنە پیرۆزەیە، بزانن کە خوا بینایە بەهەموو کارو کردەوەیەکتان. (تاج/٤ ز/٣١ ژ/٤١٠٥ — سوورەتی فەتح: بڕوانە: ژمارە: ١١٧٦ کەلەزنجیرە/٩٣٧ دا، لەپێشەوە لەم کتێبەدا ڕابورد).

## سوورەتی حوجرات = سورة الحجرات

### ١٧٢٢- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ} (٣١٠-٣١٣)

### باب: في قوله تعالى: {لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ} الآية

٢١٦٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ جَلَسَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ فِي بَيْتِهِ وَقَالَ: أَنَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ. وَاحْتَبَسَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَسَأَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) سَعْدَ بْنَ مُعَاذٍ فَقَالَ « يَا أَبَا عَمْرٍو مَا شَأْنُ ثَابِتٍ أَشْتَكَى؟». قَالَ سَعْدٌ: إِنَّهُ لَجَارِي وَمَا عَلِمْتُ لَهُ بِشَكْوَى. قَالَ فَأَتَاهُ سَعْدٌ فَذَكَرَ لَهُ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ ثَابِتٌ أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ وَلَقَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّى مِنْ أَرْفَعِكُمْ صَوْتًا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَأَنَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ. فَذَكَرَ ذَلِكَ سَعْدٌ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « بَلْ هُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ». (الحديث ٣١٠ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٣٢٦ فم = ف.م = فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. تجريد البخاري بالكوردي = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية، المجلد الرابع الرقم ١٤٣٨ = ٣٦١٣، ٤٨٤٦، فتح الباري. تحفة الأشراف: ٣٤٣).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەقورئانی پیرۆزدا: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ}.

واتە: ئەی خاوەن باوەڕەکان، ئەی موسوڵمانەکان! لەکاتی قسەو گوفتوگۆدا، دەنگ بەرزمەکەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەر دا، بەڵکوو بەوپەڕی ڕێزەوەو

بەهێمنیو نەرمی لەخزمەتی دا، قسەو باسو گوفتوگۆبکەن، تانەبێ بە مایەی بێ ڕێزیو ئازار بۆی. سەرەنجام کردەوە باشەکانتان بەم هۆیەوە پووچ ببێتەوە.

ئەنەس فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتەی خوێندرایەوە هات، ثابیتی کوڕی قەیس (ڕەزای خوای لێ بێ) لەماڵەوەی کزومات دانیشتو نەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر بۆ مزگەوت، وە گوتی: من دۆزەخیم. جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەعدی کوڕی موعاذی پرسیو پێی فەرموو: ئەی سەعد! ئەی باوکی عەمر! ثابیتی کوڕی قەیس دیارنییە، خۆ نەخۆش نییە؟ سەعد فەرمووی: ثابیت دراوسێمە، شتی وام نەبیستووە کە نەخۆشبێ.

فەرمووی: جا سەعد دەچێ بۆلای ثابیتو هەواڵ پرسییەکەی پێغەمبەری پێ گوتو پێی گوت: پێغەمبەر دەفەرموێ: خێرە وا ثابیت دیارنییە؟

ثابیت فەرمووی: بەڕاستی خراپم لێ قەوماوە هەرچی کردەوەی چاکەم هەیە، هەموویم بەفیڕۆ داناوە، بۆخۆم بووم بە دۆزەخی، بێ ویلێم لەخزمەت حەزرەت دا کردووەو پاداشی باشی خۆمم بەزایە داوە، چونکە من پیاوێکی دەنگ گەورەمو کەلەخزمەتی حەزرەت دا قسەدەکەم دەنگم لەدەنگی ئەو بەرزترە، خودایش دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ} (سورة الحجرات-٤٩/٢).

ئەوەتا بەپێی ئەم ئایەتە دەنگە دەنگو قسەی بەرز لە خزمەت پێغەمبەر دا دەبێ بەمایەی پووچبوونەوەی کردەوەی باش بەبێ ئەوە خاوەنەکەی بەوە بزانێ! ثابیت فەرمووی: ئەوە لەبەرئەوەیە کەمن لەماڵەوە دەرگام لەخۆم داخستووەو کزوماتو داماو دانیشتووم! بۆ خۆشتان دەزانن کەمن دەنگم زۆر بەرزو گەورەیەو دەنگم سەردەنگی پێغەمبەر دەکەوێ، کەواتە بەپێی ئەم ئایەتە بەبۆچوونی خۆم من دۆزەخیم!!

جا سەعد کە هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم داستانەی ثابیتی کوڕی قەیسی گێڕایەوە بۆی، کە ثابیت لەبەر ئەمەیە کە دیارنییە. خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی سەعد! بچۆرەوە بۆلای ثابیتو موژدەی بەرێ: کە تۆ دۆزەخی نیت، بەڵکوو بەپێچەوانەوە تۆ بەهەشتیت! (تاج/٤ ز/٣٢ ژ/٤١٠٨، ٤١٠٩ — سوورەتی حوجرات).

**روونکردنەوە:**

لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا، لەتەفسیری: تەفسیری کوردی لەکەلامی خوداوەندی دانراوی مەلای گەورە (مەلا موحەممەد کۆیی) دەفەرموێ: وەکی زومەخشەری ئەفەرموێ: ئایەت دەلالەت ئەکا لە سەردوو چشتی هائیل (سامناك-وە) یەکێ کە بەعضێ گوناە، عەمەلی خێر بەفەساد ئەبا، دووەم: گوناهی واهەیە فاعیل نازانێ ئەعمالی بەهەدر ئەدا (لَعَلَّهُ عِنْدَ اللهِ مُحْبِطَ)ە، کەوابێ ئینسان لەتەقوادا، وەکی کەسێ بەرێی درکاوی دا بڕوا، ئەبێ زۆر بە ئیحتیرازو تەوەققیو تەحەفوظ بێ. ئەمە قسەیە زۆرجوانە، مەقبوولە، موئمین لازمە ریعایەتی بکا (تەفسیری کوردی لەکەلامی خوداوەندی بەرگی/٩ سوورەتی حوجرات، ئایەتی دووەم).

٢- ثابیت کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس ئەنصارییە، خەزرەجییە وتاربێژی ئەنصارەکان بوو، نازناوی خەطیبی ڕەسولەڵلا بوو، وەکوو بەحەسانی کوڕی ثابیت دەگوترا: شاعیری پێغەمبەر.

کاتێ لەسەفەری کۆچ دا، خۆشەویست گەیشتە مەدینە، ثابیت بەم بۆنەیەوە، وتاری بەخێرهاتنی خوێندەوەو تیادا گوتی:

وەك چۆن خۆمانوماڵو منداڵمان دەپارێزین لەهەمموو پێشهاتێ، ئاوەها تۆیش دەپارێزین، لەتۆڵەی ئەم خزمەتەدا لەلای خودای گەورە چی پاداشێ باش بۆ ئێمە هەیە؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): بەهەشت. گوتیان قەبووڵمانە.

لەڕۆژی (ئەلحەررە)دا سێ کوڕی ثابیت، بەناوی: موحەممەدو یەحیاو عەبدوڵلا شەهید بوون. ئیبنو ئەثیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەنیهایە دا، دەفەرموێ: ڕۆژی ئەلحەررە،

رۆژێکە ناسراوە لەمێژووی ئیسلاما، لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاوویەدا رووی داوە، سوپایەکی زۆری لەخەڵکی شام نارد، بەسەرکردەیی موسلیمی کوڕی ئەلموڕری، لەمانگی قوربانی ساڵی شەستو سێی کۆچی دا (٦٣) دەستیانکرد بە کوشتوبڕی خەڵکی مەدینە، وەشاری مەدینەیان تالآن کرد، وە صەحابەو تابیعینێکی زۆریان شەهید کرد، حەڕرە خڕە بەرداوییەکە، وا لەدەوری مەدینە، بەردێکی ڕەشی زۆری والیّ، جەنگەی کوشتارەکە لەوێدا رووی دا (بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، لاپەڕە: ٣٣٦، ژمارەی فەرموودە: ١٢١٣ = ٢٩٥٩ هەتا کۆتایی ڕاڤەو شیکردنەوە)کە.

ثابیت لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی جەنگی ئوحودو جەنگەکانی تری پاش ئوحود بووە، ثابیت لەجەنگی یەمامەدا کەلە دژی موسەیلەمەی کەززاب کرا شەهید بوو، وەك لەبوخاری پیرۆزدا دەفەرمویّ: ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: رۆژی رووداوی یەمامە، کە موسوڵمانان لەجەنگێکی بێ سامانا، ئابلۆقەی موسەیلەمەی کەززابیان دابوو، چووم بۆلای ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس، هەردوو ڕانی خۆی هەڵماڵیبوونو خەریکبوو بۆنی گیراوەی کفنی مردووانی دەدا لەخۆی، وەك کەسێ خۆی بۆ مردنو شەهید بوون ئامادەبکا، وەك چۆن هەندێ کەس ئێستا کەدەچن بۆ شەڕ کفن لەبەردەکەن... جا ثابیت لەم شەڕەدا شەهید بوو، زریەیەکی گرانبەهای دزرابوو، پیاوێ لەخەوی دا دەیبینیّ، ثابیت پێی دەڵێ: زریەکەم والەناو مەنجەڵێکا، وا لەژێر کورتانێکا، وا لەفیسارە شوێن دا، وەچەند ڕاسپێرییەکی تری دەکا، وەپێشی دەڵێ: ئەمە راسپێریو وەسێتی منە بۆتۆی دەکەم نەکەی بڵێی ئەمە خەونەو جێ بەجێی ناکەم، بڕۆ بۆلای خالیدی کوڕی وەلید، کە سەرکردەی لەشکرەکەیە، لەسەر زمانی من پێی بڵێ کە ئەو زریە لەسەر ئەم ناوو نیشانەیە وەربگرێتەوە، هەروا کە چوویتەوە بۆ مەدینە بڕۆ بۆلای ئەبوبەکری صەدیق، عەرزی بکە ئەو راسپێرییانەی ترم جێ بەجێ بکا، ثابیت چۆنی فەرموی بوو، زریەکە لەوێدا بوو، دۆزییانەوەو لەکابرای دزیان سەندەوە، هەروا ڕاسپێریو

ئامۆژگارییەکانی تری دەقاو دەق وابوون، وەك خۆی فەرموو بووی، ئەبوبەکر هەمووی جێ بەجێ کردن، یەکەم ڕاسپێری بوو کەخاوەنەکەی لەپاش مەرگی بیکاو جێ بەجێ بکرێ. (بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٣ ژمارە/١١٧٣ = ٢٨٤٥ فەتحولباری).

## سورەتی قاف = سورة القاف

### ١٧٢٣- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: { يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ} (٧٠٩٣-٧١٢٥)

٢١٦٧- عن عَبْدُ الْوَهَّابِ بْنُ عَطَاءٍ فِى قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ) فَأَخْبَرَنَا عَنْ سَعِيدٍ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: « لاَ تَزَالُ جَهَنَّمُ يُلْقَى فِيهَا وَتَقُولُ (هَلْ مِنْ مَزِيدٍ) حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ فَيَنْزَوِى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ وَتَقُولُ قَطْ قَطْ بِعِزَّتِكَ وَكَرَمِكَ. وَلاَ يَزَالُ فِى الْجَنَّةِ فَضْلٌ حَتَّى يُنْشِئَ اللَّهُ لَهَا خَلْقًا فَيُسْكِنَهُمْ فَضْلَ الْجَنَّةِ ». (الحديث ٧١٠٨ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧١٣٥ فم = فتح الملهم شرح صحيح مسلم. تجريد البخاري/٤ رقم: ١٦٩٧ = ٤٨٤٨ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١١٧٧) + (١٦٩٨ تەجريد = ٤٨٥٠ فتح).

لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەو سەرووەرەوە: {يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ} (ق-٥٠/٣٠).

واتە: ڕۆژی قیامەت دەڵێین بەدۆزەخ: ئەرێ پڕبووی؟ دەڵێ ئەگەر ماوە بابێ. عەبدولوەهابی کوڕی عەطاء لەبارەی ئەم ئایەتەوە فەرمووی: سەعید فەرمووی: قەتادە فەرمووی: ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەڕۆژی قیامەتا دەستە دەستە خەڵك بڕك دەدەنە ناو دۆزەخەوە، بەلام دۆزەخ لەبەر گەورەیی‌و پان‌و پۆڕیی خۆی هەر پڕنابێ، جا گشت جارێ کە بەدۆزەخ دەڵێن: ئایا پڕبوویت؟ ئایا ماوتە کە پڕببی؟ ئەویش دەڵێ: ئایا هی تر ماوە؟ ئەگەر هی تر هەیە بابێ!

ئەم حاڵو پرسیارو وەڵامە هەروا بەردەوام دەبێ، هەتا خودای پاكو پیرۆزو مەزن پێی عیززەتی دادەنێ لەسەری، ئەو دەمە وازدێنێو دەڵێ: سوێند بەگەورەییو بەخشندەیی تۆ، ئیتر بەسە، ئیتر بەسە، جێگە نەما، ئەوجا پڕ دەبێو پیش دەخواتەوەو دەپەچنێ بەسەریەكاو، لەناو خۆیدا دەپیشێو پەنگ دەخواتەوە بەسەر یەكا!.

دیارە كە خودای گەورەو خاوەن شكۆ زۆرو ستەمو ناهەقی لەكەس ناكا لەدروستكراوانی خۆی، وە هەروەها بەهەشتیش هەر پڕنابێو پەیتا پەیتا هەر خەڵك دێو دەچنە ناویو هەر جێگەی چۆڵی دەمێنێ، هەتا خودا لەنوێ خەڵكی تری بۆ درسوت دەكاو بەو خەڵكە نوێیە پڕی دەكا!. (تاج/٤ ز/٢٣ ژ/٤١١٦، ٤١١٧).

## سوورەتی اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ = سورة اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ

### ١٧٢٤- لەبارەی فەرمایشتی خوداوە: { فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ} (١٩١١ – ١٩١٦)

### باب: في قوله تعالى: { فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ}

٢١٦٨- عن أبي إِسْحَاقَ قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلاً سَأَلَ الأَسْوَدَ بْنَ يَزِيدَ وَهُوَ يُعَلِّمُ الْقُرْآنَ فِى الْمَسْجِدِ فَقَالَ: كَيْفَ تَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ (فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ) أَدَالاً أَمْ ذَالاً؟ فَقَالَ: بَلْ دَالاً، سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ: « مُدَّكِرٍ ». دَالاً. (الحديث ١٩١١ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ١٨٨٤ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. بخاري. كتاب الأنبياء: ٣٣٤١، ٣٣٧٦، ٤٨٦٩، ٤٨٧٠، ٤٨٧١، ٤٨٧٣. تحفة الأشراف: ٩١٧٩).

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: ئەسوەدی كوڕی یەزید لەمزگەوت قورئانی فێری خەڵك دەكرد، پیاوێكم دی لێی پرسی: ئەم ئایەتە چۆن بخوێنین {فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ} بەدال بیخوێنینو بڵێین {مِنْ مُدَّكِرٍ} یا بەذال بیخوێنینو بڵێین {مِنْ مُذَّكِرٍ}؟

ئەسوەد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: نەء، بەذال مەیخوێنە، بەڵكوو بەدال بیخوێنە، بیستم لەعەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود دەیفەرموو: {مُدَّكِرٍ} بەدال دەیخوێند نەوەك بەذال.

## سورەتی رەحمان = سورة الرحمن

### ١٧٢٥- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ} (٧٤٢٠-٧٤٢٥)

### باب: في قوله تعالى: {وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ}

٢١٦٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « خُلِقَتِ الْمَلاَئِكَةُ مِنْ نُورٍ وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ ».

(الحديث ٧٤٢٠ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٤٥٥ حسب ترقيم فتح الملهم = فم. = ف.م. بشرح صحيح الإمام مسلم).

**عائیشە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی:** فریشتەکان لەنوور، (لەڕووناکی) دروست کراون، وەجان کە باوکی ڕەگەزی جنۆکەیەو ناوی ئیبلیسە لەگڕی ئاگری بێ دووکەڵ دروست کراوە، ئادەمیش کە بابا گەورەی ئێوەیە لەوە دروستکراوە کە لەقورئان دا باس کراوە بۆتان لەچەند ئایەتێکا وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ} (سورە المؤمنون-١٢/٢٣). واتە: بەڵێ لەکاتی خۆی دا ئادەممان دروست کرد لە ئەندازەیێ گڵی پوختەی تەڕکراو بەئاو. (تاج/٤ ز/٨٥ ژ/٥٤٧٧ — پایانی. باسی سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر).

## سورەتی ئەلحەدید = سورة الحدید

### ١٧٢٦- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: { أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ} (٧٤٣٩-٧٤٧٩)

### باب: في قوله تعالى: {أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ}

٢١٧٠- عن ابْنَ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا كَانَ بَيْنَ إِسْلاَمِنَا وَبَيْنَ أَنْ عَاتَبَنَا اللَّهُ عز وجلَّ بِهَذِهِ الآيَةِ (أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ) إِلاَّ أَرْبَعُ سِنِينَ.

(الحديث ٧٤٦٦ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام مسلم = ٧٥٠٢ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح مسلم. تحفة الأشراف: ٩٣٤٢).

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەنێوانی موسوڵمان بوونی ئێمەو گلەیی خودادا لەئێمە، کەوا ئەو گلەییە لەم ئایەتەدا باسکراوە تەنیا چوار ساڵ بوو، کەدەفەرموێ: {أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ} (الحديد-٥٧/١٦).

واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئەی موسوڵمانەکان! دڵ دابهێنن بۆ یادی خودای میهرەبان.

## سورەتی حەشر = سورة الحشر

### ١٧٢٧- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ} (٧٤٣٩-٧٤٧٩)

### باب: في قوله تعالى: {وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ}

٢١٧١- عن عُرْوَةَ قَالَ: قَالَتْ لِي عَائِشَةُ (رضي الله عنها) يَا ابْنَ أُخْتِي أُمِرُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لأَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَسَبُّوهُمْ. (الحديث ٧٤٥٥ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم بشرح الإمام النووي = ٧٤٩١ حسب ترقيم فتح الملهم لصحيح مسلم).

عوروە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) بیستی کە خەڵکی میسر قسەی خراپ سەبارەت بە ئیمامی عوثمان دەکەن‌و ئەهلی شام قسە بەعەلی دەڵێن‌و حەرووریيەکان قسە بە هەموويان دەڵێن کاتێ ئەمە رووی دا عائیشە بەمنی فەرموو: ئەی خوشکەزای خۆم، ئەمانە بەپێی ئایەتی: {وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ} (الحشر/١٠) خودای گەورە بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە فەرمانی پێیان کردووە کە داوای لێ بوردن‌و لێخۆشبوون لەخودا بکەن، بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵەکانی بێ) کەچی ئەوان بەپێچەوانەی فەرمانەکەی خوداوە دەچن جنێویان پێ دەدەن!. واتای ئایەتەکە: چین لەدوا چین لەموسوڵمان کە لەپاش کۆچکاران‌و یاریدەدەران دێنە دنیاوە، لەخودا داوا دەکەن‌و لێی

دەپاڕێنەوەو دەڵێن: خودایە! هەم لەئێمەو هەم لە پێشینانی دوورو نزیکی ئێمە خۆشبە، وە ئەمە داوایانە هەتا ڕۆژی قیامەت.

## سوورەتی جینن = سورة الجِنّ

### ١٧٢٨- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ} (١٠٠٥-١٠١٠)

### باب: في قوله تعالى: {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ}

٢١٧٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: مَا قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عَلَى الْجِنِّ وَمَا رَآهُمْ، انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ. قَالُوا: مَا ذَاكَ إِلاَّ مِنْ شَيْءٍ حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا مَا هَذَا الَّذِى حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَانْطَلَقُوا يَضْرِبُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا فَمَرَّ النَّفَرُ الَّذِينَ أَخَذُوا نَحْوَ تِهَامَةَ - وَهُوَ بِنَخْلٍ - عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ وَهُوَ يُصَلِّى بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ وَقَالُوا: هَذَا الَّذِى حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَرَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا (إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا، يَهْدِى إِلَى الرُّشْدِ، فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا). فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ مُحَمَّدٍ -صلى الله عليه وسلم-: (قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ). (الحديث ١٠٠٥ حسب ترقيم الشيخ مأمون شيحا لصحيح الإمام مسلم بشرح الإمام النووي = ٩٩٨ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخاري = الترجمة الكردية/١ رقم: ٤٢٠ = ٧٧٣، ٤٩٢١، فتح الباري شرح صحيح البخاري. ترمذي. تفسير: ٣٣٢٣. تحفة الأشراف/٥٤٥٢). (راجع الرقم: ٢١١٧ سبق في تسلسل/١٦٧٩).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نە قورئانی خوێندووە بۆ جنۆکەو نە بینیویانی، بەڵکوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ دەستەیێ لەهاوەڵانی دا، لەمەککەوە دەرچوون بۆ بازاڕی عوکاظ،

کە شوێنی کۆبوونەوەی ساڵانەی کۆمەڵانی عەرەب بوو، لەو سەردەمەدا، هەتا سوود لەو بۆنەیە وەربگرێ، بۆ پەخشی ئیسلامو، عەرەبەکان بانگ بکا بۆ سەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئەمە لەو کاتەدا بوو کە شەیاتینی رێگەی ئەوەیان لێ گیرابوو کە بەئاسمانا سەرکەون بۆ هەواڵو دەنگوباس، هەر شەیتانێ هەوڵی ئەوەی بدایێ، بڵێسەی ئاگرو برووسکەو چەخماخە بەرەنگاری دەبوو، جاکاتێ شەیتانەکان بەنائومێدی دەگەڕانەوە، هۆزەکەیەان پێیان دەگوتن: ئەوە چیتانە؟ دەیانگوت: دەنگو باسو هەواڵی ئاسمانمان لێ قەدەغە کراوەو کەدەچین بۆ هەواڵهێنان بۆ ئاسمان، دەدرێینە بەر شووڵە ئاگرو برووسکە. جا شەیتان دەڵێ: دیارە کەشتێ رووی داوە لەجیهانا، بۆیە رێگەی ئاسمانتان لێ گیراوە، دەسادەی کونو قوژبنی سەرزەوی، چ لەرۆژ هەڵاتو چ لەرۆژئاوا، بگەڕێنو بزانن چی رووی داوە، کە بووە بەهۆی ئەم ئاگر بارانە.

جا ئەوانیش بەهەرچوار لادا بۆئەم مەبەستە دەردەچنو دەکەونە هەڵپەو جمو جووڵو سوسەکردن، تا ئەوانەی کەبەرەو مەککە هاتن لەبەطنونەخلە تووشی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەبن، خەریك دەبێ بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ هاوڕێکانی دەکا، کاتێ قورئانەکە دەبیستن، بەوردی گوێی لێ دەگرنو دەڵێن: ئەم قورئانەیە کە بووە بەهۆی ئەوەی کە ناهێڵێ ئێمە وەك جاران بەئاسمانا سەربکەوینو هەواڵ بگرین. ئەوسا دەگەڕێنەوە بۆلای گەلەکەیانو دەڵێن: ئەی گەلی ئێمە! {إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ، يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا} (سورة الجن٧٢/١-٢).

واتە: ئەی گەلی ئێمە! ئێمە قورئانێکمان بیستووە، جێگەی سەرسووڕمانە، ئەوەندە دلگیرو جوانە، رێگەی هەقناسین نیشانی کۆمەڵی ئادەمیزادو بەرەی پەری دەدا، ئێمەیش باوەڕمان پێ کردو چووینە سەر ئەو ئایینی یەکتا پەرستییە، کەئەم قورئانە بانگەوازی بۆدەکا، لەبەر ئەوە هەرگیز کەس ناکەین بەهاوبەشو هاوڕێ بۆخودای پەروەردگارمان. جا خودای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە بۆسەر

پێغەمبەری خۆشەویست خۆی (درودی خوای لەسەربێ) {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ} (الجن-١). واتە: ئەی ڕەهبەری خۆشەویست! تۆ بفەرموو: لەلایەنی خوداوە سرووش و وەحیم بۆ هاتووە، کە کۆمەڵێ لەبەرەی جنۆکە گوێیان لێ ڕاگرتووم لەکاتی دەوری قورئان دا.

تا تەواوی داستانەکە، کەوا لەسەرەتای سوورەتی جین دا، کە قسەو گوفتوگۆی جنۆکەکان بەدەق بەنیگا بۆ پێغەمبەر هاتبوو. (تاج/٤ ز/٥٥ ژ/٤١٨٩-سورەتی جین).

## سوورەتی قیامەت = سورة القيامه

### ١٧٢٩- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ} (١٠٠٣-١٠٠٤)

### باب: عن قول الله تعالى: {لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ}

٢١٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) فِى قَوْلِهِ تَعَالَى ( لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لتعجلِ بِهِ) قَالَ كَانَ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً ، وَكَانَ يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ - فَقَالَ لِى ابْنُ عَبَّاسٍ أنا أُحَرِّكُهُمَا لَكَ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَرِّكُهُمَا فحرك شفتيه. فَقَالَ سَعِيدٌ أَنَا أُحَرِّكُهُمَا كَمَا كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يُحَرِّكُهُمَا فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ - فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ( لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ * إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ ) قَالَ جَمْعُهُ فِى صَدْرِكَ ثُمَّ تَقْرَؤُهُ . ( فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ) قَالَ فَاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ تَقْرَأَهُ . قَالَ فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - اسْتَمَعَ فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ قَرَأَهُ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَمَا أَقْرَأَهُ .

(الحديث ١٠٠٤ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح الإمام مسلم بشرح الإمام النووي = ٩٩٧ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخاري بالكوردي = الترجمة الكوردية. المجلد الرابع. الرقم: ٥ = ٥، ٤٩٢٧، ٤٩٢٨، ٤٩٢٩، ٥٠٤٤، ٧٥٢٤. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٣٢٩. تحفة الأشراف/ ٥٦٣٧).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) فەرمووی: لەپێش دا کاتێ جوبرائیل (درودی خودای لەسەر بێ) سرووش (وەحی)ی دەهێنا بۆ پێغەمبەر (درودو

سەلام‌و صەڵاواتی خوداو فریشتەو ئەهلی ئیمانی لەسەر بێ‌و سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و دایك‌و باوك‌و كەسوكارو هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیكارانی گۆڕی پیرۆزی بێ) گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پەلە پەلی دەكردو خۆش خۆش لێوو زمانی خۆیی بۆدەبزاواندو، ئەم حاڵە زۆر پەرێشانی دەكرد، لەبەر ئەوە ئەم حاڵەی پێوە دیاربوو، ئیبنو عەبباس بەسەعیدی كوڕی جوبەیری فەرموو: وەكوو چۆن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لێوی بۆ ئەجوولان، منیش ئاوا لێو بۆ تۆ دەجووڵێنم، هەتا لەو حاڵەتەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەباشی حاڵی ببی، وە ئیبنو عەبباس بەهەمان شێوە لێوەكانی خۆی جوولان.

سەعیدی كوڕی جوبەیریش بەمووسای كوڕی ئەبو عائیشەی فەرموو: منیش وەكوو چۆن ئیبنو عەبباس، لێوەكانی خۆیی دەجولاند، منیش ئاوەها لێوەكانی خۆم بۆ ئێوە دەجووڵێنم، وە سەعید لێوەكانی خۆی بزواند.

جا خودای باڵادەست‌و خاوەن شكۆ، ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە بۆی: ﴿ لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ﴾ (سورة القيامة: سورەتی ژمارە ٧٥ ئایەتی ژمارە ١٦ و ١٧).

واتە: لەكاتی وەرگرتنی قورئان دا، كاتێ جوبرائیل بە سرووش دەیهێنێ بۆت، پەلە پەلی لێ مەكەو، دەمت نەیەت بەیەكاو مەترسی ئەوەت نەبێ كە بۆت ڕەوان ناكرێ، چونكە ئێمە بەپێی بەڵێنێك كەداومانە پێت، لەئایەتی ﴿سَنُقْرِؤُكَ فَلَا تَنسَى﴾ دا، بەپێی ئەم بەڵێنە لەسەرمانە كە كۆی بكەینەوەو لە فەوتان ڕزگاری بكەین‌و زۆر بەجوانیش بەتۆی ڕەوان بكەین!

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و باوكی) فەرمووی: واتە: ئێمە لەسەرمانەو بەڵێنەو دەیدەین بەتۆ كە ئەم قورئانە بەجوانی بەتۆ ڕەوان بكەین‌و لەسەر زمانت ئاسانی بكەین‌و، بەدڵ باش باش تێی بگەیت، هەتا تۆیش گەلی خۆت، سەرجەمی موسوڵمانان، فێری خوێندن‌و واتاو مانای قورئان بكەی؟

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ = ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە عەبباسی باوکی) فەرمووی: ئیتر لەوە دوا کاتێ جوبرائیل سرووشی بۆی دەهێنا، بەپێی ئەم ئایەتە: {فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ} کاتێ جوبرائیل دەیخوێندەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر مات دەبوو، گوێی دەگرت‌و قسەی نەدەکرد، کاتێ جوبرائیل دەڕۆیشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) قورئانەکەی زۆر بەجوانی‌و بەڕەوانی‌و بەشێنەیی دەخوێند، دەق وەك ئەوەی کە جوبرائیل پێی خوێندبوو، وەك خودا بەڵێن‌و موژدەی ئەوەی پێ دابوو! (تاج/٤ ز/٥٨ ژ/٤١٩٥ — سوورەتی قیامەت).

## سوورەتی {وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ} = سورة: {وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ}

## ١٧٣٠- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ} (٧١٣٢- ٧١٣٥)

## باب: في قوله تعالى: {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ}

٢١٧٤- عن ابن عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «( يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ )، قال: (حتى يَقُومَ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ ». (الحديث ٧١٣٢ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧١٥٩ حسب ترقيم فتح الملهم شرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخاري بالكوردي/٤ رقم: ١٧١٤ = ٤٩٣٨، ٦٥٣١ فتح الباري).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ = ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەعومەری باوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ} (المطففين — سورەتی ژمارە:٨٣ ئایەتی ژمارە:٦) واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی گەلێ گەورەیە، ئەو خەڵکە سەرجەم لەبەر بارەگای پەروەردگاری هەردوو جیهان دا، بۆ پرسینەوەو دادپرسی، دەستەو نەزەر ڕادەوەستن.

فەرمووی: لەکاتی ڕوودانی ڕاوەستانی ئەم ڕۆژەدا هەڵوێست وا ئاڵۆز دەبێ‌و، ئەوەندە بەپێوە ڕادەوەستن‌و ئەوەندە ماندوو و شەکەت دەبن، هی وایان هەیە

ئەوەندە دەوەستێ، هەتا بنا گوێی لەئارەقی خۆی دا دەچەقێ. (تاج/٤ ز/٦٦ ژ/٤٢٠٥ — سورەتی موطەففیفین).

## سورەتی ئینشیقاق - سوره الإنْشقَاق

## ١٧٣١- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: { فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا } (٧١٥٤-٧١٥٧)

## باب: في قوله تعالى: { فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا }

٢١٧٥- عن عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قالت: قال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « مَنْ حُوسِبَ يومَ القيامة عُذِّبَ » . فَقُلْتُ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ( فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا )؟ فَقَالَ: (ليس ذلك الحسابُ، إنما ذاك العَرْضُ، مَنْ نُوقِشَ الحِسابَ يوم القيامةُ عُذِّب). (الحديث ٧١٥٤ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧١٨١ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية/١. الرقم: ٨٧ = ١٠٣، ٤٩٣٩، ٦٥٣٦، ٦٥٣٧ فتح الباري).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەرکەسێ لەقیامەت دا موحاسەبە بکرێ سزا دەدرێ، منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! خودا بمکات بەقوربانت! ئەی ئەوە نییە، کە خودای گەورە دەفەرموێ: {فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ، فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا} (سورة الإنشقاق-٨٤/٧-٨).

واتە: هەرکەسێ بەدەستی ڕاستی نامەی کرداری خۆی لەقیامەت دا وەربگرێ، بەئاسانی حیسابو لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێ.

کەواتە: تۆ مەبەستت چییە کە دەفەرمووی: هەرکەسێ لەقیامەت دا موحاسەبە بکرێ سزادەدرێ؟

خۆشەویست (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ لابردنی ئەم پرسە فەرمووی: ئەوەی کە لێرەدا، وادەفەرموێ، مەبەست دەورکردنەوەو ڕانواندنێکی سەرەتاییە، کە خودا لەگەڵ بەندەکەدا، دوو بەدوو چاوێ بەنامەی کرداریدا دەخشێنێو پێی دەفەرموێ: ئایا

پێ دەنێیت لەم گوناحە، ئەویش عەرزی دەکا: بەڵێ، خودایش دەفەرموێ پێی: مەترسێ، من لەجیهان دا ئەم گوناهانەم بۆ پۆشیویت، ئەوا ئەمڕۆکەیش خۆش دەبم لێت، لەو گوناهانە، ئەمەیش بەس بەدیمەن حیسابو لێپرسینەوەیە، دەنا هەرکەسێ لەحیسابو لێکۆڵینەوەدا، لە گەڵی دا بکۆڵنەوە بەرباد دەبێو بەفاتارەت دەچێ. (تاج/٤ ز/٦٧ ژ/٤٤٠٧ — سوورەتی ئینشیقاق).

## سوورەتی وَاللَّيلِ = سورة وَاللَّيْلِ

### ١٧٣٢- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: { وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى } (١٩١١-١٩١٦)

### باب: في قوله تعالى: { وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى }

٢١٧٦- عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ قَدِمْنَا الشَّامَ فَأَتَانَا أَبُو الدَّرْدَاءِ (رضي الله عنه) فَقَالَ أَفِيكُمْ أَحَدٌ يَقْرَأُ عَلَى قِرَاءَةِ عَبْدِ اللَّهِ؟ فَقُلْتُ نَعَمْ، أَنَا. قَالَ: فَكَيْفَ سَمِعْتَ عَبْدَ اللَّهِ يَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ ( وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى؟) قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ: (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى ). قَالَ: وَأَنَا وَاللَّهِ هَكَذَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَؤُهَا وَلَكِنْ هَؤُلاَءِ يُرِيدُونَ أَنْ أَقْرَأَ: (وَمَا خَلَقَ الذكَرَ والأُنثى). فَلاَ أُتَابِعُهُمْ. (الحديث ١٩١٣ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ١٨٨٦ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. بخاري. تفسير: ٤٩٤٣، ٤٩٤٤).

عەلقەمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆیشتین بۆ شام، کە گەیشتمە دیمەشق چوومە مزگەوت، دوو ڕکات نوێژم کردو گوتم: ئەی خودایە! هاونشینێکی باشم بۆبڕەخسێنە، جا چاوم لێ بوو پیرەمێردێ هات، کە نزیک بووەوە گوتم: هیوام وایە کە خودا تکاکەی گیرا کردبێتم، تاهات لەتەنیشتمەوە دانیشت، پرسیم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەبو دەردایە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتم پێی: لەخودا پاڕامەوە کە هاودەمێکی باشم بۆ بنێرێ، خودا تۆی ناردبۆم، فەرمووی: تۆ خەڵکی کوێیت؟ گوتم: خەڵکی کووفەم، فەرمووی: لەقسەتەوە وادیارە کە فێرخوازیو ویلی بەشوێن زانینا، خۆ ئەو پیاوەی کە سۆڵو کەوشو سەرینو مەتارەکەی پێغەمبەری هەڵ دەگرتو سەرپەرشتی دەکردن، کە ئیبنو مەسعوودە لەلای ئێوە بوو، هەروا ئەو پیاوەشی کە

خـودا پـەنای داوە لەشـەيتان لەسـەر زمـانـی پێغەمبـەر خـۆی لـەلای ئێوەيـە. واتـە: عـەممار، هـەروا ئـەو پياوەشـی کەهـەر خـۆی نهێنييـە تايبەتييـەکانی دەزانـی کـە حەزرەت خۆی پێی گوتبوو، کە حوذەيفەی کوڕی يەمانە، ئەويش هـەر لـەلای ئێـوە بوو، کەواتە: زانای گەورە گەورە لەلای خۆتان زۆرە، ئيتر چی پێويستە شت لـەمن بپرسيت. عەلقەمە فەرمووی: لەپاش دا ئيختيارەکە فـەرمووی: ئيبنـو مەسـعوود { وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى} ی چۆن دەخوێندەوە؟ منيش گـوتم: ئـاوای دەخوێنـدەوە { وَاللَّيْـلِ إِذَا يَغْشَى، وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى، وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى}.

پيرەمێـرد فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووددو صـەڵاواتو سـەلامو ڕەحمـەتو بەرەکاتی خـودای گـەورەی لەسـەر بـێ) بـەزاری پيرۆزی خـۆی ئـەم سوورەتەی پـێ گوتـووم‌و ئـەم سـوورەتەم بـەدەمی خـۆم لـەدەمی خـۆی وەرگرتـووە، کەچـی ئێسـتە ئەمانە هەروازيان لـێ نـەدەهێنام‌و دەيـان ويسـت کـەمنيش ببەنـە سـەر قيرائـەت‌و شـێوە خوێنـدنـەوەی خۆيـان‌و لـەباتی رسـتەی { وَالـذَّكَرِ وَالأُنْثَـى} وەك ئـەوان بخوێنمەوە: {وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى}. ئەمە دەقـی گێڕانـەوەی تـاجول ئوصـولە کـە لەبوخارييەوە ريوايەتی دەکات (تاجول ئوصول بـەرگی/٣ زنجيرە/٢٨ ژمـارە/٣٤٠٤ — چاکێتی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود).

## سوورەتی ضوحا = سورة الضُّحى

### ١٧٣٣- لەبارەی فەرمايشتی خودای گەورەوە: {مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى} (٤٦٥٠-٤٦٣٧)

### باب: في قوله تعالى: {مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى}

٢١٧٧- عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ جُنْدُبَ بْنَ سُفْيَانَ يَقُولُ: اشْتَكَى رَسُولُ اللَّـهِ -صلى الله عليه وسلم- فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَتَـيْنِ أَوْ ثَلاَثًـا، فَجَاءَتْـهُ امْـرَأَةٌ فَقَالَـتْ: يَـا مُحَمَّـدُ إِنِّـى لأَرْجُو أَنْ يَكُونَ شَيْطَانُكَ قَدْ تَرَكَكَ، لَمْ أَرَهُ قَرِبَكَ مُنْذُ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثٍ. قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَـزَّ وَجَلَّ: ( وَالضُّحَى وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى). (الحديث ٤٦٣٣ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٤٦٢١ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمـام مسـلم.

تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية = المجلد الأول، الرقم: ٥٦٠ = ١١٢٤، ١١٢٥، ٤٩٥٠، ٤٩٨٣ فتح الباري).

ئەسوەدی کوڕی قەیس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: خۆشەویست (دروودو صەڵاواتو سەلامو ڕەحمەتو بەرەکاتو پیرۆزیی خودای گەورەی لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو ڕۆحو چاوو دڵو کەسوکارو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکارانی ئارامگای پیرۆزی بێ) تۆزێ ناساخ بوو، دووشەو یا سێ شەو هەڵنەسا بۆ شەونوێژ، جا عەورای ژنی ئەبو لەهەبی لەعنەتی، هاتە گیانی حەزرەتو گوتی: ئەی موحەممەد! دەنگت نییە، ئەمە دوو سێ شەوە نابینم شەیتانەکەت سەرت لێ بدات، ئومێد دەکەم کەوازی لێ هێنابیت. ئیتر خودا ئەمەی نارد: ﴿وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ (الضحى- ٩٢/١-٢).

واتە: سوێند بەکاتی چێشتەنگاو کە جوانترین کاتە، وە سوێند بەشەو کەتەواو دەزرنگێتەوەو، بەتارای ڕەشی تاریکی خۆی هەموو شت دادەپۆشێو کاتی ئەوە دێ ماندوو بحەسێتەوەو هەموو شت ئارام بگرێ. ئەی موحەممەد! خودای تۆ کەتۆی پەروەردە کردووە، هەمیشە هەتا هەتایە وازت لێ ناهێنێو دەست بەردارت نابێ، تۆ خۆشەویستی منی، قەت لێت زیزو دلگیر نابم، چجای ئەوەی رقم لێت بێ).
(تاج/ ژ/٤ ز/٧٦ ژ/٤٢١٦ - سوورەتی ضوحا).

## سوورەتی تەکاثور = سورة التَّكَاثُرِ

### ١٧٣٤- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾ (٧٣٤٣-٧٣٨٨)
### باب: في قوله تعالى: ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾

٢١٧٨- عن عبدالله بن الشِّخِّير (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ يَقْرَأُ (أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ) قَالَ « يَقُولُ ابْنُ آدَمَ مَالِى مَالِى - قَالَ - وَهَلْ لَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مِنْ مَالِكَ إِلاَّ مَا أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ أَوْ تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ ».

(الحديث ٧٣٤٦ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٣٨٠ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم)

عەبدوڵلای کوڕی شەخیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چوومە خزمەتی حەزرەتی خۆشەویست (درودو صەڵاواتو سەلامو ڕەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو سەروەری لەسەر بێ) خەریك بوو سوورەتی {أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ}ی دەخوێند. فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): ئادەمیزاد هەر هەڵپەو هاواریەتی بۆماڵو دەڵێ: ماڵەکەم واو، ماڵەکەم وا! ئایا پێم ناڵێی ئەم ماڵەی تۆ کامەی هی تۆیە، جگە لەوەی کە دەیکەی بەخێرو چاکەو لەپێش خۆتەوە دەینێری بۆ ئەو جیهان، یا دەیخۆیو لەناوی دەبەی لەپێش مردنتا، یالەبەری دەکەیت تا کۆن دەبێو دەدڕێ. (تاج/٤ ز/٨٤ ژ/٤٢٢٤ — سوورەتی تەکاثور).

## سوورەتی نەصر = سورة النَّصْر

### ١٧٣٥- لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە: {إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ} (٧٤٣٩ – ٧٤٧٩)

### باب: في قوله تعالى: { إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ}

٢١٧٩- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ قَالَ لِىَ ابْنُ عَبَّاسٍ تَعْلَمُ - وَقَالَ هَارُونُ تَدْرِى - آخِرَ سُورَةٍ نَزَلَتْ مِنَ الْقُرْآنِ نَزَلَتْ جَمِيعًا؟ قُلْتُ نَعَمْ. (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ) قَالَ صَدَقْتَ. (الحديث ٧٤٦٢ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٧٤٩٨ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح الإمام مسلم. تحفة الأشراف. ٥٨٣٠).

عوبەیدوڵلای کوڕی عوتبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ = ڕەزای خودای گەورە لەخۆیو لە عەبباسی باوکی) فەرمووی پێم: ئایا دەزانیت کە کام سوورەتە دواهەمین سوورەتە کەهەمووی بەیەکەوە، بەیەکجار، هاتبێتە خوارەوە؟ گوتم: بەڵێ، سورەتی {إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ} . فەرمووی: ڕاست دەکەیت.

مامۆستای گەورەو سەروەر (الحافظ زكي الدين عبدالعظيم بن عبد القويّ بن سلامة المنذري الدِّمَشْقِيّ) دەفەرموێ: لەڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی بیستو دووی مانگی شەعبانی ساڵی شەشسەدو سیی‌و نۆ (٦٣٩)ی کۆچی لە (دار الحدیث الکاملیة) لەم موختەصەری صەحیحی ئیمامی موسلیمە (ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ) لێ بوومەوە.

بەندەیش لێرەدا عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم، ئەم دەمە کە سەعات حەوتی بەیانی ڕۆژی ٢٠١١/١/١ ز = ٢٦ موحەڕەمی ١٤٣٢ کۆچییە، لەماڵی خۆمان، لەگەڕەکی مامۆستایان، لەشاری سلێمانی، لەکوردستانی عێراق، لە وەرگێڕانو بەکوردی کردنو ڕوونکردنەوەی ئەم (مختصر صحیح مسلم – للحافظ المنذریّ)یە، لەسایەی خوداوە لێ بوومەوە.

بەکوڵی دڵ لەخودای گەورەو سەوەر داوادەکەم کە ببێ بەمایەی ڕەحمەتی دینو دونیامان، بۆخۆمانو ماڵو منداڵمانو نەوەو وەچەمانو بۆ خوێنەرو چاپکارو بۆ وڵاتو شارمان. ...ئامین ..

نیو سەدە زیاترە کەمن سەرگەرمی خزمەتی سوننەتی پێغەمبەرم، زۆر خۆشی‌و ناخۆشیم لەم ماوەدا دیوە، بەڵام بەهیچ شتێ وەك ئەم جیهادو کۆششە پیرۆزە بەردەوامە لەخزمەتی سوننەتی حەزرەت دا، شادو کامەرانو دڵشاد نەبووم، لەخودای گەورەو سەروەر داوادەکەم کە بیکا بە مایەی شانازی‌و سەربەرزیی دینو دونیامان.... ئامین ....

لەم ماوەدا، بەواتای وشە ئەم زاتانە، یارمەتییان داومو بەپێی تەوانا کارئاسانییان بۆ کردووم، حەزدەکەم لەم شوێنە پیرۆزەدا ناویان تۆماربکەم، هەتا بەدوعای خێر یاد بکرێن ... هاوسەری زۆر بەڕێزم ﴿حاجی مەلا زەکیە خان مەلا کەریم عەلی مرواری تەنگی سەری قەرەداغ﴾. ﴿صەلاح الدینو کامەرانو ئازاد و ئاسۆ لەگەڵ کەژاڵو گەشاوو ئاوازو نەورۆزو سۆزان﴾ کە هەر نۆیان منداڵی خۆمن

لەحاجی زەكیەن. خوا دەست بەحاڵو ماڵو تەمەنو صەلاحو دینو دونیایان بگریو لەكێشەو بەرەو موشكیلە بیانپارێزێ.

بەتایبەتی كچەزایەكی زۆر خۆشەویستو ژیروو وریام هەیە ناوی ﴿تانیا خان كاروان عەبدورەحمانە﴾، زۆر شتم بۆ دەخوێنێتەوە یارمەتیم دەدا، لەسەر داوای خۆی، كە بەو منالییەی خۆی هەست دەكا كەئەم جۆرە كتێبە خێرو بەرەكەتو ڕەحمەتە، جا لەسەر داوای خۆی لێرەدا ناوم هێنا، عەمری درێژبێو بەباوكو دایك گەورەبێو رووی لەڕەحمەتی خودا بێ لەگەڵ ﴿توانا﴾ی برایو ﴿تینا﴾ی خوشكی.

شایانی باسە كەلەم شوێنە پیرۆزەدا، دوعایەكی خێر بۆ جەنابی ﴿مامۆستا محمود أحمد محمد﴾بكەم، كە بەڕاستی ئەم زاتە خزمەتی ئەم بەرهەمە قەڵەمییە پیرۆزانەی بەندەی هەژاری كردووە.

هەروا لەكۆتادا، لەخوای گەورە دوادەكەم كەبەرەكەت بخاتە قەڵەمو زمانو دڵو چاومان، بۆ خزمەتی دینە پیرۆزەكەی هەتا ئاخر لەحظەی ژیانمان.... ئامین....

ئێستایش لەم شوێنە پیرۆزەدا، بە ئومێدی گیرا بوونو قەبووڵ بوونو وەرگرتنی ئەم طاعەتی خزمەتی سوننەتی پێغەمبەرە ئەم چامەیە دەنووسم:

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

سوپاس بۆخودا، سلا و لەحەزرەت
درووود لەیاران، ڕەحمەت لەئوممەت
خۆشەویستی خوا، ئەحمەدی نازدار!
تا چەكەرە و چووز شین دەكا بەهار
تا بانگ دەدرێ، لەدێهات و شار
سەلاوات لەتۆ، بەسەدان هەزار
تا گوڵ لەگوڵشەن دەشەكێتەوە
بەشنۆی ڕەحمەت دڵ دەشێنێتەوە
شەونم بەهەتاو، دەشۆرێتەوە!
بارانی درووود داتگرێتەوە!

تامـــــەل دەخـــــوێنێ لەســـــەر چـــــڵی دار
بەشـــــنەی بـــــاوەڕ دڵ دەبـــــێ بێـــــدار
بەشـــــەو و بـــــەڕۆژ بـــــێ حـــــەد و شـــــومار
بـــــۆ گیـــــانی پاکـــــت ســـــلاوی بۆنـــــدار

★★★★★★★★★

ئـــــەی خۆشەویســـــتی گـــــەلی کـــــورد زمـــــان!
ئەحمـــــەدی ســـــەروەر تـــــاجی ســـــەر ســـــەرمان!
بەقـــــەد گـــــەلا و گیـــــاو گـــــوڵی کوردســـــتان
بـــــارانی ڕەحمـــــەت بـــــدا لـــــەگۆڕتان
کـــــۆتری نامەبـــــەر! شـــــنەبای ڕەحمـــــەت!
ڕابـــــەری نێـــــوان حـــــەزرەت و ئوممـــــەت
تکـــــام ئەمەیـــــە کەبـــــەبێ زەحمـــــەت
ئـــــەم نامـــــەم بـــــەری بـــــۆ خزمـــــەت حـــــەزرەت
لـــــەپاش بـــــەیانی عـــــەرزی ســـــلاوم
ئـــــاواتی گـــــەورەم ئـــــەی نـــــووری چـــــاوم!
بەســـــەیری دیـــــدار بڕێـــــژم چـــــاوم
بـــــەڵکوو بینـــــابێ، هـــــەتاکوو مـــــاوم!
قوربـــــان! کـــــوردێکم ئەشـــــقی قورئانـــــت
نـــــەک جـــــارێ ســـــەد جـــــار بم بـــــەقوربانت
تەشـــــریفێ بێنـــــە بـــــۆ کوردســـــتانت
دوعـــــای بـــــۆ بکـــــە، دەســـــتم دامانـــــت
وا لەباوەشـــــــیا، زۆر لـــــــەیارانت
تامـــــەزرۆن لـــــە بـــــۆ میهـــــری جارانـــــت
وان لـــــە ئامێزیـــــا نوێنـــــەری جوانـــــت
لـــــەخزم و دۆســـــت و نـــــەوە و باوانـــــت!
بـــــۆ کـــــوردان بوونـــــە چـــــەتری ئـــــەمانت
چـــــاوەڕێن لـــــە بـــــۆ تەشـــــریف هێنانـــــت
کـــــاتێ تـــــەواو بـــــوو گەشـــــت و ســـــەیرانت

